




# دایک

ماکسیم گورکی

و: کەریم حیسامی

چاپخانەی ڕۆژهەڵات
Rojhalat Print

- ناوی کتێب: دایک
- نووسینی: ماکسیم گورکی
- وەرگێڕانی: کەریم حیسامی
- بەرگ و دیزانی ناوەوە: ئاگری باڵەکی
- چاپی سێیەم ٢٠٠٧
- نرخ: ٦٥٠٠دینار
- ژمارەی سپاردن:
- ناوەندی بڵاوکردنەوە: هەولێر کتێبخانەی ئاوێر

Email: h.daneshfar@yahoo.com
Mob: ٠٧٥٠ ٤٤٩ ٣٥٦١
هەولێر ـ شەقامی ئاراس ـ کۆڵانی سینەما سیروان





چەند وشەیەک

نووسینی پێشەکی بۆ ڕۆمانی دایک، کە یەکێک لە شاکارە ئەدەبییەکانی واقیعی و پێشکەوتووی جیهانە لە توانای قەڵەمی مندا نییە و بەڕاستی ناتوانم بە و جۆرە باسی بکەم کە نرخی خۆی بدەمێ و شتێکی ئەوتۆی لە سەر بنووسم کە پڕ بە پێستی بێ و وەڵامی ناوەرۆکەکەی بداتەوە. ئەوە هیچ کە قەڵەمی من بۆ هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆکی ڕۆمانی دایک، بڕشتی نییە بەڵکو نووسین لە سەر نووسەری ڕۆمانەکە و پایەی ئەدەبی و هونەری و چۆنییەتی ژیانی لێ وردبوونەوە و پێدا چوونەوە و لێکۆڵینەوە و تێکۆشانێکی زۆری دەوێ کە لە توانای مندا نییە، ئەمەر ئەوە هاتە سەر ئەو باوەڕە کە هەر نەبێ بۆ شارەزایی خوێنەرانی بەڕێزی کورد با زۆریە کورتیش بێ چەند دێڕێک لە سەر ماکسیم گورکی بنووسم و سیمای سادە و سەکاری "دایک" بیش عەمسە بەر چاوی خوێنەرانی بەڕێز .

ئەلیکسێی "ماکسیموڤیچ گۆرکی" ساڵی ١٨٦٨ لە "نیژنی نۆڤگۆرۆد" کە ئێستا ناونراوە ماکسیم گۆرکی لە "دایک" بووە. هەر بە منداڵی هەتیو کەوتووە و سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری بە بێکەسی و هەژاری و لارەملی ڕابواردووە . بە منداڵی زۆر حەزی لە خوێندن بووە. بۆ خۆی دەڵێ: ئەگەر پێیەکگرتبام پێت دەخوێنی ئەو شەرتەی هەموو ڕۆژێ یەک شەمۆیان لە مەیدانی نیکۆلایێڤسکی دارکاریت دەکەمێ بێ گومان قبوڵم دەکرد.

زۆر بە ئاوات بوو بچێتە زانستگا و ساڵی ١٨٨٤ هە ڕێبەر هیوایە چووە "کازان" بەڵام لە جیاتی زانستگا لە لەنگەرگاکانی سەر شەپۆلی دەریا لە نێولات و دز و سەر سەرپێیان دا دەستی بەکار کرد. هیوا و ئەواتی لە بارەی خوێندن لە زانستگا بە هیچ دەرچوو لەو لەنگەرگایەدا شەو و ڕۆژ ١٤- ١٦ سەعات کاری دەکرد .

گۆرکی زۆر بە شێلگیری خەریکی خۆفێر کردن بوو. دەیەویست زۆر باش شارەزای ژیانی خەڵک بێ و وڵاتی خۆی بناسێ بۆ ئەو مەبەستە دەستی کرد بە گەڕان و سووڕانەوە لە وڵات دا ڕۆژەکانی چەمی "ڤۆلگا" ؟ بە پێیان گەڕا ڕووسیای ناوەندی پشکنی، لە ئۆکرانیادا سووڕایەوە و سەری لە کریم و قەفقاز دا .

هەواڵی چیرۆکی ماکسیم گورکی بە ناوی "ماکار چوودرا" ساڵی ١٨٩٢ لە "تیفلیس" پێتەختی گورجستان لە ڕۆژنامەی قەفقاز دا بڵاو کرایەوە. ماکسیم گۆرکی بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆی تویە بە ڕەوتی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕی چینی کرێکاری ڕووسیاوە گرێ دەدا ساڵی ١٩٠٥ -١٩٠٦ ڕۆمانی" دایک"ی نووسی گۆرکی لەو





ڕۆمانەدا خەباتی شۆڕشگێڕی پرۆلیتاریای ڕووسیای دژی ڕێژیمی بۆرژوازی و بۆ گەیشتن بە سۆسیالیزم بە جوانی نیشان دا. قارەمانەکانی ڕۆمانی "دایک" پاڤێل ڤلاسۆڤ و ئاندرێی ناخودکای کرێکار و هەڤاڵەکانیان لە خوێندنەوەی کتێبی قەدەغە کراو و لە وتووێژی نێو گرووپە بچکۆلەکانی سۆسیال دیموکراتەوە دێنە مەیدانی خەباتی ئاشکراو داخوازیی ئابووری و سیاسی دێنە گۆڕێ و خۆپیشاندانی هەوەڵی مانگی ئەیار ساز دەکەن و لە دادگا ئازایانە بۆ هەقانییەتی بیروباوەڕی خۆیان بەڵگە دێننەوە و لە بارەی سۆسیالیزمەوە قسە دەکەن

ماکسیم گۆرکی ساڵی ١٩٠٦ دەچێتە ئەمریکا و چەند وڵاتی دیکەش دەگەڕێ. ساڵی ١٩٣٦ لە مۆسکۆ کۆچی دوایی کرد و لە مەیدانی سوور لە بن دیواری کرێملین لە ڕیزی شۆڕشگێڕانی سۆڤیەت دا بە خاک ئەسپێردرا





دایک

ماکسیم گۆرکی ساڵی ١٩٠٥ پاش لە جەنگەی شۆڕشی ڕووسیەدا ، دەستی کرد بە نووسینی ڕۆمانی "دایک" و ساڵی ١٩٠٦ تەواوی کرد لە کاتی نووسین دا بە زنجیرە لە گۆڤاری – زانیاری – دا بڵاو دەکرایەوە بەڵام زۆر شوێنی سانسۆر دەکرا و چاپ نەدەبوو

ساڵی ١٩٠٧ بە تەواوی نووسینی" دایک" وەک پڕوپاگاندیستی دژی قەیسەر بۆ دادگا بانگ کرا بەڵام گۆرکی لەو کاتەدا لە ئیتاڵیا بوو و دەستیان پێ ڕانەگەیشت گۆڤاری زانیاری کە کتێبەکەی تێدا بڵاو کرابۆوە ، لەلایەن پۆلیسی قەیسەرەوە کۆکرایەوە و قەدەغە کرا. ساڵی ١٩١٧ بۆ یەکەم جار بە تەواوی و بە ئاشکرا چاپ و بڵاو کرایەوە.

ڕۆمانی "دایک "بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان وەرگێڕاوە و بە قسەی نووسەرێکی ڕووس بۆ هەموو ڕەنجکێشێک بووەتە کتێبی بەردەستی

"دایک" ڕێگای وریا بوونەوەی سیاسی بە زەحمەتکێشان نیشان دەدا و خەباتی شۆڕشگێڕی ڕۆمانتیکی لە خۆی دا کۆ کردووەتەوە. یەکێک لە نووسەران لە بارەی ڕۆمانی "دایک" ەوە دەڵێ: ڕەنگە بە درێژایی تەمەنی ئەدەبی جیهان کۆکراوە یەکێ ئەدەبی وەک "دایک" ی ماکسیم گۆرکی چ لە باری خوێنەری زۆر و چ لە باری ئەنسیری ڕاستەوخۆوە لە چارەنووسی میلیۆنها خەڵک دا ، دەست نەکەوێ. بەڕاستی ئەو ڕۆمانە نەک هەر وەک ئەدەبی شۆڕشگێڕ خۆ دەنوێنێ بەڵکو باسی دروست بوون و گۆڕانی سەر بە خۆی شێوازێکی سادەش دەکا لە مەیدانی خەبات دا

گۆرکی لەم ڕۆمانەدا دایک لە پێش دا وەک ژنێکی ژێردەست و داماو و هەژار و لێقەوماو و نەخوێندەوار و بێ بەش نیشان دەدا . لە سەرەتاوە کاتێک سۆسیالیست گیڕی دەکا، چوونکە بیستبووی کە سۆسیالیستەکان قەیسەریان کوشتووە لە ترسی چارەنووسی کوڕەکەی لە گەڵ ڕەوەند دەکەوێ دەبینێ چۆن خەڵک لە دەوری





کوڕەکەی کۆدەبنەوە. لە گەڵ ڕووبەڕووبوونی ژاندارم و هاتوچۆی شۆڕشگێڕان و کۆبوونەوەیان ڕێگای ڕاست شارەزا دەبێ و دەست بە بڵاو کردنەوەی ڕۆژنامە و نووسراوی شۆڕشگێڕانە دەکا. ئەگەر لە سەرەتاوە لەسەر خاتری کوڕەکەی ئەوەی دەکرد پاشان بە بیروباوەڕەوە لە پێناوی ئازادی دا تێدە کۆشێ

لە باری هونەرییەوە کەم بەرهەمی ئەدەبی ئەوتۆ هەیە بتوانێ وەک ڕۆمانی "دایک" خوێنەر بە دووای خۆی دا ڕابکێشێ و پێ بە پێ شارەزای ڕووداوەکانی بکا و بیباتە دنیای مرۆڤایەتی و ئازایی و خۆشەویستی و تێکۆشان .

دۆلۆریس ئیباروری تێکۆشەری بە ناوبانگی ئیسپانیا لە بارەی ئەم ڕۆمانەوە دەڵێ:" دایک"ی ماکسیم گۆرکی بووە هەموو دایکێکی زەحمەتکێش و دایکی هەموو شۆڕشگێڕانی جیهانە

••••••••

زۆر خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە شانازی ئەوەم بە نسیب بوو ئەم شاکارە ئەدەبی و شۆڕشگێڕییە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی و خوێنەرانی کورد بە زمانی خۆیان شارەزای ئەم بەرهەمە گەورە بکەم و کتێبخانەی کوردی بەم کتێبە جەزیە دەوڵەمەند بکەم و برازێنمەوە. بە خۆ بەکەم گرتنەوە دەتوانم بڵێم لە کاتێکدا کە ئەمینداریی یەکی تەواوم لە وەرگێڕانیدا ڕەچاو کردووە هەر لەو کاتەش دا ئەوەندەی لە توانام دا بووبێ هەوڵم داوە وشە و زاراوەکانی بێ ئەوەی ناوەرۆک و مانای خۆیان تێک بچێ بە زاراو و گوتنی کوردی بە کاریان بێنم. بێ جێ نابێ ئەوەندەش بڵێم کە هەوەڵ جار ئەم کتێبەم لە زمانی فارسی یەوە وەرگێڕا سەرزمانی کوردی پاشان لە گەڵ نووسخەی ڕووسی یەکەم بەراورد کرد و لەو شوێنانەی پێویست بوو دەسکاریم کرد

لە کۆتایی دا وەرگێڕانی ئەم شاکارە ئەدەبی و شۆڕشگێڕییە پێشکەش بە گیانی ئەو دایکانە دەکەم کە ئەوەند هەر ڕۆڵەکانیان وەک پاڤێل ڤلاسۆڤ بە گیانی ئازایەتی و نیشتمانپەروەری پەروەردە دەکەن بەڵکو بۆ خۆشیان شان بە شانی ڕۆڵەکانیان وە "کاپیتلاگیا نیلوڤنا ڤلاسۆڤا" لە پێناوی بەختەوەری و خێر و خۆشی گەلەکەیان دا خەبات دەکەن. سوپاسی ئەم هاوڕێ و برادەرانەش دەکەم کە لە ئامادە کردنی ئەم کتێبەدا یارمەتییان داوم هەروەها سوپاسی دوکتور ئاوەحمانی حاجی مارف دەکەم کە هانی دام دایک وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی و پێشکەش بە خوێنەرانی کوردی بکەم

وەرگێڕ

# بەشی یەکەم

## (١)

لە گەڕەکی بەسام و پڕ دووکەڵی کرێکاران دا , هەموو ڕۆژێ دەنگی دڵتەزێنی ئاژێری کارخانە وڵاتی دەلەرزاند . پاشان خەڵکێکی هیلاك و ماندوو بە پەلە لە خانووە بچووکە بۆرەکان دەهاتنە دەر و وەك مارمێلکەی ترساو رایان دەکرد . لە سەرماو سۆڵی تاریك و رونی بەیانی دا , بە کۆڵانێکی تەنگ دا بۆ لای دیوارە بەرزەکانی ئەو کارخانەیە دەچوون کە بەساردی چاوەڕوانیان بوو . پەنجەرەکانی وەك چاوی چووار گۆشە ڕێگا قوڕ و چەورەکانیان روناك دەکرد . قوڕ لە ژێر پێ یان دا فڵچە فڵچی دەهات و دەنگە دەنگی خەڵکی خەواڵو وەك هەرایەك لە هەوا دەنگی دەدایەوە . جنێوەکان هەوایان دەقەڵاشت و لافاوێك لە گرم و هۆڕی ماشێنان و هاڕەی بوخار بە پێشوازیی کرێکارانەوە دەهات .

دووکەڵکێشە ڕەش و بەرزەکان وەك کێشکچی و داوەڵی ڕەش و قامیشی بەرز دیوێکیان دەبینرا.

لە ڕۆژئاوادا کە شەبەقی سووری ڕۆژ لە سەر شووشەی خانووەکان دەدرەوشایەوە . کارخانە ئینسانەکانی وەك خشت و خۆڵ و بڕەی ئاسن لە ژوورە بەردینەکان وەدەر دەنا, ئەوان کە بە دووکەڵ ڕەش هەڵگەرابوون و لە برسان ددانیان سپی دەچوون بۆنی گرانی ڕۆن و چەورایی مەکینەیان لە پاش بە جێ دەما و سەر لە نوێ بە کۆڵانەکان دا بڵاو دەبوونەوە. جموجۆڵ و تەنانەت شادییش لە ئاوازیان دا هەست پێ دەکرا , چوونکە کاری ئەو ڕۆژەیان تەواو کردبوو , حەسانەوە و خواردن لەماڵەوە چاوەڕوانیان بوو .

کارخانە سەعاتەکانی ڕۆژی هەڵدەلوشی و مەکینەکان ئەوەندەی پێداویستیان بوو , هێزی باسکی کرێکارانیان دەمژی . بە بێ نەتیجە ڕۆژێك لە ژیان ڕەش دەبووەوە. مرۆڤ هەنگاوێکی تری بۆ لای گۆڕی خۆی داویشت . بەڵام ئێستا شاد و ڕازی بوو چوونکە دەحەسایەوە و دەیتوانی لە مەیخانە پڕ لە دووکەڵەکان چێژەیەك بکا .

رۆژەکانی وچان تا سەعاتی دە دەنووستن. پاشان پیاوەکانی گەڕاوە و بە ژن و ماڵ جلە باشەکانیان لە بەر دەکرد و دەچوونە کلیسا و سەر کۆنەی لاوەکانیان دەکرد کە گوێ نادەنە ئایین. پاش ئەوەی لە کلیسا دەگەرانەوە ,"پاتە یان" دەخوارد و سەر لە نوێ تا ئێواری دەخەوتن.

ئەو ماندوویی و هیلاکییەی لە کۆنەوە لە لەشیان دا کۆبووبووەوە , ئیشتیای کوشتبوون بۆ ئەوەی نانیان پێ بخورێ دەبوو بخۆنەوە و مەعدەی تەمبەڵیان بە زووراندنەوەی ڤۆدکای توند وەکار بخەن .

ئێواران بە تووەزەلی لە شەقام دا دەگەڕان و ئەوانەی گالۆشیان هەبوو بە وشکەتیش هەر دەپێ یان دەکرد. ئەوانەی چەتریان هەبوو لە کاتی تاو و ساویش دا بە دەستیانەوە دەگرت .

کاتێك توشی یەك دەبون باسی کارخانە و مەکینەیان دەکرد و قسەیان بە خاوەن کار دەگوت. تەنیا باسی ئەو شتانەیان دەکرد کە پەیوەندی بە کارەوە هەبوو . هۆشی سادە و بێ هێزیان لەو رۆژە یەك چەشنەدا کەمتر تروسکەی دەدا . کە دەچوونە ماڵێ لە گەڵ ژنەکانیان شەڕیان دەکرد و زۆر جاریش باشیان دەکوتان . لاوەکان لە مەیخانە دەمانەوە , یا شەوانە لە ماڵێك کۆ دەبوونەوە , "گارمۆن" یان لێ دەدا و گۆرانی هەرزەکارانە و سوکیان دەگوت، سەمایان دەکرد. مەتەڵۆك و نەزیلەی جلف و پوچیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە و زۆریان شەراب دەخواردەوە . لە بەر ئەوەی زۆر هیلاك بوون ,زوو سەرخۆش دەبوون، هەر لە خۆوە تووڕەییەکی بێ مانا لە سینگیان داگڕی دەگرت و دەیانەویست لە شوێنێك دەری بپڕن . ئەم دەم بە بیانویەکی زۆر کەم بە رقێکی دڕندانە پەلاماری یەکتریان دەدا و شەڕێکی خوێناوی ساز دەبوو .

لە پەیوەندی نێوان خەڵك دا , هەمیشە دوژمنایەتیەکی هاندەرانە هەست پێ دەکرا کە وەك ماندوویی و هیلاکی لە ماهیچەکانیان دا ریشەی داکوتابوو .خەڵك بەو نەخۆشی یە رۆحی یەوە لە دایك بووبوون و لە باوکیان بۆیان بە میرات مابووەوە و تا سەر پێچاڵی گۆڕ وەك تارماییەك هەر لە گەڵیان بوو و تووشی کردەوەی چەپەڵ و نارەوای دەکردن .لاوەکان لە رۆژەکانی و چان دا شەو درەنگ بە جلی دڕاو و چڵکن و بە رومەتی داوشاوەوە دەهاتنەوە ماڵێ و خۆیان بەوە رادەنا کە لە هەڤاڵەکانیانیان دابوو. ئەو سووکایەتیەی پێیان کرابوو تووڕەی دەکردن و دەیگریاندن . لەو کاتە دا جێگای بەزەیی بوون و , سەرخۆش و بێچارە و بێز هەستێن بوون . هێندێك جار دایك و باوك رۆڵەکانیان بە سەرخۆشی لە کۆڵان و مەیخانەدا دەدۆزییەوە و دەیانبردنەوە ماڵێ و لە کاتێك دا خواردنەوە بێ حاڵی کردبوون جنێو وتێهەڵدانیان بەسەردا دەباری. پاشان لە جێگایان رادەکردن و بەیانی لە گەڵ نەڕەی ئاژێری کارخانە راستیان دەکردنەوە. دایك و باوکیان هەر چەند جنێویان پێ دەدان , بەڵام سەر خۆشی و شەڕ و کێشەی ئەوانیان پێ کارێکی سروشتی و ئاسایی بوو . باوکەکانیش لە سەردەمی

گەنجییاندا هەروا خواردبوویانەوە و بەشەڕ هاتبوون. ئەوانیش دایك و باوكیان هەبوو . ژیـان هەمیشـە هـەر وا بووە .كەس نازانێ ئەو ژیانە كە وەك چەمێكی قوڕاو بە مەندی دەروا دەڕژێتە كوێوە .

لە گەڕەكدا جاروبار هێندێ كەسی بێگانە دەبینران كە لە سـەرەتاوە لـە بـەر نەناسـراوی سـەرنجی خـەڵكیان رادەكێشا. پاشان خەڵك باسی ئەوەیان دەكرد كە لە كوێ كار دەكەن . بەڵام زوو خەڵك بە دیتنیـان رادەهـاتن و ئیتر كەس بە تەنگیانەوە نەدەبوو.لە قسەكانیان وا دەردەكەوت كە ژیانی كرێكار لە هەموو شوێنێك هەروایـە , جا كە وابوو باسی چی بكەین قسە لێ كردنی ناوێ .

هێندێ لەوانە جاروبار قسەی ئەوتۆیان دەكرد كە لە گەڕەكـدا نەبیسـترابوون . كـەس دەمەتەقـەی لـە گـەڵ نەدەكردن ,بەڵام بە وردی و بە بێ بڕوایی گوێیان بۆ قسە سەیرەكانیان رادەداشت . ئەو قسانە هێنـدێ كەسـیان كوێر كوێرانە تووڕە دەكرد,هێندێك پێیان نیگەران دەبـوون و لـە هێنـدێكیانیش دا هیوایـەكی خـەیاڵیان پێـك دەهێنا و دەبوو بە هۆی ئەوە كە بۆ دامركاندنی كوڵ و كۆی دەرونیان پتر بخۆنەوە .

ئەگەر لە رواڵەت و قسەكانی كابرای بێگانەدا شتێكی تایبەتی دەبینران خەڵكی گەڕەك ماوەیـەك لـە كـۆڵی نەدەبوونەوە و بە بێزاری لە گەڵ دەجوڵانەوە و دەتگوت ترسیان لەوە هەیە كە شتێكی ئـەو تۆیـان بەرێتـە نێـو ژیانی كە رەوەندی پڕ لە كوێرەوەری بەڵام هێدی و ئارامی ژیانیان لێ تێك بدا . بە كوێرەوەری ژیـان راهـاتبوون وایان دەزانی هەر چەشنە ئاڵوگۆڕێك تەنیا بۆ ئەوەیە باریان گرانتر بكا.

خۆیان لەو كەسانە دەبوارد كە قسە سەیرەكانیان دەكرد. پاشان ئەوانە ون دەبوون و دیار نەبوو دەچـنە كـوێ. كاتێك لە كارخانە دەمانەوە بە جیاواز دەژیان و نەیاندەتوانی بچنە نێو كۆمەڵی یەكڕەنگی كرێكاران. پاش ٥٠ ساڵ ژیانی بەمجۆرە ئیتر كابرا دەمرد.

## (٢)

"میخائیل ڤلاسۆڤی" قوفڵ ساز كە كابرایەكی خەمناكی خەمناك و داماو بوو و دووچاوی پڕ لە دڕدۆنگی و بێ بڕوایی لە ژێر برۆ بە پشتەكانی تروسكەیان دەهات . لەم ماڵە دا دەژیا. ئەم كابرایە باشـترین قوفـڵ سـازی كارخانە و پاڵەوانی گەرەك بوو . بەڵام لە گەڵ سەرۆكەكان توند و تیژ بـوو جـا بۆیـە هەقدەسـتێكی كـەمیان دەدایە. رۆژەكانی وچان لە كەسێكی هەر دەدا . هەموو لێی‌دەترسان و كەس خۆشی نەدەویست، هێنـدێ كـەس زۆر جار خەریك بوون لێی بدەن بەڵام دەرۆستی نەدەهاتن. كاتێك ڤلاسۆڤ دەیزانی یەكێك خەریكە پەلاماری بدا .دار ,ئاسن , هەرچی وەبەر دەستی هاتبا هەڵی دەگرت و لینگی لە بەریەك دەبـردن و راسـت رادەوسـتا و بـێ دەنگ چاوی لە دوژمن دەبڕی. سەرو چاوی تا ئەستۆی بە ریشـێكی رەش داپۆشـرابوو، باسـكە توكاوییـەكانی هەمووی چاوترسێن كردبوون . بە تایبەتی لە چاوە زیتەكانی دەترسان كە وەك درێشەی تیژ لە مرۆڤ رادەچوون .

کاتێك مرۆڤ دەکەوتە بەر نیگای هەستی دەکرد کە کەوتووەتەبەرامبەر هێزێکی دڕندەی بێ باك و دەیـەوێ بـە بێ بەزەیی لێی بدا .

بە دەنگێکی نووساو دەیگوت : "خوێڕینە برۆن وەلا کەون" کەڵپە زەرد و گڕەکانی لە نێو توکی سەر و چاوی دا دەدەروشان . خەلك بە جنێـو دان لێـی دەکشـانەو بـە دووای ئەوانـدا هـاواری دەکـرد :" ئـەی ناپیاوینـە" برۆسکەی سووکایەتی پێ کردن لە چاوانی دەدروشـا و پاشـان سـەری هەڵـدەبری و بـە دووای دوژمنـەکانی دا هاواری دەکرد :

-باشە کێ دەخوازێ بمرێ؟

کەس نەیدەویست .

قسـەی کەم دەکردن , قسەی خۆشی ناپیاو بوو . ئەم قسەی بە سەرۆکی کارخانە و بە کرێکارەکانیش دەگـوت . بۆ بانگ کردنی ژنەکەشی بە کاری دەهێنا :

-خوێڕی نازانی پانتۆڵەکەم دڕاوە .

کاتێك "  پاڤێل" ی کوڕی تەمەنی گەیشتە چواردە ساڵ، رۆژێـك خـەریك بـوو قـژەکانی بگـرێ بـەڵام " پاڤێل" رۆهاتە چەکوشێکی گەورەو گوتی :

نەکەی! دەستم لێ نەدەی ......

باۆك هەر وەکی سێبەر بکەوێتە سەر داری، بۆ لای کوڕە باڵابەرزەکەی چوو گوتی :

-چی ؟

-بەسە!   پاڤێل گوتی ئیتر ناهێڵم بەم جۆرە لەگەڵم بجزوویەوە و چەکوشەکەی هەڵ سوڕاند. باوك چاوێکی لێ کردو دەستە توکاویەکانی لە پشتەوە گرت و بە پێکەنینەوە گوتی :

- باشە ........

پاشان بە دەنگی بەرز گوتی :

ئاخ ......خوێڕی .....

گورج بە ژنەکەی گوت :

- بۆ خەرجی خوت و   پاڤێل ئیتر داوای پارە لە من نەکەی ......

ژنەکەی غیرەتی هاتە بەرو گوتی : هەمووی بە ڤۆدکا دەدەی ؟

مستێکی لە میزەکەی داو هاورای کرد: بە تو چی ناچیزە، یارێك بۆ خۆم دەگرم. یاری پەیـدا نـەکرد , بـەڵام نیزیکەی دو ساڵ تا سەرە مەرگی قسەی لە گەڵ کوڕەکەی نەکردو سەرنجی نەدایە .

سەگێکی توکن و زەلامی هەبوو وەك خۆی دەچوو. هەموو ڕۆژێ بەیانی تا بەردەرگای کارخانە وە دوای دەکەوت و ئێوارانیش هەر لەوێ چاوەڕوانی دەبوو . ڕۆژەکانی وچان دەچووە میخانە و بە بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێ بەریگا دا دەرویی. وەك بە دوای شتێك دا بگەرێ , بەمۆرە لێ کردن دڵی ڕێبوارانی دەڕوشاند. تەواوی ڕۆژ سەگەکەی بەدوایەوە بوو. کلکە کوڵکن و ئەستورەکەی بەردەدایەوە .

کاتێك بە سەر خۆشی دەهاتەوە ماڵێ , نانی دەخواردو هەر لە قاپەکەی خۆشی دا بەشی سەگەکەی دەدا . قەت لە سەگەکەی نەدەدا و چخەی نەدەکردێ و ئەشی دەلاواندەوە. ئەگەر ژنەکەی پێی ڕانەگیشتبایە پاش نان خواردن قاپەکان کۆ بکاتەوە , بە عەرزی دادەدان .

بوتڵە ڤۆدکایەکەی لە پێش خۆی دادەناو پاڵی بە دیواری دەدا . بەچاوی نوقاوە زاری لێك دەکردەوەو بە دەنگێکی لاڵەپەتە دەستی بە گۆرانی دەکرد .

دەنگە ناخۆشەکەی لە نێو سمێڵە کانیدا کەوردە نانیان لێ هەڵ دەوەری گیر دەبوون . قوفلێ ساز بە قامکە ئەستورەکانی ریشی دادەهێناو گۆرانی دەتگوت . وشەی گورانیەکانی کەسی لێ تێ نەدەگەیشت .هەواکەی وەك لورەی گورگی زستان دەچوو . تا تەڕایی لە بوتڵەکەی دەبری گۆرانی دەگوت . پاشان لە سەر نێو تەختەکەی رادەکشا و سەری وەسەر مێزەکەی دەکرد و تا کارخانە ئاژێری لێ دەدا هەر بەم چەشنە دەخەوت و سەگەکەشی لە تەنیشتی وەردەکەوت .

قوقلێ ساز قۆرِ بوو . ئەخۆشی پێوە نوسا لەبەر دەرد وژان شین هەڵگەڕابوو. پێنج ڕۆژی تەواو لە نێو جێگادا گینگڵی دەدا وددانی ڕێك دەکوشین هێندێ جار بە ژنەکەی دەگوت:

- ژارم بدەیە .

ژنەکەی دوکتوری هێنا سەری. دوکتور گوتی پێویستە عەمەلیات بکرێ، خێرا بیگەیەننە نە خۆشخانە .

ڤلاسۆڤ لە وەڵامدا گوتی :

- برۆ ناجسن ,جەهەننەم بە. من خۆم دەمرم .

دووای ڕۆیشتنی دوکتور ژنەکەی بە گریانەوە گوتی لێ گەرێ بتبەمە ئەخۆشخانە با عەمەلیاتت بکەن. میخائیل بە مست هەرەشەی لێکرد و گوتی :

ئەگەر چاك بمەوە بۆ تۆ خراپتر دەبێ.

بەیانی ڕاست لەو کاتە دا کە ئاژێری کارخانە بانگی کرێکارانی دەکرد مرد . بە چاوی زەق و دەمی ئاواڵەوە لە تابوتیان نا .ژن و کوڕ و سەگەکەی بۆ سەر قەبران لە گەڵ بوون. "دانیلا ڤێسۆڤشیکۆڤ" ئەو دزە ئارەق خۆرەی کە لە کارخانەیان وەدەر نابوو ، لەگەڵ چەند هەژاری گەڕەك تاگۆڕستان لە گەڵ تەرمەکەی کەوتن

.ژنەکەی تۆزێك گریا. بەڵام   پاڤێلی کوڕی تەرایی بە چاوی دا نەهات . ئەو کەسانەی تابوت و بەرێکەرەکانیان دەدی , رادەوستان و نیشانەی خاچیان دەکێشا. یەکێك لەوانە گوتی :

- ئەمرد............. تۆپی .

پاش ئەوەی تەرمەکەیان بۆ خاك ئەسپارد  خەڵکەکە گەڕانەوە. سەگەکە لە سەر قەبری وەرکەوت , بۆی پێوە دەکرد. دووای چەن رۆژ نەزانراکێ کوشتی.

(٣)

پانزە رۆژ پاش مردنی باوکی رۆژێکی یەك شەمۆ   پاڤێل بە سەرخۆشی هاتەوە ماڵێ . بەلاکە لاك چووە ژووری  و هەر وەك میخائیلی باوکی مستێکی لە مێزەکە دا و بانگی دایکی کرد .

-نان .........................

دایك چوو لە پەنای دانیشت و لە ئامێزی گرت و سەری بە سینگی خۆیەوەنا .  پاڤێل پاڵی پێوە نا و باسکی هاویشتە سەر شانی وگوتی :

- دایە زوو بە

- ئەی هەژار , دایك بە لاواندنەوە و بە دەنگێکی خەمناکەوە وەڵامی دایەوە ,- پاڤێل بە زەحمەت زمانی دەگەڕا ئەڕاندی :

- منیش دەمەوێ سەبیلەی بکێشم. بێنە سەبیلەی باوکم بدە بەمن ...... ئەوە هەوەڵێن سەرخۆشی   پاڤێل بوو . ڤۆدکا هێزی لەبەر بڕیبوو , بەڵام هێشتا هۆشی مابوو , لە خۆی دەپرسی :

ئەدەبوا وا بکەی ......

پاڤێل دڵی تێك هەڵات. پاش ئەوەی هێندێك رشایەوە دایکی درێژی کرد و دەسرەیەکی تەڕی لە سەر نێو چاوانی دانا . تۆزێك وەخۆ هاتەوە بەڵام هەموو شت لەبەر چاوی دەسووڕا . پشتی چاوانی گران بووبوو . تامێکی تاڵ و ناخۆشی لە زاری دەهات . چاوی لە دایکی دەکرد و قسەی دەبزڕکاند :

- هێشتا زووە بۆ من ئەوانی تر هەموو دەخۆنەوە و تێك ناچن , من تێك دەچم .

وەك زۆر لە دوورەوە بێ گوێی لە دەنگی نەرمی دایکی دەبوو کە دەیگوت :

ئەگەر ئەتۆ دەست بدەیتە خواردنەوە ئیتر چۆن دەتوانی من بەخێو بکەی ؟

پاڤێل چاوەکانی لە سەریەك دانا و گوتی : هەموو دەخۆنەوە ......

ـ ئەوان دەخۆنەوە، تۆ مەخۆوە! ئەوەندەی پێویست بوو باوکت لە جیاتی تۆش خواردەیەوە , منیش زۆر ئازار دەدا. باشتر ئەوەیە بەزەییت بە دایکت دابێ .

پاڤێلّ بە بیستنی ئەم قسە نەرم و خەمبارە ژیانی دایکی وەبیر هاتەوە کە چۆن لە کن بابی هەمیشە ناڕەحەت وبێ دەنگ بوو , هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بوو کە مێردەکەی لێی بدا .

بۆ ئەوەی باوکی نەبینی لەم دواییەدا کەمتر لە ماڵێ دەبوو تا رادەیەك دایکی لە بیر چووبووەوە . ئێستا تۆزێك وەهۆش هاتبووەوە لە دایکی دەڕوانی .

باڵا بەرز بوو و تۆزێك چەمابووەوە. لەشی لە بەر زەحمەت و کوێرەوەری بەردەوام و کوتەکی مێردەکەی تێك شکابوو . بێ هەست و خوارە خوارە دەجولاوە . دەتگوت لەوە دەترسێ کە وەشتێك بکەوێ. سەر و چاوی گەورە و درێژەکی و چرچ و کەمێك هەڵساوی بە هۆی چاوە رەشەکانییەوە دەدرەوشانەوە کە وەك چاوی زۆربەی ژنانی ئەو گەڕەکە خەم و خەفەتیان لێ دەباری . جێ برینێکی گەورە لە نێو چاوانی برۆی راستەی تۆزێك هەڵکێشابوو . وادەهاتە بەرچاو کە گوێی راستەی لە هی چەپەی هەورازترە و ئەوە خۆی دیمەنی بەسام دەکرد. لە نێو قژە پڕەکانی دا داوداوی سپی دەبینرا و دەهات پرچی ماش و برینج ببێ .

هەمیشە هێدی بەگوێ و خەفەتبار بوو .

فرمێسکی بە کولّمان دا هاتنە خوارێ .

پاڤێلّ بە دەنگێکی هێدی لەبەری پاڕاوە: ئاوم دەیە بخۆمەوە .

- دەچم ئاوی ساردت بۆ دێنم .

تا هاتەوە پاڤێلّ خەوی لێکەوتبوو. تاوێ لە سەر سەری راوەستا و هەناسەیەکی هەڵکێشا . قاپەکەی لە دەستی دا دەلەرزی و لەتکە سەهۆڵەکان وەقەراخی قاپەکە دەکەوتن . قاپەکەی لە سەر مێزکە دانا و لە بەرامبەر وێنە ی پیرۆزدا چۆکی داداو دەستی بە پاڕانەوە کرد. شوشەی پەنجەرەکان لە بەر لافاوی بە تەوژمی تاریك و مەستانەی دەرەوە دەلەرزین . لە شەوی سارد و تاریکی پایزدا دەنگی گارمۆن دەهات . یەکێك بە دەنگی بەرز گۆرانی دەگوت. قسەی سوك و ناشیرین دەبیسران دەنگی ئەو ژنانەی ترسابوون لە هەوادا دەنگی دەدایەوە

لە ماڵە بچووکەکەی خێزانی ڤلاسۆڤدا ژیانێکی یەك چەشن بەڵام لەجاران هێدی و هێمن تر رێگای خۆی دەبڕی و لە گەڵ ژیانی گشتی گەڕەك فەرقی هەبوو . خانووە کەیان لەو سەری کۆڵان لە سەر کەنداڵێکی قوڵ دروست کرابوو، خوارەوەی زەلکاو بوو .

چێشتخانە سێ یەکی خانووەکەی داگرتبوو . تیغەیەکی باریك و ئەوی کە نەدەگەیشتنە بن میچ، چیشتخانەی لە هۆدەی بچووکی خەوی دایك جیا کردبووەوە. ئەوی تر ژوورێکی دوو پەنجەرەی چووار گوشە بوو. قەرەوێڵەی پاڤێلّ لە قوژبنێکدا بوو و لایەکی تریش دوو نیمچە قەروەێڵە و چەند کورسی و کۆمەدێکی جلان و

ئاوێنەیەكی بچووك و سەعاتێكی دیواری و دوو وێنەی پیرۆزی لێبوو . ئیتر ئاویّ بێنە و دەستان بشۆ . پاڤێلّ دەیوست وەك خەلّك بژی و ئەوەی دەكرد كە لە گەنجێك دەوەشایەوە . گارمۆنێك و كراس و كراواتێكی چەتر و گالۆش و عەسایەكی كڕی و هاتە ریزی هاوتەمەن و هاوشانەكانی خۆی. دەچووە شەونشینی،دانس وسەمای پۆلاكاو هی تر فێر دەبوون. شەوی یەك شەمۆیان بە سەر خۆشی دەهاتەوە مالیّ. بەیانی سەری ژانی دەكرد و تای دەهاتیّ و رەنگی دەبزڕكا .

رۆژێك دایكی لێی پرسی : باشە دوێنیّ خۆشت رابوارد ؟

پاڤێلّ بە خەمناكی وەلآمی داوە :

زۆر هیلاك بووم. باشترە بچمە راوەماسی یا تفەنگێك بكڕم .

بە شێلگیری كاری دەكرد . قەت جەریمە نەدەكرا و بێكا رنەدەبوو , وەك دایكی بیّ دەنگ و ئارام بوو . زۆر بە بیّ وازی چاوی دەگێڕان. تفەنگی نەكڕی, نەچووە راوەماسیش . ئەو رێبازەی بە جیّ هێشت كە هەڤالەكانی پێیدا دەرۆیشتن . كەمتر دەچووە شەونشینی . رۆژی یەك شەمۆیان وەدەر دەكەوت بەلآم بەوشیاری دەهاتەوە . دایك ئاگاداری بوو .دەیدیت كە رومەتە سەوزەكانی رۆژ بە رۆژ لاوازتر دەبن . نیگای بەسامتر دەبیّ و لێوەكانی رێك دین و روالەتێكی سەرسوورهێنەر بە خۆیەوە دەگریّ , وادەردەكەوت كە لە شتێك تووڕەیە و دەنگ ناكا یا نەخۆشە .لە پێش دا هەڤالەكانی دەهاتنە لای پاشان كە دیتیان قەت لە مالّ نییە , ئیتر هاتو چۆیان نەدەكرد . دایك بە خۆشییەوە دەیدیت كورەكەی لاسایی لاوەكانی كارخانە ناكاتەوە . بەلآم كاتێك تێگەیشت كە پاڤێلّ دەیەویّ لە لافاوی لێلّی ژیانی یەك چەشن دوور كەوێتەوە مەترسییەكی گەورە بە سەر گیانیدا زالّ بوو .

رۆژێك دایك لێی پرسی: رۆلە گیان رەنگە نەخۆش بی؟

نا حالّم باشە و ساخم .

دایك هەناسەیەكی هەلكێشا و گوتی: چەند كز بووی .

پاڤێلّ ئەوجار كتێبی دەهێنا یەوە مالیّ و بە نهێنی دەیخوێندنەوە . هێندیّ جار لە سەر كوتە كاغەزێك شتێكی دەنووسی و دەیشاردەوە .

لە گەلّ یەكتر كەم دەدووان و كەم یەكتریان دەدی . پاڤێلّ بەیانیان بە بیّ دەنگی چایەكی دەخواردەوە و دەچووە كاریّ . نیوەڕۆ بۆ نانخواردن دەهاتەوە . لە سەر نان خواردن تەنیا قسەی گالتە دەكران و پاشان تا رۆژئاوا ون دەبوو . كاتێك دەستی لەكار هەلدەگرت جوان خۆی دەشوشت، نانی شەوی دەخوارد و كتێبی دەخوێندەوە . رۆژەكانی یەك شەمۆ بەیانی زوو وەدەردەكەوت و شەو درەنگان دەگەڕایەوە . دایكی دەیزانی كە

پاڤێلْ دەچێتە شارو حەز لە تیاتر دەکا , بەڵام لە شارەوە کەس نەدەهات سەری بدا . دەیدی پاڤێلْ تا دێ کەمتر قسان دەکا هەروەها هێندێك وشەی تازە بەکار دێنی کە ئەو لێیان تێناگا . زاراوەی ناحەز و ناشیرین لە قسەکانی دا نین. پتر لە جاران بە خۆی دادەهات و دەچوو . چالاکتر دەجولاّیەوە و هێدی و هێمن تر دەبوو. دایك لەو گۆڕانەش دەترسا. لە گەل دایکیشی بە شێوەیەکی تازە دەجولاّیەوە . هێندێ جار ژوورەکەی خاوێن دەکردەوە. ڕۆژانی یەك شەمۆ بۆ خۆی جێگای هەڵدەگرت و هەولێ دەدا زەحمەتی دایکی کەم بکاتەو لە گەرەکی ئەوان کەس ئەوەی نەدەکرد.

ڕۆژێکیان تابلۆیەکی هێنا لە دیواری هەلاّوەسی، سێ کەس لەو تابلۆیەدا دەبینران کە نیشانەی ئازایەتی و ئیرادەیان لە دیمەنی دیار بوو .

بۆ دایکی ڕون کردەوە: ئەوە مەسیحە لە گەل پیاوەکانی دەچێتە "ئیمانوس ."

دایك تابلۆکەی پێ جوان بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی: مەسیحت دەوێ بەڵام ناچیە کلیسا ....

تا دەهات ژمارەی کتێبەکان لە کتێبخانەی جوانی پاڤێلْ دا کە دارتاشێکی هاوڕێی بۆی دروست کردبوو زۆرتر دەبوو . دیمەنی ژوورەکە جوانتر دەبوو .

پاڤێلْ زۆر جار ئێوەی بە دایکی دەگوت و بە "ماما" ی بانگ دەکرد. هێندێ جاریش بە خۆشی پێی دەگوت : دایە نیگەران مەبە شەو درەنگ دێمەوە .

دایك ئەم قسانەی پێ خۆش دەبوون. هەستی دەکرد لە ژێر پەردەی ئەم قسانەدا شتێکی شێلگیر و پتەو شاردراوەتەوە . بەڵام لەبەر ئەوەی بۆی ڕون نەدەبووەوە نیگەرانی دایك لە زیادی بوو هەستی ڕوداوێکی نامەعلوم تا دەهات پتر دڵی ڕێك دەگوشی. هێندیٚ جارلە پاڤێلْ نارازی دەبوو بیری دەکردەوە :

هەموو کەس وەك مرۆڤ دەژی. بەڵام کوڕەکەی من وەك "چلەکێش" دەژی. زۆرمات دەبیٚ ورادەمێنیٚ . تەمەنی ئەو ئەمە هەڵناگری. هێندێ جار بیری دەکردەوە :

ڕەنگە یارێکی هەبێ ؟

بەڵام بۆ دڵداری و خۆشەویستی کچان پارە پێویستە لە کاتێك دا پاڤێلْ تەواوی مانگانەکەی خۆی دەکاتە مستی دایکی. بەم چەشنە حەوتو و مانگ تێپەڕین و دوو ساڵ لە ژیانی کڕ و مات و پڕ قسەی خەمناك و بیری بە سام ڕابورد.

## (٤)

شەوێك دووای نان خورادن  پاڤێلٚ پەردەكانی دادانەوە و چرایەكی لە پشت سەری بە دیوارەوە هەلاوەسی و دەستی بە كتێب خوێندنەوە كرد. دایك لە هەلٚوێژاردنی چێشتخانە بووەوە و بە بێ هەستی چووە ژوورەكەی پاڤێلٚ.  پاڤێلٚ سەری هەلٚبڕی و وەك پرسیاری لیٚ بكا چاوی لێكرد.

- هیچ نییە  پاڤێلٚۆكە من بووم، ئەوەندەی گوت و بڕۆی هەلٚتەكاند و خێرا وەدەركەوت. پاش ئەوەی تاوێك لە چێشتخانەكە راوەستا دەستەكانی شوشت و بە پەشۆكاوی گەڕایەوە لای  پاڤێلٚ و بە هێدی گوتی : دەمویست لێت بپرسم ئەوە چییە هەمیشە دەیخوێنییەوە ؟

پاڤێلٚ كتێبەكەی وەلانا :دایە دانیشە .........

پیلاگێیا لە تەنیشتی دانیشت و چاوەڕوانی بوو شتێكی گرنگی پیٚ بلیٚ.  پاڤێلٚ بیٚ ئەوەی چاوی لێبكا بە دەنگێكی نەرم و زۆر ئاسایی گوتی :

- من كتێبی قاچاخ دەخوێنمەوە. خوێندنەوەیان قەدەخە كراوە چونكە لە بارەی ژیانی ئێمە یانی ژیانی كۆمەلٚانی خەلٚك راستی دەنووسن . ئەو كتێبانە بە نهێنی چاپ دەكرێن ئەگەر ئەو كتێبانە لە كن من بدۆزنەوە دەمگرن و بەندم دەكەن. هەر لە سەر ئەوەی ویستومە لە راستی تێبگەم ..... تێگەیشتی ؟

لە پڕدایك پشوی سوار بوو وە هەناسە بڕكە كەوت و بە زەقی چاوی لە كوڕەكەی بڕیٚ . هەر دەتگوت چاو لە بێگانە دەكا.  پاڤێلٚ دەنگی گۆڕا بوو بە قامكە باریكەكانی سمێلی بادەدان و لە بنەوە چاوی لە دایكی دەكرد. بۆ كورەكەی مەترسی وێكەوت و بەزەیی پێداهات :  پاڤێلٚۆكە بۆچی وا دەكەی ؟

- دەمەویٚ راستی بزانم لە حەقیقەت تێبگەم .

دەنگی نەرم و بەلٚام پیاوانە بوو. چاوی دەدرەوشان. دایك زانی كە كوڕەكەی بۆ هەمیشە خۆی بۆ شتێكی بەترس و نهێنی تەرخان كردووە . هەموو شتێك لە ژیانی دا لە بەرچاوی ئەو مسۆگەر و یەكجاری بوو . وای لێهات كە بیٚ بیر لێكردنەوە تەسلیم بێجا بۆیە بیٚ ئەوەی قسەیەك لە دلٚیدا بدۆزێتەوە، دەستی بەگریان كرد .

- دایە مەگری . بە هێدی و ئارامی و بە لاواندنەوە قسەی لەگەلٚ كرد . دایك پێی وابوو مالٚئاوایی لێدەكا. بیر لەوە بكەوە كە ئێمە ژیانمان چۆنە ؟ تۆ تەمەنت گەیوەتە چل سالٚ بەلٚام داخوا ژیان هەبووە ؟ باوكم هەمیشە لێی دەدای. قینی خۆی بە تۆ دەڕشت. ئەو لە ژیانی خۆی تووڕە بوو، بەلٚام بۆ خۆشی نەیدەزانی ماكەی ئەو چارەڕەشییە لە كوێیە .

باوكم ٣٠ساڵ كاری كرد . كاتێك دەستی بە كار كرد كارخانە تەنیا دوو خانووی هەبوو . ئێستا حەوت دەزگای هەیە .

دایك بە ترسەوە هەر لەو كاتەشدا بە حەز و ئاواتەوە قسەكانی دەبیست. چاوەكانی پاڤێل بە جوانی دەدەدرەوشان، سینگی بە مێزەكەوە نابوو، لە دایكی نزیك بووبووەوە رومەتی وەكوڵمەی دایكی دەكەوت كە بە فرمێسك تەڕ بووبوو. یەكەم و تاری خۆی لە بارەی حەقیقەتەوە بە جۆریك دەردەبڕی كە دایك لێی تێبگا. بە هێزی گەنجیەتی و گەرم و گوڕی قوتابییەك كە بە شارەزایی خۆی دەخوڕی و بە دڵ بڕوای پێدەكا، لە بارەی ئەو شتانەوە قسەی دەكرد كە بۆ خۆی رون بوون . مەبەستی ئەوە بوو خۆی تاقی بكاتەوە و دایكیشی قانع بكا. هێندێ جار كە وشەی لە بیر دەچوون رادەوەستا و چاوی بە رومەتی بزركاوی دایكی دەكەوت كە چاوە فرمێسكاوییەكانی بە ترس و نیگەرانییەوە دەتروسكان. بەزەیی پێدا دەهات و سەر لە نوێ باسەكەی دەهێنایەوە سەر دایكی و دەیگوت :

- خۆشی چیت دیوە ؟ چی خۆشت لە رابوردوو وەبیر دێ ؟

دایك بە خەمناكییەوە سەری رادەوەشاند. هەستی بە شتێكی تازە دەكرد كە بۆی رون نەبوو، داخاوییش و دڵخۆشكەریش بوو. پاڤێل دڵی خەفەتباری دەلاواندەوە. یەكەم جار بوو لە بارەی ژیانییەوە قسەیان لە گەڵ دەكرد. بیری لێڵ و ئاڵۆزی كە لە كۆنەوە خەوتبوو ، وەخەبەر دەهات. هەستی دامركاوی بە ئارامی گەش دەبووەوە. بیرەوەرییەكانی سەردەمی گەنجییەتی و ژیانی خەفەتباری زیندوو دەبوونەوە.پێلاگێیا لە گەڵ هەڤاڵەكانی باسی ژیانی كردبوو. باسی هەمووشتی كرد، بەڵام وەك هەموو كەس بێجگە لە سكاڵا و دەردی دڵ رێگای دیكەی نەدەزانی. هیچ كەس بۆی رون نەكردبووەوە كە ژیان بۆچی ئەوەندە سەخت و دژوارە. ئێستا كوڕەكەی لەگەڵی دانیشتبوو، چاوەكانی ,رومەتی , قسەكانی , هەموو لە دڵیدا جێیان دەگرت و شانازی بە كوڕە كەیەوە دەكرد كە بەراستی لە ژیانی دایكی تێگەیشتبوو، لە بارەی كوێرەوەرییەكانی قسەی بۆ دەكرد و بەزەیی پێدا دەهات .

كەم كەس بۆ دایكان دڵسۆزی دەكا .

دایك ئەوەی دەزانی. هەرچی لە بارەی ژیانی ئەوەوە دەیگوت، تاڵ بوو، بەڵام حەقیقەت بوو، هەربۆیەش هەستێكی لە دڵی دایكی دا دەجوڵاندەوە كە وەك لاواندنەوەیەكی بێدەنگی گەرمی دادەهێنا .

پێلاگێیا قسەكەی پاڤێلی بڕی و پرسی : دەتەوێ چی بكەی ؟

- دەمەوێ فێر بم و خەڵكی تریش فێر بكەم . ئێمە دەبێ فێر بین. دەبی بزانین دەبێ تێبگەین بۆچی ژیانی ئێمە ئەوەندە دژوار و بەكوێرەوەریە .

دایك زۆر بەوە دلخۆشی بوو کە دەیدیت چاوە کاڵەکانی کوڕەکەی هەمیشە زەق و زیندوو بوون و لە خۆشیان دەتروسکان. هەرچەندە هێشتا تەڕایی فرمێسکی لە چرچایی رومەتی دا مابوو، بەڵام لە خۆشیان بزەی دەهاتێ. هەستی بە دووشت دەکرد , لە لایەك شانازی بەوە دەکرد کە کوڕەکەی بەختەوەری هەموو کەسی دەوێ و دلسۆزی هەموانە و کوێرەوەری ژیانی تێدەگا، لە لایەکی تریش نەیدەتوانی لە بیر خۆی بەرێتەوە کە کوڕەکەی گەنجە و وەك خەڵکی تر قسە ناکا و بڕیاری داوە بە تەنیا لە گەڵ ئەو ژیانە خەبات بکا کە خۆی و خەڵکی تریش هەیانە . دەیویست پێی بڵێ :

- خۆشەویستم تۆ چت پێدەکرێ ؟

بەڵام لەوە دەترسا کە هەستی خۆشەویستی لە ئاست کوڕەکەی کەم بێتەوە کە هێندە بە هۆش و تا رادەیەك بێگانەش دەهاتە بەر چاو .

پاڤێل دەیزانی دایکی سەرنجی قسەکانی دەدا و بزەی لێوی و ئەو خۆشەویستییەی کە لە چاوەکانی دا دەدەرەوشاوە دەینی. پێی وابوو ئەو حەقیقەتەی خۆی دۆزیویەتەوە بردوویەتە مێشکی دایکیشی. شانازی بە هێزی قسەکانی دەکرد . بڕوای بە خۆی بەهێزتر دەبوو. توند داگیرسابوو , جارێك بە پێکەنین و جارێکیش بە تووڕەیی قسەی دەکرد. هێندێ جار رقێك لە سینگی دا دەجولا یەوە. کاتێك پێلاگێیا ئەو تووڕەیی و قینەی دەدی بە ترسەوە سەری دەلەقاند و هێدی دەیپرسێ :

- پاڤێلۆکە، جا وایە ؟

- بەڵێ وایە .......... بە دەنگیکی مەند و پتەو وەڵامی دەدایەوە. باسی هێندێك کەسی بۆ کرد کە خێرخوای گەلن و تۆوی حەقیقەت دەچێنن. هەر بۆیەش راویان دەنێن و دەیانخەنە بەندیخانە یان بۆ شوێنی کاری گران دووریان دەخەنەوە . بە توندی هاواری کرد من ئەو کەسانەم دیوە گیانی پاکی سەرزەوین. ئەو قسانە دایکیان ترساند .

دەیویست لە کوڕەکەی بپرسی:

بەراستی وایە ؟

بەڵام لەو بارەوە بڕیاری نەدا . گوێی بۆ باسکردنی ئەو کەسانە رادەگرت کە نەیدەناسین و شێوە بیر کردنەوە و قسە کردنێکیان فێری کوڕەکەی کردبوو کە مەترسی هەبوو بۆی .

ئاخرەکەی دایك گوتی :

- ئێستا رۆژ دەبێتەوە، باشترە بخەوی ...... راکشێ ....دەبێ بەیانی زوو بچیە کارێ .

- باشە ئێستا دەچم دەخەوم، سەری بۆ لای دایکی خوار کردەوە و پرسی : لێم تێگەیشتی ؟

- وەڵامی داوە .... بەڵێ تێگەیشتم. دیسان فرمێسکی بە چاوان دا هاتە خوار و بە کوڵی گریانەوە گوتی: تێدا دەچی .

پاڤێلْ هەستا و لە ژوورەکەدا دەستی بە هاتو چۆ کرد و گوتی :

- باشە ئێستا تێگەیشتی چ دەکەم و دەچمە کوێ. هەموو شتێکم پێ گوتی . تکا دەکەم ئەگەر خۆشت دەوێم پێشم نەگری .

دایك قیژاندی : رۆڵە گیان باشتربوو هیچم نەزانیبایە .

پاڤێلْ دەستەکانی دایکی لە نێو دەستی خۆی گرت و توند رێکی کوشی.

پێلاگێیا لە وشەی "دایە گیان" ولەو دەست گوشینە کە بۆ ئەو تازە بوو، واقی ورِما و بە هەناسە برِکە گوتی :

بە پێچەوانە ی مەیلی تۆ هیچ ناکەم تەنیا دەمەوێ ئاگات لە خۆت بێ.... ئاگا . پاشان بێ ئەوەی بزانێ ئاگای لە چی بێ. بە خەمناکییەوە لێی زیاد کرد :

رۆژ لە گەڵ رۆژ کزتر دەبێ. بە نیگایەکی خۆشەویستانە تەماشایەکی بەژن و باڵای رێك و پێکی کورِەکەی کرد و هێدی گوتی :

خوا بتپارێزی. چۆنت دەوێ ئاوا بژی. دەستت وەبەر ناهێنم تەنیا شتێکم لە تۆ دەوێ:

قسەی بێسەرە و بەرەمەکە. دەبێ خۆ لە خەڵك بپارێزی، هەموویان دژی یەکترن. بۆ تەماع و ئێرەیی دەژیـن. هەموو دەیانەوێ خراپە بکەن کاتێك بتەوێ عەیبەکانیان بلێی و بیر و رای خۆت دەربـبرِی، خۆشیان ئاوێی و دەتفەوتێنن .

- پاڤێلْ لە دەرگا راوستا بوو ئەم قسە خەفەتبارانەی دەبیست، بە زەردەخەنەوە گوتی :

- بەڵێ خەڵك خراپن. بەڵام لەوەتا بۆم دەرکەوتووە حەقیقەتێك لە سەر زەوی هەیە، باشتر دێنە بەر چاو .

دیسان بزەیەکی هاتێ و درێژەی پێدا :

بۆ خۆشم تێنا گەم بۆ وابوو. بە منداڵی لە هەموو کەس دەترسام کە گەورە بووم لە هەموو کەس بێزار بووم ... لە هێندەێکیان لە بەر بێ غیرەتی.....لە هێندێکی تر نازانم بۆ چی؟ بەڵام ئێستا وانییە. بەزەییم پێیاندادێ ........

نازانم بۆ چی ؟لەوەتا زانیومە حەقیقەتێك هەیە و خەڵك هەموو تاوانباری ئەو ژیانە نالەبارەی خۆیان نین، دڵم نەرمتر بووە ...

تاوێك بێ دەنگ بوو. وەك بییەوە شتێك لە خۆی ببیسێ. پاشان بە مەندی و هێدی قسەکەی درێژە پێدا :

حەقیقەت ناوا کاریگەرە .
دایك تەماشایەکی کرد و بە کزی گوتی : بۆ خاتری خوای تۆ زۆر گۆڕاوی .
کاتێك راکشا و خەوی لێکەوت، دایك بەسپایی هەستا و لە قەرەوێڵەکەی چووە پێش. پاڤێل لە سەر سینگ درێژ ببوو. سەر و چاوی رەشتاڵە و خەتەکانی لە سەر سەرینی سپی نەخشیان بەستبوو. دایك بە پێی خاوسی و بە کراسی خەویْ دەستی دەبەر یەك نان و بە دیاریەوە راوەستا . بێ دەنگ بوو. لێوی دەبزاوتن و دڵۆپە فرمێسکی لە چاوان دەتکان. سەر لە نۆی ژیانیان دەستی پێکردەوە . بێ دەنگ بوون لە کن یەك بوون و لێك دوور بوون.

## (٥)

رۆژێك لە نیوەی حەوتودا پاڤێل هاتەوە بە دایکی گوت :
ـ شەمۆیە لە شارەوە میوانم دێن!
لە شارەوە ؟دایك راچەنی .
بۆچی دایە گیان ؟ پاڤێل بە نارەحەتی هاواری کرد.
هەر ناوا .................. نازانم بۆ چی ؟
دەترسی ؟
ئەو جار درکاندی : بەڵێ دەترسم .
پاڤێل سەری بۆ لای رۆمەتی دایکی خوار کردەوە و هەر وەك باوکی بە توورەیی گوتی :هەر لە بەر ئەو ترسەیە هەموومان بە هیلاك دەچین. ئەوانەی بە سەر ئێمە دا فەرمانڕەوایی دەکەن هەرلەم ترسەی ئێمە کەڵك وەردەگرن و پترمان دەترسێنن .
دایك بە خەمناکی هاواری کرد:لێم زیز مەبە ..... ئەی چۆن نەترسم. تەواوی ژیانم بە ترس رابواردووە . ترس بەسەر گیانم دا زاڵ بووە .
پاڤێل بە دەنگێکی نەرم و هێدی گوتی : لێم ببورە .....چاری دیکەم نییە. وەدەرکەوت .سێ رۆژی تەواو دایك هەر چەند وەبیری دەهاتەوە کەوا بەم نزیکانە خەڵکی بێگانە دێنە ماڵی، ئەو کەسانە دێنە ماڵی کە ئەم رێگایەیان بە کوڕەکەی نیشان داوە کە بەسەری دا دەڕوا لەرزی لی ٘ دەنیشت .
ئەگەر کەسێك هات بڵێ ئێستا دێتەوەچاوەڕوانم بن. تکایە مەترسی ٘.
دایك لە سەرەخۆ پاڵی وە نیمچە قەرەوێڵەکە دا، پاڤێل بە مۆڕی چاوێکی لێکرد و گوتی : تۆ دەتوانی بچیە شوێنێکی تر .

دایکی بەم قسە دڵی یەشا و بە نیشانەی بەرهەڵستی سەری راوەشاند و گوتی :

ـ نا. بۆ دەچمە دەرێ؟ ناخری مانگی تەشرینی دوو بوو. بە فرێکی وشك و ورد باریبوو . بەستبووی و لە ژێر پێی پاڤێلّ دا سێڕەی دەهات. تاریکایی وەك دوژمنێك کە خۆی لە شتێك مات دابێ , شووشە پەنجەرەکانی گرتبوو. دایك دەستی بە تەختەکەوە گرتبوو، دانیشتبوو و چاوی لە دەرگا بڕیبوو.

وای دەهاتە بەر چاو کە لە هەموو لایەکەوە دز دەوری ماڵەکەیانی داوە و خەڵك بە جلی سەیرەوە روو لە ماڵەکەیان دەکەن . ئەوەتا، یەکێك ئەوە لە بن دیوارە و بە دەستە کوت لە دیواری دەگەڕێ. دەنگی فیکەیەك هات و وەك سیمێکی باریکی دەنگ خۆش و خەمبار، بە مارپێچ وەسەرکەوت . ئەو دەنگە لە کڕو ماتی شەودا سەر گەردان بوو، نزیك دەبووەوە، لەبن پەنجەرە ون دەبوو . وەکوو لە داری چوار چێوەی خزابێ . دەنگی پێی بای دایەو. دایك لە رزێکی هاتێ وتوند برۆی هەڵتەکاند و هەستا.

دەرگایان کردەوە. لە پێش دا سەرێکی زل بە کڵاوێکی کەوڵەوە دەرکەوت. لەشێکی درێژ و چەماوەی بە دووادا دەکێشا. خۆی راست کردەوە و باسکی راستی هەڵێنا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە دەنگێکی لە قوڵایی سینگیەوە گوتی :

ئێوارە باش !

دایك بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێ کووڕ بووەوە .

ـ پاڤێلّ لە ماڵە ؟

کابرا بە کاوە خۆ چاکەتە کەوڵەکەی داکەند و لاقێکی هەڵێنا و بە کڵاوەکەی بەفری لە چەکمەکانی تەکاند و کڵاوەکەی فڕێ دا قوژبنێك و لە کاتێکدا بە سەر لاقە درێژەکانییەوە بەم لاو ئەو لادا دەهات، وەژوور کەوت، لە کورسییەکە نزیك بووەوە ، وەك بێ یەوێ قایم و قۆڵی کورسییەکە تاقی کاتەوە. پاشان دانیشت و باوێشکی هاتێ. دەستی بە زاریەوە گرت . سەرێکی خڕی هەبوو و بە مەکینە لە بندا تاشیبووی. ریشی تاشراو و سمێڵە درێژەکانی شۆڕ بووبوونەوە . زۆر بە وردی بە چاوە زەقەکانی تەماشای ژوورەکەی دەکرد. لاقی هاویشتبوونە سەر یەك و لە کاتێکدا کورسییەکەی دەبزاوت پرسی :

ـ ئەم خانووە ئی خۆتانە یا بە کرێتان گرتووە ؟

دایك لە بەرامبەری دانیشت و لە وەڵامدا گوتی : بە کرێمان گرتووە .

خانوویەکی وانییە — کابرا گوتی —

دایك بە نەرمی گوتی : ئێستا پاڤێلّ دێتەوە، چاوەڕوان بە . کابرا درێژەکە بە ئارامی وەڵامی داوە : بەڵێ چاوەروان دەبم. ئارامی و دەنگی نەرم و سادەیی سەروچاوی ، غیرەتی وەبەر دایك نا و بە دڵسۆزی چاوی

لێکرد.کابراش بە راشکاوی تەماشای کرد . لە قوڵایی چاوە زەقەکانی دا تروسکەیەکی خۆش دیار بوو . لەو مەخلوقە خوار و خێچەدا کە لە سەر دوو پێ ڕاوەستا بوو شتێکی شاد و دڵخۆشکەر دەبینرا. جلەکانی کراسێکی شین و پانتۆلێکی ڕەش بوو کە دەلینگەکانی لە چەکمەکەی هاویشتبوون . دایك خەریك بوو لێی پرسێ : کێیە و لە کوێوە هاتووە و داخوا لە مێژە کوڕەکەی دەناسێ ؟ بەڵام کابرا لە پڕ خۆی بزاوت و گوتی:

- دایە گەورە کێ ئەم برینەی لە نێو چاوانت کردووە؟

بە دەنگێکی خۆش قسەی دەکرد و بە چاوان پێدەکەنی. ئەم پرسیارە حاڵی پێلاگێیای گۆڕی. لێوەکانی تێك نا و پاش تاوێك مات بوون بە ساردییەکەوە گوتی : باوکە گیان ئەو مەسەلەیە بە تۆ چی ؟

کابرا تەواو ڕوی بۆ لای دایك وەرگێڕا وگوتی : باشە. زیز مەبە. بۆیە پرسیارم کرد ، چونکە باوەژنەکەی منیش ڕاست وەك تۆ سەری قەڵشابوو . مێردەکەی بە قالبە کەوش لە سەری دابوو . مێردەکەی پێڵاودرو بوو , بۆ خۆشی جل شۆر بوو . ئەو غەزەب لێگیراوە نازانم لە کوێ ئەو ئارەقخۆرەی دیتبووەوە . پێشتر منی بە کوڕی خۆی قبول کردبوو. تەنیا دەتوانم ئەوەندەت پێ بڵێم کە لێی دەدام بەڵام لێدان .ئەوەندەی لێ دەترسام زراوم چوو بوو .

پێلاگێیا لە بەرامبەر ئەم ساکاری و ڕاستییەدا خۆی بێ دەسەڵات هاتە بەرچاو و پێی وابوو ئەگەر لە ناست ئەو پیاوەدا روخۆش نەبێ، پاڤێڵ توورە دەبێ . بە زەردەخەنەیەکی شەرماوییەوە گوتی : دڵم نایەشێ ......بەڵام تۆ زۆر زوو پرسیارت لێکردم . ئەوە میراتی مێردەکەمە. تۆ تاتار نی ؟

کابرا لاقەکانی ڕاوەشاند و قاقایەکی وای کێشا گوێیەکانیش پاشەوشکێن بوون . پاشان بە

مەندی گوتی نا هێشتا تاتارنیم . دایك لە گاڵتەکەی حاڵی بوو، بە بزەیەکەوە گوتی : بە ڕوسییەکی تەواو قسە ناکەی .

میوان بە خۆشییەوە سەری ڕاوەشاند و گوتی :

ـ زمانی من لە زمانی ڕوسی باشترە. من خەڵکی" کانیوڤم."

ـ لە مێژە لێرەی ؟

ـ نزیکەی ساڵێك لە شاری بووم و ئێستا مانگێك دەبێ هاتومە کارخانەی لای ئێوە لێرە. خەڵکێکی باشم دۆزیوەتەوە. وەك کوڕی تۆ و ئی دیکەش . لە کاتێکدا سمێڵی دەبزاوتن گوتی: دەمەوێ هەرلێرە بژیم .

پێلاگێیا لە خۆشە ویستی و لە سوپاسی ئەو قسەی لەبارەی کوڕەکەیەوە کردی، ویستی شتێکی بداتێ. لێی پرسی :

ـ چای دەخۆیەوە ؟

ـ چۆن به تەنیا بخۆمەوە ؟ کە هەموو کۆبوونەوە ئەوجا دەخۆینەوە .

هەستی بەوە کرد کە دایك دەترسێ.

ـ "ئەگەر هەموو وا دەبوون" دایك بە گەرمی تکای لێکرد.

دیسان لە تاریکاییدا دەنگی پێیان هات . لە پڕ دەرگا کرایەوە. دایك راست بووەوە. بە سەرسوورمانەوە دیتی کیژێکی گەنجی قژ زەرد، کورتە بالاّ و رەنگ لادێیی و جلێکی فەقیرانە و تەنگی لـە بەردایـە. یەکسـەر چـووە چێشتخانە و پرسی : وەدرەنگی نەکەوتوم ؟

میوانەکە لە دەرگاوە چاوی لێکرد و گوتی نا .......... بە پێیان هاتی ؟

ـ دیارە ...... تۆ دایکی پاڤێل "میخائیلۆڤیچ" ی ؟ ئێوارەباش. من ناوم "ناتاشا" یە ......

ـ دایك پرسی: باوکت ناوی چییە ؟ فامیلت چییە ؟

ـ ڤاسیلێڤنا, ئەدی تۆ ؟

ـ پێلاگێیا نیلۆڤنا .

ـ ئاوا ئێستا ئیتر ئاشنای یەکین .

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە زەردەخەنەیەکەوە روانییە کچەکە و گوتی ... بەڵێ وایە .

کابرای پرچن کە ناوی "ئەندرێی" بوو، پرسی : هەواکەی ساردە ؟

بەڵێ ،دەرێ زۆر ساردە. بای دێ

دەنگێکی نەرم و خۆشی هەبوو. دەمی بچووك و بەژن و بالاّی تـەڕ و لـەبار بـوو . پاڵتۆکـەی داکەنـد و بـە دەستەکانی کە لە سەرمان شین هەڵگەرابوون ، رومەتـە جوانـەکانی دامـاڵی. لـە ژوورەکـەدا خێـرا دەهـات و دەچوو. پانییەی پۆتینەکانی سیڕەیان دەهات .

دایك سەرنجی دا کە گالۆشی نییە .

بە لەرزەوە درێژەی پێدا. نیمە .... بەستویەتی .

ئێستا سەماوەر تێداوێم. هەر ئێستا . دایك ئەوەی گوت و چووە چێشتخانە . هەر دەتگوت لە مێژە دەیناسی . وەك دایکێك خۆشی دەویست. بە پێکەنینەوە گوێی بۆ قسەی میوانەکان راگرتبوو .

کچەکە پرسی: بۆ چی وا کزی ؟ شتێك رووی داوە ؟

پرچن لە سەرە خۆ وەڵامی داوە هیچ ... هەروا .

ئەم ژنە چاوەکانی زۆر وەچاوی دایکم دەچن ..... دەزانی زۆر بیری دایکم دەکەمـەوە. هەمیشـە وەك زینـدوو دێتە بەرچاوم .....

- تۆ دەتگوت دایکم مردووە ... نا ئەوە زڕدایکمە ... مەبەستم دایکی خۆمە. لام وایە لە ناوچەی "کییێڤ" گەدایی دەکا و نارەق دەخواتەوە .. کاتێك سەرخۆش دەبێ پۆلیس لێی دەدەن .

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەبەر خۆیەوە گوتی:" ئاخ تۆ چەندە بەرەحمی" .

ناتاشا خێرا خێرا بەڵام نەرم و هێدی دەستی پێکرد، پاشان پرچن وەدەنگ هات :

- ئێوە گەنجن. تاقی کاریتان کەمە. منداڵداری زەحمەتە. بەڵام چاکەی فێری خەڵك بکەی لەوەش دژوارترە "

- تۆ بزانە دایك لە دڵی خۆیدا دەیویست بە ئەندرێی بڵێ چەندە مێهرەبانی. لە پڕ دەرگا کرایەوە نیکۆلای ڤێسۆڤشیکۆڤ" ی کوڕی "دانیلا "ی پیرە دز و درۆزن وەژوور کەوت کە باوکی لە هەموو گەڕەك بە پیاو خراپ ناسرابوو . هەمیشە لە خەڵك دوور دەکەوتەوە و گاڵتەیان پێ دەکرد.

دایك بەسەر سوورِمانەوە لێی پرسی : نیکۆلای چت دەوێ ؟

بە چاوە شین و بچوکەکانی چاوێکی لێکرد و بە دەستە پانەکانی دەم و چاوی گرۆێی سڕییەوە و بێ ئەوەی سڵاوی لێبکا گوتی :

پاڤێلّ لە ماڵە ؟

نا ......

چاوێکی لە ژووریّ کرد و وەژوورکەوت و گوتی : هاوڕێیان ئێوارەتان باش ....

دایك بە رقەوە بیری لێکردەوە و زۆری پێ سەیر بوو. "چۆن ئەتۆش" پێی سەیر بوو کە ناتاشا زۆر بە گەرمی دەستی گوشی. پاشان دوو لاوی دیکە وەژوور کەوتن کە تازە پێدەگەیشتن. دایك یەکیانی دەناسی . برازای "فیۆدۆر سیزۆڤ"ی پیرە کرێکاری کارخانە بوو . ئێو چاوانێکی بەرزی هەبوو و قژی لول بوون. ئەوی دیکەیان قژی لوس بون، بەڵام دایك نەیدەناسی. لێشی نەدەترسا. دیار بوو لوت بەرز و بەفیز نییە. ئاخرەکەی پاڤێلیش لە گەڵ دوو پیاوی گەنج هاتەوە دایك ئەوانی دەناسی، هەر دووکیان کرێکار بوون. جێگای پێ نیشان دان و پاڤێلّ زۆر بە روخۆشی پرسی : چات لێناوە ؟ سوپاس

دایك کە نەیدەزانی چۆن سوپاسی ئەم شتە بکا کە هێشتا لێی تێناگا , پێشنیاری کرد: ئەریّ فۆدکاتان بۆ بێنم، پاڤێلّ بە خۆشی وپێکەنینەوە گوتی: نا.......پێویست ناکا.

دایك لە پڕ بە بیری دا هات کە پاڤێلّ بە ئەنقەست بۆ ئەوەی گاڵتەی پێ بکا، مەترسی کۆبونەوەی زۆر بە گەورە نیشان داوە.

## (٦)

سەماوەر وەکولّ هات و دایك بردیە ژووریّ . میوانەکان لە دەوری میّزەکە دانیشتبوون. ناتاشا لـە سوچـیّکی لە بن چرایەکە دانیشتبوو، کتیّبیّکی بە دەستەوە بوو گوتی : بۆ ئەوەی بزانین کە بۆچی خـەلّك ئەوەنـدە خـراپ دەژین .... ئەندریێ قسەکەی پیّ بڕی و گوتی :

- بۆ چی ئەوەندە خراپن ؟

- پیّویستە بزانین ژیانیان چۆن دەست پیّ کردووە .

دایك لە گەلّ چا تیّکردن لە بن لیّوانەوە دەیگوت: بزانن، خۆشەویستەکانم بزانن. هەموویان بیّ دەنـگ بـوون. پاڤیّلّ بە روگرژی پرسی : دایە ئەوە چی دەلّیی ؟

- من.؟ دایك کاتیّك دیتی هەمرو چاویان تیّبریوە، بە خەمناکی گوتی :

- لە گەلّ خۆم قسە دەکەم. کاری خۆتان بکەن !

ناتاشا و پاڤیّلّ پیّکەنین. ئەندریّی بانگی کرد :

- دایە گیان خۆش بی بۆ چات:

هیّشتا نەتانخواردووەتەوە سوپاس دەکەی . پاشان رووی کردە پاڤیّلّ گوتی: :

ریّگای ئیّوەم نەگرتووە ؟

ناتاشا گوتی تۆ کە خانە خویّی ، چۆن ریّگای میوانان دەگری. پاشان بە دەنگیّکی منداڵانە پاڕایـەوە : دایـە گیان زوو چام بدەیە لە سەرمان دەلەرزم. لاقەکانم بە ستویانە .....

- ئیّستا ... هەر ئیّستا

ناتاشا چایەکەی خواردەوە و هەناسەیەکی دریـّژی هەلّکیّشـا و کـەزیی هاویشـتنەوە سەرشـانی و کتیّبیّکـی گەورەی پڕ لە ویّنەی بەرگ زەردی لیّك کـردەوە . دایـك چـای تیّـدەکرد و هـەولّی دەدا پیالّـەکان لیّـك نـەدا. هەرچەند میّشکی ئەوەندەی کارنەدەکرد بەلاّم بەوردی گویّی بۆ دەنگە خۆشەکەی ناتاشا ڕاگرتبـوو کـە کتیّبـی دەخویّندەوە. دەنگی خۆشی ناتاشا لە گـەلّ گیـزەی سـەماوەر تیّکـەلّ دەبـوو. دیـمەنی چـیرۆکی ئـەو ئینسـانە وەحشیانەی دەهیّنا بەرچاو کە لە ئەشکەوتەکاندا دەژیان و بـە بـەرد حـەیوانیان دەکوشـت. هـەر وەك چـیرۆك دەچوو. دایك چەند جار تـەماشای کوڕەکەی کرد. دەیویـست پرسیاری لیّ بکا کە کام بەشی ئـەم چـیرۆکە و ئـەم میّژووە قەدەخەیە. بەلاّم زوو سەرنجی لە سەر چیرۆکەکە لاچوو. لە بنەوە بیّ ئەوەی کوڕەکەی و ئەوانی تر بـزانن سەیری میوانەکانی دەکرد.

پاڤێلٚ لە تەنیشت ناتاشاوە دانیشتبوو، لە هەمووان چاکتر بوو. کیژەکە سەری بەسەر کتێب دا خوار کردبووەوە و جاروبار کە پرچە نەرم و لولەکانی دەکەوتنە سەر نێو چاوانی بە دەستی لای دەدان. هێندێ جار سەری دەبزاوت و بە نگایەکی دڵسۆزانەوە دەنگی نزم دەکرد و شتێکی بە دانیشتووان دەگوت .پرچن سینگە پانەکەی وەسوچی مێزەکە دابوو، سمێڵەکانی بادەدا و چاوی لە خوارێ دەبڕی تا سمێڵە بادراوەکانی ببینێ. "ڤێسۆڤشیکۆڤ "قیت لە سەر کورسی دانیشتبوو. دەستی هاویشتبووە سەر ئەژنۆکانی. سەروچاوی گڕۆیی کە بێ برۆ بوو بە سمێڵێکی باریك رازابووەوە .بێ ئەوەی چاوە بچووکەکانی بگێڕێ لە سەماوەرەکەدا تەماشای چرچیی روومەتی دەکرد. هەر دەتگوت پشوی نایە" فێدیا "بچکۆلە گوێی بۆ خوێندنەوە راگرتبوو، لێوەکانی دەبزاوت و وشەکانی کتێبی دووپاتە دەکردەوە. هاورێ پرچ لولەکەی سەری داخستبوو ئانیشکی هاویشتبووە سەر ئەژنوکانی و دەم و چاوی گرتبووە نێو دەستەکانی و بزەی دەهات .

یەکێك لەو لاوانەی لەگەڵ پاڤێلٚ هاتبوون تۆکی سەری سوور بووو قەڵافەتێکی باریکی هەبوو لە چاوەشینەکانیدا نیشانەی شادی و خۆشی دەبینرا دەیویست قسە بکا و لە پەلە پەل خۆی دەبزاوت ئەوەی دیکەیان بە قژی کورت و بۆرەوەتەماشای دەوروبەری ژوورەکەی دەکرد و دەستی بە سەری دا دەهێنا .

ئەو شەوە هەوای ژوورەکە زۆر گەرم و خۆش بوو. جریوەی دەنگی ناتاشا و گیزەی سەماوەر شەونشینییە پڕ هەڵلا و بگرەکانی سەردەمی لاوێتی و قسە و لاتاوی رەق و بێ شەرمانەی کوڕانی وەبیر دایك دەخستەوە کە بۆنی ڤۆدکا یان لێدەهات و گاڵتەیان پێ دەکرد .لەوبیرەوەرییە تاڵانە دڵی دەگوشرا و بەزەیی بە خۆیدا دەهات و تێك دەچوو .

ئەوەی وەبیری دەهاتەوە کە لە شەونشینییەکدا مێردە رەحمەتییەکەی لە داڵانێکی تاریك دا لە ئامێزی گرتبوو. توند بە دیوارییەوە نابوو، بە توندی پێی گوتبوو : شوم پێ دەکەی یان نا؟

پێلا گێیا لای وابوو سووکایەتی پێکردووە. پێی ناخۆش بوو بەو قامەکە ئەستورانە مەمکی گوشیبو میخائیل لەو کاتەدا چلمی هەڵدەلوشی و هەناسەی گەرمی بە روومەتی وەردەکرد . پێلاگێیا ویستبووی خۆی لە ئامێز درەباوێ و لە بەر چنگانی راپەڕێ. قیژاندبووی .

ـ بۆ کوێ دەچی ؟ وەڵامم دەوە!

پێلاگێیا لە توورەیی و لە شەرمان قسەی پێ نەکرابوو، هەناسە بڕکەی وێ کەوتبوو .

یەکێك لە پڕ دەرگای کردبووەوە. بە پەلە کیژەکەی بەردابوو و گوتبووی: یەك شەمۆ دەنێرمە خوازبێنی. قسەکەی خۆی بردە سەرو ناردی . دایك چاوی لە سەر یەك دانان و لە ئاخەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا .

"ڤێسۆڤشیکوڤ" له پڕ به دەنگێکی نارازی و تووڕه گوتی: پێویستم بەوە نییه بزانم خەلك چۆن ژیاون. دەمەوێ بزانم دەبێ چۆن بژین. کوڕه قژزەردەکه وەدەنگ هات: راست دەکا .

"فێدیا" گوتی : وانییه. من قایل نیم. ئەگەر بمانەوێ بچینه پێش دەبێ هەموو شت بزانین.

لاوه قژبادراوەکه گوتی: راسته .

باسێکی گەرم پەیدابوو. دایك نەیدەزانی ئەو هەرا هەرایه له سەر چییه. هەموو سور هەلگرابوون بەلام هیچیان نەگۆڕابوون، ئەو قسه رەق و ناشیرینانەی پێلاگێیا بیستبوونی لێره نەدەبیستران. لای وا بوو شەرم له کچەکه دەکەن .

روالەت و روکاری جیددی ناتاشا دلخۆشی دەکرد. سەیری ئەوانی دیکەی دەکرد و راست ئەو جووتەی به مندالی خۆی دادەنا. له پڕ ناتاشا گوتی : هاوڕێیان راوەستن .

هەموو بێ دەنگ بوون و چاویان بڕییه کچەکه. بەجۆره دەستی پێکرد: ئەوانەی دەلێن پێویسته هەموو شت بزانین راست دەکەن. ئێمه دەبێ به چرای عەقل و زانست رێگای خۆمان رون بکەینەوه تا ئەو کەسانەی له تاریکی جەهل و نەزانین دا دەژین بمانبینن. دەبێ به راستی وەلامی هەموو شت بدەینەوه. پێویسته هەموو راستی و ناراستی لێك بکەینەوه .پرچن له هەوای قسەکانی ناتاشا سەری دەبزاوت. ڤێسۆڤشیکۆڤ و ئەو دو کرێکارەی له گەل پاڤێل له کارخانەوه هاتبوون، دەستەیەکی سێ کەسییان لێ دروست بووبوو.

دیار نەبوو لەبەر چی دایك ئەو سێ کەسەی خۆش نەدەویست .

کاتێك قسەکانی ناتاشا تەواو بوو، پاڤێل هەستا سەرپێ و بەکاوه خۆ گوتی :

- ئایا تەنیا ئەوەمان دەوێ که سکمان تێر بێ ؟ به تیژی چاوی له دەستەی سێ کەسی کرد و پاشان خۆی وەلامی خۆی دایەوه: نا دەمانەوێ بەو کەسانەی دەمانچه و سێننەوه و چاو و گوێمان دەبەستن نیشان بدەین که هەمووشت دەزانین گێل و نەفام نین، تەنیا مەبەستمان خواردن نییه، بەلکو دەمانەوێ به جۆرێك بژین شایانی مرۆڤ بێ .دەمانەوێ به دوژمنەکان نیشان بدەین که ئەم وەزعه دژوار و نالەبارەی ئەوان به سەریاندا سەپاندووین، نابێته کۆسپ و بەرهەلست بۆ ئەوەی له باری هۆش و تێگەیشتنەوه بگەینه ئەوان و تەنانەت دەبێ وەپێش ئەوانیش بکەوینەوه .

دایك گوێی لەو قسانه دەبوو، شانازی بەوه دەکرد که کوڕەکەی ئاوا باش و رەوان قسه دەکا .

ئەندرێی گوتی: خەلکی تێرو پڕ زۆره بەلام راست و بەشەرەف کەمه . ئێمه دەبێ بەسەر زەلکاوی بۆگەنی ژیانی خۆماندا پردێك دروست بکەین تا بمانگەیەنێته دوارۆژێکی باش و راست و ئینسانی . ئەمه ئەرکی ئێمەیه هاوڕێیان !

ڤێسۆڤشیکۆڤ بە دەنگێکی گیراو هەڵیدایە: لە جەنگەی شەرو پێهەڵپڕژاندا وەختی برین پێچانی دەست نییە .

ئیتر نیوە شەو تێپەڕ بووبوو. ڤێسۆڤشیکۆڤ و کوڕە مووسوورەکە لە پێش هەمواندا دەرکەوتن. دایک دیسان ئەمەشی بە کەیف نەبوو وەختی خواحافیزی بیری لەوە دەکردەوە: بزانە چەند بە پەلەن .

ناتاشا پرسی: تۆ من بەڕێ دەکەی ؟ پرچن لە وەڵامیدا گوتی: ئەدی چۆن!

کاتێك ناتاشا لە چێشتخانە پاڵتۆی لە بەر دەکرد دایك گوتی : گۆرەوییەکانت زۆر تەنکن بۆ ئێستا نابن. با جوتە گۆرەوەیەکی خوریت بۆ بچنم. کیژە کە بە پێکەنینەوە سوپاسی کرد :

پێلاگێیا نیلۆڤنا سوپاس. گۆرەوەی خوری پێم دێنێتە خوران .

گۆرەوی ئەوتۆت بۆ دەچنم پێت نەیەنێتە خوران!

ناتاشا برژانگەکانی لێك داو چاوی لە دایك کرد. ئەو چاو لێکردنە دایکی بە خۆدا دەشکاندەوە. لە سەر خۆگوتی: ببورە. بەراستی بە دڵسۆزی ئەم قسەیەم کرد .

ناتاشا دەستەکانی دایکی بە گەرمی گوشی و بە نەرمی گوتی: تۆ چەند مێهرەبانی. ئەندرێی چاوێکی لێکرد و گوتی : دایە گیان شەوێکی شاد. خوار بووەوە و بە دووای ناتاشا دا وەردەکەوت . دایك چاوێکی لە کوڕەکەی کرد کە لە بەر دەرگا راوەستا بوو پێدەکەنی. بە شەرمەوە لێی پرسی: بە چی پێدەکەنی؟

ـ بە هیچ. لە خۆشییان

دایك لە سەر خۆ و بە خەمبارییەوە گوتی :من پیرو بێ عەقڵم، بەڵام منیش باش تێدەگەم.

پاڤێلّ گوتی: ئێ زۆر باشە ئێستا بچۆ بخەوە ...............

ئێستا دەچم رادەکشێم .

دایك بە پەرێشانی بە دەوری مێزەکەدا دەگەڕا، قاپەکانی کۆ دەکردەوە. شاد بوو تەنانەت لە خۆشی یان نارەقەی کردبوو . زۆر لەوە دڵخۆش بوو کە هەمووشت بە هێدی و هێمنی و بە خۆشی تەواو بوو. بە پاڤێلی گوت :

باشت بیر کردووەتەوە. ئەوانە پیاوی چاکن. ئەندرێی زۆر مێهرەبانە. کچەکەش هەر وایە ....ئای چەند بە هۆشە! ئەوەکێیە ؟

پاڤێلّ کە بە نێو ماڵەکەدا دەهات و دەچوو بە کورتی وەڵامی داوە : مامۆستایە .

ـ لە مۆسکۆ ؟ پاڤێلّ لە پەنا دایکی راوەستا و لە سەرخۆ گوتی : باوکی زۆر دەولەمەندە بازرگانی ئاسنەواڵەیە . چەند خانووی هەیە. لەبەر ئەوەی ناتاشا ئەم رێگایەی گرتووە دەری کردووە. ناتاشا لە خۆشی

دا ژیاوە. کەس و کاری خۆشیان ویستووە. هەر چی ویستووە بۆیان کردووە .... بەڵام ئێستا دەبێ حەوت کیلۆمەتر بە تەنیایی و بە پێیان ڕێگا ببڕێ .

ئەم قسانە دایکیان نارەحەت کرد. لە نێو ژوورەکە راوەستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێ چاوی لە کورەکەی بڕی. لەبەر سەر سوورمان برۆیەکانی هەڵکشابوون. پاشان لە سەرخۆ پرسی : دەچێتەوە شار ؟

- بەڵێ.

سەیرە....ناترسێ ؟

پاڤێڵ بە پێکەنینەوە وەڵامی داوە: نا ......... ناترسێ .

- بۆ چی بەم شەوە رۆیشت . دەکرا شەوێ لێرە بێ و لە کن من بخەوێ .

- نەدەکرا. بەیانی خەڵك لێرە دەیبینن. نە ئێمە و نە ئەو پێویستمان بەوە نییە .

دایك بە بیر کردنەوە چاوێکی لە پەنجەرە کرد و بە کاوەخۆ قسەکانی درێژە پێدا : پاڤێڵ گیان. نازانم ئەم ترسە چییە. ئەم قسانە بۆ قەدەخەن؟ خۆ ئەم شتانە زیانیان نییە. وا نییە؟

دایك تەواو بڕوای نەدەکرد .دەیویست وەڵامی" نا" لە کوڕەکەی ببیسێ. پاڤێڵ بە هێمنی ئاوڕێکی دایەوە و بە دەنگێکی مەند گوتی :

- ئێمە هیچ کارێکی خراپمان نەکردووە و نایکەین. سەرەڕای ئەوەش زیندان چاوەروانمانە. تۆ دەبێ ئەمە بزانی.

پێلاگێیا دەستەکانی لەرزین و بە دەنگێکی گیراو گوتی : تۆ بڵێی ؟ خوا بکا وا نەبێ .

پاڤێڵ بە لاواندنەوە گوتی: نا, من ناتوانم تۆ فریو بدەم. نارەحەت مەبە بزەیەکی هاتێ و گوتی : بچۆ بخەوە ... ماندووی .... شەوێکی شاد.

کاتێك دایك بە تەنیا مایەوە، چووە بەر پەنجەرە و تەماشای کۆڵانی کرد. بای دەهات و بەفری سەربانەکانی لە خەو رادەپەڕاند و رایدەماڵی. لە دیوارەکانی دەدا و دیار نەبوو بە سرتە چییان پێ دەڵێ. وەعەرزی دەکەوت و بەفری وشکی وەك هەوری سپی بە کۆڵاندا رادەدا. لە تاریکایی شەودا لە دوورەوە ئاگری ناوشار دەبینرا .

- عیسای مەسیح ! بەزەییت پێماندا بێ . لە ترسان لە سەر خۆ دەپارایەوە .

فرمێسکی لە چاوان دەگەڕا و چاوەروانی مسیبەتێك بوو کە کوڕەکەی ئاوا بە هێمنی و دڵنیایی قسەی لێکرد بوو، وەك شەمشەمە کوێرەیەك لە دڵی دا دەجوڵا .

دەشت و چۆڵێکی پڕ لە بەفری هاتە بەرچاو. بایەکی سەر لێ شێواو لەو چۆڵەدا نرکەی دەهات. لەو دەشتەدا تارمایی کیژێکی بچووك بە تەنیا بە لاکە لاك دەرۆیشت. با دەلاقانی وەردەهات و داوێنی هەڵدەدایەوە. کلوە

بەفر وەك قامچی وەسەر و چاوی دەكەوتن. لە بەفردا دەكەوت و هەڵدەستایەوە و بە زەحمەت ڕێگای دەبڕی. هەوایەكی سارد و ڕێگایەكی تاریك و بەسام بوو. كیژەكە وەك چڵە گیایەك كە ڕەشەبای پایز هەڵیكەنی و بێرە و بەوێیدا دەدا دەكەوت و هەڵدەستایەوەلە لای ڕاستەی لە باتلاغێكدا دیواری تاریكی لێڕەوارێك دەبینرا. خەڵفە شینەكانی سنۆبەر دەلەرزین و لە دوور تروسكەی ئاگر دەدرەوشا.

- خوایە ڕەحمێك .لە ترسان دەلەرزی و هێدی هێدی دەپاڕایەوە .

## (٧)

ڕۆژەكان یەك بە دووای یەكدا تێدەپەڕین و وەك mووروی چۆرت بە شێوەی مانگ و حەوتو كۆ دەبوونەوە. هەموو ڕۆژەكانی یەك شەمۆ هاورێكان دەهاتنە كن پاڤێلّ و كۆ بوونەوەكان وەك پلەی پەیژەیەكی درێژ دەچوون كە بە كاوەخۆ پێیدا وەسەر دەكەوتن . خەڵكی تازەش پەیدا دەبوون. ماڵە بچووكەكەی" ڤلاسۆڤ" بەر تەنگ دەبوو: ناتاشا بە ماندوویی و سەرما بردوویی بەڵام هەمیشە بە ڕێك و پێكی و شادی دەهات. دایك گۆرەویی بۆ چنیبوو, بەڵام دەیویست خۆی بیكاتە لاقە بچووكەكانی. ناتاشا لە هەوەڵەوە پێكەنی و پاشان بێ دەنگ بوو. تۆزێكی بیری كردەوە و گوتی :

دایانێكم هەبوو , لە ڕادە بەدەر باش بوو . چەندزەحمەتكێش و ژیانی بە كوێرەوەریی بوو , چەنددڵێكی باشی هەبوو , ئەویش وەك تۆ.

دەستی ڕاداشت , وەك دەست بۆ شوێنێكی دوور ڕابدێرێ, پێلاگێیا گوتی: وەك خۆت. دەستت لە دایك و باب و هەموو شت هەڵگرتووە. نەیتوانی هەموو نیازەكەی دەربڕێ. هەناسەیەكی هەڵكێشا و بە چاو لێكردنی ناتاشا بێ دەنگ بوو. بێ ئەوەی بزانێ بۆ چی سوپاسی دەكرد. لە پێش كچەكە لە عەرزی دانیشت. ناتاشا زەردەخەنەیەكی لە سەر لێوان بوو، سەری بەردابۆوە .

ناتاشا دووپاتەی كردەوە: دەستم لە دایك و بابم هەلگرت ؟ ئەوە دژوار نەبوو .باوكم زۆر نەزان و توورە و تۆسنە . براكەشم هەروایە. هەمیشە دەخواتەوە. خوشكە گەورەكەم زۆر چارەڕەشە. شوی بە كابرایەكی زۆر دەوڵەمەند كردووە . زۆر پیس و ڕەزا گرانە و لە خوشكیشم بە تەمەنترە. بەڵام پەرۆشی دایكممە. وەك تۆ ساویلكە و بچووكە , ڕاست بە قەد مشكێك. هەمیشە ڕادەكا و لە هەموو كەس دەترسی هێندێ جار زۆر حەز دەكەم بیبینم .

دایك بە خەمناكییەوە سەری جولاند و گوتی :

ـ رۆڵە گیان: چەند بەستەزمانە .
ـ نا. نا. هێندیٚ جار هەست بە خۆشی و بەختەوەری دەکەم .!
ڕەنگی بزرکابوو. چاوەکاڵەکانی دەتروسکان و لە کاتێکدا دەستی هاویشتبووە سەر شانی پێلاگێیا, بە دەنگێکی بەسۆزەوە کە لە ناخی دڵیەوە دەهات گوتی :
ـ خۆزیا زانیبات ........ خۆزیا تێگەیشتبای کە ئێمە کارێکی چەند گرنگ و گەورە دەکەین .
هەستی ئێرەی - پیٚ بردن کەوتە سەر دڵی دایك و هەستا و بە خەمناکییەوە گوتی: ئیتر من بۆ ئەو کارە پیرم. نەخوێندەوارم .
پاڤێل هەمیشە و لە هەموو شوێنێك پتر قسەی دەکرد و باسی دەکرد و ڕۆژ بە ڕۆژ کزتر دەبوو. دایك وای دەهاتە بەرچاو کە لە گەڵ ناتاشا قسە دەکا یا چاوی پێدەکەویٚ , نیگای نەرمتر و دەنگی باریکتر و سادەتر دەبیٚ .
"خوابکا" دایك بیری کردەوە و بزەیەکی هاتیٚ . کاتێك لە کۆبوونەوەکان دا باس و دەمەتەقە توند و تیژ دەبوو, ئەندریی هەڵدەستا و لە کاتێکدا لەشی وەك زمانەی زەنگوڵە لە سەر لاقەکانی ئەملاو ئەولای دەکرد بە دەنگێکی ڕەوان و قسەی سادە و پاراو کۆبوونەوەی هێدی دەکردەوە.
فێسۆڤشیکۆڤ هەمیشە ئەو و سامۆیلۆڤ – لاوە سوورکارەکە - باس و دەمەتەقەیان دادەمەزراند." ئیڤان بوکین" لاوە سەر خڕو برۆ سپیەکە کە دەتگوت تاو بردوویە، لایەنگری ئەوان بوو. یاکۆڤ سۆمۆڤ خاوێن و ڕێك و پێك ,هێدی و لە سەرەخۆ بوو قسەی کەم دەکرد. لە گەڵ فێدیا مازین لایەنگری  پاڤێل و پرچنی بوو .
لە جیاتی ناتاشا, هێندیٚ جار نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ بە چاویلکەیەك و ریشێکی شاش و زەردەوە لە شارڕا دەهات. ئەو خەڵکی ناوچەیەکی دوور بوو. لە بارەی ژیانی خێزانی و لە بارەی منداڵان و بازرگانی و شارەوانی و نرخی گۆشت و نان و ئەوەی پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەوە هەیە, بە زمانێکی شیرین و پاراو و ساکار قسەی دەکرد . لە قسەکانی دا کەم و کوڕی و هەڵە و کارە ئەحمەقانەکانی ئەوانی دەردەخست و ئەو شتانەی ڕون دەکردەوە کە بۆ حاڵی خەڵك زیانیان هەبوو .
دایك پێی وابوو کە نیکۆلای ئیڤانۆڤیج لە وڵاتێکی دیکە و لە دوورەوە هاتووە کە لەویٚ ژیانی خەڵك خۆشتر و ڕێك وپێك ترە و لێرە لە هەموو شت بێزارە .ئەو ناتوانیٚ بەم ژیانە رابیٚ. بە ناچاری ئەم ژیانەی قبوڵ کردووە . لەوانەیە دڵخۆشی نەکا .هەوڵی دەدا لە گەڵ هەموو هەل و مەرجێك ڕێك بکەویٚ . ڕەنگی زەرد بوو. دەوروبەری چاوی گنجیان تێکەوتبوو. دەنگی نەرم دەستەکانی هەمیشە گەرم بوون کاتێك سڵاوی لە دایك دەکرد دەستی دایکی بە پەنجە گەورەکانی توند دەگوشی و دایك پێی دەحەسایەوە و گیانی ئاسودە دەبوو. لە شارەوە خەڵکی

دیکەش دەهاتن لە نێو ئەواندا کچێکی باڵابەرزی چاو گەورەو روومەت لاواز دەهات ناوی" ساشێنکا" بوو . ئاکار و کردەوەی وەك پیاوان دەچوو. برۆ رەشەکانی تێك دەنا و لە قسە کردندا لوتە جوانەکەی دەبزووت .

رۆژێك بۆ یەکەمجار ساشێنکا بە دەنگێکی بەرز گوتی :

"ئێمە سۆسیالیستەکان "

کاتێك دایك گوێی لەم وشەیە بوو, بە ماتی و بە ترسەوە چاوی لە کیژەکە بڕی. پێلاگێیا بیستبووی کە سۆسیالیستەکان قەیسەریان کوشتووە. ئەو کارە لە سەردەمی لاوێتی ئەودا روی دابوو. ئەودەم دەیانگوت دەرەبەگەکان بۆیە لە قەیسەر توورەن چوونکە وەرزێرەکانی ئازاد کردووە. سوێندیان خواردووە تا قەیسەر نەکوژن سەری خۆیان ناتاشن. ئێستا ئەو نەیدەزانی بۆچی کوڕەکەی و هاوڕێکانی بوونە سۆسیالیست .

کاتێك میوانەکان هەموو رۆیشتن لە پاڤێلی پرسی :

پاڤێلۆکە، راستە تۆ سۆسیالیستی ؟

پاڤێلّ وەك هەموو جارێ لە بەردەمی دا راوەستا و راستەوراست گوتی :

بەڵێ راستە, بۆ چیووە؟

دایك لە ناخی دڵیەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و چاوەکانی لە سەر یەك دانان و گوتی :

رۆڵە گیان ئەوە کارێکی باشە ؟ ئەوان دژی قەیسەرن و یەکیشیان لە قەیسەرەکان کوشتووە . پاڤێلّ چووە ژوورەکەی دایکی و دەستی بە روومەتی دا هێنا و بە پێکەنینەوە گوتی :

ئێمە پێویستمان بەم کارە نییە .تاوێك بە درێژی و بە نەرم و هێدی قسەی لە گەڵ کرد.

پێلاگێیا چاوی لە کوڕەکەی بڕی و بیرێکی کردەوە و گوتی :

قەیسەر هیچ کارێکی خراپ ناکا. قەیسەر دەسەڵاتی نییە. پاشان ئەم وشە بەترسە هەرهات و دووپاتە کراوە , تاوەك وشە و زاراوی تر کە لە پێش داتێیان نەدەگەیشت گوێی پێ ڕاهات .

دایك ساشێنکای خۆش نەدەویست .کە ئەو دەهات خەمناك دەبوو. شەوێکیان بە نارەحەتی بە پرچنی گوت: ساشێنکا زۆر توندی دەگرێ. هەر ئەمردەکا. تۆ ئەمە بکەو ئەوی تر ئەوە بکا .

پرچن قاقا پێکەنی :

- ئەشراف زادەیە .

پاڤێلّ بە ساردی وەدەنگ هات :

- ساشێنکا ئینسانێکی باشە .

ئەمە راستە (ئەندرێی بۆی سەلماند ). بەڵام تەنیا ئەوەندەیە نازانێ ئەرکی ئەو چییە و ئێمە چیمان دەوێ و چ دەتوانین .

دایك سەرنجی دابوو کە ساشێنکا لەگەڵ پاڤێلیش توند و تیژە و ئەمری بەسەردا دەکا. جاری وایە بەسەریشی دا دەگورێنێ .

پاڤێل بزەی دەهاتێ وبێ دەنگ دەبوو. هەر بەو چاوە نەرمەش چاوی لەو دەکرد کە چاوی لە رومەتی ناتاشاش دەکرد.دایك ئەوەشی پێخۆش نەبوو .

حەوتووی دووجار لێك کۆدەبوونەوە . کاتێك دایك دەیدیت کەوا لاوەکان چەند بە سەرنجەوە گوێ بۆ وتاری کورەکەی رادەگرن و قسەکانی ئەندرێی و ناتاشا و ساشێنکا و نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ دەبیسن ترس و نیگەرانی بەسەر دەچوو . زۆر جار دایك لەو خۆشییەی بەسەر لاوەکاندا دەهات واقی ورِدەما. بەتایبەتی پاش خوێندنەوەی دەنگ و باسی چینی کرێکار لە وڵاتانی دیکە. شادییەکی سەیر و منداڵانە بەسەریان دا دەهات و هەموو پێدەکەنین و لە شانی یەکتریان دەدا .

یەکیان سەرخۆش دەبوو. لە دنیای سەرخۆشی دا دەیگوت :

ـ هەر خۆش بن هاورێ ئەڵمانیەکانمان .

ـ بژین کرێکارانی ئیتالیایی .

کاتێك ئەو سلاوەیان بۆ دۆستە نەدیوە و نەناسیوەکانیان دەنارد کە زمانیشیان نەدەزانین ,دڵنیا بوون کە ئەوان دەبینین و لە شادی ئەواندا شەریکن ,

پرچن بە چاوێکی زەق و هەستێکی پرِ لە خۆشەویستی دەیگوت:

باشترە نامەیان بۆ بنووسین تابزانن لە روسیا هارِێیان هەن بیر و باوەریان وەك وانە ,مەرامیان مەرامی وانە, لە سەرکەوتنی ئەواندا شادن .هەموویان بە حەزەوە بە رومەتی گەش و پێکەنینەوە ماوەیەکی زۆر باسی کرێکارانی فەرِانسە و ئینگلیز و سوێدیان دەکرد، وەك باسی هاورێی خۆیان بکەن. باسی ئەو کەسانەیان دەکردکە رێز لە ژیانیان دەگرن و هەست بە خەم و پەژارەیان دەکەن .

لەم ژوورە تەنگ و بچووکەدا هەستی نزیکی و برایەتی لەگەڵ کرێکارانی جیهان پەیدا دەبوو. ئەو هەستە وەك گیانێك هەموویانی دادەگرت و کاری لە دایکیش دەکرد. هەر چەند ئەو تێنەدەگەیشت بەڵام بەو هێزە شادی هێنەر و پرِ لە هیوایە قەدی راست دەکردەوە .

رۆژێك بە پرچنی گوت : ئێوە چین ؟ ئەرمەنی و روس و ئوتریش هەموو هاورِێن و لە شادی و خەمی یەکتردا شەریکن .

ئەندرێی وەڵامی دایەوە: بۆ هەمووان، دایە گیان بۆ هەمووان! بۆ ئێمە نەتەوە و خزم و قەوم لە گۆڕێدا نییە. بۆ ئێمە تەنیا دۆست و دوژمن هەیە . هەموو کرێکارێك هاورێی ئێمەیە .هەموو سەرمایەدار و حكومەتێك دوژمنی ئێمەیە. کاتێك بە چاوێکی ئاواڵەوە تەماشای ئەم دنیایە بکەی، کاتێك ببینی ژمارەی ئێمە کرێکاران چەندە زۆرە و چ هێزیکمان هەیە, چە شادییەکت دەکەوێتە دڵی و چە جێژنێکی گەورەت لە دڵیدا ساز دەبێ .

هەروەها دایە, فەرانسەیی و ئەڵمانیایش کاتێك تەماشای ژیان دەکەن ئەوانیش هەست پێدەکەن. ئیتالیاییش پێی شاد دەبن .ئێمە هەموو رۆڵەی دایکێکین. رۆڵەی پەرییەکی لە شکان نەهاتوو، کە ناومان ناوە "رایەتی کرێکارانی هەموو نەتەوەکانی سەرزەوی" ئەو دایکە گەرمان دەکاتەوە. ئەو خۆری ئاسمانی دادپەروەرییە. ئەو ئاسمانەش لە دڵی کرێکار دایە .کەسێك وا نەبێ چۆن دەتوانێ بە خۆی بڵێ سۆسیالیست. برایەتی ئێمە بە گیانە و لە ئێستاوە بۆ هەمیشەیە .

ئەمە منداڵانەیە, بەڵام بڕوایەکی پتەوە و لە دڵی هەمووان دا جێگیر بووە و پەرەی سەندووە و هێزی بە تەوژمی خۆی داکوتاوە .کاتێك دایك ئەوەی دەدیت هەستی دەکرد کە شتێکی تازە و مەزن و پرشنگدار لە دایك بووە کە وەك رۆژی ئاسمان دنیای رون کردووەتەوە .

زۆر جار بە دەنگی خۆش گۆرانی و مەقامی خۆماڵی و بە ناوبانگیان دەگوت .هێندێ جار گۆرانی خەمبار و تازەیان دەگوت کە لە نێو خەڵك دانە کەو تبوو. لە کاتی ئەو گۆرانییانەدا رادەمان و وەك سرودی ئایینی بخوێننەوە رەنگیان دەپەڕی .

یەکێك لەو گۆرانییە تازانە دایکی بە تایبەتی نارەحەت دەکرد .لەو گۆرانییەدا خەم و پەژارەی گیانێکی داماو و سەرلێشێواو هەبوو کە کەوتبووە بەر پەلاماری هەژاری و نەداری ولە ترسان خەرفابوو. دەرد و داخی گیان لەبەرێکی دووپاتە دەکردەوە کە چاکە و خراپەی لێ تێکچوو بوو. لەو گۆرانییەدا هیچ لە دنیای کۆن، دنیای کۆیلەکان نەدەبیسرا .دایك قسەی دژوارو گۆرانی خەمبارانەی پێخوش نەبوو, بەڵام لەو گۆرانییەدا هێزێکی بێ پایان هەبوو کە دەتگوت دەنگ و وشەکان دادە پۆشێ و هەستی پێش روودانی کارەساتێك کە بۆ بیری ئینسا ن زۆر گەورەیە، لە دڵدا زیندوو دەکاتەوە، دایك ئەم شتەی لە دیمەنی لاوەکاندا بەدی دەکرد و هەمیشە بە سەرنج و بە نیگەرانییەوە گوێی بۆ ئەو گۆرانییانە رادەگرت .

خەلکی دیکەش بە هێدی ئەو گۆرانییانەیان دەگوت. بەڵام بە توندی دەنگی دەدایەوە. خەڵك گوێیان بۆ هەڵدەخست وەك هەوای سەرەتای بەهار و تەرزەی هەوەڵی پایز .

ڤێسۆڤشیکۆڤ بە خەمناکی گوتی : ئەمجارە دەبێ ئەم گۆرانییە لە شەقامان بڵێین .

کاتێك باوکی سەر لە نوێ لە سەر دزی گیرا و کەوتە بەندیخانە, گوتی هاوڕێیان ئێستا دەتوانین لە ماڵی ئێمە کۆببینەوە .

زۆر شەوان پاش ئەوەی لە کار دەبوونەوە هاوڕێیەکی پاڤێلّ دەهاتە لای و پێکەوە کتێبیان دەخوێندەوە و هێندێك شتیان لەبەر دەنووسییەوە .خەمبار بوون و دەرەتانی خۆ شوشتنیان نەبوو . وەختی خواردنیش کتێبەکانیان هەر بە دەستەوە بوو. دایك کەمتر لە قسەکانیان دەگەیشت.

زۆر جار پاڤێلّ دەیگوت: ئێمە رۆژنامەیەکمان پێویستە .

ژیان گەرمتر و بە پەلەتر تێدەپەری. خەڵك وەك مێش هەنگوین لەم گوڵەوە بۆ ئەو گوڵ

دەفرین و لێك کۆ دەبوونەوە و لە خۆیندنەوەی کتێبێکەوە بۆ یەکی تر دەچوون .

جارێك ڤێسۆڤشیکۆڤ گوتی : قسە و باسی ئێمە کەوتووتە سەر زارو زمانان و لە وانەیە بەم زووانە بمانگرن. ئەندرێی گوتی: هەوێردە بۆیە دروست کراوەکە بە داوەوە بێت .

دایك رۆژ بە رۆژ پرچنی پتر خۆش دەویست. کاتێك پرچن پێی دەگوت:"دایە گیان" ئەم وشەیە وەك دەستی نەرمی منداڵێك بە سەروچاوی دایك دا دەهات .

رۆژەکانی یەك شەمۆ کە پاڤێلّ کاری دەبوو ئەو داری بۆ دەشکاندن. رۆژێك تەشۆی هەڵگرت و پلەیەکی گەندەڵی پەیژەی گۆری. جارێکیش نێردیوانێکی شکاوی چاك کردەوە. لە کاتی کار کردندا بەسۆز گۆرانی دەگوت .

رۆژێك دایك بە پاڤێلی گوت: با ئەندرێی هەر لە ماڵی خۆمان بێ و خەرجی خۆی بکێشی, بۆ ئێوەش وا باشترە تا زیاتر بچنە کن یەك .

پاڤێلّ شانەکانی هەڵتەکاند و گوتی: بۆچی ئەو زەحمەتە بخەینە سەر شانی تۆ ؟

ـ ئەم قسانە چین ؟ من لە تەواوی ژیانم دا زەحمەتم کێشاوە. بۆ پیاوێکی باش هەرچی زەحمەت بکێشی، زەحمەت نییە .

ـ چۆنت پێخۆشە با وابێ . ئەگەر ئەو بییەوێ من پێم خۆشە. پرچن لە گەڵ ئەوان بوو بە یەك ماڵ .

## (٨)

ئەم خانووە بچووکەی سەرپەڕی کۆڵان سەرنجی خەڵکی رادەکێشا. بە دەیان نیگای دڵ پیسی و دڕدۆنگی وە دیوارەکانی دەکەوت. دەمگۆی گشتی لە سەر ئەم خانووە دەهات و دەچوو. خەڵك زۆر بە تەنگەوە بوون کە نهێنی نێو ئەم خانووە بدۆزنەوە. بە شەو هێندێ کەس لە شووشەی پەنجەرەوە تەماشایان دەکرد .هێندێ جار یەکێك لە شووشەی دەدا و پاشان رای دەکرد.

رۆژێکیان "بێگۆتسۆڤ" ی ئارەق فرۆش کە پیرە مێردێکی خاوێن بوو و هەمیشە دەسرەیەکی ئاوریشمی رەشی لە ملە چرچەکەی دەهاڵاند و چاویلکەکە لە سەر لوتی درێژ و باریکی رادەوەستا, لە کۆڵانی ڕێگای بە دایکی پاڤێڵ گرت. یەك جێ بێ ئەوەی رێگای بدا وەڵامی بداتەوە , بە کۆڵێك قسەی وشك و رەق پێلاگێیای لە دوواخست .

پیلاگێیا نیلۆڤنا چۆنی ؟ کوڕەکەت چۆنە؟ هێشتا بە تەمانی ژنی بۆ بێنی ؟ وەختی هاتووە ژن بێنێ. ئەگەر دایك و باب زوو ژن بۆ کوڕیان بێنن ئاسودە دەبن, پیاوی بە ژن و ماڵ بە لەش و گیان ساختره وەك کارگ لە سرکه باوێژن باشتردەمێنی. من لە جیاتی تۆ بام ژنم بۆ دەهێنا. بۆیە دەبێ ئاگات لێ بێ خەڵك دەستی پێکردووه بە کەیفی خۆی بژی. فکری پەرش و بڵاویا ن دێتە نێو مێشکی .توشی کارو کردەوەی ناحەزیش دەبن. لاوەکان ناچنە کلیسا لە شوێنی گشتی خۆ دەدزنەوە و لە کەلێن و قوژبنان بە نهێنی کۆ دەبنەوە. بە گوێی یەکتردادەچرپێنن. رێگا بدە لێت بپرسم ئەم سرت و خورتەیان لە چییە ؟ بۆچی خۆیان دەشارنەوە؟ قسەیەکی پیاو نەتوانێ لە مەیخانە و لە هەموو شوێنێك بە ئاشکرا بیڵێ نرخی چییە ؟ دیارە کارەکانیان رەمزاوییە، بەڵام کلیسای پیرۆز جێگای رەمزە. ئەو شتانەی بە دزی فێر دەکرێن هەموو گومراین. خواحافیز . کلاوەکەی بە فیزێکەوە راوەشاند و رۆیشت .دایکی لە پەرێشانی و خەیاڵدا بە جێ هێشت .

رۆژێکیشیان ماریا کۆرسونۆڤای دراوسێی ماڵی ڤلاسۆڤ کە بێوەژنی ئاسنگەرێك بوو و لەبەر دەرگای کارخانە شتی دەفرۆشت, لە بازاری توشی پێلاگێیا بوو پێی گوت :

- پێلاگێیا وریای کوڕەکەت بە .

- بۆچی ؟ چبوە

هێدی و بە سرتە گوتی : لەم دەروبەرە باسی دەکەن. بە خراپەش .دەڵێن کۆمەڵە دادەمەزرێنێ, وەك کۆمەڵەی "قامچی وەشێن" . (ئەوانە کۆمەڵێکی ئایینی بوون لە سەدەی سێزدەدا لە بەر چاوی خەڵك قامچی یان لە یەکتر دەدا .)

دایك گوتی : ماریا قسەی هیچ و پوچ مەکە .

- ئەوەی کاری هیچ و پوچ دەکا دەبێ سەرکۆنە بکرێ نەك ئەوەی دەیگێڕێتەوە .

دایك ئەم قسانەی بۆ کوڕەکەی گێڕایەوە. پاڤێڵ بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە شانی هەڵتەکاند. ئەندرێی دەستی بە پێکەنین کرد .

دایك گوتی : کچەکانیش لە دەست ئێوە بێزارن. چوونکە ئێوە پاروی چەورن .چاك کاردەکەن، ئارەقخۆر نین، بەڵام خۆ لە کچەکان ناگەیەنن. دەڵێن لە شارەوە کچی بەدناو دێنە لاتان .

پاڤێلْ نێو چاوانی تێك نا و بە بێزارییەوە گوتی: دیارە وایە . ئەندرێی هەناسەیەکی هەلکێشا و گوتی: هەرچی لە نێو زەلکاودا بیّ بۆگەن دەکا. دایە گیان باشتر بوو بۆ ئەو کچانە رون بکەیەوە کە شوو کردن ئەوەندە ناهێنێ و با بۆ شو ئەوەندە پەلە نەکەن .

دایك گوتی: باشە دەزانن. بەلاّم چۆن دەتوانن چاوی لیّ بپۆشن .

پاڤێلْ گوتی: نازانن, دەنا خۆیان بە کارێکی دیکەوە خەریك دەکرد .

دایك بە توورەیی چاوێکی لێکرد و گۆتی :

ـ ئەمە ئەرکی ئێوەیە بانگیان بکەن و بۆیان روون بکەنەوە وتێیان بگەیەنن.

پاڤێلْ بە وشکی وەلاّمی دایەوە: ناکریّ .

ئەندرێی پرسی: چۆنە تاقی بکەینەوە ؟

پاڤێلْ تاوێك مات بوو پاشان وەدەنگ هات :

ـ ژن و پیاو لە هەوەلّەوە جوت جوت پێکەوە دەگەڕێن. پاشان هێندێکیان دەبنە ژن و مێرد.

دایك کەوتە بیر کردنەوە .لە وشکی سۆفییانەی کوڕەکەی ترسا. دەیدیت کە هەموو هەڤاڵەکانی تەنانەت ئەوانەی وەك ئەندرێیش کە لەو گەورەترن بە قسەی دەکەن، بەلاّم وای دەهاتە بەر چاو کە لێی دەترسن و لە ئاکاری سارد وشکی رازی نین . جارێکیان راکشا بوو و لە پشت تیغەی دیوارەوە گوێی لە قسەکانی ئەندرێی و پاڤێلْ بوو کە کتێبیان دەخوێندەوە .

ئەندرێی گوتی : دەزانی من ناتاشام خۆش دەوی ؟

پاڤێلْ بە کاوە خۆ وەلاّمی دایەوە :دەزانم

ئەندرێی هەستا و لە ژوورەکەدا دەستی کرد بە هاتوچۆ بە پێی روت بە ژوورەکەدا دەگەڕا و بە فیکە گۆرانییەکی بە سۆزی دەگوت .

دیسان وەدەنگ هات :

- دەبیّ ئەو پیّ بزانی ؟

پاڤێلْ وەلاّمی نەدایەوە:

ئەندرێی کە هاتوچۆی دەکرد گوتی: خۆزگە پێم گوتبایە .

- چت پیّ گوتبایە ؟

- پێم گوتبا کەمن ....

- بۆ چی پێت گوتبا ؟ پاڤێلْ قسەکەی پیّ بڕی .

دایك گوێی له دەنگی پێكەنین بوو .

- دەزانی چی ؟ من لام وایه كاتێك پیاو كچێكی خۆش بوێ ، پێویسته پێی بلێ .دەنا ئەنجامی نابێ .......

پاڤێلّ كتێبەكەتی وێك ناوپرسی

بە هیوای ئەنجانی چی ؟

هەر دووكیان تاوێك بێ دەنگ بوون .

پاڤێلّ له سەر خۆ وەدەنگ هات و گوتی:ئەوەی مرۆڤ دەیەوێ پێویسته بە رونی بیهێنێته بەر چاوی خۆی. وای دابنێن كه ئەویش تۆی خۆش دەوێ, كه من پێم وانییە، بەڵام هەر وای دادەنێم .كه وابوو دەبنه ژن و مێرد. كچێكی خوێندەوار شو به كرێكارێك دەكا .زۆر كارێكی باشه ........ منداڵیشتان دەبێ . ئەو دەم پێویسته به تەنیا زۆرتر كار بكەی . ژیانی تۆش وەك ژیانی ئەوانیتر دەبێ. یانی دەبێ بۆ دابین كردنی خواردەمەنی و خانووی

خۆت و منداڵەكان هەوڵی پتر بدەی. بەو حاڵە هیچ كامتان بە كاری ئەو ئامانج و مەرامه راناگەن كه گرتومانەته پێش و خەباتی بۆ دەكەین .

تاوێك بێ دەنگ بوون. پاشان پاڤێلّ به دەنگێكی نەرم گوتی :

- دەست لەو مەسەله هەڵگرە. باسی مەكە و خەیاڵیشت مەشێوێنە.

بێ دەنگ بوون. بێجگه له چرتەی سەعاته دیوارییەكه كه دەبزووت و سانییەكانی له رۆژگار كەم دەكردەوە هیچی تر نەدەبیسرا .

ئەندرێی گوتی: نیوەی دڵم خۆشی دەوێ, نیوەكەی تری بێزارە . وای لەبەر ئەو دڵە .

خشەی پەڕە وەرگێڕانی كتێبەكه دەبیسرا . وا دیار بوو پاڤێلّ دەستی بە خوێندنەوە كردووەتەوە .دایك راكشا بوو چاوەكانی له سەر یەك دانابوو. نەیدەوێرا وسته بكا .

سكی به ئەندرێی دەسوتا. بەڵام پتر بە كوڕەكەی خۆی لەبەر خۆیەوە دەیگوت :

- "خۆشەویستەكەم"

جارێكی تر ئەندرێی وەدەنگ هات :

- كەواته بێ دەنگەی لێبكەم ؟

پاڤێلّ له سەر خۆگوتی : ئەمە كارێكی بەشەرەفانەیە .

- كه وابوو ئێمەش بەورێگایە دا دەڕۆین . پاش تاوێك به خەمناكی گوتی :

- پاڤێلّ ئەگەر نۆرەی تۆش بێ ,لەئازار و پەرێشانی دا دەبی .

- نۆرەی منیش هاتووە. هێشتا هیچ نەبووە لە نازاردام .

- تۆش ؟.........

لە دەرەوە بای دەهات .

ئەندرێی گوتی: وەزع باش نییە .

پێلاگێیا لیفەی بەسەر چاوان داداو دەستی کرد بە گریان .

بەیانی ئەندرێی لە بەرچاوی دایك كزتر بووبوو. هەستی دەكرد كە پتر ئەنـدرێی خـۆش دەوێ. كوڕەكـەی هـەر درێژو رەق لاواز دەبوو .دایك لە پێش دا پرچنی هەر بەناوی" ئەندرێی ئۆنیسمۆڤیچ "بانگ دەكـرد. بـەڵام ئـەو رۆژە بێ ئیرادە بانگی كرد ,

- "ئەندرۆكە" ........ چەكمەكانت دەبێ چاك بكەیەوە, دەنا لاقت سەرمای دەبێ.

- پاش ئەوەی مانگانەم وەرگرت چەكمەی دیكە دەكڕم. پاشان بـە پێكەنینـەوە دەسـتی هاویشـتە سەرشانی دایك و گوتی :

- رەنگە دایكی بەراستیم هەر تۆ بی . بەڵام چونكە ناحەزم ناتەوێ ئیعتیراف بكەی. وانییە ؟دایك بێ ئـەوەی قسە بكا دەستی لە پشتی دەستدا. دەیویست بە یەك دوو قسـە دڵی بداتەوە بەڵام زمانی گیرا .

## (٩)

لە گەڕەك باسی سۆسیالیستەكان دەكـرا. هێنـدێ بەیاننامـەیان بـە مەرەكـەبی شـین دەنووسـی و بڵاویـان دەكردەوە. لەو بەیاننامەدا رەخنە لەو بڕیارانە دەگیرا كـە بەسـەر كرێكارنـدا سـەپێنرابوون. باسـی مـانگرتنی پێتێربۆرگ ورۆسیای خوارو دەكرا . ئەو نووسراوانە كرێكارانیان بۆ یەكیەتی و یكگـرتن و پاراسـتنی قـازانجی خۆیان هان دەدا .هێندێ كەسی پیر و كۆنەساڵ كە لە كارخانەدا كاری باشیان هەبوو لەو نووسراوانە توورە بـوون و دەیانگوت :

دەبێ نووسەر و هاندەرەكان لە دار بـدرێن. لاپـەڕەكانیان بـۆ سـەرۆكەكان دەبـرد . لاوەكـان نووسـراوەكانیان دەخوێندەوە و دەیانگوت :

- راست دەكەن .

زۆربەی كرێكاران كە زۆر ماندوو بوون و لە ئاست هەموو شت خۆیان گێل دەكرد لە بەر تەمبـەڵی وایـان بـیر دەكردەوە :

- هیچ بەرهەمی نابێ .......

بەڵام ئەو بەیاننامە خەڵکیان دەهاوروژاند و سەرنجیان رادەکێشان .رۆژێك کە بڵاو نەدەکرانەوە، خەڵك بە یەکتریان دەگوت: ئەمرۆ هیچ باس نییە. هیچ بڵاو نەکراوەتەوە، بەڵام کاتێك رۆژی دووشەمۆ سەر لە نوێ بڵاو دەکرانەوە, کرێکاران وەخۆ دەکەوتن .

لە کارخانە و مەیخانەکاندا هێندێ کەسی نەناسراو دەبینران، پرسیاریان لە خەڵك دەکرد و لەشتیان دەکۆڵییەوە. بۆنیان دەکرد و کردەوەی گومان لێکراو هەموو کەسیان دردۆنگ دەکرد.

دایك دەیزانی ئەو هەرا و بەزمە لە کردەوەی کوڕەکەی پەیدا دەبێ .دەیدیت کە خەڵك لە دەورەی کۆ دەبنەوە و قەت بە تەنیا نییە. مەترسی لە بارەی پاڤێڵەوە بە شانازی کردنەوە کەم دەبووەوە .لە لایەکی تریش ترسی لە دووارۆژ هەبوو. کردەوە سەیرەکانی وەك ناوی رون و رەوانی جۆگەلە لەگەڵ لافاوی شلوێی ژیان تێکەڵ دەبوو

شەوێك ماریاکۆرسونۆڤا لە پەنجەرەی دا . کاتێك دایك پەنجەرەی لێکردەوە، دراوسێکەی بە سرتە گوتی :

- خۆت ئامادە کە. گاڵتە و گەمەی منداڵەکان کۆتایی هات .ئەمرۆ دێنە ماڵی ئێوە و مازین و ڤێسۆڤشیکۆڤ .

لێوە ئەستورەکانی خێرا لێك دەدا .لوتەزلەکەی هەر فرەی دەهات .برژانگەکانی لێك دەدا و وەك چاوەڕوانی کەسێك بێ بەملاو بەو لادا چاوی دەگێڕا. پاشان بە دایکی گوت :

- هەروا بزانە منت نەدیوە وئاگات لە من نییە. تەنانەت لە دیتنی منیش حاشا بکە. تێگەیشتی ؟

ماریا ون بوو و رۆیشت.

دایك پەنجەرەکەی داخستەوە و مات وشەکەت لە سەر کورسییەك کەوت. بەڵام لە پڕ هەستی ئەو مەترسییەی‌کە هەڕەشەی لە کوڕەکەی دەکرد راستی کردەوە. بە پەلە جلی لەبەر کرد و دەسماڵێکی لە سەری وەرگرت و چووە لای فێدیا مازین کە لەبەر نەخۆشی لە ژوورێ کەوتبوو. کە دایك وەژوور کەوت فێدیا لە بەر پەنجەرە دانیشتبوو. بە دەستی چەپی قامکی گەورەی دەستی رادەژاند و کتێبی دەخوێندەوە.

لە گەڵ بیستنی ئەم خەبەرە ناخۆشە خێرا لە جێ دەرپەڕی و رەنگی بزڕکا و بە بۆڵە بۆڵ گوتی :

- نە قلێکی خۆشە. تۆ بزانە قامکیشم کوانی لێهاتووە .

دایك کە بە دەستە لەرزیوەکانی ئارەقی نێو چاوانی دەسڕییەوە گوتی:

- دەبی چ بکەین ؟

فێدیا دەستە ساخەکەی بە مووە رەشەکانیدا هێنا و گوتی: لە سەرخۆبە ومەترسێ .

پێلاگێیا گوتی: تۆ ئێستا خۆشت دەترسی .

- من ؟رومەتەکانی سوور هەڵگەران و بە پێکەنینەوە گوتی :

- راست دەکەی. پێویستە پاڤێڵ ئاگادار بکەین ....... ئێستا یەکێکی دەنێرم .......... تۆ بچۆوە مـاڵێ ......... گرنگ نییە . .... قەی ناکە ............ لێمان نادەن .

کاتێك پێلاگێیا گەڕایەوە بۆ ماڵیٚ, هەموو کتێبەکانی کۆ کردەوە و خەریك بوو بیانشارێتەوە. نێـو سـۆبە و لولە کورە و نێو سەماوەر و بەرمیلی ئاو و هەموو شوێنێکی تاقی کردەوە کـە کتێبەکانیتێـدا بشـارێتە. لای وابوو پاڤێڵ دەست لە کار هەڵدەگریٚ و دێتەوە ماڵ، بەڵام نەهاتەوە .دایك شەکەت بوو. لە چێشتخانە لە سەر نیمچە کورسییەك دانیشت. کتێبەکانی خستە ژێر داوێنی کراسەکەی و تاکورەکـەی هاتـەوە نـەبزووت . پـێش ئەوەی هەستیٚ. هاواری کرد دەزانی ؟

پاڤێڵ بزەیەکی هاتیٚ و بە هێمنی گوتی :دەزانم تۆ دەترسی ؟

- زۆر دەترسم .

ئەندرێی گوتی: نابیٚ بترسی، ترس هیچ نییە.

پاڤێڵ گوتی: سماوەریشت تیٚ ناویشتووە !

دایك هەستا و کتێبەکانی نیشان دا و بە داماوی گوتی :

- لە بەر ئەوانە ..........

ئەندرێی و پاڤێڵ دایانە پێکەنین. پێکەنینی ئەوان دایکی هیناوە سەرخۆو دڵی خۆش کردەوە .

پاشان پاڤێڵ چەند کتێبی تاو دانیٚ کە بڕواڵە حەوشە بیانشارێتەوە.ئەندرێیش خەریکی سەماوەر بوو گوتی :

- هیچ شتێکی وانییە دایە, تەنیا شەرم و ریسوایی بۆ ئەو کەسانەیە کە خەریکی ئەو کارانـە دەبـن. هێنـدیٚ کەسی سەرخۆش و چەکمەرەق و مامزە لە پیٚ لە ماڵان وەژووردەکەون و هەموو شوێنێك دەپشکنن. سەر بە ژێر عەرز و عەمباران دا دەکەن و شیروانیانیش دەگەڕێن. تەونی جاڵ جاڵۆکە لە سەر چاویان دەهاڵیٚ و لوشك داوێن و ماندوو ریسوادەبن و خۆ لە خەڵك سوور و شین هەڵدەگێرن. کارەکەیان کـارێکی پـیس و چـەپەڵە .هـەر ئـەو کارەشیان لە دەست دیٚ . جارێك هاتن ماڵەکەی منیان پشکنی هیچیان نەدیتەوە، رۆیشتن .جارێکیش گرتیـانم و چووار مانگ لە بەندیخانەدا بووم .جاروبار دەهاتن بمگرن لە گەڵ چەند سەرباز بە کۆڵانان دا دەیانگێڕام. وریـا و شارەزانین. قسـەی عاقڵانە ناکەن. بەجۆرە خەلك دێنن و دەبـەن. دەبـیٚ کارێـك بکـەن تـا موچـەیان بـدەنیٚ. ئاخرەکەشی ئازادیان کردم و بڕایەوە .

دایك گوتی: ئەوە چییە ئەتۆ هەمیشە ئەم قسانە دەکەی.

ئەندرێی لە پێش سەماوەر هەڵترو شكابوو فوی پێدا دەكرد و رومەتی سوور هەڵگەرابوو. سەری هەڵێنا و دەستێكی بە سمێڵەكانیدا هێنا و گوتی :

- قسەی چۆن دەكەم ؟

- بە جۆرێك قسان دەكەی وەك لە ژیان دا قەت سووكایەتیت پیِ نەكرابێ .....

هەستا سەرپیِ و لە دایك نزیك بووەوە و سەری راوەشاند و بە پێكەنینەوە گوتی :

- كەس هەیە لەم جیهانەدا سووكایەتی پیِ نەكرابێ ؟ من ئەوەندەم سووكایەتی پێكراوە كەوەسەر خۆی ناهێنم. ئینسان كە چاری دیكەی نەبێ چ دەكا ؟ سوكایەتی پیِ كردن زۆرم ئازار دەدا. دەستم پیِ لە كاركردن شل دەكاتەوە, بەڵام ناكرێ خۆی لیِ بپارێزی.

ئەگەر پیاو زۆر گوێ بداتێ وەختی بە خۆڕایی دەروا. ژیان هەر ئاوایە پێشتر لەخەڵك توورە دەبووم. پاشان كە هۆشم هاتەوە سەرخۆ دیتم هەموویان دڵ شكاون، هەموو لەوەی دەترسن كە دراوسێكانیان لێیان بدەن، جا بۆیە هەوڵ دەدەن بۆ لێدان دەست پێشخەری بكەن.

نەرم و هێدی قسەی دەكرد و نیگەرانی دایكی كەم دەكردەوە. چاوە زەقەكانی بە پەژارەوە دەتروسكان. قەد و قەوارەی هەر چەند شل و شەپرێو بوو بەڵام چالاك و لە سەرپیِ بوو. لەشی دەتگوت لاستیكە.

دایك هەناسەیەكی گەرمی هەڵكێشا و گوتی:

- ئەندرۆكە خوا بە ختەوەرت كا!

ئەندرێی چووە لای سەماوەرەكە و لە پێش دایكدا هەڵترو شكا و لە سەرەخۆ گوتی : بەختەوەریم بدەنێ دەستی وەبەر ناهێنم , بە تكاش وەدەستی ناهێنم.

پاڤێڵ هاتەوە ژوور و بە دڵنیایی گوتی: هیچ نادۆزنەوە. چوو دەستانی بشوا ,دەستەكانی وشك كردەوە و هێدی بە دایكی گوت:

- دایە ئەگەر بزانن دەترسی وەشك دەكەون و وادەزانن شتێك هەیە ,لە كاتێكدا هیچ لە گۆڕێدا نییە و هیچمان نەكردووە ...... خۆت دەزانی ئێمە خەیاڵی خراپمان نییە. حەق و عەدالەت لایەنگری ئێمەیە و لە ژیانمان دا بۆ وەدی هێنانی ئەم دوو شتە تێ دەكۆشین. تاوانمان هەر ئەوەیە كەوابوو نابێ بلەرزی .

دایك بەلێنی دا ئازا و بە جەرگ بێ .

پاشان ئەندرێی گوتی خۆزگە هەر ئێستا دەهاتن.

ئەو شەوەی نەهاتن. بەیانی هەستی دەكرد كە لە بارەی ترسەوە گاڵتەی لە گەڵ دەكەن .بەر لە هەموو شتێ دەستی كرد بە پێكەنین

## (١٠)

نزیکەی مانگێــك بــە ســەردا رابــورد. شــەوێك بــە تــرس و ســامەوە پەیــدا بــوون. ئەنــدرێی و پاڤێــلّ و ڤێسۆڤشیکۆڤ کۆبووبوونەوە باسی رۆژنامەیان دەکرد. شەو راشکا بوو. لای نیوەشەو بوو دایك راکشا بوو. چاوی لە بیرە خەورِا چوو بوون. بە حاستەم گوێی لە دەنگــی هێــدی لاوەکــان دەبــوو. لــە پــرِ ئەنــدرێی هەســتا و بــە سەرپێیەکەوە چووە چێشتخانە بە دووای خۆیدا دەرگای پێوەدا .لــە دالآن ســەتلێك کەوتــە خــوار و تەقــەی لیّ بەرزبوّوە ئەندرێی گوتی :

- گویّ هەڵخەن. دەنگی مامزەیە لە کوّلانیّ دیّ.

دایك راپەڕی و بە دەستێکی لەرزۆك چمکێکی کراسەکەی گرت، بەڵام لە نێو دەرگا پاڤێــلّ گەیشــتیّ و بــە هێمنی گوتی :

راکشیّ حالّت باش نییە. لەبەر هەیوانیّ خشەخشێك دەهات. پاڤێلّ چووە بەردەرگا و پرسی کێیە؟

قەد و قەوارەیەکی بۆری کەڵەگەت و چووارشانە وەك بریســك لــە نێــو دەرگــا شــین بــووەوە و دووی دیکەشــی بەدوواوە بوو. کوڕەکەیان پالّەپەستۆدا و لە نێو خۆیان گرت. دەنگێك گوتی

- ئەوانە نین چاوەڕوانیان بوون. ئەفسەرێکی بالّابەرزی قەد باریك بە سمێلّی رەشەوە ئەم قسەی کرد .

پاسەوانێکی گەڕەك کەناوی "فێدیاکین " بوو , بۆلای قەرەوێلەکەی دایك چوو.

دەستێکی بە کلاوەکەیەوە گرتبوو بە دەستەکەی تری دایکی نیشان داو بە چاوێکی بەسامەوە گوتی:

- ئەمە دایکیەتی. بەختی نێوەیە پاشان دەستی پاڤێلّی گرت و گوتی :

- ئەمەش خۆیەتی

ئەفسەرەکە مژۆلّی لێك دان و گوتی پاڤێلّ ڤلّاسۆڤ؟

پاڤێلّ وەلّامی نەدایەوە. سەرێکی لەقاند. ئەفسەر لێوی کۆ کردنەوە و گوتی:

- دەبیّ مالّی تۆ بپشکنم. هەستە پیرێژن کیّ لەوێیە ؟ چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا و بە توندی بۆ لای دەرگــا رۆیشت.

- ناو نیشانتان ؟ قسەکانی دەبیسران.

دووکەسی دیکەی ناسراو سەر و کەللەیان پەیدا. بوو یەکیان ناسنگەرێك بوو ناوی "تڤێریــاکۆڤ "بــوو. ئــەوی دیکەش شۆفێرێکی کرێگرتووی بوو ناوی" رێبین" بوو .

کابرایەکی کاکۆلّ رەش و هێدی و لە سەر خۆ بوو بە دەنگێکی توند بانگی کرد :

ئێواره باش نیلۆڤنا

دایك جلەکانی کردەوە بەر و بۆ ئەوەی غیرەتێکی وەبەر خۆی نابێ لەبەر خۆیەوە گوتی: زۆر سەیرە خەڵك خەوتووە، ئەوانە بەم شەوە لە چی دەگەڕێن؟

ژووره که بچووك بوو .بۆنێکی توندی بۆیەی کەوشانی لێدەهات. دوو ژاندارمە و" ریسکین" ی کە لانتەری گەڕەك کتێبەکانیان لە سەر قەفەسە هەڵدەگرت و لە سەر مێزلە پێش ئەفسەرەکەیان دادەنان. دووی دیکەش مستیان لە دیواری دەدا و ژێر کورسییەکان دەگەڕان. یەکیان بەزەحمەت چووە سەر سۆبەکە. ئەندرێی و ڤێسۆڤشیکۆڤ بە جووتە لە سیلەیەك راوەستابوون. قژە زەردەکانی سەر و چاوی گرۆی ڤێسۆڤشیکۆڤیان داپۆشیبوو. چاوی لە ئەفسەرەکە وەرنەدەگێڕا. ئەندرێی سمێڵی بادەدان. کاتێك دایك دەچووە ژووری بەسەر نیشارەیەکی بۆ دەکرد .پێلاگێیا بۆ ئەوەی ترسی خۆی بشارێتەوە بە پێچەوانەی عادەتی خۆی سینگی وەپێش دەدا،وەك شانازی بە خۆی بکا بە تەق و هۆر دەهات و دەچوو. برۆی تێك دەنان و تۆزێك سەیر دەهاتە بەر چاو .

ئەفسەر بە گورجی کتێبەکانی هەڵدەگرت و بە قامکە سپی و باریکەکانی پەڕەکانی هەڵدەدایەوە و خێرا لەولای دادەنان. جاری وابو یەکیان دەکەوتنە خوار و تەپەیەکی نەرمی لێدەهات. هەموو بێ دەنگ بون بێجگە لە فنەفنی ژاندارمە گەرم داهاتووەکان و زرینگەی مامزەی پاش پانییان هیچ دەنگی دیکە نەدەبیسرا. هێندێ جار یەکێك دەیپرسی :

ـ ئێرەت چاو لێکرد؟

دایك لەگەڵ پاڤێل لە پەنا دیوار راوەستا. دەستی هاویشتبووە سەر سینگی. خەریك بوو پرسیارێك لە ئەفسەر بکا .ئەژنۆی دەلەرزین و تارماییەك بەری چاوی دەگرت.

لە پڕ دەنگی ڤێسو ڤشیکۆڤ بەرز بووەوە :

- فڕێ دانی ئەم کتێبانە قازانجی چییە؟

دایك راچەنی. تڤێر یاکۆڤ هەر وەك زللەیان لە پشت ملی دابێ ئاورێکی دایەوە. ڕێبین بۆ لە بۆڵێکی لێهات و چاوێکی لە تاوانبار کرد.

ئەفسەر مژۆڵی لێك دەدان و چاوی لە سەر و چاوی گرۆیی لاوەکە دەکرد. پاشان بە توندی پەڕەکانی هەڵدەدایەوە .هێندێ جار چاوە کاڵەکانی وەها زەق دەکرد دەتگوت ژان دەکا و خەریکە لە بەر ئازار بە توندی هاوار بکا.

ڤێسۆڤشیکۆڤ دیسان گوتی: سەرباز! ئەم کتێبانە کۆ بکەوە.

ژاندارمەکان رویان تیٚ کرد و چاویٚکیان لە ئەفسەر کرد. کابرا سەری هەڵبڕی و دیسان چاویٚکی لە گڕویٚ کرد و بە سەر جوڵاندن فەرمانیدا.

- ئەم کتێبانە کۆ کەنەوە.

یەکێك لە ژاندارمەکان داهاتەە و لە کاتێکدا بە سیلەی چاوی سەیری ڤیٚسۆڤشیکۆڤی دەکرد دەستی کرد بە کۆ کردنەوەی ئەو کتێبانەی بڵاو کرابوونەوە.

دایك لە سەر خۆ بە کوڕەکە ی گوت :

- باشترە کە ڤیٚسۆڤشیکۆڤ بیٚ دەنگ بیٚ.

پاڤیٚلٚ شانەکانی هەڵتەکاند و ئەندرێی ملی بۆ لاراکێشا:

- ئەم سرت و خورتە چییە؟ کیٚ لێرە تەورات دەخوێنیٚ ؟

پاڤیٚلٚ لەوەڵامدا گوتی: من.

ـ ئەم کتێبانە هەموو ئی کێن ؟

پاڤیٚلٚ گوتی: ئی من .

ئەفسەر پاڵی وە کورسییەکەدا . قامکە سپیەکانی شکاندنەوە و لاقەکانی بۆ ژێر کورسییەکە راکێشا و دەستی بە سمێڵەکانی داهێنا و لە ڤیٚسۆڤشیکۆڤی پرسی :ئەندرێی ناخۆدکا تۆی ؟

ڤیٚسۆڤشیکۆڤ هاتە پێش و لە وەڵامدا گوتی: منم .

ئەندرێی لە پشتەوە شانی گرت و بۆ پشتەوەی راکێشا و گوتی:

- بە هەڵە چووە, ئەندرێی منم.

ئەفسەر دەستی هەڵێنا و بە قامك هەرەشەی لە ڤیٚسۆشیکۆڤ کرد و گوتی:

- ئاگات لە خۆت بیٚ. پاشان دەستی کرد بە تێك وەردانی کاغەزەکانی. شەو زرینگابووەوە و تروسکایی شەو لە پشت پەنجەرەوە تەماشای ژووری دەکرد. لەبەر دەرگای خانووەکە یەکێك دەجولایەوە. لە ژێرپێیانی سیرەی بەفر دەهات.

ئەفسەر پرسی : ناخۆدکا پێشتر بە تاوانی سیاسی گیراوی ؟

- بەلی. لە رۆستۆڤ و لە ساراتۆڤ .فەرقی ئەوەندە بوو ژاندارمەکان لەویٚ پێیان دەگوتم" ئێوە"

ئەفسەر چاوی راستی لە سەر یەك دانا و ددانە وردەکانی دەرخست و گوتی:

ـ باشە رەنگە تۆ ئەو تاوانبارانە بناسی کە لە کارخانە دا بەیاننامەی قەدەخە بڵاو دەکەنەوە؟

ئەندرێی لە سەر پێیان خۆی بزاوت و بە زەردەخەنەیەكی درێژە وە خەریك بوو شتێك بڵێ، بەڵام سەر لە نوێ ڤیسۆڤشیكۆڤ بە توورەیی گوتی :

- ئێمە یەكەم جارە تاوانبار دەبینین .

تاوێك مات و بێ دەنگ بوون. دایك رەنگی بزركا. برۆی راستی هەڵكشا. ریشی رێبین زۆر سەیردەستی بە لەرزین كرد. ئەفسەر بە توندی فەرمانی دا : ئەم حەیوانە وەدەر نێن.

ژاندارم پەلی لاوەكەیان گرت و بۆ لای چێشتخانەیان برد. لەوێ كە بە هەموو تواناوە لاقی بەعەرزییەوە چەسپاندەبوون هاواری كرد:

- راوەستن. دەمەوێ پاڵتۆیەكەم لەبەر كەم.

كەڵانتەر كە چووبوو حەوشە بپشكنێ گەڕایەوە و گوتی:

- هیچم نەدۆزیەوە.

ئەفسەر بە گاڵتە و لاتاو گوتی: پیاوی كارامە و بە ئەزمون لێرەن.

دایك ئەم دەنگە باریك و تیژەی دەبیست و كە تەماشای رەنگە زەردەكەی ئەفسەری دەكرد، دەیزانی ئەم كابرایە دوژمنە. دوژمنێكی دڵرەق و پڕ لە قینی خەڵكە. پێشتر كەم كەسی ئاوای دیتبوو. تەنانەت لەمساڵانەی دواییدا ئەم جۆرە كەسانەی لە بیریش چو بووەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی:

- ئێمە بووین بە هۆی نیگەرانی ئەوانە.

ئەفسەر روی لە ئەندرێی كرد و گوتی : ئاغای ئەندرێی ئەنیسیمۆڤ ناخۆدكای بیژو ! من تۆ دەگرم

ئەندرێی زۆر بە هێدی پرسی: لەبەر چی ؟

- پاشان پێت دەڵێم. بە توورەیی روی لە پێلاگێیا كرد و گوتی :

خوێندەواری ؟ پاڤێلّ لە جیاتی دایك وەڵامی داوە: نا.

ئەفسەر بە توورەیی گوتی: من لە تۆ ناپرسم. پیرەژن تۆ وەڵام بدەوە .دایك لە ئاست ئەو كابرایە سینگی پربوو لە قین و بێزاری. لە پرپشتی راست كردەوە و هەر وەك كەوتبێتە نێو سەهۆڵاو هەموو لەشی دەلەرزی. جێ برینی دەمی و چاوی سوور هەڵگەرابوو. برۆی ئەوی بووبوون، دەستی بۆ لای ئەفسەرەك راكێشا و گوتی:

- مەقیژێنە. تۆ هێشتا گەنجی، مانای دەرد ژان ونازانی ...........

پاڤێلّ قسەی دایكی بڕی .

- دایە بێ دەنگ بە.

ئەندرێش ئامۆژگاری كرد: باشترە مرۆڤ خۆراگر و بێ دەنگ بێ

دایك خۆی بۆ لای مێزەکە راتڵەکاند و هاواری کرد :

پاڤێلّ راوەستە !.... ئەم خەلکە بۆ دەگرن؟

ئەفسەر هەستا سەر پێ و نەڕاندی: بە تۆ چی ... بێ دەنگ بە! ....... ڤێسۆ ڤشیکۆ ڤ بێنن !پاشان کاغەزێکی بە بەرچاوەوە گرت و دەستی کرد بە خۆێندنەوە.

لاوەکەیان هێنا. ئەفسەر دەستی لە خوێندنەوە هەلگرت و تێی ڕاخوڕی.

کلاوەکەت هەل گرە.

رێبین لە پێلاگێیاوە نزیك کەوت و گوتی: دایە هێدی بە.

ڤێسۆڤشیکۆڤ گوتی : کاتێکی دەستیان گرتوم چۆن دەتوانم کلاوم هەلّگرم ؟ئەفسەر نووسراوەکەی هاویشتە سەر مێز و گوتی :

- وەرن ئیمزای بکەن

دایك دیتی نووسراوەکە ئیمزا دەکەن .دامرکابووەوە ,دلّ و زاتی لانەمابوو. فرمێسکی گەرمی لە چاواندا قەتیس مابوو .هەژاری و بێ دەسەلاتی لێ دیار بوو .لە ماوەی بیست سالّ ژن و مێردایەتیدا زۆری لەو فرمێسکانە رشتبوو. لەوەتی بێوەژن کە وتبوو زۆراندنەوەی توندی فرمێسکەکانی لەبیر چوو بووەوە. ئەفسەر چاوێکی لێکرد و بە روگرژی گوتی :

پیرێژن ئێستا زۆر زووە کە بقوڕێنیّ. دەبینی کە بۆ داهاتوو تەرایيت لە چاواندا نامێنی .

پێلاگێیا بە تووڕەیی وەلّامی داوە : دایکان بۆ هەموو شت فرمێسکیتەواویان هەیە . .......

بۆ هەموو شت ..... ئەگەر تۆش دایکت هەبێ بێگومان ئەوەی دەزانی .

ئەفسەر کاغەزەکانی لە جانتا تازەکەی نا. قوفڵەکەی تروسکەی دەهات. بە کەلّانتەری گوت: وەڕێ کەون.

پاڤێلّ بە گەرمی دەستی هاورێیانی گوشی. خواحافیز ئەندرێی. خواحافیز نیکولّای .

ئەفسەر بە گالّتە گوتی : بەلّێ راستە، خواحافیز .

ڤێسۆڤشیکۆڤ بێ ئەوەی دەنگی لەبەر بێتە دەر بە قامکە کورتەکانی, دەستی دایکی دەکوشی. بە زەحمەت پشوی دەهات. خوێن لە ملە ئەستورەکەی دا کۆببووەوە .

چاوەکانی لە رقان دەدروشان. ئەندرێی بزەی لە سەر لێوان بوو. سەری راوەشاند. چەند قسەیەکی بە دایك گوت. دایك نیشانەی خاچی بۆ کێشا ووەلّامی داوە :

- خوا پیاوی دادگەر دەناسێ. ئاخرەکەی ئەو کۆمەڵە پیاوە بە شنێلی بۆر و تەقەتەقی مامزە لە ماڵی وەدەرکەوتن. ڕێبین لە دووای هەمووان وەدەرکەوت. بە چاوە ڕەشەکانی سەیرێکی پاڤێلی کرد و گوتی : باشە خواحافیز.

پاڤێل دەستی لە پشتەوە گرتبوون و بە کاوە خۆ بە نێو بوخچەی لیباس و کتێبەکاندا کە ڕژابوونە سەر عەرزی تێپەری و بە دەنگێکی گیراو گوتی :

بزانە ئەوانە چدەکەن ؟

دایك بێ ئەوەی بیر بکاتەوە چاوی لە ژووره پەڕش و بلاوەکە کرد و بە خەفەتەوە گوتی: نیکولای بۆ چی لێیان توورە بۆ؟

پاڤێل لە سەرەخۆ گوتی: بێ گومان ترسابوو .

دایك لە کاتێکدا باسکی رادەوەشاند لە بن لێوانەوە گوتی: هاتن, گرتیان و بردیان ! کوڕەکەی بۆ مایەوە, دڵی هێدی تر لێدەدا. بەڵام لە ناست شتێك کە سەری لێ دەرنەدەکرد بیری رادەوەستا :

- ئەو کابرا زەردەلە ئێمەی بە گاڵتە گرتووە و هەڕەشەمان لێدەکا .

- دایە ئیتر بەسە تۆ وەرە با ئەو شتانە کۆ بکەینەوە.

وشەی "دایە" و" تۆ "ی بە جۆرێك گوت کە تەنیا لە کاتی زۆر لێك نزیك بوونەوەدا دەگوترێ. دایك لێی وەنزیك کەوت و تەماشایەکی کرد و بە نەرمی لێی پرسی :

لە تۆ خۆش بوون ؟

- بەڵێ! ئەوە دژوارە! باشتر بوو منیش لە گەڵیان بم ....

دایك وای هاتە بەر چاو کە پاڤێل فرمێسکی دەچاوان گەڕاوە. بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە گوتی :

- راوەستە تۆش دەگرن .............

- وەڵامی داوە: دەزانم دەمگرن ..........

دایك پاش تاوێك بێ دەنگی بە خەفەتەوە گوتی : رۆڵە گیان چەند بێ رەحمی. خۆزیا دڵخۆشیت دابامەوە. بەلام بە پێچەوانەوە ....

من قسەی سامناك دەکەم تۆش وەڵامی بەترسترم دەدیەوە. پاڤێل چاوێکی لێکرد و لێی نزیك بووەوە و لە سەرەخۆ گوتی : دایە نازانم وەڵامت بدەمەوە. ناتوانم دروت لە گەڵ بکەم. دەبێ پێرابێین. دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و بێ دەنگ بوو. پاشان بە لەرزەوە قسەکانی درێژە پێدا و گوتی: چووزانم دەڵێن خەڵك شکەنجە

دەدەن، لە شیان و نجڕو نجڕ دەکەن .نێسکیان تێك دەهارن. رۆڵە گیان خوشەویستەکەم کە بیر لەوانە دەکەمەوە دەترسێم.

– گیان ئازار دەدەن, نەك لەش. کە دەستی پیس لە لەشی مرۆڤ دەدەن لە ئەشکەنجە بەژان ترە .

## (١١)

رۆژی دووایی بلاوبوەوە کە بوکین و سامۆیلۆڤ وسۆمۆڤ و پێنج کەسی تر گیراون. فێدیا مازین رای کردبوو. مالیّ ئەویش گەڕابوون. خۆی بە قارەمان دەزانی کە دەرباز بووبوو .

دایك لێی پرسی: فێدیا ترسای ؟

رەنگی بزڕکا. نێو چاوانی گرژ بوو. کونە لوتی دەستی کرد بە لەرزین .

– لەوە دەترسام ئەفسەرەکە لێم بدا. ریشێکی دزێوی هەبوو. دەستی توکاوی بوون. چاویلکەیەکی رەشی لە چاویدا بوو، دەتگوت هەر چاوی نییە. دەیزیڕاند. پێی بە عەرزیدا دەدا و دەیگوت :

لە گرتوخانە دا دەترزێنم. تا ئێستا کەس لێی نەداوم تەنانەت دایك و باوکیشم. چونکە تاقانە بووم خوشیان دەویستم. هەموو کەس لێی دەدریّ بەلاّم من هێشتا دەستی کەسم ویّ نەکەوتوە. چاوە سورەکانی تاوێك لێك نا. لێوەکانی پێك وەنوساند خێرا قژەکانی بۆ پاشەوە هەلّ داوە و چاوێکی لە پاڤێلی کردو گوتی :

– ئەگەر کەسێك لێم بدا وەك کێرد لە سکی رادەچم. بەکەلپان پچڕ پچڕی دەکەم.ئەو دەم با لێم بدەن. دایك وەدەنگ هات: ئەی رو تۆ زور کزو بیّ هێزی چۆن دەتوانی شەربکەی؟ فێدیا سەبرۆکە وەلاّمی داوە: هەر دەیکەم , کە فیدیا رۆیشت دایك بە کوڕەکەی گوت : ئەوەیان لە هەموان پتر تێك دەشکیّ .

پاڤێلّ بیّ دەنگ بوو. پاش چەند دەقیقە دەرکی چێشتخانە بە ئەسپایی کرایەوە و رێبین وەژوورە کەوت و بە پێکەنینەوە گوتی:

رۆژ باش. دیسان هاتمەوە. دوێنیّ شەو ناچاریان کردم بێم, بەلاّم ئەمشەو بە خۆشی خۆم هاتم. بەلیّ بە توندی دەستی پاڤێلی گوشی و شانی دایکی گرت و پرسی :

چام دەدەییّ ؟

پاڤێلّ چاوێکی لە ریشی پان و سەر و چاوی بەرین و چاوە زەقەکانی میوانەکەی کرد . لە نیگایدا رێز و غیرەت و خۆڕاگری دەبینرا. بە ژنو بالاّی رێبین کە وەك پالەوانان دەچوو لە بەر هێز و زیبك بۆ خۆش ویستن دەبوو .

دایك چو سەماوەر تیّ باویّ. رێبین دانیشت و دەستێکی بە سمێلی دا هێنا و ئانیشکی خستە سەر مێزەکە و چاوی لە پاڤێلّ برین وەك و تووێژیکی نیوە چلّ درێژەی پێدا و دەستی پێکرد :

- ئاوا ........ پێویستە ڕەپ و ڕاست پێت بڵێم: ماوەیەکی زۆر بۆ تۆم هەڵنابوو و خستبوومیە ژێر چاودێری. ئێمە دراوسێی یەکین. دەمدی زۆر کەس دێنەماڵتان بەڵام هیچیان سەرخۆش نابن، بەدمەستی ناکەن. ئەوە یەکەمیانە خەڵك کردەوەی باشی هەبێ، دەردەکەوێ و پیاو دەزانێ چ کارەن و چ دەکەن. منیش چوونکە دوور لە خەڵك دەژیم بە بێ ئەوەی کارێکی خراپ بکەم دەکەومە بەر سەرنجی خەڵك .

هێدی و ڕەوان قسەی دەکرد. قسەکانی دڵنیایی و بڕوایان لە پیاودا پەیدا دەکرد . بەمجۆرە هەموو باسی تۆ دەکەن. خاوەن ماڵەکەم تۆ بە کافر دەزانێ چوونکە ناچیتەکلیسا. منیش ناچم پاشان ئەم نووسراو و بە یاننامانە سەریان هەڵدا ..... تۆ کەوتیە سەرئەو بیرە

پاڤێل بێ ئەوەی ڕو لە ڕێبین وەرگێڕێ وەڵامی دایەوە: بەڵێ !

ئەویش چاوی لە پاڤێل بڕیبوو. دایك بە نیگەرانی لە چێشتخانە هاتە دەر وگوتی :

- سەیرە هەر تۆ بە تەنیا نی !

پاڤێل و ڕێبین پێکەنین. ڕێبین هەناسەیەکی هەڵکێشا. دایك چلمی هەڵلوشی و کاتێك زانی زۆر گوێ بۆ قسەکانی شل ناکەن کەمێك تێکچوو .

دایك گوتی : بڵاو کردنەوەی ئەو بەیاننامە کارێکی باش بوو. گەل دەورووژێنن. نۆزدە دانە بوون ؟ پاڤێل لە وەڵامدا گوتی : بەڵێ.

- هەمووم خوێندەوە. هێندێ مەتڵەبی زیادیان تێدا هەبوو،تێگەیشتنیان دژوار بوو. مرۆڤ کە زۆری گوت توشی قسەی بێ جێش دەبێ .

ڕێبین پێکەنی. دانەکانی سپی و ساخ و سەلیم بوون.

پاشان ئەو پشکنین و گەڕانە هاتە پێش. ئەوە بوو بە هۆی ئەوە کە تۆم خۆش بوێ. تۆش و ئەندرێی و ڤێسۆڤشیکۆڤ و هەمووتان نیشانتاندا ......... ئەو زاراوەی دەیویست بە کاری بێنی بۆی نەدۆزراوە، بۆیە بێ دەنگ بوو. چاوێکی لە پەنجەرە کرد و بە پەنجە لەمێزەکەی دا .

ـ بڕیارەکەتان جوامێریی ئێوەی نیشان دا. ئێوە کاری خۆتان بکەن. ئێمەش کاری خۆمان دەکەین. ئەندرێیش هەڤاڵێکی باشە زۆر جار گوێم لێ دەبێ کە لە کارخانە چۆن قسان دەکا.بیری لێ دەکەمەوە و گومانم لەوەیدا نییە تەنیا مەرگە تێکی دەشکێنێ. پیاوێکی بە دەمارە. پاڤێل تۆ بڕوا بە قسەکانم دەکەی؟

پاڤێل سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: بەڵێ.

ـ تەماشام کە تەمەنم چل ساڵە و دوو ئەوەندەی تۆ ژیاوم. بیست ئەوەندەی تۆش دەزانم. سێ ساڵ سەرباز بووم دوو، جار ژنم هێناوە، یەکیان مردووە یەکیشم تەڵاق داوە. لە قەفقاس بووم "دووخۆبرەکان" دەناسم

(دەستەیەكی ئایینی بوون لە رۆژهەلاتی روسیای ئەوروپا پێك هاتبوون) ئەوان برای یەكتر بوون بە سـەر ژیانـدا سەر نەكەوتن, نا .

دایك بە حەزەوە گوێی بۆ قسەكانی راگرتبوو. ئەوەی زۆر پێخۆش بوو كە پیاوێكی بە ساڵداچوو هاتووەتە كـن كوڕەكەی و وەك پێ لە گوناحی خۆی بنێ‌ وابـوو، بـەڵام وای دەهاتـە بەرچـاو كـە پاڤێـلّ زۆر گـوێ ناداتـە میوانەكەی. بۆ ئەوەی وشكی وساردی نەهێڵێ، لە رێبینی پرسی :میخائیل ئیڤانۆڤیچ شتێك ناخۆی ؟

ـ نا دایە. سوپاس نانم خواردووە. پاڤێلّ تۆ پێت وانییە دووای ئەو بڕیارە رووداوەكانی ژیان وا نابن وەك دەبێ بن ؟

پاڤێلّ هەستا دەستی لە پشتەوە گرت و لەگەڵ هاتو چۆ كردن لە ژوورێدا وەڵامی داوە :

ـ نا رووداوەكان باش دەبن. بۆ نمونە ئێستا گیانی پشكوتوی تۆ رێگای لای منی پیشـان داوی. ئێمـە كـە بـێ وچان كار بكەین كەم كەم دەگەینە یەك. رۆژێك دێ هەموومان یەك دەگرین .وەزعەكەوای لێهاتووە كە بۆ ئێمە دژوارە . بەڵام ژیان چاووگوێمان دەكاتەوە و مانـای تـاڵی بـۆ ئێمـە رون دەكاتـەوە و پێمـان نیشـان دەدا كـە رووداوەكان چۆن بەڕیوە بەرین .

رێبین قسەكانی پێ بڕی و گوتی : راستە بەڵام من پێم وایە كە جیهان و مـرۆڤ دەبـێ سـەر لـە نـوێ دروست بكرێنەوە. كاتێك پیاو لەشی دەخورێ دەچێتە گەرما و خۆی دەشوا و بەرگی خاوێن دەكاتە بەر و دەحەسێتەوە. وانییە ؟ هەروەها كاتێك كوانی لێ دێ دەبێ بیدڕێ با خوێنیشی لێبێ, بیشوا. وانییە ؟ بـەڵام ئـەی ئێـو دڵ و ناخی مرۆڤ چۆن خاوێن دەكرێتەوە ؟

پاڤێلّ بە گەرمی لە بارەی خودا و ئیمپراتۆر و كاربە دەستانی كارخانە و خەباتی كرێكـارانی هەندەرانـە وە دژی ئەوانەی مافیان دەخۆن قسـەی كرد. رێبین هێندێ جار پێدەكەنی. پاشـان هـەر وەكـی نوختـە بـۆ و تـاری پاڤێلّ دابنێ بە قامك لە مێزەكەی دەدا، بـەڵام جارێـك نـەیگوت راسـت دەكـەی لەگـەڵ ئـەوەش دووای وردە پێكەنینێك لە سەرەخۆ گوتی : ناخ تۆ هێشتا گەنجی، تۆ خەڵك ناناسی .

پاڤێلّ هەر وەك راوەستابوو بەسەر گرانی وەڵامی داوە : با قسە لە گەنجی و پیری نەكەین با بزانین كام بـیر و باوەڕ راست تر و باشترە ؟

ـ كە وابوو تۆ پێت وایە هەر بۆ فریودانی ئێمە كەڵكیان لە ناوی خوداش وەرگرتووە .

– راست وایە . منیش لە سەر ئەو باوەڕەم كە ئایینی ئێمە هەڵەیـە و زیـانی زۆرە . دایـك كەوتـە بـەینیان. كاتێك پاڤێلّ باسی خودا و شتی پیرۆزی دەكرد دەیویست بە جۆرێك داوای لێبكا كە بە وشـەی تونـد و رەق و

بێ بڕوایی دڵی ئەو نەشکێنێ. بەڵام کە هەستی دەکرد کورەکەی سەرەڕای دردۆنگی و بە دگومانی بڕوایەکی هەیە، تۆزێك هێدی دەبووەوە و لە دڵی خۆیدا دیگوت :

چۆن دەتوانم لە بیر و بڕوای ئەو بگەم. پێی وابوو قسەکانی پاڤێل بۆ پیرە پیاوێکی وەك ڕێبین سوك و نالەبارن. کاتێکی ڕێبین بە ئارامی ئەو پرسیارەی لە پاڤێل کرد. دایك خۆی پێ ڕانەگیرا بە کورتی بەڵام بە بێ بڕوایی گوتی :

کاتێك باسی خودا دەکەن وریای خۆتان بن. چ دەخوازن بیکەن پاشان کە پشوی هاتەوە بەر خۆ بە هێزێکی پترەوە گوتی :

من پیرم ئەگە ر خوداشم لێ بستێنەوە ئەدی کاتی خەم و خەفەت هیوام بە کێ بیێ؟

پاڤێل بە نەرمی گوتی :دایە گیان لە مەبەستی ئێمە نەگەیشتووی . ڕێبین بە دەنگێکی ڕەق و توند گوتی : دایە بمانبورە بە زە ردەخەنەوە چاوێکی لە پاڤێل کرد و گوتی :

ـ لە بیرم چوو تۆ لەوەی پیرتری کە ریشت بۆ بتاشن .

پاڤێل گوتی: من باسی ئەو خودا مەزن و مێهرەبانە ناکەم کە تۆ بڕوات پێی هەیە، مەبەستم ئەو خودایە بوو کە قەشەکان هەرەشەی پێ لە ئێمە دەکەن و دەیانەوێ بە ناوی ئەوەوە تەواوی مرۆڤایەتی بخەنە ژێر دەستی چەند کەسێك .

ـ بەڵێ ڕاستە, خواشیان لێ گۆڕیوین. دوژمنەکانمان هەرچی بە دەستیانەوە هەیە دژی ئێمە بەکاری دێنن. دایە بزانە خودا مرۆڤی لە سەر شکڵی خۆی دروست کردووە کەوابو ئەگەر مرۆڤ لەو دەکا، ئەویش لە مرۆڤ دەکا، بەڵام ئێستا ئێمە لە جیاتی ئەوەی لە خودا بکەین لە جانەوەران دەچین. لە باتی خودا داوەڵی کلیسا مان نیشان دەدەن. دەبێ وێنەی خودا بگۆڕین , خاوێنی کەینەوە , کراسی بوختان و درۆی لەبەرداماڵین، ئەو بەرگەی بۆ کوشتنیئێمە کردوویانەتە بەری .

بە شێنەیی و ڕەوانی قسەی دەکرد. قسەکانی هەر یەك زەبرێك بوون وەدایك دەکەوتن. لەو سەر و چاوە کە بە ریشێکی تۆپی ڕەش داپۆشرابوو دەترسا و نەیدەتوانی چاو لە چاوە بزەکانی بکا .

دایك سەری ڕاوەشاند و گوتی : پێم خوشە لێرە بڕۆم. هێزی بیستنی ئەم قسانەم نییە, ناتوانم. پەنای بۆ چێشتخانە برد .ڕێبین گوتی :

ـ پاڤێل دەبینی . ؟ نەك لە سەرەوە, پێویستە لە دڵەوە دەست پێ بکەی. لە لەشی مرۆڤدا دڵ لە شوێنیکە هیچی دیکەی لێ شین نابێ .

پاڤێلّ گوتی: تەنیا عەقل و مێشك مرۆڤ ئازاد دەكا . رێبین بە دەنگێكی لە رزۆك گوتی :

ـ عەقلّ هێز نابەخشی. دلّ هێز پەیدا دەكا نەك مێشك. ئەوەیە! دایك بە بیّ ئەوەی دووعاكانی بخوێنیّ لە جیّ خزابوو و نووستبوو. سەرمای بوو، هەستی بە ماندوویی دەكرد. لە پێشدا رێبینی بە عاقلّ و سەنگین هـاتبووە پێش چاو بەلاّم ئێستا خۆشی نەدەویست.

دایك گوێی دابووە دەنگێكی كاریگەر كە بە هاسانی لە سینگێكی پان دەهاتە دەر. بیری دەكردەوە .

ـ كافر .......... ئاژاوەچی .................. بۆچی دێیە ئێرە .

رێبین هێدی و ئارام دەیگوت : جێگای پیرۆز بە تالّ نابیّ. ئەو شوێنەی ئێمە كـە خـوای تێدایـە پـیس بـووە. ئەگەر خوا لە گیانی مرۆڤ دەركەویّ بریندار دەبیّ. پاڤێلّ راستییەكەی ئەوەیە !

دەبیّ بڕوایەكی نویّ پەیدا بكەی. دەبیّ بڕوامان بە خودایـەك هـەبیّ كـە لـە ئاسـت هـەموان دادپـەروەربیّ. خوایەكی شەڕ كەر و بیّ رەحم نەبیّ, بەلكوو دۆستی مرۆڤ بیّ .

پاڤێلّ گوتی: باشە حەزرەتی مەسیحیش هەروا بوو . راوەستەحەزرەتی مەسیح گیانێكی بـە هێـزی نـەبووە گوتویە "جامی شەهادەت لە من وەدوورخە". قەیسـەری بە رەسمی ناسیوە. خـوا نـاتوانیّ دەسـەلاّتی مرۆڤێـك بەسەر مرۆڤدا بە رەسمی بناسیّ. ئەو خۆی دەسەلاّتداری تەواوە .ئەو گیانی خـۆی بـە بەشـی خـودایی و بەشـی ئێنسانی بەش نەكردووە چوونكە خۆی بە خوا دەزانیّ و پێویستیشی بە هیچ شتێكی ئـەو تـۆ نییـە كـە بـاری ئینسانی بیّ. ئەوەیە مرۆڤایەتی، بەلاّم مەسیح بازرگانی و ژن هێنانی بە رەوا زانیـوە. لـە داری هـەنجیر بێـزار بووە, ئەوەی بیّ ئینسافییە. چما ئەو سوچی خۆیەتی كە هستێور و نەزۆك بووە, گیانیش ئەگەر بەرهەمی باش نەبیّ خۆی تاوانی نییە من تۆوی خراپەم لیّ چاندوو ئەوەیە !

لە ژوورەكە دا دوو دەنگ بیّ وچان وەك لە یارییەكی گەرم دا بە گژ یەكدا هاتبن دەنگیان دەداوە. پاڤێـلّ بـە هەنگاوی بەرز بە ژوورێدا دەهات و دەچوو. كاتێك قسەی دەكرد دەنگی رەسەر هەموو شت دەكـەوت. كاتێـك رێبین بە ئارامی وەلاّمی دەداوە چرتەی سەعات و دەنگی وشكی بەستەلّەك دەبیسرا.

- من بە شێوەی خۆم قسەت لە گەلّ دەكەم وەك ئاگر خۆشكەرێك. خوا وەك ئاگرە وایە. لە دلّـی مـرۆڤ دایـە گوتراوە خوا وشەیە وشەش گیانە .

پاڤێلّ قسەكانی ئەوی راست كردەوە, گوتی عاقلّ . راستە كە وابوو خوالەدلّ وعەقلّ دایە نەك لە كلیسا دا.

هەموو ناتەواوی و هەژاری و چارەرەشی لەوەدایە كە ئێمەیان لە خۆمان جیا كرددووەتەوە عەقلّ دلّـی وەپـاش داوە و خۆشی رۆیشتووە

دایك خەوی لێكەوتبوو, نەیزانی رێبین كەنگی رۆیشت .

رێبین دەستی بە هاتوچۆی ماڵی پاڤێڵ كرد و زۆر جاران دەهات. ئەگەر هاورێیەكی پاڤێڵ لەوێ با، رێبین مات و بێ دەنگ دادەنیشت و جاروبار دەیگوت: راستە..... وایە .

جارێكیان روی لە هەموان كرد و گوتی : دەبێ باسی ئەو شتەی بكەن كە هەیە. دووارۆژ چ دەبێ, هیچی لی نازانین.كاتێك گەل ئازاد بوو خۆی دەزانی چی باشە. لە كۆنەوە زۆرشتی ئەو تۆیان بردووەتە مێشكی كە خۆی نەیویستووە. بەسە. با خۆی تێبگات. لەوانەیە هەموو شتێك بداتە دوواوە .

هەموو ژیان و هەموو زانست. لەوانەیە بزانێ هەموو شت دژی ئەوە، تەنیا كتێبەكانی وێ بدەن . خۆی وەڵام دەداتەوە، ئەوەیە!

كاتێك كە پاڤێڵ تەنیا دەبوو لە گەڵ رێبین دەستیان بە باسێكی دوور و درێژ دەكرد.

دایك بە نیگەرانییەوە گوێی بۆ قسەكانیان رادەگرت. بە بێ دەنگی سەیری دەكردن و هەولی دەدا كە لە قسەكانیان بگا. هێندی وای دەهاتە بەر چاو كە كابرای چنگ پان و ریش رەش و كوڕەكەی هەر دووكیان كوێرن.دەتگوت لە تاریكاییدا لە نێوان دیواری ژوورە بچووكەكەدا ئەم لاو ئەولا دەكەن و لە رۆژنەیەك و لە روناكییەك دەگەڕێن. سەریان لێشێواوە، بەدەستی بە هێز بەڵام بە نەزانی پەنا بۆ هەموو شت دەبەن. دەست لە هەموو شت دەدەن و رای دەوەشێنن، هێندێ شتیش بە عەرزی دا دەدەن و پاشان پێ شێلی دەكەن. بە كاوەخۆ بێ ئەوەی بروا و هیوای خۆیان لە دەست بدەن دەست بە هەموو شتدا دێنن و هەمووی وەلا دەنێن .

دایكیان فێر كردبوو كە بە ساویلكەیی و نازایی قسەی بە ترسیشی گوێ لێبێ. ئەو قسانە ئیتر وەك هەوەڵ جارئەوەندە بۆی مەترسیدار نەبوون، هەرچەند لە قسەكانیدا جاروبار خوی وەبەر دەدا بەڵام بڕوای هەر پێبوون. رێبینی خۆش نەدەویست بەڵام واش نەبوو بە نەیاری بزانیˇ.

دایك حەوتووی رۆژێك كتێب و جلی خاوێنی بۆ ئەندرێی دەبردە زیندان. رۆژێك رێگایان دا چاویشی پێبكەوێ. كە هاتەوە ماڵێ بە دلسۆزییەوە گێڕایەوە : هەر وەك خۆیەتی. هەموو خۆشیان دەوێ، لەگەڵ هەموان گاڵتە دەكا. ژیانی ناخۆش و ناڕەحەتە. بەڵام وەسەرخۆی ناهێنیˇ. رێبین گوتی: هەر دەبیˇ وابێ، ئێمە هەموو لە خەم و خەفەت داین. خەم دەمژین و كراسی خەم دەكەینە بەر.خۆهەڵكێشانی ناوێ هەموو كەس چاوی نەبەستراوە. هێندێك هەن چاوی خۆیان دەبەستن هەر وایە تا ئەو دەمەی كە مرۆڤ ئەحمەقە هەر دەبێ ئازار و كوێرەوەری ببینیˇ ........................

(١٢)

کۆنە خانووە بچکۆلەی ڤلاسۆڤ لەو گەڕەکەدا رۆژ بە رۆژ پـتر سـەرنجی رادەکێشـا. لـە نێـو ئـەو سـەرنجانە دا دڕدۆنگی و گومان و لالوتیش دەبینرا .جاری و ابوو کەسێکی بروا پێکـراو و دڵسـۆزیش دەهـات و بـە وشـتی تەماشای ئەملا و ئەولای دەکرد و بە پاڤێلی دەگوت : باشە براگیان ! تۆ کە کتێب دەخوێنییەوە لـە یاسـاش دەگەی و شارەزای بۆم روون بکەوە. پاشان باسی ئەو زوڵم و کارە نالەبارانەی دەکرد کە شارەوانی یان بەڕێوەبەری کارخانە کردبوونی. ئەگەر مەسەلە و پێداویستی کابرا دژوار و قورس بوایە نووسراوێکی دەدایە و دەینارده کـن دادیارێکی ناسیاو لە شار. ئەگەرمەسەلەکەش هاسان بووایە خۆی کابرای رێنوێنی دەکرد .

کەم کەم ئەم لاوە رێك و پێکە قەدر و رێزی لە نێو خەڵکی گەڕەك زیاد دەبوو. بە رێزەوە چاویان لێدەکرد. بە ئازایی و بە زمانی سادە وەڵامی خەڵکی دەدایەوە. بـە وردی سـەرنجی هـەموو شـتی دەدا. گـوێی بـۆ خـەڵك رادەگرت. لە نێوان هەزار گری˘ و گۆڵدا هەودای پەیوەندی نێوان خەڵکی دیبووەوە .

دایك دەیبینی رێزو دەسەڵاتی کوڕەکەی پەردەستێنی˘ دەهات لـە مانـا و نـاوەرۆکی کارەکـای تێبگـات. وەك منداڵان کەیف خۆش دەبوو. پاڤێلّ بە تایبەتی ئەو دەمە لە پێش بیرو رای گشتی دا خۆی نواند و نـاوی کـرد کە مەسەلەی مێژویی "کەپێکێك بۆ زەلکاو" هاتە گۆڕێ .

زلکاوێکی گەورە کە داری سەرو و سنۆبەریان تێدا چەقاند بوو وەك خەنـدەکێکی بـۆ گـەن دەوری کارخانـەی دابوو لە هاوین دا بۆ گەنێکی زۆر و شەپۆلی مێشولان بەم گەڕەکەدا بلاو دەبووەوە و نەخۆشی لـەرزو تـای لـە گەڵ خۆ دەهێنا. زەڵکاوی کارخانە بوو. بەرێوەبەری تازەی کارخانە هاتە سەر ئەو باوەرە کە وشکی بکـا و لـە خۆلەمێشی گژ و گیاکەش جۆرە زوو خالێك ساز بکات. بە کرێکارانیش گوت کە وشك بـوونی زەلکـاو دەورەی کارخانە پاك دەکاتەوە و دەبێتە هۆی باش بوونی وەزعی گشتی. بۆ خەرجی ئـەو کـارە ئـەمری کـرد لـە هـەر "رۆبلّ" یّك ((کەپێك)) لە حەق دەستی کرێکاران بگێڕنـەوە, کرێکـاران وروژان چـوونکە ئـەوە حـەقی بەسـەر کرێکارەوە نەبوو .

رۆژی شەمۆ کە بەرێوەبەری کارخانە بریارەکەی راگەیاند پاڤێلّ نەخۆش بوو. نەچووبووە کـاریّ، ئاگـای لـەو مەسەلەیە نەبوو. رۆژی دوایە "سیزۆڤی" ئاسنگەر و ماخۆتین ی قوفلّ ساز کە کابرایەکی بالابەرز و تـووڕە بـو هاتنە لای پاڤێلّ و مەسەلەیان بۆ گێراوە .سیزۆڤ گوتی :ئەو کرێکارانەی تەمەنمان پترە کـۆ بووینـەوە و لـەو بارەوە قسەمان کرد، ئێمەیان ناردە کن تۆ لەبەر ئەوەی پیاوێکی زانا و روناکبیری پرست پیّ بکەین کـە داخـوا بە گوێرەی قانون بەرێوەبەری کارخانە دەتوانیّ بە پارەی ئێمە دژی مێشولان خەبات بکا ؟

ماخۆتین بە ژیری چاوەکانی چووك کردەوە و گوتی: چووار ساڵ لەمەوبەر ئەو دزانە ۳۸۰۰ رۆبـلّ پارەیـان بـۆ دروست کردنی گەرماو کۆ کردەوە ئێستاش گەرماوەکە نییە. پارەکە چی لێهـات؟ پاڤێـلّ گـوتی ئـەو باجـە

زاڵمانەیە. تەنیا کارخانە قازانجی لێدەکا. کرێکارەکان بە روگرژی وەدەرکەوتن، دایك تا بەردەرگا بەڕێی کردن و بە زەردەخەنەیەکەوە بە پاڤێلی گوت :

پاڤێلّ ئێستا پیرە مێردیش دێنە لات و لە تۆوە فێر دەبن . پاڤێلّ بە بێ ئەوەی وەڵامی دایکی بداتەوە بە خەمباری دەستی کرد بە نووسین و پاش تاوێك گوتی : دایە گیان تکا دەکەم خێرا برۆ بۆ شار و ئەونووسراوەش لە گەڵ خۆت بەرە .

دایك پرسی مەترسی تێدا هەیە ؟

- بەڵێ. رۆژنامەکەمان لەوێ بۆ چاپ دەکەن ..زۆر پێویستە مەسەلەی کەپێك لەو رۆژنامەدا چاپ بکرێ .

- باشە ... باشە ........خێرا جلی کردەبەر و ...... ئێستا دەچم ..................

ئەوە یەکەم کار بوو کوڕەکەی پێی دەسپارد. زۆری پێخۆش بوو کە پاڤێلّ مەسەلەکەی بەراستی لە گەڵ باس کردووە. ئەویش دەتوانی یارمەتی بدا. بە کوڕەکەی گوت: دەزانم ئەوەی دەدزن پیاوەکە ناوی چییە ؟ یێگۆر ئیڤانۆڤیچ ؟

شەو دەرنگانێك دایك هاتەوە ماڵێ. ماندوو و هیلاك بوو، بەڵام رازی وبە کەیف بوو، بە کورەکەی گوت : ساشێنکام چاو پێکەوت، سڵاوی لێدەکردی. ئەم یێگۆر ئیڤانۆڤیچەش چەندە کوڕێکی باش و گاڵتە چییە .

پاڤێلّ لە سەرە خۆ گوتی زۆرم پێخۆش بوو کە ئەوانت بە کەیفێ بوو .زۆر ئینسانی سادە و ساکارن. پیاو بە دیتنیان شاد دەبێ.هەموویان رێزت لێدەگرن. رۆژی دووشەمۆش پاڤێلّ سەری دەیەشا و نەیتوانی بچێتە کارێ. بەڵام نیوەڕۆیە فیدیا مازین بە تاڵوکە و هەناسەبڕکە گەیشتێ .خۆی گەیاندە پاڤێلّ و خەبەری دایە : کرێکارانی کارخانە راپەڕین .منیان لە دوی تۆ ناردووە. سیزۆڤ و ماخۆتین دەڵێن تۆ لە هەموو کەس باشتر دەتوانی مەسەلەکە رون بکەیەوە. دەبێ چیبکەن ؟ پاڤێلّ بە بێ دەنگی جلی لەبەر کرد .

ژنەکانیش کۆ بووبوونەوە و دەیانقیژاند. دایك راست بووەوە, منیش دێم. چییان لەوێساز کردووە ؟ منیش دێم!

پاڤێلّ گوتی وەرە .. تۆش وەرە. خێرا بێ ئەوەی قسان بکەن و رێکەوتن. دایك لە بەر هیلاکی هەناسەبڕکەی پێکەوتبوو. هەستی دەکرد کارەساتێکی گرنگ دەقەومێ. لەبەر دەرگای کارخانە کۆمەڵە ژنێك کۆبووبوونەوە هاواریان دەکرد و دەمەتەقەیان بوو. کاتێکی هەر سێکیان بە نهێنی لە دەروازەی کارخانە وەژوور کەوتن, کەوتنە نێو کۆمەڵێکی رەشی گەرم داهاتوی پر هەرا و هوریا .

دایك دیتی هەموو رۆیان لە لای ئاسنگەر خانەیە. لە پەنا دیواری سووری ئاسنگەر خانە سیزۆڤ و ماخۆتین و پێنج پیرە پیاوی تری بە دەسەڵات لە نێو کرێکاران دا راوەستاون و دەست رادەوەشێنن .

یەکێك هاواری کرد. ڤلاسۆڤ هات .

- ڤلاسۆڤ بابێتە ئێرە .

لە پەنایەکەوە دەنگی ڕێبین بەرز بووەوە : بەربەرەکانێمان لەبەر کەپێك نییە. لە پێناوی دادپەروەری دایە، کەپێکی ئێمە لە کەپێکی خەڵکی تر خۆشەویست تر نییە، بەڵام قورسترە. کەپێکی ئێمە لە ڕۆبڵێکی بەرێوەبەری کارخانەی پتر خوێنی مرۆڤی تێدا یە .قسەکانی وەك ڕێژنە بەسەر خەڵکدا دەرژان و هاواری گەرم و بە گوڕی بەرز دەکردنەوە :

- ڕاستە، ڕێبین!

- ئاسنگەر حەقیەتی!

ڤلاسۆڤ هات!

دەنگەکان وەك گێژەڵوکەی بە هێز تەقەتەقی مەکینەکانیان بێ دەنگ دەکرد. لە هەموو لاوە لێك کۆ دەبوونەوە و قسە و باسیان دەست پێ کرد و بە وتاری گەرم و بزوێنەر یەکتریان هان دەدا. ئەو قینەی لە سینگە ماندووەکان دا خەوتبوو وە خەبەر دەهات .دەکەوتە سەر لێوان و بە سەر کەوتوویی هەڵدەرژا . هەورێکی دووکەڵ و تۆز لە سەر سەری خەڵك و یستابوو. ڕومەتەکان بە نارەقە سوور هەڵگەرابوون. پاڤێڵ سەری هەڵدا و دەنگی بەرز بووە. -- هاوڕێیان جارێکی دیکەش دووپاتەی کردەوە. تین و هێزێك لە گەڵ قسەکانی تێکەڵ دەبوو. ئێمە ئەو کەسانەین کە کلیسا و کارخانە دروست دەکەین و زیو دەتوێنینەوە. نەو هێزە زیندووەین کە لە سەر لانکەوە تا لێواری گڵکۆ خەڵك بە خێو دەکەین و دەیانژینین.

ڕاستە ! دەنگی ڕێبین بەرز بووەوە .

ـ ئێمە هەمیشە و لە هەموو شوێنێ بۆ کارکردن لە پێشەوەین بەڵام بۆ ژیان لە ریزی دوواوەین. کێ لە خەمی ئێمە دایە؟ کێ خێر و خۆشی ئێمەی دەوێ ؟ کێ بە مرۆمان دەزانی ؟ هیچ کەس. یەکێك هاواری کرد و قسەکەی دووپاتە کردەوە: هیچ کەس .

پاڤێڵ هاتەوە سەرخۆ و هێمن و بە زمانێکی سادە دەستی پێکردەوە. خەڵکەکە وەك لە شێکی بۆری هەزار سەر دەبزوتن و بۆ لای دەچوون و چاویان لێدەکرد . دایك بەسەد چاو تەماشای دەکرد و قسەکانی سەر خۆشیان کردبوو .

ـ ئێمە ژیانمان باشتر نابێ. تا ئەو دەمەی خۆمان بە هاورێی یەك نەزانین. خۆمان بە یەك ماڵ و هاودەرد نەزانین، تا بە یەکەوە تێکرا بۆ مافی خۆمان خەبات نەکەین .یەکێك لە پەنا دایکەوە هاواری کرد: باسی وەزعەکە بکە!

لە دوو لاوەهاواریان کرد: قسەکانی پێ مەبڕن .بێ باوەڕییەك لە روومەتە بزرکاو و رەش هەڵگەراوەکانیان دا دەبینرا. دەیان کەس بە وردی گوێیان بۆ قسەکانی پاڤێل راگرتبوو، چاویان تێ بڕیبوو.

یەکێك هاواری کرد: سۆسیالیستە. بێ عەقڵ نییە .

یەکێکی تر: شۆڕشگێڕە . کرێکارێکی باڵابەرزی خێل شانی دایکی راوەشاند و گوتی :

- چەند ئازایانە قسە دەکا .

- هاوڕێیان کاتی ئەوە هاتووە کە تێبگەین بێجگە لە خۆمان هیچ کەسی تر یارمەتیمان نادا. یەکێك بۆ هەمووان و هەمووان بۆ یەکێك، ئەوە قانون و بڕوای ئێمەیە . ئەگەر بمانەوێ دوژمن تێك بشکێنین دەبێ بڕوامان بەو قانونە هەبێ. ماخۆتین مستی خۆی بەرزکردەوە و هاواری کرد: برایان ئەوەی دەیڵێ راستە و گوێ بدەنە راستی. پاڤێڵ قسەکانی درێژە پێدا: پێویستە بەرێوەبەر بانگ کەین بێتە ئێرە. ئەم قسە وەك رنوبەسەر خەڵك دا هات و بە جارێك دەیان کەس تێکرا هاواریان کرد :

- بەرێوەبەر بێ. نوێنەری‌لەدوو بنێرن .

دایك خۆی گەیاندە ریزی پێشەوە و بە سەربەرزی و شانازی تەماشای کوڕەکەی دەکرد. پاڤێل لە نێو کرێکارە پیر و بەڕێزەکاندا راوەستا بوو. هەموو گوێیان بۆ راگرتبوو بە قسەیان دەکرد. پێلاگێیا زۆری پێ خۆش بوو کە پاڤێل وەك ئەوانی تر ناقیژێنی و جنێو نادا .

هەر وەك تەرزە بە سەر بانێکی تەنەکەدا بباری ئاوا جنێو و قسەی سوك و دەنگی تووڕەیی و بێزاری دەباری. پاڤێل هەر وەك لە کەسێك بگەڕێ چاوەکانی کردبووەوە و تەماشای کۆمەڵی دەکرد .

- نوێنەرەکان!

- سیزوڤ!

- ڤلاسۆڤ!

- رێبین! ددانی زۆر شاشن.

یەکێك لە نێو کۆمەڵەکەدا هاواری کرد : ئەوەتا بۆ خۆی دێ .

- بەرێوەبەر!

خەڵك درِی دا و رێگای بۆ کابرایەکی باڵابەرز و رەق و تەق کردەوە کە ریشێکی درێژیشی هەبوو . رێگا بەدەن ئەوەی گوت و بێ ئەوەی خۆ لە کرێکاران بدا بە دەست راوەشاندەن بە نێو کرێکاراندا تێپەڕی و وەك فەرمانڕەوایەکی بە تەجرەبە چاوی لە کرێکاران دەکرد.

ئەوانیش کلاویان بۆ دادەگرت و سەریان بۆ دادەنواند بیّ ئەوەی وەلامی سلاویان بداتەوە. بیّ دەنگی بە سەر خەلکدا زال بوو لە بزەی بیّ جیّ و سەردانەواندنیان دیار بوو کە وەك مندالیّکی هار و هاجی کردبیّ، لە کردەوەی خۆیان پەشیمان بوونەوە.

بە پیّش دایکدا تیّپەری و مۆرەیەکی لیّکرد و چو لە بن تۆپەلە ئاسنیّك راوەستا: لە سەرەوەرا یەکیّك دەستی دریّژ کرد کە وەسەری بخا، ئەو دەستی نەدایە و بە چالاکی سەرکەوت و لە ریزی پیّشەوە لە پیّش پاڤیّلّ و سیزۆڤ راوەستا و پرسی: ئەم کۆبوونەوە چییە و بۆ چی دەستیان لە کار هەلگرتووە ؟

چەند سانییە هەموو بیّ دەنگ بوون. سەری کریّکاران راست وەك گولە گەنم دەجولاوە. سیزۆڤ کلاوەکەی راوەشاند و شانی هەلتەکاندن و سەری بەردایەوە ..........

بەریّوەبەر هاواری کرد. من پرسیار دەکەم، وەلام بدەنەوە. پاڤیّلّ هاتە پیّشیّ و چاویّکی لە ریّبین و سیزۆڤ کرد و بە دەنگیّکی بەرز گوتی : ئیّمە سیّ کەس لە لایەن هاوریّیانەوە کراوین بە نویّنەر کە داوات لیّبکەین بریاری خۆت لە بارەی کەم کردنەوەی کە پیّك لە کریّکاران وەربگریەوە .

بەریّوەبەر بیّ ئەوەی چاو لە پاڤیّلّ بکا پرسی لە بەرچی ؟

پاڤیّلّ بە دەنگیّکی نیّرانە وەلامی داوە : لەبەر ئەوەی ئیّمە ئەو باجە بە زالمانە دەزانین .

- کەوابوو پیّتان وایە مەبەستی من چەوساندنەوەی کریّکارانە نەك باش کردنی وەزعی ئەوان. وانییە؟

بەلیّ پیّمان وایە ؟ بەریّوەبەر روی کردە ریّبین و گوتی: تۆش پیاوی باش؟

بەلیّ. منیش داوات لیّدەکەم دەست لە و پیّکانە هەلبگری. ئەوەی گوت و سەر لە نویّ بزەیەکی هاتیّ و سەری بەرداوە .

بەریّوەبەر بە کاوەخۆ سەیریّکی خەلکەکەی کرد و شانیّکی هەلتەکاند و چاویّکی لە قەد و بالای پاڤیّلّ کرد و گوتی: لام وایە تۆ تارادەیك خویّندەواریت هەیە ،چۆن لە قازانجی ئەم بریارە تیّناگەی؟ پاڤیّلّ بە لیّبراوی وەلامی داوە : ئەگەرکارخانە بە خەرجی خۆی زەلکاوی وشك کربایە هەمو لە قازانجی ئەو کارە تیّدەگەیشتن. بەریّوەبەر گوتی: کارخانە کاری ئەوع پەرستانە ناکا. فەرمان دەدەم هەمووتان بچنەوە سەرکار. پاشان بیّ ئەوەی تەماشای کەس بکا لە کاتیّکدا پەنجەی پیّلاوەکانی بە حاستەم لە ئاسن دەدا هاتەوە خواریّ .

هەللاو بگر لە توورەیی و بیّزاری ساز بوو . بەریّوەبەرراوەستا و پرسی: یانی چی ؟

هەموو بیّ دەنگ بوون. دەنگیّك لە دوورەوە بەرزبووەوە: خۆت کاربکە .

بەرێوەبەر بە دەنگێکی رەق گوتی: ئەگەر تا چارەگە سەعاتێکی تر نەچنەوە سەر کار, ئەمردەکەم هەمووتان سزا بدەن.

ئەوەی گوت و بە نێو کۆمەڵدا گەڕایەوە. بە دووای ئەودا دەنگە دەنگ پەیدا بوو. هەتا دوورتر دەکەوتەوە دەنگەکان توندتر دەبوون .

- بچن قسەی لە گەڵ بکەن!

- ئەوەتا حەقمانە ئاخ لەو شانسە .

رویان دەکردە پاڤێل ودەیانگوت: باشە، حقوقزان، ئێستا چ بکەین ؟

قسەت کرد، تۆ قسەت کرد بەڵام ئەو هات و هەمووی چودوەپاش . باشە ڤلاسۆڤ چار چییە ؟

کاتێك هەرا و هوریاکە زیاتر بوو پاڤێل وەدەنگ هات :

هاوڕێیان من پێشنیار دەکەم هەموو دەست لە کار هەڵبگرین تا بەرێوەبەر دەست لە کەم کردنەوەی کەپێك هەڵدەگرێ .

- هێندێ بە توورەیی بەرز بوونەوە :

ئەحمەقی دیتووەتەوە

- مانگرتن ؟

- هەربۆ کەپێك ؟

- ئەدی چی ؟ بەڵێ .......... مانگرتن .

هەمووان دەردەکەن!

- کێ کار دەکا ؟

کرێکاری تر پەیدا دەکەن!

- کرێکاری خائین!

## (١٣)

پاڤێل هاتە خوارێ و لە پەنا دارێکی راوەستا. هەموو پۆل پۆل لێك کۆبوونەوە و دەمەتەقە و هەرا و هۆریا دەست پێکرا. رێبین لە پاڤێل وەنزیك کەوت و گوتی : مان ناگرن خەڵك هەر چەند بە تەماعە, بەڵام ترسەنۆکە, رەنگە سێ سەد کەس لەگەڵ تۆ هاوبیر بن و لایەنت بگرن. پتر نا. ئەو کۆمەڵە گەورە تەنیا بە چەند کەس وەکار ناکەوێ. پاڤێل بێ دەنگ بوو. خەڵك بە پێشی دا دەهاتن و چاویان لێ دەکرد، هەر وەك داوای

شتێکی لێبکەن. دڵی توند لێی دەدا. وای دەهاتە بەرچاو کە قسەکانی هەر وەك دڵۆپە بارانێك کە بەسەر زەوییەکی وشك و قەڵشی قەڵشدا بباریێ، بێ ئەوەی کاریان کردبێتە سەرخەلك، بە خێرایی چوون. کرێکاران یەك لە دووای یەك لێی وەنزیك دەکەوتن و بە بۆنەی وتارەکەیەوە پیروزباییان لێدەکرد، بەڵام شکیان لەوەدا هەبوو کە مانگرتن سەرکەویێ. سکاڵایان لەوە هەبوو کە میللەت هێشتا قازانج و زیانی خۆی لێك ناکاتەوە. پاڤێل بە هیلاکی و خەمبارییەوە بۆ ماڵێ گەڕایەوە. دووابەدووای ئەو سیزۆڤ و دایکیشی چوونەوە. رێبین لە تەنیشتی دەرۆیشت و گوتی :

تۆ باش قسە دەکەی بەڵام ناچیە نێو دڵەوە ............ ئاوایە دەبێ ئیشك بخەیە ناخی دەرونەوە. بە عەقڵ دەتوانی خەلك رابکێشی. ئەم پێڵاوە بۆ لاقی میللەت تەنگە !

سیزۆڤ بە دایکی گوت:

کاتی ئەوە هاتووە ئێمە پیرەکان بچینەگۆڕستان. بەرەی تازە دەست پێدەکا, ئێمە چۆن ژیاوین ؟ لە سەر ئەژنۆیان خزیوین و هەمیشە کڕنۆشمان بردووە و بۆ لای زەوی خوار بووینەوە. ئێستاش دیار نییە کە خەلك وەخەبەر هاتووە یان لە ئێمە پتر بە هەڵە دەچن، هەرچی بێ لە ئێمە ناچن. ئێستا لاوەکان دەستیان پێ کردووە؟ جۆرێك لە گەڵ بەریوەبەر قسە دەکەن هەر وەك لە گەڵ خێزانی خۆیان بدوێن .

خوا حافیز پاڤێل میخائیلۆڤیچ، تۆ کوڕێکی باشی, دیفاع لە کۆمەڵانی گەل دەکەی .......

خوا پشتیوانت بێ رێگا و رۆژنەیەك پەیدا دەکەی, بە تەمای خوای نیتر رۆیشت .

رێبین بە سرتە گوتی: باشترە بمرن, ئێوە پیاو نین, بۆ قەڵشی دیواریباشن.... پاڤێل دیتت ئەوانە لە هەمووان زیاتر هاواریان بوو کە تۆ بە نوێنەر دیاری بکرێی, هەر ئەوانیش بوون دەیانگوت تۆ شۆڕشگێڕ و ئاژاوەچی ......... بەڵێ هەر ئەوان ............

فکریان کردووتەوە کە لە کارخانەت دەرکەن. هەر ئەوەشیان دەویست.

پاڤێل گوتی: ئەوان سەبارەت بە خۆیان حەقیانە .

- گورگیش کە یەکتر هەڵدەدڕن حەقیانە!

رێبین دەنگی گیرابوو, هەموو لەشی دەرزی.

خەلك بروا بە قسەی راست ورەوان ناکەن. دەبێ ئازار بدرێن و قسەکان بە خوێن بشۆرێنەوە .

پاڤێل بە تەواوی رۆژ نارەحەت و گرژ و پەشۆکاو بوو. چاوی سوور هەڵگەڕا بوون. دایك هەستی پێکرد بوو لە سەر خۆ لێی پرسی : پاڤێل گیان ئەوە چیتە ؟

پاڤێل بە ماتی وەڵامی داوە: سەرم ژان دەکا .

راکشێ ........... من دوکتوری بانگ دەکەم . پاڤێلۆ چاوێکی لێکرد و بە گورجی وەڵامی داوە : نا ........ پێویست ناکا.

پاشان لەبەر خۆیەوە گوتی : هێشتا منداڵ و بێ دەسەڵاتم. ئەوە دیتم بروایان پێ نەکردم وەدووای من نەکەوتن. وا دەردەکەوێ نەمزانیوە قسەیان لە گەڵ بکەم. ئەوە بۆ من باشنەبوو سکم بۆ خۆم دەسوتی

دایک تەماشای دەم و چاوی گرژی کوڕەکەی کرد. دەیویست دڵخۆشی بداتەوە، بە نەرمی گوتی : تۆ سەبر بکە ئەمرۆ تێ نەگەیشتن بەیانی تێدەگەن ... پاڤێلۆ گوتی: ناچارن تێبگەن

بزانە! ئێستا منیش لەو راستییەی تێدەگەم .............

پاڤێلۆ لێی وەنزیک کەوت :

- تۆ دایە گیان .. ئینسانێکی باشی :.

دایکی روی لێوەرگێڕا. دەلەرزی هەروەك بیپەرستێ بە قسەی نەرم و خۆش دەستی لە سەر دڵی دانا و رۆیشت

.

شەوێ کاتێك دایك لە پرخەی خەودا بوو پاڤێلیش لە سەر تەختەکەی راکشابو کتێبی دەخوێندەوە. ژاندارمەیان لێ وەژوور کەوتن و بە تووڕەیی دەستیان کرد بە گەڕان و هەموو کەلێن و قوژبنیان پشکنی. ئەفسەرە زەردەڵەکە هەر وەك جاری هەوەڵێ دەستی کرد بە گاڵتە و قسەی سوك. بەوە دلخۆش بوو کە دڵی دایك و پاڤێلی ئازار دەدا.

پێلاگێیا لە سیلەیەك هەڵترو شکابوو تەماشای کوڕەکەی دەکرد. پاڤێلۆ هەوڵی دەدا کە نیگەرانی و نارەحەتی خۆی بشارێتەوە, بەڵام کە ئەفسەر پێدەکەنی قامکەکانی پاڤێلۆ زۆر سەیر دەلەرزین. دایك هەستی دەکرد کە وەڵام نەدانەوەی ژاندارم بۆ کوڕەکەی دژوارەو تەوس و لاتاوی ئەوان بەزەحمەت قبولٚ دەکا. دایك لە چاو جاری پێشو کەمتر دەترسا. بەڵام لە ناست میوانە بانك نەکراوەکانی شەوێ کە بە جلی بۆر و تەقەتەقی مامزەوە لێی وەژوور کەوتبوون، قین و بێزاری پتر دەبوو. ئەو قین و تووڕەییە ترسەکەی کەم دەکردەوە . پاڤێلۆ توانی بە سرتە بە دایکی بڵێ:

من لەگەڵ خۆیان دەبەن .

دایك سەری ئەوی کرد و بە سرتە گوتی : دەزانم ..........

ئەو دەیزانی بە تاوانی ئەو قسانەی بۆ کرێکارانی کردبوو حەپسی دەکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو دەنگیان بۆ قسەکانی داوە و هەموو دەبێ پشتیوانی لێبکەن, دیارە زۆر لە بەندیخانە دا نامێنێتەوە .

دایك دەیویست لە ئامێزی بگرێ و بگرییێ، بەڵام ئەفسەرەکە لە پەنای راوەستا بوو بە چاوێکی ناحەزانە چاوی لێدەکرد. پێی وابوو ئەو کابرایە چاوەڕوانی پاڕانەوە و فرمێسکەکانی ئەوە. هەموو هێز و توانای خۆی کۆ کردەوە, هەوڵی دەدا کەم قسە بکا.

دەستی کوڕەکەی گوشی و پشوی خواردەوە و لە سەرەخۆ گوتی : پاڤێلێ بە خێر چی ........ هەموو شتی پێویستت بردووە ؟

ـ بەڵێ نارەحەت مەبە .

ـ خوات لە گەڵ بێ ........................

کاتێك کوڕەکەیان برد بۆ خۆی لە سەر قەرەوێڵەکە لێکەوت و هەناسەیەکی هەڵکێشا و چاوەکانی لە سەر یەك دانا و سەبرۆکە نوزەی دەهات. مێردەکەی چۆنی پاڵ دەداوە, ئەویش هەستا وا پاڵی وەدیواری دا. لە کاتێکدا لەبەر خەم و خەفەت و بێ هێزی ئازاری دەکێشا، دەگریا و ژانی دڵە خوێناوییەکەی بە فرمێسکی چاوان دەشوشتەوە. قەڵافەتێکی زەردی دەهاتە بەر چاو کە راوەستاوە و لە حاڵێکی خۆشدا بە سمێڵی باریکەوە برژانگان لێك دەدا. قین و بێزاری لەو کەسانەی کوڕ لە دایك دەستێنن هەر بەو تاوانە کە قسەی حەقی کردووە وەك گلۆڵەی رەش لە سینگی دا لیك دەهاڵا.

هەوای سارد بوو. باران وە شووشەکان دەکەوت. وای دەهاتە بەر چاوی کە بە شەو بە دەروری ماڵەکەی قەڵافەتی بۆری دەم و چاو سووری بسك درێژ هاتوچوو دەکەن و دەنگی مامزەکانیان دێ .

ـ خۆزگە منیشیان دەبرد. لە دڵی خۆیدا دەیگوت. ئاژێر دەنگی هات. دەبوو خەڵك بچنە سەر کار. ئەمرۆ دەنگی ئاژێر هێدی بوو. دەرگا کرایەوە و رێبین وەژوور کەوت، لە کاتێکدا تەڕایی بارانی لە ریشی دەسڕییەوە پرسی :

- بردیان ؟

هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: بردیان لەعنەتیان لێ بێ .بزەیەکی هاتێ و گوتی: کاروایە. زۆر سەیرە! گیرفانەکانم گەڕان, هەموو جێیەکیان پشکنی .......... جنێویان دامێ ........ بەڵام نەیانگرتم. کەوابوو پاڤێلیان برد! بەرێوە بەر ئیشارەی کرد و ژاندارم تێ بەربوون و مرۆڤێك نەما. ئەوان پێکەوە یەکن. یەکیان میللەت دەدۆشێ و ئەوی دیکەشیان شاخی دەگرێ .

دایك هەستا سەرپێ و گوتی :

دەبوو ئێوە پشتیوانی لە پاڤێلێ بکەن. ئاخر ئەو لە بەر خاتری ئێوە خۆی لە مەترسی هاویشت.

ـ کێ دەبوو پشتیوانی لێبکا؟ـ ئێوە.... هەمووتان!

پێت وایە ؟ نا ....... شتی وانابێ. بە زەردەخەنەیەکەوە ئەمەی گوت و بە شێوە ڕۆیشتنی خۆیلێی دا ڕۆیشت و بەم قسە کاڵ و ناهومێدانە خەم و پەژارەی دایکی پتر کرد.

"ڕەنگە ئازاری بدەن و بتکوژن" ...... دایك لە دڵی خۆیدا گوتی."

لەشی پاڤێلی بە داخکراوی و ئەنجنراوی دەهاتە بەرچاو. لە ترسان دەستە ساردەکانی وەك تۆپەڵە بەفرێك لە سەر دڵی دانا. چاوەکانی ژانیان دەکرد. سۆبەی هەڵ نەکرد. نانی نەخوارد و چای نەخواردەوە. کاتێك ڕاکشا بەخۆی گوت: لە تەواوی ژیانی دا هەرگیز ئەوەندە خەفەتبار و لێ قەوماو و تەك و تەنیا نەبووە. لەم ساڵانەی دواییدا ڕاهاتووە کە هەمیشە چاوەڕوانیشتێکی گرنگ بێ کە بەختەوەری تێدا بێ. لە دەوروبەری خۆی لاوی بزۆز و ئازای دەدیتن کە کوڕەکەی کە ئەم ژیانە نائارامەی پێك هێنابوو , بە قەد و باڵایەکی پیاوانە سەرۆکیان بوو. ئێستا کە کوڕەکەی لانەماوە ئیتر ژیانیش بۆ ئەو نەماوە .

## (١٤)

ڕۆژبە شێنەیی و شەو بە بێ خەو تێپەڕین. ڕۆژی دوایییش لە بەر چاوی درێژتر بوو .

دیار نەبوو چاوەڕوانی کێیە, بەڵام ڕۆژئاوا بوو کەس نەهات. بارانێکی سارد وەدیوارەکان دەکەوت. با خۆی لە لولەی سۆبەی دەکرد. دەنگی خەفەتباری دڵۆپە بارانەکان کە وەك فرمێسك دەکەوتنە سەربانی هەوایان پڕ دەکرد. وا دەهاتە بەر چاو کە ماڵەکەی هەموو دەلەرزی و خەمێك دەوروبەری کردووەتە بە ستەڵەك .

یەکێك بە ئەسپایی لە پەنجەرەی دا. دایك بەو شێوە لە پەنجەرە دانە ڕاهاتبوو, نەدەترسا هەر وەك ئامپولێکی شادی لێبدەن جینگڵی دا, بە هومێدێکی نادیارەوە لە جێگا ڕاپەڕی, دەسماڵێکی بەسەر دا دا و دەرگای کردەوە .........

سامۆیلۆڤ لە حاڵێکدا کە سەری بردبووە نێو یەخەی هەڵدراوەوەی پاڵتۆکەیەوە و کلاوەکەشی تاسەر برۆیان داکێشا بوو, لە گەڵ یەکی تر وەژوورکەوت .

بێ ئەوەی سڵاو بکا گوتی: لە خەویشمان کردی ؟ بە پێچەوانەی جاران خەمبار دەهاتە بەرچاو.

- نا. خەوم لێنەکەوتبوو. پاشان وەك بییەوێ پرسیارێکی لێبکا چاوی تێبڕی. هاوڕێکەی سامۆیلۆڤ هەناسەیەکی هەڵکێشا و کلاوەکەی داگرت و دەستی پان و قامکە ئەستورەکانی بۆ لای دایك درێژ کرد. هەر دەتگوت توشی کۆنە ئاشنایەك بووە. دۆستانە پێی گوت: دایە گیان ئێوارە باش. تۆ من ناناسیەوە ؟

دایك لە خۆشیان هاواری کرد: ئەوە تۆی یێگۆر ئیڤانۆڤیچ! سەیرە !

سەرە زلەکەی دانەواند و گوتی: بەڵێ منم .

زەردەخەنەیەك دەم و چاوە خڕەکەی ڕون دەکردەوە. چاوە شینە بچــکۆلەکای بــە شــێوەی دڵدانــەوە لــە دایــك بریبوون. بەژن و باڵای کورت و قەڵەو و ملی ئەستور و باسکی قوڵەی هەر دەتگوت سەماوەرە دەنگی هەناسەی دەهات و دیار نەبوو چییە. هەمیشە لە سینگی دا خرپەی دێ. بچنە ژووری. من ئێستا جلەکانم دەگۆڕم و دێـم .

سامۆیلۆڤ لە بنەوە چاوێکی لێکرد و گوتی: پێویستە شتێکت پێ بڵێین

یێگور چووە ژوورەکەی تر و گوتی :

- دایە گیان نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ ئەمرۆ بەیانی لە بەندیخانە هاتووەتە دەرێ کە زۆر باشی دەناسی. سێ مانگ و یازدە ڕۆژلە زیندان بووە. پاڤێلێ و ئەندرێی دیوە. سڵاویان بۆ تۆ ناردووە بە تایبەتی پاڤێلێ تکـای لــە تــۆ کردووە کە نیگەران نەبی. لەو ڕێگایەدا کە ئەو گرتویەتە بەر بەندیخانە جێگای حەسانەوەیە. ئەوە بڕیـاری کـار بە دەستانی دەوڵەتە . با بۆت بگێڕمەوە .

دەزانی دوێنێ چەند کەس گیراون ؟

- نا، کەوابوو پاڤێلێ تەنیا نییە ؟

یێگۆر بە هێدی قسـەکەی پێ بڕی: چل و نۆهەمە. چاوەڕوانی ئەوەن کە یازدە کەسی دیکـەش بگـرن. یــەکیان ئەم کاکەیە. سامۆیلۆڤ بە پەشۆکاوی گوتی: کەوابوو منیش .

پێلاگێیا هەستی کرد کە هاسانتر دەتوانیٚ هەناسە هەڵکێشیٚ لە دڵی خۆیدا گوتی :

- باشە لەوێ بە تەنیا نییە .

کاتێك جلەکانی گۆڕی و چووە ژووریٚ, نازایانە لە گەڵ میوانەکان پێکەنی .

- ئەگەر زۆر بن بێ گومان ماوەیەکی زۆریان ڕاناگرن .

یێگۆر ئیڤانۆڤیچ گوتی: ڕاستە بەڵام ئەگەربتوانین نەخشەی دوژمنەکانمان تێك بدەین لەوە زیـاتر ســەرناکەون. مەسـەلەکە ئاوایە، ئەگەرئێستا بڵاو کردنەوەی نووسراوەکانمان لە کارخانە کۆتایی پێ بـێ ژاندارمــەکان هەسـت دەکەن کە ئەو کارە تەنیا خـەتای پاڤێـڵ و هاوبەندییــەکانی بــووە .دایــك بــە ترســەوە هــاواری کـرد: چــۆن ؟......... بۆ چی ؟.........

- زۆر بە هاسانی ؟ بە ئەسپایی ئیڤانۆڤیچ گوتی: هێندێ جاربەڵگەی ژاندارمەکان ڕاستە. تۆ بیری لێبکــەوە کاتێك پاڤێلێ لە دەرێ بوو نووسراو و بەیاننامە بڵاو دەکرانەوە, کاتێك پاڤێلێ نییە و لە زیندانە بەیاننامە و نوسراوەش وشکاویان دێ! کەوابوو ئەوە مانای وایە ئەو بەیاننامە و نووسراوانە ئەو بڵاوی کردوونــەوە. ئــەودەم ژاندارمە خەریك دەبن هەمووان لە بەین بەرن. ژاندارمە زۆریان پێخۆشە خەڵك لەت و پەت کەن .

دایك به خەمباریەوە گوتی: تێگەیشتم ..... حاڵی بووم. ئەی خوایە .......... باشە .......... چار چییە ؟ چیبکەین ؟ سامۆیلۆڤ لەچێشتخانەوە هاواری کرد : بەتون چن! زۆربەی هاورێکانیان گرتووە دەبێ. وەك پێشوو درێژە بە كار بدەین نەك هەر بۆ پێش خستنی مەرام، بەڵكو بۆ ئازادی هاورێیان .

پێگۆر بزەیەكی هاتێ و گوتی : بەڵام كەسمان بۆ كار كردن نەماوە! بە یاننامەی باشمان هەن ... خۆم ئامادەم كردوون. بەڵام چۆن بیانبەینە نێو كارخانە، رێگا شك نابەم .

سامۆیلۆڤ گوتی: ئێستا كاتی چوونە ژووریَ، باخەڵی هەموو كەس دەگەرێن. دایك هەستی كرد كە شتێكیان لێدەویَ بە پەلە گوتی : باشە چارچییە ؟ ....... چیبکەین ؟

سامۆیلۆڤ لە دەرگا راوەستابوو گوتی : پێلاگێیا نیلۆڤنا تۆ "كۆرسونۆڤا" ی چێشت فرۆش دەناسی ؟

- بەڵێ دەیناسم . بچۆ بیدوێنە بەڵكو وەنەستۆی خۆی بگریَ بەیاننامەكانمان بۆ بەریتە ژووریَ .ئاخ ...... نا پیرێژنێكی بە قسە و باسە نا . چۆن دەبێ باسی ئەوەی لە من بزانیَ ؟ نابێ .... نا !

پاشان لە پڕ فكرێكی بە دڵداهات و بە شادییەوە گوتی : بە منیان دەن ....... بیاندەن بە من ....... رێگایەك دەدۆزمەوە تكا لە ماریا دەكەم بمكاتە بەردەستی خۆی. من پیر بووم ئەگەر بمەویَ بژیم و نان بخۆم دەبێ كاریش بكەم. من نان بۆ كرێكاران دەبەمە كارخانە. من خۆم جێبەجێی دەكەم .

دەستەكانی لە سەر سینگی دانا و بڕوای بەوە هەبوو كە بەباشی ئەنجامی دەدا. بە شادی و بە دەنگێكی سەركەوتوانە گوتی : ئەوان دەبینن كە پاڤێلْ لێرە نییە بەڵام دەستی دەیانگاتیَ، دەبینن .

هەرسێك گەشانەوە، پێگۆر توند دەستەكانی گوشی و گوتی : دایە گیا ن هەر بژی. ئەگەر بزانی كارێكی چەندە باشە. بەراستی خۆشە. سامۆیلۆڤ بە پێكەنینەوە گوتی :

- ئەگەر لەو كارەدا سەركەوی، من لە بەندیخانەدا ئەوەندە شاد دەبم هەر وەك لە سەر تەختی دانیشتبم .

پێگۆر بە خۆشییەوە هاواری كرد: ئای چەند دایكی چاكی !دایك بزەی هاتی. لێی رون بوو ئەگەر سەركەویَ و بتوانیَ بەیاننامەكان بەرێتە نێو كارخانە، دڵنیا دەبن كە پاڤێلْ بڵاوی نەكردوونەوە. چونكە پێی وابوو دەتوانیَ ئەو كارە بكا لە خۆشیان دەلەرزی .

پێگور گوتی: كاتێك دەچی چاوت بە پاڤێلْ بكەویَ. پێی بڵێ دایكێكی باشی هەیە!

سامۆیلۆڤ بە پێكەنینەوە بەلێنی دا كە زووتر دەیبینم!

تۆ ئەوەشی پیَ بڵێ من هەرچی پێویست بیَ دەیكەم! با ئەوەی بزانیَ! دایك چاوێكی لە سامۆیلۆڤ كرد و بە پێگۆری گوت ئەگەر نەیانگرت ؟

- باشە چارچییە .

هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین. دایك کە هەستی بە هەڵەی خۆی کرد, وەك ئـەوانی دیکـە پێکـەنی, بـەڵام تۆزێك بە خۆیدا شکایەوە. چاوەکانی بەرداوە و گوتی : کاتێك مرۆ هەست و هۆشـی هـەر لای کـەس و کـاری نزیکی خۆیەتی, خەڵکی دیکە باش نابینیٚ .

بێگۆر گوتی راستە. لە بارەی پاڤێلەوە نیگەران مەبە, خەمی مەخۆ. باشتر لە جاران لە زینـدان دێتـە دەر. پیاو لە وێدا دەحەسێتەوە و شت فێر دەبیٚ. ئێمە لە کاتی ئازادیدا ئەو کارانەمان بۆ ناکریٚ. سیٚ جـاران زۆر بـە ناخۆشی گیرام بەڵام هەموو جاریٚ بۆ عەقڵ و دڵم سودی هەبووە .

دایك بە دڵسۆزییەوە چاوێکی لێکرد و گوتی: بە زەحمەت هەناسە هەڵدەکێشی ؟

قامکی هەڵهێناوە و گوتی: ئەوەش هۆیەکی خۆی هەیە ئاوا, کەوابوو دایە گیان بڕیا ردرا .......

بەیانی شتەکانت بۆ دێنین و ئەو چەرخەی کە تاریکایی تەمەن ناهێڵیٚ دیسان وەگەڕ دەکەوێتەوە. بژی ئـازادی وتارو دەربڕین, بژی دڵی دایك, جاریٚ بە خۆشی ..... تا یەکتر دەبینینەوە !

سامۆیلۆڤ بە گەرمی دەستی دایکی گوشی و گوتی : جاریٚ بە خۆشی! من ناتوانم لـە بـارەی ئـەو مەسـەلانە وشەیەکیش لە گەڵ دایکم باس بکەم.

دایك بۆ ئەوەی پێی خۆش بیٚ گوتی: ئاخرەکەی هەموو تێدەگەن .

کە ئەوان رۆیشتن دایك دەرگای داخست. لە نێوە راستی هۆدەکەی چۆکی دادا. لە گەڵ دەنگـی بـاران دەسـتی کرد بە پاڕانەوە و دووعا. وەك فکرێکی گرنگی هەبیٚ بۆ تەواوی ئەو کەسانە پاڕایەوە کە پاڤێل هێنابوونییـە نێو ژیانی ئەو. ئەوانی دەهاتە بەرچاو کە چۆن بە نێوان ئەو وێنە پیرۆزەکاندا تێپەڕ دەبن و زۆر سادە و سـاکارن, لێك نزیکن، بەڵام بیٚ کەس و تاك و تەنیان .

بەیانی زوو چووە لای ماریا کۆرسونوڤا .

ئەو ژنە زۆربلێیە بە جلی چلکن و چەورەوە بە دڵسۆزی پێشوازی لێکرد .دەستێکی چەوری لە شانی دایکـدا و پرسی : گرتیان و بردیان ؟ باشە .بە غیرەت بە، هیلاك دەبی. گرنگ نییـە, جـاران خـەڵکیان بـە تـاوانی دزی دەگرت ئێستا لە سەر قسەی حەق دەیانگرن. رەنگە پاڤێل قسەی ئەوتۆی کردبیٚ کە نەدەبو بیکـا. بـەڵام بـۆ پارێزگاری هاوڕێیانی کردووە. هەموو کەس ئەوەی دەزانیٚ.مە ترسە ئەگـەر ئەشـیلێن دەزانـن کـوڕێکی باشـە. خەریك بووم بێمە ماڵیٚ سەرت بدەم بەڵام پێم نەکرا ....... بیٚ حەسانەوە چێشت لێدەنێم و خۆم دەتوێنمـەوە، لە سەر ئەو حاڵەشەوە بیٚ گومان لە برسان و لە بەر نەداری دەمـرم. فاسـقە نالـەبارەکان مـاڵ وێـرانم دەکـەن, دەخۆن و دەخۆن هەروەك رەشە ولاخ وەبەر دەدەن, هەر کە دە رۆبلم کۆکردەوە یەکێك لەو کافرانە دیٚ و دەستی

پێدا دێنیّ ...... هەر وایە, ژنیەتی شتێکی خراپە، ژیانێکی لەعنەتییە. ژیانی بە تەنیایی زۆر دژوارە بەڵام دووکەسی لەویش دژوارتر پێلاگێیا ئەم دەم هەراشەی بیّ دەنگ کردو گوتی:

هاتوومەلات تکات لێبکەم بمکەیە بەردەستی خۆت.

ماریا پرسی: چۆن ؟ پاشان کە گوێی بۆ قسەی دەستە خوشکەکەی راگرت تا تەواوی کرد بە نیشانەی رازی بوون سەری لەقاند و گوتی :

- بەتەواوی ئامادەم. لە بیرتە کاتێکی مێردەکەم راوی دەنام تۆ پەنات دەدام. ئێستا نۆرەی منەکە لە فەقیریدا پەنات بدەم و ئاگاداریت بکەم. ئێستا ئەرکی هەموانە کە یارمەتیت بدەن. چوونکە کوڕەکەت لە سەر کارێکی ئەو تۆ گیراوە کە پەیوەندی بە هەموانەوە هەیە . کوڕێکی باشە. هەموو دەڵێن دڵسۆزی هەموو کەسە. من لە سەرئەو باوەڕەم ئەم گرتنە دووارۆژێکی باشی بۆ کارخانە نابیّ. بزانە لەویّ چ باسە. قسەی سەیری لیّ دەکریّ. سەرۆکەکانی لایان وایە ئەگەر لاقی کەسێکیان گرت ئیتر کار تەواوە لە کاتێکدا ئەگەر دەکەس بگیرێن سەد کەسی تر توورە و بێزار دەبن. کەسێك بیەویّ دەست لە کۆمەڵ بدا دەبیّ ئاگای لە خۆ بیّ .کۆمەڵ ماوەیەکی زۆر خۆڕادەگریّ و قبوڵ دەکا. بەڵام پاشان رۆژێك دەتەقێتەوە.

هەر دوو ژن لە سەر ئەوە رێك کەوتن کە لە بەیانییەوە, دایك لە نیوە ڕۆدا دوودیزە شۆربا کە ماریا لێی دەنان بیانباتە کارخانە. ئیتر ماریا چووە بازاری.

## (١٥)

کرێکاران لە پڕ شوربا فروشێکی تازەیان چاو پیّ کەوت. هەندێك لێی دچونە پێش و دۆستانە لێیان دەپرسی

- نیلۆڤنا ئەوە کارت پیدا کردووە ؟

هەندێك دەچوون دڵخۆشیان دەدایەوە و دڵنیایان دەکردکە بەو زوانە پاڤێل بەردەبێت. پاڤێل لە سەر حەقە. هەندێکی تر بە قسەی دڵسوزانە دڵی برینداریان دەکولاندەوە .دەستەیەکی دیکەش بە ئاشکرا جنێویان بە بەڕێوە بەری کارخانە دەدا. بانگەوازێکی راستگۆیانەیان لە دڵی ئەودا وەخەبەر دەهێنا. هی واش هەبوون بە چاوی بەدخوایی تەماشایان دەکرد.

"ئسای گۆربۆڤ" ددانی دەچیڕەوە برد و گوتی : ئەگەر من حاکم بام کوڕەکەتم دەدا لە داری بدەن، تا تێبگا کە گومرا کردنی میللەت مانای نییە.

ئەو قسە ناحەزانەدایکیان وەك مردوو سارد کردەوە. هیچ وەڵامی نیسا ی نەداوە تەنیا تەماشای دەم و چاوی چکۆلە و شلەی کردو بە هەناسەوە چاوەکانی بەردانەوە. کارخانە هێندی نەبوو. کرێکاران پۆل پۆل لێك

کۆدەبونەوە بە گەرمی بەڵام لەسەرخۆ باسیان دەکرد. سەر کرێکارەکان بەڕویەکی گرژ وترش و تاڵەوە بە سەریان دا دەگەڕان. هێندێك جار قسەی سووك و پێکەنینی بە تووڕەیی دەنگی دەداوە. لەو کاتەدا دو پۆلیس سامۆیلۆڤیان وە پێش خۆدابو دیانبرد دەستێکی لە گیرفانی نابو، دەستەکەی تریشی لە قژە ئاڵۆزەکانی وەردەدا. نیزیکەی سەد کرێکار وە دوایکەوتبون و گاڵتەیان بە پولیسەکان دەکردو جنێویان پێ دەدان: یەکێك هاواری کرد .:

هاوڕێ بو گەڕانێ دەچێ ؟

یەکی دیکە گوتی : هەر بژی هەڤاڵی نێمە. پارێزەریان لە گەڵ خستوون. کۆمەڵێك جنێو لە هەوادا دەنگیان دەداوە .

کرێکارێکی باڵابەرزی خێل نەڕاندی. دیارە گرتنی دزان سودی کەمترە, بۆیە هەر پیاوە راست و دروستەکان دەگرن .

کرێکارێکی تر هاواری کرد: دیسان ئەگەر بە شەو بیانگرتبا باشتر بوو. ئەو ناکەسانە شەرمێ ناکەن بە نێوەڕۆیە دەیانگرن .

پۆلیسەکان پەشۆکا بوون, خۆش دەرۆیشتن, وەپەلە کەوتبوون هەوڵییان دەدا کە هیچ نەبینن و ئەو جنێوانە نەبیسن کە بۆیان بەڕی دەکران. سێ کرێکار بە ئاسنێکی درێژەوە چوونە پێشیان و بە هەڕەشە تێیا ن راخوڕین: لادەن بۆ قەراخی ماسیگرەکان. کاتێك سامۆیلۆڤ گەیشتە پێش دایك بە پێکەنینەوە سەری بۆ دانەواند و گوتی:

- سەرخۆش و مەستن .

دایك بێ دەنگ بوو. لە کاتێکدا کە دیمەنی ئەو لاوە بە هۆش و ئازایانە کە بە زەردەخەنەوە بۆ زیندان دەچوون زۆر خەفەتباری کردبوو، خوار بووەوە و بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ هاودەردی و خۆشەویستییەکی دایکانەی سەبارەت بەوان پەیدا کرد. کەیفی دەکرد کە دەیبیست هەڕەشە و سووکایەتی بە سەرۆکەکان دەکەن. لەو نێوە دا هەستی بە زیبك و زاکونی کوڕەکەی دەکرد.

کاتێك لە کارخانە هاتە دەرێ, رۆژەکەی لە کن ماریا رابوارد. گوێی دابووە قسەکانی. ئەو درەنگ بۆ ماڵە سارد و چۆڵ و هۆڵەکەی خۆی گەڕایەوە. ماوەیەکی زۆر لە کەلێن و قوژبنی ماڵەکەی دا سەرگەردان بوو. نەیدەزانی چ بکا و لە کوێدا دانیشێ. لەبەر ئەوەش دڵە کوتەی پێکەو تبوو کە یێگۆر نیڤانۆڤیچ لە کاتی خۆیدا نەهاتبوو.

لە دەرەوە بەفر دەباری و کلوە بەفرەکان وە شوشەی پەنجەرە دەکەوتن و پاشان بێ دەنگ دەتوانەوەودەبونە ئاو و شوێنەوارێکی تەڕیان لێ بەجێ دەما. دایك فکری پاڤێل هەڵی گرت. یەکێك بە ئەسپایی لە دەرگای

دا. دایك دەرگای لێ كردەوە ساشینكا هاتە ژورێ. ماوەیەكی زۆر بوو نەهات بوو. لە قەڵەو بوونی لە رادەبەدەری واقیوڕ ما. زۆری پێ خوش بوو كە هاوڕازێكی هەیەو تا شەو درەنگانێك بە تەنیا نابێ .

- ماوەیەكە نەمدیوی, لێرە نەبوی ؟

- بەزەردەخەنەیەكەوە وەڵامی داوە و گوتی :

- نا. لە زیندان بووم. هەر ئەو دەمی كە نیكۆلای ئیڤانۆڤیچ گیرا, منیش گیرام. نیكۆلایت وە بیر دێ ؟

- چۆن ئینسان دەتوانێ ئەو پیاوە لە بیر بەرێتەوە ؟دوێنێ یێگۆر گوتی : بەریان داوە. بەڵام كەس باسی توی نەكردوە. كەس بەمنی نەگوت كە تۆ گیراوی.

- پێ گوتنی ناوێت. بۆ چی بڵێن؟ تا یێگۆر ئیڤانۆڤیچ نەهاتوە با خۆم بگۆڕم

- زۆر تەڕ بوی.

- بەیاننامەكانم هێناون.

- بێنە, وێم دە, بێنە .

- هەرئێستا.

كیژەكە خێرا دوگمەی پاڵتوكەی كردەوە و خۆی راوەشاند و بەستەی بەیاننامە وەك گەڵای‌داركەوتنە خوارێ. دایك بە پێكەنینەوە كۆی كردنەوە.

هەناسەیەكی هەل كێشاو گوتی :

- جا بزانە، كاتێكی دیتم سكت وا هەستاوە, پێم وابوو شوت كردووە ئێستا سكت پڕە. نای, چەند زۆرت هێناون. بە پێیانیش هاتوی ؟

- بەڵێ بە پێیان هاتوم! كیژەكە وەك جاران باریك بووەو دایك دەیدیت كەسەر كولمەی قوپاون و سێبەرێكی مەیلەو تاریك دەوری چاوە گەورەكانی داوە .

دایك هەناسەیەكی هەڵكێشاو بە سەر بادانەوە گوتی : تۆ تازە لە زیندان هاتویە دەر لە جیانی ئەوە بحەسێیەوە .......... حەوت كیلو مەتر ئەو بارەشت هێناوە ؟

- پێویست بوو. دەبوو بیانهێنم . بلێ بزانم پاڤێلْ میخایلۆڤیچ حاڵی چونە؟ زۆر خەفەتی نەخوارد ؟

نا ........ ئاخ ............ خۆ نادوڕێنێ ............

كچەكە بە دەنگێكی ناسك و نەرم و توزێك لەرزۆكەوە گوتی : دڵی بە هێزە .......... وانیە ؟

- قەت نەخۆش نەبووە. دیارە سەرماتە دەلەرزی؟ راوەستە ئێستا چات بۆ لێ دەنێم مرباى شاتوشت بۆ دێنم .

ساشێنكا بەزەردەخەنەیەكەوە گوتی: زۆر باشە. بەڵام تۆ بۆ زەحمەت بكێشی؟ درەنگە, بۆ خۆم چای لێدەنێم.

- ئەی ڕۆ، چۆن شتی وا دەبێ، تۆ ماندووی. دایك سەماوەری تێ هاویشت. ساشێنکا بۆ چیشتخانە وە دوای کەوت و لەوێ لە سەر کەرەوێتەیەك دانیشت و دەستەکانی تێك وەر هێناو گوتی :

- زۆر هیلاکم. زیندان پیاو دەڕزێنێ. ئەو بێ کاریە نەگریسە لە هەمووشت دژوارترە. پیاو حەوتویەك، مانگێك لەوێ دەبێ، هەموکارەکانی دیارن. زیندانیەکان چاوڕەوانی ئەوەن شتیان فێربکەی، پێویستە ئەوەی مرۆڤ خۆی دەیزانی فێری ئەوانیشی بکا. ئینسان وەك حەیوانێکی دڕندە لە قەفەس دایە. هەر ئەوەشە کە دڵی مرۆڤ وشك دەکا .

دایك پرسی : کێ پاداشی تۆ دەداتەوە ؟ پاشان هەر بۆ خۆی هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی : لە خوا بەولاوە کێ هەیە؟ ڕەنگە تۆش بڕوات بە خوا نەبێ ؟

- نا ............

دایك لە ناکاو دەر هەڵبوو. کە وابوو منیش بڕوا بە قسەکانی ئیوە ناکەم. دەستەکانی کە بە خەڵوز ڕەش بوبون بە بەرهەڵبێنە خاوێنی کردنەوە و بە بڕوایەکی بەتینەوە گوتی :

ئیوە لە بیر باوەڕی خۆتان ئاگادار نین ، چۆن دەکرێ کەسێکی بڕوای بە خوا نەبێ، خۆی بۆ ژیانێکی ئاواتەرخان بکا؟ لە پشت دەرگا هەستی پێیان هات و سرتەیەکیان گوێ لێبوو. دایك لەرزی. کچەکە لە پڕ رابوو و بە ئەسپایی گوتی:

- دەرگا مەکەوە. ئەگەر ژاندارم بن، تۆ بڵێ من ناناسی .......... ڕێگام لێ گوراوە. حاڵم باش نەبووە، بەناچاری لە تۆ وەژور کەوتم. تۆ پاڵتۆت لەبەر من داکەندوەو بەیاننامەکان لە باخەڵم بەربوونەوە .

- خوشەویستم ئەو قسانە یانی چی ؟

- راوەستە لام وایە پێگورە.

خۆی بوو هیلاك و ماندوو، باران تەڕی کردبوو، وە ژور کەوت: دایە گیان سەماوەرەکە سازە ........؟ ئێستا چا لە هەمور شت خۆشترە....... سەیرە....... ساشێنکا ئەوە هێشتا لێرەی ؟ لە کاتێکدا دەنگی نێرانەی چێشتخانەکەی پڕ کردبوو، پاڵتۆ قورسەکەی دەرهێنا و پێش ئەوەی بحەسێتەوە گوتی :

دایە گیان! کاربەدەستانی ئێستا ئەو کیژەیان خۆش ناوێ، حەزلە چارەی ناکەن. یەکێك لە زیندانەوانەکان قسەی سوکی لە رودا کردبوو. ئەم رایگەیاند ئەگەر کابرا نەیە و تکای لێخۆش بوونی لێنەکا، خۆی لە برسان دەکوژێ. هەشت رۆژی تەواو هیچی نەخوارد. کەم مابوو تەشریف بەرێتە دنیای خوشتر! بەلای تۆوە باشترنەبو؟ لە بارەی ورگی بچووکی منەوە رات چییە ؟

لەبەر بەیاننامە و بڵاوکراوە ورگی هەڵمسابوو. باسکە کورتەکانی لەبەر وەرهێنابوون. چووە ژووری و دەرگای لە سەر خۆ پێوەدا. دایك بە سەر سوورِ مانەوە پرسی :

- بەراستی هەشت رۆژ هیچت نەخوارد ؟

کیژەکە لە سەرمان شانی هەڵتەکاند و گوتی :

- دەبوو داوای لێخۆش بوونم لێبکا .

ئەو نارامی و بێ دەنگی و سەرسەختیە چلە کێشانە وەزعێکی نەو تۆی بۆدایك پێکهێنا, دەتگوت سەرکۆنە کراوە.

بیری کردەوە "ئاخ, هەر وایە !"

- باشە، بەڵکو مردبای ؟!

هیچ. دەمردم. ئاخرەکەی لێبوردنی کرد. پیاو نابێ لە سووکایەتی پێکردن چاو بپۆشی . ئەوە راستە ......بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا لە تەواوی ژیان دا سووکایەتی بە ئێمەی ژن کراوە.

بێگۆر دەرگای کردەوە و گوتی: بارم سووك بوو! سەماوەر سازە ؟رێگا بدەن با مـن بیهێنم. سەماوەرەکەی هەڵگرت و لە کاتێك دا دەیبردە ژووری گوتی :

- باوکم بە لانیکەمەوە رۆژێ بیست ئیستیکان چای دەخواردەوە, هەربۆیەش بێ ئەوەی نەخۆش بکەوێ حەفتا ساڵ ژیا. سەد کیلو پتر بوو. لە گوندی "ڤۆسکرێسێنکی" مجێوری کلیسا بوو .

دایك هاواری کرد: ئەیرۆ چۆن تۆ کوڕی بابە ئیڤانی ؟

- بەڵێ، تۆ لە کوێ دەزانی؟

- چۆن منیش خەڵکی گوندی "ڤۆسکرێسێنسکی"!

کەوابوو هاووڵاتین. کچێکت بوو، ناوی چی بوو ؟

سێرێنگینا ...دڕواسێ بووین .

تۆ کچی "نیلا" شەلی, من باشی دەناسم. چەند جار گوێچکەی راکێشاوم . ئەم دووانە دەستیان بە قسە و پرسیار کردبوو. ساشێنکاش چاوی تێبڕیبوون و بە زەردەخەنەوە چای تێدەکرد. دەنگی ئیستیکانەکان دایکی تێکڕا کرد و کارەکەی وەبیر هێنایەوە .

- ببوورە دستم بە قسان کردووە و ئێوەم لە بیر چووتەوە. دەزانی چاوپێکەوتنی هاوشارییەك چەند خۆشە.

ساشێنکا گوتی: ئێوە دەبێ بمبوورن کە چام بۆ خۆم تێکرد، بەڵام قەی ناکا سەعات یازدەیە و رێگاشم دوورە.

بۆکۆی .......... بۆ شار؟

بەڵێ شەوە, هیلاکی و بارانیش دەبارێ. هەر لێرە بمێنەوە. پێگۆر لە چێشتخانەکە دەنوێ و ئێمەش لێرە.

- نا دەبی بڕۆم .

پێگۆر گوتی: بەڵێ هاوشاری، ئەو کیژە دەبێ بروا. دەیناسن. ئەگەرلێرە بیبینن باش نییە.

- چۆن بە تەنیا دەروا ؟

پێگۆر بزەیەکی هاتێ و گوتی: بەڵێ، دەڕوا.

کچەکە چایەکی دیکەشی بۆ خۆی تێکرد و پاروە نانێکی جۆی هەڵگرت و تـۆزێکی خـوێ پێـوە کـرد و لـە کاتێکدا تەماشای دایکی دەکرد، دەستی کردبە خواردن .

دایك گوتی: چۆن دەتوانی؟ ناتاشا چۆن ئەوەی دەکرد, من کـاری وا ناکـەم دەترسـم! پێگـۆر گـوتی: ئـەویش دەترسێ ، وانییە ساشێنکا ؟

- نا. وانییە

دایك تەماشای کرد و گوتی: چەندە ئازای !

ساشێنکا پاش ئەوەی چایەکەی خواردەوە، بێ ئەوەی دەنگی لێ بێتـەوە, دەسـتی پێگـۆری گوشـی و چـووە چێشتخانە و دایك بە دووایدا چوو. بە دایکی گوت : ئەگەر چاوت بە پاڤێڵ کەوت سڵاوی منی

پێبگەیەنە. دەستی لە سەر دەسگرەی دەرگابوو, لە پڕ گەڕاوە و بە ئەسپایی گوتی: دەکرێ ماچت کەم ؟

دایك بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە بە توندی لە ئامێزی گرت. کیژەکە زۆر بە کاوەخۆ گوتی: مێرسی! سەری لە قاند و وەدەرکەوت .

دایك گەڕاوە ژوورێ و چاوی لە پەنجەرەی بڕی. لە تاریکی شەودا شلێوە دەباری. پێگۆر ئارەقی کردبوو، سـوور هەڵگەرابوو, لینگی لەبەر یەك بردبوون و چای دەخواردەوە. شادییەك لە دەم و چاوی دیار بوو .دایك دانیشت و بە خەفەتەوە سێرەیەکی میوانەکەی دا و گوتی :

فەقیرە، ساشێنکا چۆن دەگاتەوە ؟

ماندوو دەبێ، زیندان زۆر هیلاك و شەکەتی کردووە. لە پێش دا بە خۆوەتر بوو .

بێجگە لەوەش بە کوێرەوەری رانەهاتووە من لام وایە ریخۆلەکانی نەخۆشن.

ئەم ساشێنکایە کێیە ؟

کچی کابرایەکی خاوەن ملکە ... باوکی زۆر دەوڵەمەند و لاپرەسەنە. دایە گیـان رەنگـە بزانـی یـەکتر بیـان خۆش دەوێ و دەیانەوێ پێکەوە بژین .......... ببنە ژن و مێرد.

کێ و کی؟

- پاڤێلّ و ساشێنکا. بەڵام وەزعەکەیان ئاوایە کە ناتوانن. کاتێکی پاڤێلّ ئازادە، ساشێنکا حەپسە، کاتێك ساشێنکا ئازادە ......... پاڤێلّ گیراوە.

- ئەوەم نەدەزانی پاڤێلّ قەت باسی خۆی ناکا.

دایك ئەمجار پتر لە خەمی کچەکەدا بوو. بێ ئەوەی خۆی بیبیەوێ، بە تووڕەییەکەوە تەماشای میوانەکەی کرد و گوتی :

حەق وابوو لەگەڵی چووبای.

- نەدەکرا لێرە کارم زۆرە. تەواوی رۆژ دەبێ بە رێگاوە بم پیادە رۆیشتن بۆ یەکێکی وەك مـن تەنگـە نەفـەس زۆر دژوارە.

دایك لە کاتێکدا کە بیری لە قسەی یێگۆر دەکردەوە گوتی: کیژێکی چەندە نازدارە. بەوەی نارەحەت بوو کە پاڤێلّ باسی ئەو شتەی نەکردبوو. لێوەکانی گەست و بڕۆی داکەوتن.

یێگۆر سەری راوەشاند و گوتی: بە دڵ تەنگت دەبینم. خراپ دەکەی! ئەگەر قەراربێ دڵت بە هەموو لێقاوماوێك بسوتی، بەش ناکا. راستییەکەی ئەوەیە کەس ژیانی خۆش نییە! ماوەیەك لە مەوبەر هەڤاڵێك دوور خرا بووەوە، گەڕایەوە. کاتێکی گەیشتە "نیژنی" ژن و منداڵەکانی لە "سمۆلێنك" چاوەڕوانی بوون. کە ئەو گەیشتە سمۆلێنك ئەوان لە مۆسکۆ گیرابوون. ئێستا نۆرە گەیوەتە ژنان کە بۆ سیبریا دووریان بخەنەوە. منیش ژنێکی زۆر نازدارم هەبوو، بەڵام پێنج ساڵ دوور خستنەوە ناردیە دنیای دیکە .

قومێکی لە ئیستیکانەکەیدا و قسەکانی درێژە پێدا، ساڵ و مانگەکانی زیندان و دوور خستنەوەی دەژمارد. باسی کوێرەوەری جۆربە جۆری خۆی کرد. باسی قات و قڕی سیبریا و کوشتاری بەندیخانەی کرد. دایك چاوی تێبڕ یبوو. گوێی بۆ قسەکانی راگرتبوو.

سەری لەوە سووڕ مابوو کە کاتێکی باسی ئەو هەموو ئازار و شکەنجیە دەکا، ئەوەندە هێدی و لە سەر خۆیە.

باشە، باسی مەسەلەی خۆمان بکەین .

دەنگی گۆڕا و بە گەرمی لە دایکی پرسی: دەتەوێ چۆن نووسراوو بەیاننامەکان بەریە کارخانە. دایك سەری لەوە سووڕما کە ئاگای لە هەموو شت هەبوو.

- پاش ئەوەی رێ و شوێنی کارەکانیان رێك وپێك کرد. سەر لە نوێ هاتنەوە سەرباسی گوندەکەی خۆیان. لە کاتێك دا یێگۆر گاڵتەی دەکرد، دایك ساڵەکانی رابوردووی وەبیر خۆی دەهێناوە. گوندەکەی دەهاتەوە بەرچاو کە بووەتە زلکاو، گرد و تەپۆلکەی جۆر بە جۆر و پڕ لە داری کاج و سنەوبەر. بە داخ و خەفەتێکی زۆرەوە

تەماشای ئەو پەردەی دەکرد. قەد و باڵای کیژێکی دەهاتە بە رچاو کە بە تاقی تەنیا لە ژێر رەهێڵەی بەفر و باراندا رێگای گرتووەتە بەر, کورەکەشی لە ژووێکی بچووکی پەنجەرە ئاسن دا حەپس کراوە و رەنگە ئێستا نەخوتبێ و لە یادی ئەودا بێ. بەڵام بیر لە حاڵی دایکی ناکاتەوە. چوونکە یەکێك هەیە لە لای خۆشەویست تر بێ. خەیاڵێکی تاڵ وەك پەڵە هەورێکی چڵکن بۆ لای دەهات و بە سەر گیانی دا زاڵ دەبوو.

پێگۆر بزەیەکی هاتێ و گوتی:

دایە گیان ماندووی، بچین بنوین .

دایە شەوباشی لێکرد و چووە چێشتخانەکە. لە کاتێکدا بە لارەلار و لە سەر خۆ دەرۆیشت دڵی پڕ بوو لە داخ و خەفەت. رۆژی دوایی لە سەر نان و چای بەیانی پێگۆر گوتی :

ئەگەر بتگرن و لێت پرسن ئەو هەموو نووسراوە قەدەخە کراوانەت لە کێ وەرگرتووە و لە کوێتراهێناوە وەڵامت چییە ؟

ـ دەڵێم بە ئێوە چی ........ و تەواو ............

بەڵێ، بەڵام بەوەندە دەستت لێ هەڵناگرن. ئەوان لایان وایە پەیوەندیت بەوانەوە هەیە و ماوەیەکی زۆر لێت دەکۆڵنەوە .

ـ باشە...... هیچ ناڵێم........

ـ دەتگرن و دەتبەنە زیندان.

ـ گرنگ نییە شوکری خوا لانیەم قازانجێکم دەبێ کەس پێداویستی بە من نییە. وەك دەڵێن ئیتر شکەنجە نادەن.

ـ ها شکەنجەت نادەن ؟ ژنێکی وەك تۆ دەبێ باش ئاگای لە خۆ بێ .

تۆ کە لای لایە دەزانی، ئەدی بۆ چی خۆت خەوت لێنا کەوێ؟

پێگۆر بێ دەنگ بوو. دەستی کرد بە هاتوچۆ و لە دایك وەنزیك کەوت :

ـ هاوشاری دژوارە. وا هەست دەکەم, ئەو وەزعە بۆ تۆ زۆر دژوارە .

دایك دەستی بزاوت و گوتی: وەزعی هەمووان هەروایە, رەنگە بۆ ئەوکەسانەی تێدەگەن هاسانتر بێ، بەڵام منیش ئەوەی پیاوی تێگەیشتو دەیانەوێ کەمێکی تێدەگەم.

پێگۆر بە ئەدەبەوە گوتی:

- هەرئەوەندە کە تێدەگەی بۆ ئەوان بە کەڵکی چاوێکی. لێکرد و پێکەنی. نزیک بە نیوەڕۆ دایک زۆر لە سەرخۆ وەك کەسێکی کارێکی زۆری هەبێ، نووسراوەکانی لە بن جلەکانی دا شاردەوە. کاتێکی بێگۆر دیتی، کە دایك چۆن بە تەردەستی تاقەتیان دەکا لە خۆشییان وەدەنگ هات .

- زۆر باشە دایە گیان، وەك ئەڵمانی کە زۆر بیرە دەخۆنەوە دەڵێن: "ڕێرگوت!" خوێندەواری تۆی نەگۆڕیوە هەروەك خۆت باش ماوییەوە. خوا بەرکەت بخاتە کارەکەت .

دایك پاش نیو ساعەت بە هێدی و هێمنی بە کۆڵەوە لەبەر دەرگای کارخانە راوەستا. دوو دەرگەوان کە لە گاڵتە پێکردنی کرێکارانی ژن تووڕە بووبوون و شەڕە جنێویان لەگەڵ دەکردن. هەر کەس چووبا ژووری دیانپشکنی. پاسەوانێك لە گەڵ کابرایەکی چاو زەق و لاق کورت و دەم و چاو سوور لە نزیك دەرگا دەهات و دەچوو .

دایك لە کاتێکدا سەتڵەکەی شانە وشان دەکرد, سیلەیەکی چاوی دانێ و هەستی کرد کە دەبێ جاسوس بن. کابرایەکی مل ئەستوری قژلول کە کلاوەکەی هاویشتبووە پشت سەری دەنگی دەرکەوانەکانیدا کە خەڵکیان دەپشکنی : عیفریتەکان سەر بپشکنن نەك گیرفان . یەك لە دەرکەوانەکان گوتی: نەسپێ نەبێ لە سەریاندا نییە.

کرێکارێك هاواری کرد: باشە ئەسپێیەکان بخۆن. ئێوە هەر بۆ ئەوە باشن.

جاسوسەکە ئاورێکی داوە و تفێکی لە عەرزی کرد.

دایك هاواری کرد: ڕێگا بدەن بڕۆم کۆڵەکەم زۆر قورسە، وەختە پشتم بشکێ . دەرکەوان بە تووڕەیی دەنگی دا: بڕۆ ............ ئەوەندە قسە مەکە .

دایك کە گەیشتە شوێنەکەی خۆی قاپەکانی لە عەرزی دانا و سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد ئارەقی لە ڕومەتی سڕیەوە

دوو قوفڵ سازی برا کە ناویان" گوسێڤ" بوو لێی وەنزیك کەوتن. برا گەورەکەیان کە ناوی بچووکی" ڤاسیلی" بوو بڕۆی تێك نان و بە دەنگێکی بەرز پرسی :

- پەتاتەت هەیە ؟

- سبەینی ٚ دەیهێنم.

ئەم وشە نیشانەیان بوو. براکان گەشانەوە. ئیڤان خۆی پێ ڕانەگیرا و هاواری کرد : نای چەند دایکێکی باشی

ڤاسیلی هەڵتروشکا و تەماشای دەفری شۆرباکەی کرد و بە ئەسپایی دەستە کاغەزێکی لە باخەڵی راکرا. پاشان بە دەنگێکی بەرز گوتی : نیڤان بچینەوە ماڵێ چ بکەین؟ با هەر لێرە نانەکەمان بخۆین. هێندیك لە نوسراوەکانی دەلاسکی چەکمەکەی ڕاکرد.

ـ دەبێ یارمەتی ئەو شۆربا فرۆشە تازە بدەین .

ئیڤان پێکەنی : ڕاست دەکەی زۆر باشە.

دایك جاروبار سەیری دەوروبەری خۆی دەکردو هاواری دەکرد:

هەی شۆربا هەی کەباب هەی چێشتی گەرم.

بەیاننامەکانی کەم کەم لە باخەڵی دەرهێنا و بێ ئەوەی کەس بزانی, دەیدا بەو جووتە برایە. هەموو جارێ کە دەستە کاغەزی لە دەستان دەهاتە دەر لە پڕ سەر و چاوی ئەفسەرە ژاندرمەکەی وەك پەڵەیەکی زەرد دەهاتە بەر چاو و لە دنیای خەیاڵدا بە هەستێکی بەدخودابییەوە پێی دەگوت :

ها ............ بابە گیان, کاتێکی بەستەیەکی تری دەدایە بە خۆشییەوە دەیگوت : ئەوەش یەکی تر ............ وەرە............

کاتێکی کرێکاران بە دەفرەوە دەهاتنە پێش، نێڤان گوسێڤ قاقا پێدەکەنی. دایك دەستی لە بەستە کاغەزان هەڵدەگرت و سوپی کەلەم و شۆربای تێ دەکرد .

جووتە بڕا بە گاڵتەوە دەیانگوت:

نەنە نیلۆڤنا زرینگە. شۆفێرێك بە دڵسۆزییەوە گوتی: هەژاری و لێ قەوماوی پیاو فێری راوە مشکیش دەکا. نان هێنەریان لێ ئەستاندووە. بەڵێ ئەو ناجسنانە.... باشە. قەی ناکا. بایی سێ کە پێك شۆربام بۆ تێکە. دایە ورە بەرمەدە ....... کارەکان هەموو باش دەبن.

دایك بە پێکەنینەوە گوتی : هەرخۆش بێ بۆ ئەو قسە باشانەت.

لە کاتێکدا وەدوور کەوت, دەیگوت: ئەو قسە باشانەم بە گڕان لە سەر ناوەستن ؟

ئاسنگەرێك بە پێکەنینەوە گوتی: کەس نییە پیاو قسەی خۆی لە کن بکا. کەس بۆیە نابێ .... وانییە ؟

ڤاسیلی گوسێڤ هەستا و لە کاتێکدا دووگمەی پاڵتۆکەی دادەخست گوتی: چێشتی گەرمیشم خواردووە, کەچی هێشتا هەر سەرمامە. براکەشی هەستا و هەردوو بە فیکە کردن وەدوور کەوتن.

دایك جاروبار بزەیەکی دەهاتێ و هاواری دەکرد:

هەی شۆربای گەرم، هەی سوپی کەلەم، های هەرشتە فەرەنگی

لە دڵی خۆی دا دەیگوت: هەوەڵین تاقی کردنەوەم بۆ کوڕەکەم دەگێڕمەوە, بێ پسانەوە سەر و چاوی ئەفسەرە زەردەڵەکەی دەهاتە بەر چاو ………… سمێڵە ڕەشەکانی دەبزاوتن, ددانەکانی لە بن لێوی سەروەی دا کە لەبەر تووڕەیی ڕێك هاتبوو, دەدروشان .شادییەکی زۆر وەك باڵندەیەك لە دڵی دایك دا نارەی دەهات. بزۆکانی دەبزاوت و لەگەڵ کارکردندا دەیگوت :

وەرە ……… ئەوەش یەکی تر ……… وەرە یەکی دیکە

## (١٦)

لە تەواوی ڕۆژدا هەستێکی تازە و دلگیری هەبوو. ئێواریێ کە کارەکانی تەواو کردبوو لە کاتێك دا چای دەخواردەوە لە پێش پەنجەرە دەنگی سمی ئەسپێکی هات و دەنگی ناسیارێکی بیست. دایك بە گوڕجی ڕابوو. خۆی گەیاندە چێشتخانە و چوو دەرگای بکاتەە یەکێك بە توندی دەهات. چاوی دەڕەشەوە چوون و پاڵی وە چووار چێوەی دەرگادا و بە نوکی پێ دەرگای کردەوە. دەنگێکی ناسیاو گوتی :

- دایە گیان شەوباش! دوو دەستی وشك و درێژ کەوتنە سەر شانی دایك. ئەوەندەی کە بە چاو پێکەوتنی ئەندرێی کەیف خۆش بوو ئەوەندەش ژانی ناکامی دڵی ڕێك کوشی و ئەو دوو هەستە تێکەڵ بوون , وەك لافاوێکی بەتەوژم لە ئامێزی ئەندرێیان هاویشت.

ئەندرێیش بە توندی لە ئامێزی گرت. و ڕێکی کوشی, دەستەکانی دەلەرزین. دایك بە ئاسپایی و بێ هەست دەگریا. ئەندرێی دەستی بە سەریدا هێنا و هەر بەو دەنگە خۆشە گوتی :

- دایە گیان مەگری و خۆت ناڕەحەت مەکە. بەلێنت دەدەمی بەو زووانە ئازادی دەکەین. هیچ بەڵگەیان دژی ئەو بە دەستەوە نییە. هەڤاڵەکانیشی لە ماسی سوورەوەکراو زیاتر قسە ناکەن، تا شتێکیان لێدەرکەوێ. لە کاتێکدا بە گەرمی دەستی دایکی دەگوشی چوونە ژوور.

دایك بە تامەزرۆیی گوێ ی بۆ قسەکانی ئەندرێی ڕا گرت :

- پاڤێل سلاوی لێ دەکردی.حاڵی باشە. و کەیفی خۆشە لە زیندان دا جێگای زۆر تەنگە لە شارو لێرە سەد کەسیان پتر گرتووە. هەر هۆدەی سێ چوار کەسیان تێ ئاخنیوە. شێوەی بەڕێوەبردنی زیندان بۆ سەرکۆنە نابێ. ناجسن نین. بەڵام لەبەر کاری زۆر هەمیشە ماندوون. ئەو ژاندارمە هارانە زۆر کاریان بۆ دادەتاشن، لە سەر ئەوەشەوە زۆر توند و تیژ نین. هەمیشە بە ئێمەیان دەگوت :

- برایان تۆزێك هێدی بن و کێشەمان بۆ ساز مەکەن.

وەزع باش بوو. دەکرا قسە بکەین. کتێب بدەین بە یەکترو نان و چێشت پێکەوە بەش بکەین. زینـدانێکی خۆش، پیس و کۆن بەڵام هێدی و هێمن، ئەوانەی سیاسی یش نەبوون زۆریان خزمەت دەکردین. خراپ نـەبوون. لەبەر جێگا تەنگی من و بوکین و چووار کەسی دیکەیان ئازاد کرد. بێ گومان بەو زووانە پاڤێلیش ئازاد دەکەن. ڤێسۆڤشیکۆڤ لە هەمووان پتر لە زیندان دا دەبێ چوونکە لە بەردەستانی هەراسانن. بێ پسانەوە جنێو بە هەموو کەس دەدا. ژاندارمەکان لەبەر دەستی بێزارن. ئاخری موحاکەمەی دەکەن یا دارکاری دەکەن.

پاڤێلَ خەریکە بیکا بە ئینسان و پێی دەڵێ:نیگۆلای بێ دەنگ بە. جنێودان سوودی چییە؟ بە جنێـو باشـتر نابن .

ئەویش دەقیژێنی و دەڵی: ڕەگ و ریشەی ئەو دوومەڵانە لە سەر زەوی هەڵدەکێشم .

پاڤێلَ رەفتاری زۆر باشە لە گەڵ هەموو کەس. هێدی و لە سەر خۆیە. پێت دەڵێم بەو زووانە ئازادی دەکەن.

دایك هاتەوە سەرخۆ و بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی : بەو زووانە، دەزانم ...... بەو زووانە ئازادی دەکەن .

زۆر باش دەبێ. کەوابوو، چام بۆ تێکە. ئەم دوواییانە چت دەکرد ؟

ئەندرێی بزەی دەهاتێ و تەماشای دەکرد و بە تەواوی لـە دڵـی دایـك وەنزیـك کـەوتبوو. لـە قـوڵایی چـاوە شینەکای دا خۆشەویستییەکی ئەختێك خەفەتاوی بروسکەی دەدا .

پاش ئەوە هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو گوتی :

ئەندرێی تۆم زۆر خۆش دەوێ. بەوردی سەیرێکی دەم و چاوە لاوازەکەی کرد کە توك داپۆشیبوو . ئەندرێی لە سەر کورسی خۆی بزاوت و گوتی :

ـ بۆ من تۆزیك خۆشەویستی بەسە. دەزانم منتان خۆش دەوێ تۆ دلێکی گەورەت هەیە و دەتـوانی کەسـێکت خۆش بوێ.

دایك گوتی: من بە تایبەتی تۆم خۆش دەوێ. ئەگەر دایکت هەبایە خەڵك ئیرەیی پێ دەبرد .

ئەندرێی سەری بۆ لەقاند و هەر دوو دەستی توند ڕێك کوشی وبە دەنگێکی نەرم گوتی: منیش لە قوژبنێکـدا دایکێکم هەیە .

دەزانی ئەمرو چم کرد و .......... بە زمانێکی گیراو بەڵام بە خۆشی بۆی گێڕایـەوە کـە چـۆن بەیاننامـەی بردوونە نێو کارخانە.

ئەندرێی لە پێش دا واقی وڕما و چاوەکانی بچووك بونەوە. پاشان پتێکی لە سەری داو گوتی:

ـ ئاخ, بەڵام ئەوە گاڵتە نییە. مەسەلەیەکی جیددییە. پاڤێلَ زۆری پێخۆش دەبێ.

دایە گیان کارێکی باشت کردووە. چ دەربارەی پاڤێلّ و چە دەربارەی تەواوی ئەو کەسانەی لە گەلّ ئەو گیراون. لە خۆشیان فیکەی دەکردو کورسییەکەی دەبزاوات. شادی و خۆشی لە ڕادەبەدەری ئەندرێی گیانی دایکی بە هێز دەکرد.

دایك هەروەك بەو قسە خۆشانە دڵی کرابێتەوە جۆگەلەیەکی ڕەوانی پێدا وەرێکەوتبێ گوتی :

ئەندرێی گیان, هاوار لەو کاتەی کە بیر لە ژیانی خۆم دەکەمەوە. ئاخ خوایە, باشە من بۆچی ژیاوم, بۆ کار کردن و لێدران؟ بێجگە لەمێردەکەم کەسی ترم نەدەدی و بێجگە لە ترس هیچ شتێکی دیکەم نەدەزانی. نازانم پاڤێلّ چۆن گەورە بوو. تا مێردەکەم مابو نەمدەزانی خۆشم دەویّ یان نا؟ تەواوی خەم و خەیاڵم ئەوە بوو نان و چێشت بۆ ئەو حەیوانە دڕندەیە ساز بکەم تا لێم ڕازی بێ و توورە نەبێ و جارێك لێم نەدا. بەڵام وەبیرم نایە کە لێی نەدابم.

وای لێ دەدام دەتگوت ئەك هەر خێزانی تەمی دەکا بە ڵکو تۆڵەی ئەو کەسانەش لە من دەکاتەوە کە لێیان تووڕە بوە. بیست ساڵی تەواو بە مجۆرە ژیاوم. لە بیرم نییە پێش شوو کردن وەزعم چۆن بووە؟ زۆر هەولّ دەدەم وەبیری خۆمی بێنمەوە.بەڵام هیچ نابینم, وەك لەو کاتەوە کوێر بووبم, وایە لە گەلّ یێگۆر ئیڤانۆڤیچ خەڵکی گوندێکین. لەم دووایییەدا باسی ئێرە و ئەوێمان دەکرد. ماڵەکانمان وەبیرخۆ دەهێناوە, دووبارە خەڵکمان دەهێناوە بەرچاو، بەڵام لە بیرمان چووبووەوە کە چۆن دەژیان و چییان دەگوت و چییان بەسەر هاتبوو. سوتمانەکانم وەبیر دەهاتەوە. دوو سۆتمان..... مێردەکەم ئەوەندەی لێ دەدام هیچم وە بیر نەماوە. گیانم بە جارێك کەڕ و کوێر بووە.

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و پشویەکی خواردەوە و هەوای هەڵمژی، دەتگوت ماسییە لە نێو ئاو هاتووەتە دەر. خۆی بۆ پێشەوە خوار کردەوە و دەنگی نەرمتر کرد و گوتی :

کاتێکی مێردەکەم مرد بە کوڕەکەمەوە نوسام، ئەویش کاری وای دەکرد کە ئەو دەم سکم پێی دەسوتا و بە خۆم دەگوت :

ئەگەر ئەو نەمێنی من تاك و تەنیا چۆن دەژیم ؟ چەندە دەترسام کە بیرم لە چارەنووسی ئەو دەکردەوە خوێنم لە دڵی دەگەڕا.

دەمێك مات بوو. بە ئەسپایی سەری راوەشاند. پاشان بە دەنگێکی تایبەتی قسەکانی درێژە پێدا.

- ئەوینی ئێمە ژنان پاك نییە. ئێمە تەنیا ئەوەمان خۆش دەوێ کە پێویستمان پێیەتی. ئێستا دەزانم تۆ پەرۆشی دایکتی ........ باشە پێداویستی چیت پێ هەیە ؟ زۆر کەسی دیکەش کە لە پێناوی گەلدا ڕەنج دەکێشن و دەکەونە زیندان و بۆ سیبریا دووردەخرێنەوە و لەوێ دەمرن یا لە دار دەدرێن ئەو کیژانەی بە شەوی

بەفر و باران بە تاقی تەنیا بە نێو قورِ وزەلەق دا بۆ چاوپێكەوتنی نێمە حەوت كیلو مەتر ڕێگا بـە پـیێ دەبـڕن ...كیێ ناچاریان دەكا ئەوەی بكەن. هەر لەبەر ئەوەیە پێیان خۆشە، و بە دڵەوەش پێیان خۆشە بە بیر و بڕوا ... ئەندرێی بە بیرو بڕوا بەڵام من نازانم ئاوام پیێ خۆش بیێ. تەنیا ئەوەی پەیوەندی بە خۆم و كەس و كاری خۆمەوە هەبیێ پێم خۆشە .

ئەندرێی ڕوی وەرگێڕاو گوتی :

ـ حەقتە .......... پاشان هەر وەك جاران دەستێكی بەسەر و چاویدا هێنا و گـوتی : هـەمووو هـەر ئـاوان. ئەوەیان خۆش دەویێ كە لێیان نزیكە، بەڵام بۆ ئەو كەسەی دڵی گەورەیە ئەوەی دووریش بیێ .......نزیكـە. تـۆ دەتوانی زۆرت خۆش بووین. خۆشەویـستی دایكیەتیت زۆرە.

ـ خوا بكا ...... هەست بەوەی دەكەم كە ژیانی وا زۆر باشە، ڕەنگە تۆم لە  پاڤێلێ خۆشتر بـویێ. چـەند بـیێ قسە و باسە.  بزانە خەریكە ساشێنكا بێنی بەڵام من دایكی ئەوم لەو بارەوە هیچی پیێ نەگوتوم .

ـ ئەم قسە وانییە. ڕاستە  پاڤێلێ ساشێنكای خۆش دەویێ و ئەویش حەز لە  پاڤێلێ دەكـا، بـەڵام لـە بـارەی خواستن و شوو پیێ كردنەوە هیچیان ئامادەنین . دایـك هەناسـەیەكی هەڵكێشـا و بـە خـەمناكییوە چـاوی لـە ئەندرێی بڕی : بەڵیێ ڕاستە ..... خەلك لە خۆوە قسـە هەڵدەبەستن .

ئەندریی ٚ بە ئەسپایی گوتی:  پاڤێلێ ئینسانێكی تایبەتییە. لە جنسی پۆڵایە .

ئێستا لە بەندیخانە دایە و ئەوە بۆ من بووەتە هۆی خەفەت و دڵە كوتە، بەڵام وەك جاران ........ ژیان هـەر ئەو ژیانە نییە. خەم و خەفەتیش فەرقی كردووە. گیانی منیش گۆڕاوە و هەرواتر چاو دەگێڕیێ. لە یـەك كاتـدا شادیشە و خەمباریشە، لێی تێناگەم, كە دەبینم بڕواتان بە خوا نییە زۆرم پیێ ناخۆشـە. چ بكـەم. چـار نییـە بەڵام دەزانم ئێنسانی نازدارن, خۆتان توشی ڕەنج و كوێرەوەری كردووە تا خزمەت بە كۆمەڵ بكەن...... منیش ڕاستی ئێوەم دۆزیوەتەوە تا خەڵكی زۆردار و بە دەسەڵات هەبن كۆمەڵانی گـەل توشـی خۆشی و دادپـەروەری نایەن ......ئەوەیە.

ئەندرێی، من لە نێو ئێوەدا دەژیم. هێندی جار لە نیوە شەودا ڕابوردووی خۆم و هێزی پیێ شـێل كـراو و دڵ و گیانی تێك شكاوم وەبیر دەێنمەوە بە خەفەتەوە دڵم بە حاڵی خۆم دەسوتی، بەڵام لە گـەڵ ئـەوەش ژیـانم باشـتر بووە .

ئەندرێی هەستاو دەستی كرد بە هاتو چۆ. هەوڵی دەدا لاقەكانی بە دووای خۆیدا بخشكێنی, بیری دەكردەوە لە پڕ گوتی :

ئەوەی دەیڵێی راستە, جولەکەیەکی گەنج لە "کێرچ" هەبوو شیعری دەگوت رۆژێك ئەم شیعرەی دانابوو .:
ئەو بێ گوناحانەی کوژران بە هێزی حەقیقەت زیندوو دەبنەوە.

ئەو کابرایە لە "کێرچ" بە دەستی پۆلیس کوژرا، بەڵام ئەوە گرنگ نییە، حەقیقەتی دەناسی و تۆوی حەقیقەتی لە دڵی خەڵکدا دەچاند.

ئێوەش گیان لە بەرێکی بێ تاوانن، کوژراون ئێستا قسە دەکەم و دەیڵێم و خۆم گوێم لە قسەکانی خۆمە. بڕوام بە خۆم نییە لە تەواوی ژیانم دا مات و بێ دەنگ بووم. تەنیا فکرێکم هەبووە ئەویش ئەوە بووە کە لە ژووردا خۆم بپارێزم و بێ ئەوی خۆم تێبگەیەنن رۆژبەرمە سەر و هەر بە نەناسراو بێنمەوە. بەڵام ئێستا لە فکری هەمووان دام. رەنگە باش لە کارەکانی ئێوە سەر دەر نەکەم بەڵام هەموو کەس لە من نزیکە و دڵم بە هەموو کەس دەسوتی، بەختەوەری هەموو کەس بە ئاوات دەخوازم. بە تایبەتی بە ختەوەری ئێوە ئەندرێی گیان.

ئەندرێی لێی وەنزیك کەوت و گوتی: سوپاس بەسە نیتر لە بارەی منەوە قسە ناکەین. لە کاتێکدا توند دەستەکانی دایکی دەکوشی روی لێ وەرگێرابوو، دایك لەبەر دڵ پڕی ماندوو بووبوو، بە کاوەخۆ قاپەکانی دەشوشت و بێ دەنگ بوو. هەستێکی نازایانە دڵی گەرم دەکردەوە. ئەندرێی هات بۆ لای و گوتی :

ـ دەبوو هەوڵ بدەی ڤیسۆڤشیکۆڤی نەرم بکەی. باوکی لە گەڵ ئەو لە زیندان دایە. پیرە مێردێکی بزۆزە. کاتێکی نیکۆلای لە پەنجەرەوە دەیبینی جنێوی پێ دەدا. ئەوەش باش نییە. نیکۆلای کوڕێکی باشە .بێجگە لە ئێنسان سەگ و مشك و هەموو گیان لە بەرێکی خۆش دەوێ. بزانە تا چ رادەیەکی دەتوانن ئینسان پوچەڵ ولاری بکەن.

دایك داما و پاشان گوتی: دایکی بە یە کجاری بێ شۆین بوو، هیچ شوێنەوارێکی لە پاش بە جێ نەماوە. باوکیشی دزو نارەق خۆرە. کاتێکی ئەندرێی چوو بخەوێ دایك بێ ئەوەی ئەو بزانێ نیشانەی خاچی لە سینگی کێشاو، پاش نیو سەعات بەسپایی پرسی ؟

ئەندرێی خەوت لێ ناکەوی ؟

ـ نا .........بۆچی ؟

ـ هیچ، شەوت خۆش.

ئەندرێی لە روی پێ زانینەوە لە وڵام دا گوتی: سوپاس، سوپاس

## (١٧)

سبەینی کاتێك دایك بە کۆڵە بارەوە گەیشتە بە دەرگای کارخانە، دەرکەوان بە توندی پێشی پێگرت و گوتی: قاپ و قاچاخ و شتەکانت دانێ. پاشان دەستی کرد بە پشکنینی. لە کاتێکدا باخەڵ و گیرفانەکانی دەگەڕان لە سەر خۆ گوتی: شۆرباکەم سارد دەبێتەوە

یەکێك لە دەرکەوانەکان بە تووڕەیی دەنگی دا: بێ دەنگ بە.

یەکی تر سینگی خۆی ڕەپێش کرد و گوتی: پێم نەگوتی کە ئەوانە بەسەر پەرژینەکەدا تور هەڵدەدەن .

سیزۆڤ پێش هەموو کەس لێی وەنزیك کەوت و تەماشایەکی ئەملا و ئەو لای کرد و بە سرتە پرسی : دایە زانیوتە

ـ نا. دیسان نوسراو و بە یاننامە دۆزراونەوە. وەك زیخ و خۆڵ بلاّ و کراونەوە. گرتن و راونان هیچ سودی نییە. مازینی برازام گیراوە............ کوڕەکەی تۆش گیراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەیاننامەکان هەر وەك پێشو بڵاو بوونەوە ...... کەوابوو خەتای ئەوان نەبووە .

سیزۆڤ پاش ئەم قسانە دەستێکی بە ریشی دا هێنا و گوتی :

کاری ئینسانان نییە. کاری بیر و باوەڕە ......... بیرو باوەڕیش کێچ نییە بیگرن. ریشی لە دەستی دا کۆ کردەوە و تەماشایەکی کرد و لە کاتێك دا وەدەر کەوت گوتی : بۆ قەت نایە ماڵی ئێمە ؟ چاخواردنەوەی بە تەنیا تامی نییە .

دایك سوپاسی کرد و لە کاتێکدا بۆ فرۆشتنی شتەکان هاواری دەکرد، بە وردی سەیری ورووژان و تێکەڵ و پێکەڵی کارخانەی دەکرد. کرێکارەکان شاد و کەیف خۆش دەهاتنە بەرچاو. لێك کۆ دەبوونەوە و پاشان بلاوەیان دەکرد. لە بەشێکی کارخانەوە بۆ بەشێکی دیکە رایان دەکرد. لە دەنگ و دەم و چاویان خۆشی و شادی دەباری. لە نێو هەوای پڕ لە دووکەل و تەم دا شنەبایەکی ئازایی و پیاوەتی هەست پێدەکرا. لە کەلێن و قوژبن و بن دیواران ، جاروبار هاواری گاڵتە پێکردن و لاتاو و هێندێ جاریش دەنگی هەڕەشە بەرز دەبووەوە. بە تایبەتی لاوەکان سەرگەرم بوون و کرێکارانی وەنێوکەوتو پتر خۆیان دەپاراست و تەنیا زەردەخەنەیان دەهاتێ. سەرۆك و خاوەن کارەکان بە خەمباری دەهاتن و دەچوون. پاسەوانەکان بەملاو لادا رایان دەکرد. کە سەر و سەکوتیان دەردەکەوت، کرێکاران بلاّو دەبوونەوە یا لە جێگالی خۆیان ڕادەوەستان و مات دەبوون و بێ ئەوەی دەنگیان لە بەربێتە دەر. بە تووڕەیی تەماشای پاسەوانەکانیان دەکرد. کرێکارەکان هەمو خاوێن دەهاتنە بەرچاو. قەڵافەتی بەرزی گوسێف لە دوورەوە دیار بوو.

براکەشی بە پێکەنینەوە بە دووای دا دەهات و دەچو, دارتاشێك بە ناوی "ڤاڤیلوڤ" لە گەڵ "ئیسای" بە پێش دەمی دایك دا تێپەڕین کابرای دووایی کە قەڵەو و قوڵە خڕە بوو ناوڕی داوە و ملی بەلای چەپدا خوار کردەوە، تەماشایەکی دارتاشی کرد و چەنەگەی بزاوت و گوتی :

- نیڤان نیڤانۆڤیچ تەماشاکە، هەر چەند وەك جەنابی بەرێوە بەر دەڵێ ئەو مەسەلە پەیوەندی بە روخانی ولاتەوە هەیە، بەڵام ئەوان پێدەکەنن و کەیف خۆشن. ئەوانە بە بڕار کردن باشاریان ناکرێ. دەبێ شێوەرد بکرێن.

ڤاڤیلۆڤ لە کاتێکدا کە دەستی لە پشتەوە دەگرت و قامکی دەگوشین، بە دەنگێکی بەرز گوتی: سەگبابانە هەرچی دەکەن بیکەن. هەرچەندی دەیانەوێ با چاپی بکەن بەڵام باسی من نەکەن .

ڤاسیلی گوسێڤ لە دایك وەنزیك کەوت و گوتی : چێشتەکەت زۆر باشە .......... بۆم تێکە ............
پاشان چاوەکانی بەرداوە و مژۆڵەکانی لێك دان و گوتی:

- دەزانی بە ئاوات گەیشتین. زۆر باش بوو دایە گیان، زۆر باش

دایك دۆستانە بەسەر ئیشارەی بۆ کرد و لەوەی کە ئەو سەرسەرییەی گەڕك ئاوا بە نهێنی و بە ئەدەبەوە دەیدوێنی کەیف خۆش بوو لە دیتنی وڕوژان و جموجوڵی کارخانە شاد بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

- باشە، ئەگەر من نەبام وا نەدەبوو .

سێ کرێکار لە کن دایك ڕاوەستان. یەکێك لەوان بە ئەسپایی و بە دەنگێکی خەفەتاوی گوتی :

- من هیچم وەدەست نەکەوت. ئەوی دیکەیان گوتی : من نەخوێندەوارم بەڵام دەزانم دیسان سودی هەیە.

کرێکاری سێهەمیان تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و گوتی: با بچینە گەرمخانە بۆتان دەخوێنمەوە.

گوسێڤ چاوەکانی تروکاند و بە ئەسپایی گوتی: نووسراوەکان کاری خۆیان دەکەن. دایك ئەوێ ڕۆژێ بە خۆشی گەڕاوە ماڵێ. بە چاوی خۆی دیتبووی بە یاننامەکان ئاواتی ئەویان بە جێ گەیاندوە. بە ئەندرێی گوت: کرێکاران لە نەخوێندەواری خۆیان داخداران من بە گەنجی خوێندنەوەم دەزانی بەڵام لە بیرم چووەتەوە.

ئەندرێی گوتی: پێویستە دووبارە فێر ببیەوە. لەم تەمەنەدا ببیە گەپچاری خەڵك فایدەی چییە .

ئەندرێی کتێبێکی لە سەر مێزەکە هەڵگرت و پیتێکی بە دایك نیشان دا و پرسی ئەوە چییە ؟ دایك بە پێکەنینەوە گوتی ."ڕێ" یە. ئەوەی دیکە چییە .؟ "ئەلف" . دایك تۆزێك خەم دایگرت وای دەهاتە بەر چاو کە ئەندرێی لە بنەوە بزەی دێتی و گاڵتەی پێدەکا. خۆی لەوەی دەپاراست کە نیگایان تێك هەڵەنگوێ بەڵام دەنگی ئەو پیاوە هێدی و نەرم بوو. دایك خێسەیەکی لێکرد و دیتی کە سەرورووی جیددیە. بە پێکەنینەوە گوتی : بە ڕاستی دەتەوێ بمکەی بە خوێندەوار ؟

- بەلێ بۆ چی ناتکەمێ. باتاقی کەینەوە چونکە پێشتر پیتەکانت ناسیون. ئێستا زوو وەبیرت دێنەوە. ئەگەرسەرکەوتین و فێر بووی زۆر باشە دەنا هێچمان لە کیس نەچووە ......

دایك گوتی: ڕاست ئەودیە، هەڵوا..... هەڵوا.....زارم شیرن.

ئەندرێی سەری راوەشاند و گوتی: ئاخ ئەومەسەلانە زۆرن. مەسەلەیەکی دیکەش هەیە, مرۆڤ هەتا کە متر بزانی ئاسوودەتر دەخەوێ. لە کاتێکدا ئەوە ڕاست نییە ئەو مەسەلە و مەتەڵۆکانە لە ورگ هاتونەدەر و بۆ بەستنەوە و ڕاکێشانی گیانی مرۆڤ کەمەندیان ڕانگاوتووە تا بە کەیفی خۆیان ڕایکێشن. ئەم پیتە چیی ؟

"لام"ە

باشە، بزانە چۆن لێکیان دەکەیەوە. ئەوی دیکەیان ؟

دایك برۆی دەبزاوتن و هەوڵی دەدا بە زۆر پیتەکان وەبیر خۆی بێنێتەوە. وا لە کاری خۆیدا نوقم بوو بوو هەموو شتێکی لە بیر کردبوو. زوو چاوەکانی ماندوو بوون و فرمێسکی ماندوویی پاشان فرمێسکی خەم و پەژارە ی لە چاوان گەڕا. هەناسەیەکی هەڵکێشا و هاواری کرد:

- سەیرکەن من خەریکم خوێندن فێربم، پێم لە سەر لێوی قەبرە وتازە دەست بە خوێندن دەکەم.

- مەگەر ئەتدەتوانی جۆرێکی تر بژی. ئێستا تێدەگەی خراپ ژیاوی ....... هەزاران کەسی واهەن دەتوانن لە تۆ باشتر کار بکەن بەڵام وەك پاتاڵ دەژین و شانازیش دەکەن کە ژیانێکی باشیان هەیە. بزانین ژیانی ئەوانە چی باشی تێدا هەیە ؟ ڕۆژێك کار دەکەن و دەخون و بەیانیش هەر کار دەکەن و دەخۆن. هەموو ژیانیان ئاوا ڕادەبورێ. منداڵیشیان دەبێ لە هەوەڵەوە یارییان لە گەڵ دەکەن بەڵام پاشان کە گەورە بوون و دەستیان کرد بە زۆر خواردن، دایك و باوکیان لێیان تورە دەبن و جنێویان پێدەدەن و پێیان دەڵێن زۆر خۆرینە، زوو گەورە بن و بچن کارێ بکەن. دەیانەوێ منداڵەکانیان وەك پاتاڵ رابێنن، بەڵام منداڵەکانیش بۆ سکیان کارەدەکەن و ژیان درێژەی دەبێ. هیچ کاتێك فکرێك بە لایان دا ناڕوا کە دڵیان خۆش بکا. هێندێك وەك هەژاران گەدایی دەکەن و هێندێکی دیکە ئەودی گەرەکیان بێ لە خەڵکی دەدزن. قانونی پیس و چەپەڵ دانراون و بۆ پاسەوانی خەڵك هێندێ کەسی چەکدارو گۆپاڵ بەدەستیان داناوە پێیان دەڵێن: "خەڵك ناچار بکەن لە قانون دەر نەچن، لە ژێر سێبەری ئەم قانونەدا دەحەسێینەوە و ڕێگامان دەبێ خوێنی مرۆڤ بمژین" کاتێکی ئینسان سەر بۆ تەوژمی بێگانە دانانەوێنی بە زۆر پەندی ئەو تۆ دەبەنە مێشکیەوە سەری لێی دەتەقی ......

تەنیا ئەو کەسانە ئینسانن کە زنجیرەکان لە عەقڵ و لەشی هاورەگەزی خۆیان دەپسێنن. بۆ نمونە تۆش. لە قەدەر توانای خۆت تۆش ئەو کارەت کردووە. دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا: من چۆن دەتوانم ؟

بەڵێ، تۆ دەتوانی وەك بارانە کە هەر تنۆکەی چڵە گەنمێك ناو دەدا. کاتێکیش کە فێری خوێندن بووی...........

دەستی کرد بە پێکەنین. هەستا و لە ژوورێدا دەستی بە هاتو چۆ کرد.

لێ فێر دەبێ کە پاڤێل گەڕایەوە سەری سوور دەمێنێ.

ناخ! نا، ئەندریی...... پیاو تا گەنجە هەموو کارێکی بۆ هاسانە بەڵام کە پیر بوو خەفەتی زۆر دەبێ و تاقەتی کەم. مێشکی بە هیچ جۆر ئامادە نییە شت وەرگرێ.

شەوێ ئەندریی وەدەر کەوت. دایك چرای هەڵکرد و دەستی کرد بە گۆرەوەی چنین بەڵام زوو هەستا و چەند هەنگاوێك ڕۆیشت و چووە چێشتخانە. دەرگای جووت کردو هاتەوە ژوورێ. پاش ئەوەی پەردەی پەنجەرەکانی داداوە کتێبێکی هەڵگرت و لە کن مێزەکە دانیشتەوە. سەری بەسەردا دەگرت و لێوەکانی دەبزاوت هەر کە دەنگێك لە کۆڵانێ دەهات کتێبەکەی پێکەوە دەنا و گوێی هەڵدەخست پاشان هێندێ جار چاوی لە سەر یەك دادەنا و لە ژێر لێوە بە ئەسپایی دەیگوت .

ژ..........ی..............ا...........ن............

## (١٨)

لە دەرگایان دا. دایك ڕابوو کتێبەکەی هاویشتە سەر قەفەزەکە و لە کاتی تێپەڕین بە چێشتخانە دا پرسی : کێیە ؟

ـ منم

ڕێبین هاتە ژوورێ. شەو باش و چاك و خۆشی تاوێك دەستی لە ڕیشی وەردا و چاوێکی لە ژوورێ کرد و گوتی:

ـ جاران بێ ئەوەی بپرسی کێیە دەرگات لە خەڵك دەکردەوە...... بەتەنیای؟

ـ بەڵێ، تەنیام.

پێم وابوو ئەندریی لێرەیە...... ئەمرۆ چاوم پێکەوت. زیندان نایلە قینی. ئەحمەقی و نەزانی پتر لە هەموو شت ئێمە تێك دەدا. لە ژووری دانیشت و دەستی بە قسان کرد. دەمەوێ شتێکت پێ بلێم، دەزانی

فکرێکم بۆ هاتووەتە پێش. سەر سیمایەکی بە ویقارو سەرنج ڕاکێشی هەبوو دایکی دەپەشۆکاند لە بەرامبەری دانیشت و بێ ئەوەی قسە بکا بە نیگەرانییەوە ماتبوو.

ڕێبین بە دەنگێکی کەوتو گوتی: بۆ هەمووشت پارە پێویستە نە هاتنە دنیا و نەمردن بە خۆڕایی نییە بۆ ئەو نووسراو و بەیاننامانەش پارە پێویستە. باشە ئێستا تۆ دەزانی پارەی ئەو بڵاو کراوانە لە کۆێ دێ ؟

دایك لەو کاتەدا کە هەستی بە مەترسی دەکرد لە سەر خۆ گوتی: نازانم.

ـ هەروایە، منیش نازانم پاشان کێ دەیاننووسێ ؟

خەلك

ئەر بابەکان. ئەوانەی لە سەروی ئێمەوەن. دەنگی گڕتر دەبوو سەرو چاوی توکنی سوورتر هەڵدەگەڕا. کەوابوو گەورەکان دژی خۆیان ئەو بەیاننامانە دەنووسن. دژی ئەو کەسانەی دەسەلاتدارن و بەسەر ئێمەدا زاڵن. باشە پێم نالێی سودی بۆ ئەوان چیە .؟ بۆ بە خۆڕایی پارەی خۆیان خەرج دەکەن هەر بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەلك دژی خۆیان بوروژێنن....... ها ؟

دایك چاوی لە سەر یەك دانان و لێکی کردنەوە و بە ترسەوە هاواری کرد تێ چۆن بیر دەکەیەوە ؟ پێم نالێی؟

ڕێبین وە ك ورچێك خۆی لە سەر کورسییەکەی پان کردەوە و گوتی: هەر ئەوەیە. منیش کەبیرم لە وە کردەوە لە جێگای خۆم ڕەق هەلاتم.

ـ مەسەلە چییە هیچت زانیوە ؟

ـ خەڵەتاندنە. هەست دەکەم فریوە. هیچم نەزانیوە بەلام کە دەبینم فڕوفێڵ لە گۆڕێ دایە و گەورە گەورە و خوێندەوارەکان خەریکن فریومان بدەن من ئامادە نیم ... من پێداویستیم بە ڕاستی هەیە ڕاستی تێگەیشتوم و تێدەگەم و ئامەوی لەگەڵ دەولەمەندان یەك بگرم. کاتێکی پێویستیان بە ئێوە هەیە وەپێشتان دەخەن تا ئێسکەکانتان بۆ چوونە پێشی ئەوان بیێتە پردێك.

دایك بەو لاتاو و تیر و توانجانە دلی گیرا. لە خەفەتان هاواری کرد:

ـ خوایە! چۆن پاڤێل ئەوەندە تی نەگەیشتووە. ئەوانەی لە شارەوەش دین......... بەڕاستی ........؟

سەرو سیمای نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ و بیگور و ساشێنکای دەهێنا بەر چاو و دلی دەلەرزێ. سەری ڕاوەشاند و گوتی: نانا، من بڕوا ناکەم ویژدانیانە وایان لێدەکا. نا مەبەستی خراپیان نییە .

ڕێبین ژیرانە پرسی باسی کێ دەکەی ؟

ـ باسی هەموان...... هیچ کام لەو کەسانەی چاوم پێکەوتون سەودا بە خوێنی مرۆڤ ناکەن.

ئارەقەی بەسەر چاویدا دەهاتە خوارە و قامکەکانی دەلەرزین.

ڕێبین سەری بەرداوە گوتی: نابێ هەر تەماشایەکی ئەوەندە بکەی بەلکو پێویستە دوورتر ببینی..... ئەوانە لە ئێمە نزیکترن...... ڕەنگە خۆشیان تی نەگەیشتبن لایان وابی کاری باش دەکەن. ئەوانە دۆست و لایەنگری ڕاستین. بەلام ڕەنگە خەلکی ئەوتۆیان لە پشت سەری وێستابێ کە تەنیا لە فکری قازانجی خۆیان دابن. پیاو بێ

دەلیل دژی خۆی هەنگاو ناهاوێ. وەك دیهاتییەكی بێ بڕوابیەكی لە مێژینەی لە مێشكیدا بێ بە دلنیایی بەڵام زۆر بە ساویلكەیی گوتی: ئەرباب و خوێندەوارەكان هەرگیز كاری باش ناكەن ئەوەیە!

دایك توشی دوو دڵی و دردۆنگی بوو بوو. پرسی:

بڕیاری چت داوە؟

- من؟ چاوێكی لێكرد و تاوێك مات بو دووپاتی كردەوە و گوتی : لەگەڵ ئەوانەی لە ئێمە بەرزترن نابێ یەك بگرین. ئەوەندەیە! دیسان بێ دەنگ بوو گینگلی دا و گوتی : دایە من دەڕۆم. دەمەوێ لەگەڵ هەڤاڵەكانم كەوم وەك ئەوان كاربكەم بۆ ئەو كارە باشم لە سەری سوورم گێژنیم خوێندەواریشم هەیە بە تایبەتی دەزانم چی بە خەڵك بڵێم. هەر ئێستا دەڕۆم. دەزانم خەڵك پەشۆكاوە. لێی تێك چووە. هەموو حەسودن .

چونكە نێچیر كەمە دەیانەوێ یەكتر قوت بدەن هەر كەس خەریكە هاوڕەگەزی خۆی قوت بدا.

سەری بەرداوە و بە خەیاڵ دا چوو. تەنیا دەچمە گوندەكان كۆمەڵانی خەڵك هان دەدەم. خەڵك دەبیٚ خۆی بۆ ئازادی و سەركەوتن ڕاپەری ئەگەر تێبگا ڕۆژنەیەكی لێ دەبێتەوە من هەوڵ دەدەم تێی بگەیەنم كە بێجگە لە خۆی كە سی تر نییە ونابی هیوای بە كەس هەبی بێجگە لە خۆی نابی ڕێنوێنی دیكەی هەبێ ئەوەیە .

دایك سكی پێ دەسوتا ولە چارەنووسی دەترسا. ڕێبین لەبەرچاوی دایك هەمیشە مەترسیداربوو. بەڵام كوتو پڕ لەدایك و ەنزیك كەوتبوو بووبووە هاودەمی بیٚ ئیرادە مەترسیدار بیری كردەوە كە پاڤێل بە لایەك دادەڕواو ئەمیشەلایەكی تردا. زەحمەتی پاڤێل كەمتر دەبێ .

- دەتگرن!

- بەرم دەدەن وسەر ل نوێ دەست پیٚ دەكەمەوە.

- وەزێرەكان خۆیان بە گرتنت دەدەن لەوانەیە لە زیندان دا بمێنییەوە .....

- دێمەوە دەرێ و دیسان وەدووایكارەكەم دەكەومەوە....... وەرزێرەكان هەریەك دوو جار بە گرتنم دەدەن پاشان دەزانن بە قازانجیانە بە قسەم دەكەن. پێیان دەڵێم بڕوا بە قسەكانم مەكەن تەنیا گوێیان بدەنێ ئەگەر گوێیان دایە ئەودەمەبڕوام پێدەكەن .

هەر دوكیان بە سەبر قسەیان دەكرد وێ دەچوو بەر لەوەی قسەكانیان بكەن فیكریان لێ دەكەونەوە هەڵیان دەسەنگێنن.

ڕێبین گوتی: دایە گیان ژیانێكی ئەوەندە خۆش ڕانابوویرم لەم دووابییەدالێرە ژیاوم و زۆرشتم دیوە لە زۆر شت تێگەیشتوم ئێستا پێم وایە كە منداڵێك دەنێژم.......

دایك بە خەمناكی سەری ڕاوەشاند و گوتی : مخائیل ئیڤانۆڤیچ بە هیلاك دەچی .

چاوە رەش و قوڵەکانی تێبڕی و خۆی بۆ پێشەوە خوار کردەوە و لە کاتێکدادەستەکانی هاویشتبوونە سەر کورسی و ڕەنگی بزڕکابوو گوتی :دەزانی مەسیح لە بارەی دەنکە گەنمەوە چیی گوتووە؟ نامرێ بەڵکو زیندوو دەبێتەوە و گوڵ دەدا. مرۆڤ دەنکە گەنمی بەڕاستییە من هێشتا لە مردن دوورم ......حەقمە ......

خۆی لە سەر کورسییەکە بزاوت و لە سەر خۆ ڕاست بووەوە .دەچمە مەیخانە و تۆزێك ڕادەبوویرم. ئەندرێی نایەتەوە ...... دیسان دەستی بە کار کردووە.

دایك بە پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ هەموویان وەك یەکن هەر لە زیندان دێنە دەرێ و دەچنەوە سەرکاری خۆیان.

ـ هەر دەبێ ئاواش بێ. ئەوەی بۆ تۆم گوت: بۆی دەگێڕمەوە ؟.

چوونە چێشتخانە و بێ ئەوەی چاو لە یەك بکەن هێندێك قسەیان کرد :

بەڵێ بۆی دەگێڕمەوە. باشە خوا حافیز.

خوات لەگەڵ مەعاشەکەت کەی وەردەگری ؟

وەرم گرتووە , کەی دەڕۆی ؟ بەیانی زووخواحافیز .

خۆی دانەواند و بە گرانی وەدەرکەوت. دایك تاوێك لە بەر دەرگا ڕاوەستا گوێی دابووە دەنگی هەنگاوەکانی و دڕدۆنگییەك لەدڵی دا پەیدا بوبوو پاشان گەڕاوە کە گەیشتەوە ژووریٚ پەردەکانی لادا و لە پەنجەرەوە تەماشای کرد. تاریکاییەك شووشەکانی داپۆشیبوو دەتگوت شووشەکان دەمیان ئاواڵە کردووتەوە و نازانن چاوەڕوانی چین. دایك کەوتە بیرکردنەوە :

ـ من بە شەو دەژیم هەمیشە بە شەو. سکی بەم وەرزێرە ردین ڕەشە سوتا. سینگی ئەوەندە پان و قەوی بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەش داوە هەموو کەسی دیکە بێ هێزی پێوە دیار بوو.

ئەندرێی زوو بە خۆشحاڵی هاتەوە کاتێك دایك قسەکانی ڕێبینی بۆگێڕاوە گوتی :

دەڕوا؟ زۆر باشە، بابچێ لە دێهات ڕاستی بڵاو بکاتەوە و کۆمەڵانی خەڵك وەخەبەر بێنێ مانەوەی لەگەڵ ئێمە بۆ ئەو دژوار بوو. بیروباوەڕێکی تایبەتی لە سەریدا هەیە، ناهێڵێ بیروباوەڕی ئێمە بسەلمێنێ.

دایك لە سەرخۆ گوتی: باسی دەوڵەمەند و ئەرباب و خەڵکی خوێندەواری کرد .

وادیارە کەڵەکێك لە گۆڕێدا هەیە بەو مەرجەی ئێمە فریو نەدەن .

ئەندرێی بە پێکەنینەوە گوتی: ئەو مەسەلە تۆ نارەحەت دەکا ؟ ئاخ .. پارە خۆزیا پارەمان هەبایە هێشتا لەو بارەوە چاو لە دەستین بۆ نمونە نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ کە مانگی حەفتا و پێنج ڕۆبل وەردەگرێ مانگی پەنجا ڕۆبل دەدا بە ئێمە. ئەوانی دیکەش هەر ئاوا. خوێندکارە برسییەکانیش لە نێو خۆیاندا پارەیەك کۆ دەکەنەوە و

هێندێکی بۆ ئێمە دەنێرن. دیارە هەموو جۆرە خەڵکێك هەیە هێندێك ئێمە فریو دەدەن. هێندێك دەبنە کۆسپی سەر ڕێگامان بەڵام ئەوانەی باشن تا سەرکەوتن لە گەڵمان دەبن .

دەستەکانی ڕێك کوشین و درێژی پێدا : بەڵام ئەو سەرکەوتنە جاریˇ لە ئێمە زۆر دوورە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەین. ڕۆژی هەوەڵی مانگی ئەیار جێژن دەکەین جێژنێکی زۆر خۆش دەبێ.

قسەکانی، ئەو پەژارەیان هێدی کردەوە کە ڕێبین خستبوویە دڵی دایکەوە ئەندرێی هاتوچۆی دەکرد. لە کاتێکدالاقی بە دواری خۆیدا ڕادەکێشا دەستێکی بە سەر و چاوی خۆیدا هێنا. چاوەکانی دەعەرزی بڕی و قسەکانی درێژە پێدا:

خوزگە دەتزانی کە هێندێ جار توشی چ هەستێکی سەیر دەبم وام دێتە بەر چاو کە بچمە هەر شوێنێك خەڵکم لە گەڵە. هەموو بە ئاگرێك سوتاون و هەموو کەیف خۆش و باشن .... قسان دەکەن و بە لێو بێ دەنگن و ئیتر هیچ کەس هاورەگەزی خۆی ئازار نادا و پێویستی بەو کارە نییە. ژیان یەکسانە و هەرکەسە سروودی خۆی دەخوێنێتەوە . تەواوی ئەو سرودانە وەك چەند جۆگەلە دەبن بە چەمێك کە بەمەندی وئارامی دەڕژێتە نێو دەریای ڕووناکی ژیانی ئازادەوە. بە خۆم دەڵێم تەواوی ئەوانە جێبەجێ دەبن ئەگەر ئێمە بمانەوێ وابێ. هەروا دەبێ ئەو دەم دڵی خەفەتباری من پڕ دەبێ لە خۆشی ئەوەندە کەیف خۆشی دەبم دەمەوێ لە خۆشییان بگریم .

دایك ورتەی لێ نەهات تا خەیالاتی تێك نەدا وقسەکانی نەبڕێ. هەمیشە پتر بە وردی گوێی بۆ قسەکانی ئەو ڕادەگرت تا هاورێکانی دیکەی چوونکە قسەکانی ساکار تر بوون و کاریان لە دڵی دەکرد. پاڤێلیش چاوی لە دوارۆژ بوو کاتێکی مرۆ پێ دەنێتە ئەو ڕێگایە چۆن دەکرێ کردەوەی جۆرێکی تربێ ؟ بەڵام پاڤێل قەت هەستی خۆی دەرنەبڕی. ئەوەی دیبووی بە کەسی نەدەگوت. دایك پێی وابوو کە ئەندرێی لە ڕۆژنەی دڵیەوە دڕوانێتە دوارۆژ. هەمیشە داستانی سەر کەوتنی تەواوی خەڵکی سەرزەوی لە قسەکانیدا دووپاتە دەکردەوە ئەو داستانە لە بەر چاوی دایك ئەو ژیان و ڕێگایەی ڕووناك دەکردەوە کە کوڕەکەی و هەڤاڵەکانی گرتبوو یانە پێش. ئەندرێی سەری ڕاوەشاند و قسەکانی درێژە پێدا:

- کاتێکی دێمەوە سەرخۆ و لە دەورووبەری خۆم دەڕوانم دەبینم هەموو شت بێ تام و ساردە. خەڵك تووڕە و ماندوون وژیانیان شپرزە و پوچەڵە .

لە پێش دایك ڕاوەستا و پاشان سەری ڕاوەشاند و بە دەنگێکی هێدی و خەفەتاوی و بە نیگایەکی پر لە داخ و پەژارە درێژەی بە قسەکانی دا:

- سووکایەتیە. ئیتر ناکرێ بڕوات بە مرۆڤ هەبێ تەنانەت دەبێ لێشی بێزار بێ و بترسی. هەردەڵێی مرۆڤ دەبێتە دوو ئینسان. ژیان دەیکاتە دووبەش مرۆڤ دەیەوێ بتوانی تەنیا شتی خۆش بوێ چۆن شتی وا دەبێ چۆن

دەکرێ لە یەکێك خۆش بی کە وەك دڕندە ئامبازت دەبێ و نایەوێ گیانت لە بەردا بێنی و دەستت لێ دەوەشێنی ؟ لێخۆش بوونی ئەم دژوارە. من لەبەر خۆم وا نالێم ئەگەر تەنیا هەر خۆم بام هەموو سووکایەتییەکم قبوڵ دەکرد. بەڵام نامەوێ لە گەڵ زاڵم و زۆرداران رێك کەوم. نامەوێ پشتم بۆ ئەوان ببێتە فێرگەی لێدانی خەلکی تر .

تروسکەیەکی سارد لە چاوەکانی دا دەدرەوشا. بە حاڵەتێکی جیدی سەری دادەنواند و بە مەندییەکی پتر قسەی دەکرد.

ـ نابێ چاو لە هیچ شتێکی خراپ بپۆشی با زیانی بۆ ئێمە نەبێ من لە سەر زەوی تەنیا نیم. وای دابنێن ئەمرۆ من هیچ دەست ناکەمەوە جنێوم پێبدەن ڕەنگە بزەم بێتێ.چوونکە لە جنێوپێدان توورە نیم. بەڵام ئەو کابرای جنێوی داوە و هێزی خۆیلە سەر من تاقی کردۆتەوە سبەینێ خەڵکی تر کەوڵ دەکا هەر بۆیەش نابێ هەموان بە چاوێك چاو لێبکەین. دەبێ جڵەوی دڵ ڕابگرین و دۆست و دوژمن لێك جیا بکەینەوە. ئەوە کارێکی بە ئینسافانەیە بەڵام دڵ پەسەندی نییە.

دایك بێ ئەوەی هۆیەکەی بزانێ ساشێنکا و ئەفسەرەکەی وەبیر هاتەوە. هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: گەنمێکی هێشتا نەچێندراوە چۆن دەیکەی بە نان ؟

چارە ڕەشی هەرلەوەدایە دەبێ بە چاوی جیاواز بڕوانی, دوو دڵ لە سینگی ئێمە دا لێ دەدەن. یەکێان خەڵکی خۆش دەوێ ئەوی دیکە پێمان دەڵێ ڕاوەستە، ئاگادار بە، ئینسان دەبێتە دوو بەش .دایك هاواری کرد بەڵێ، وایە .

سەروچاوی نالەبار و گرژ و دزێوی مێردەکەی وەبیر دەهاتەوە، دەتگوت: بەردەلە قوماشیان وەرپێچاوە. ناتاشای هێنا بەرچاو کە مێردی بە ئەندرێی کردووە و کوڕەکەشی ساشێنکای هێناوە و بە ئاوات گەیشتووە. ئەندرێی گەرم داهاتبوو لە سەر قسەکانی ڕۆیی:

ـ سەبەبی چییە ؟ ئەوەندە ئاشکرایە تەنانەت گەمە و گاڵتەشە. هۆی ئەوەیە کە خەڵك هەموو لە پلەیەکدا نین کەوابوو ئەوەندە بەسە کە هەموان لە یەك ڕیزدا رابگرن .

پاشان عاقڵ پەیدای کردووە و ئەوەی دەست دروستی کردووە وەك یەك بەسەریان دا ببەشنەوە ئەو دەم ئیتر یەکتر لە کۆیلەتی و لە ترس و لە زنجیری تەماع و نەفامی دا ڕاناگرن. دایك و ئەندرێی زۆر جار پێکەوە ئەو قسەیان دەکرد. ئەندرێی سەر لە نوێ لە کارخانە دامەزرابووەوە و کاری دەکردهەموو داهاتی خۆی دەدا بە دایك ئەویش هەرجارئەندرێی بەو ساکارییەی کە پارەی پێ لە پاڤێڵ وەردەگرت لە ئەندرێشی قبوڵی دەکرد. هێندێ جار ئەندرێی بە بزەیەکەوە بە دایکی دەگوت:

دایە گیان چۆنەبیانژمێرین، ئا ؟

پێلاگێیا بە گاڵتە کردن خۆی لێدەبوارد. زەردەخەنەی ئەندرێی تۆزێك دڵگیری دەکرد و لە دڵی خۆیدا دەیگوت :

ـ ئێستا کە پێدەکەنی بۆ چی لەو بارەوە قسە بکەین ؟

ئەندرێی دەیدیت کە دایك لە جاران پتر مانای ئەو وشانە دەپرسێتەوە کە نایانزانێ . لەو کاتەدا بێ ئەوەی وەسەرخۆی بێنێ یا تەماشای بکا قسەی دەکرد. ئەندرێی زانی کە دایك بە نهێنی خەریکی خوێندن و فێر بونە بەڵام شەرم دەکا بێدرکێنێ. ئیتروازی لەوە هێنا کە دەرسی پێ بێژی.

رۆژێکیان دایك گوتی: ئەندرێی گیان چاوم چاك نابینن پێم خۆشە چاویلکەم هەبێ ..........

ـ باشە، ڕۆژی یەك شەمۆ پێکەوە دەچینە شاری دوکتورێك کە ناسیاوی منە تەماشای چاوت بکا و پاشان چاویلکەی دەکڕین.

## (١٩)

سێ جار چووبوو چاوی بە پاڤێلْ بکەوی هەموو جارێ ئەفسەری ژاندارمە کە کابرایەکی سەرسپی و لوت گەورە و دەم و چاو سوور بوویە زمانی خۆش جوابی کردبوو.

ـ خوشکم حەوتوویەکی تر، زووتر نابێ، پاش حەوتوویەك وەرەوە ... ئەمڕۆ نابێ

کابرایەکی خڕکەڵە و قەڵەو بوو دیار نەبوو بۆچی وەك تەماتەی گەیشتو بڵ دەچوو. بێ پسانەوە چیلکەی لە ددانە سپی و وردەکانی وەردەدا. چاوەشینو بچووکەکانی بزەیان دەهاتێ. دەنگی نەرم و دۆستانە بوو. دایك دەیگوت کابرایەکی بە ئەدەبە هەمیشەبزەی لە سەر لێوە. واباش نییە ئەفسەرێکی کاربەدەست بێ نابێ ناواگەمەی بکا ....

ئەندرێی گوتی: بەڵێ ئەوانە مێهرەبان و ڕۆخۆش و هەمیشە زار بە پێکەنین. پێیان دەڵێن: ئەو پیاوە بە هۆش و شەریفە بۆ ئێمە مەترسی هەیە کەوابوو لە داری بدەن. بزەیان دەێتی و مرۆڤ لە دار دەدەن پاشان سەرلە نوێ پێ دەکەنن..

دایك گوتی: ئەوەی هاتبوو ماڵمان بگەرێ باشتر بوو. زۆر ساکارتر بوو. پیاو جێبەجی دیزانی کە خوێڕی وناجسنە ........

هەردەڵێی ئادەمیزاد نین بەڵکو ئامرازێکن بۆ گێژ کردنی کۆمەڵانی گەل. قازانجیان ئەوەیە کە جۆرێك ئێمە ڕابین دەوڵەت هاسانتر بتوانی کەڵکمان لێوەربگری. ئەوانە خۆیان بە دەستێك دروست کراون کە ئێمە بەڕێوە دەبا هەرچی ئەمریان پێدەکەن بە بێ لێکدانەوە و ئەملاو لا دەتوانن ئەنجامی بدەن.

ـ چ ورگێکی هەیە
ـ بەڵێ تا ورگی گەورەتر بێ گیانی چەپەڵترە ......................
ناخرەکەی ڕێگایان دا. ڕۆژی یەك شەمموو دایك چووە دەفتەری زیندان و بە مل کەچی لە قوژبنێـك دانیشـت. لەو هۆدە پیس و تەنگەدا خەڵکی دیکەش دەبینران. بێ گومان ئەوە یەکەم جار نەبوو کە لەوێ کـۆ دەبوونـەوە یەکتریان دەناسی بە سرتە و هێدی قسەیان دەکرد.
ژنێکی قەڵەوو دەم و چاوسیس جانتایەکی لە سەر ئەژنۆ بوو دەیگوت:
ـ ئەمڕۆ بەیانی سەرۆکی کلیسا لە نزێژی جەماعات دا گوێی منداڵێکی هەڵکەندووە کەلـە دەسـتەی دووعـا خوێنان بوو .
پیاوێکی عاقڵ کە جلی سەربازی لێکەوتوی لەبەردا بوو کۆکەیەکی هاتێ و گوتی:
ـ ئەو منداڵەدووعا خوێنانەی کلیسا زۆر بێ شەرمن .
کابرایەکی کەچەڵی بچووکی گێری شەویلاك دەرپەڕیو هـەر وەك یـەکێکی پـڕ کـار لـە هۆدەکـەدا دەهـات و دەچووبێ ئەوەی و چان بدا گوتی :
ـ ژیان دژوارتر دەبێ‌هەربۆیەش خەلك لە رابوردوو خراپتر بـوون "گەروانکـە" ی گۆشـتی گـای دەرجـەی دوو بووەتە ١٤ کەپێك و نان بووەتە دوو کەپێك و نیو ........
هێندێ جار زیندانییەکان بە جلی بۆر و پێڵاوی چەرمەوە دەهاتنە ژووری. کەدەهاتنە ئەو ژوورە نیوە تاریکـە واقیان وڕ دەما. مژۆلیان لێك دەدا. یەکیان زنجیری دە لاقاندا بوو.
وا دیار بوو ئەوانەی لەوێ بوون دەمێك بوو بە دیتنی ئەو دیمەنە راهاتبوون. بە چاوی تەسلیمەوە سـەیری ئـەو وەزعەیان دەکـرد. هێنـدێك دانیشـتبوون و هێنـدێك کێشـکیان دەکێشـا.هێنـدێکیش بـە پـەژارەوە لـە گـەل زیندانییەکان قسەیان دەکرد. دایك لە بێ سەبرییان دڵی دەلەرزی بـە پەشـۆکاوی تەماشـای دەوروبـەری خـۆی دەکرد لەو ساکارییە ناخۆشەی ژیان سەری سووڕ دەما .
پیرەژنێکی چکۆڵەی چاو زەردی دەم و چاو هەڵقرچاو لە پەنای دانیشتبوو گوێی بۆ قسـان هەڵخسـتبوو. ملـە باریکەکەی درێژ دەکرد و بە تووڕەیی لە هەمووانی دەڕوانی.
دایك لێی پرسی : کێت گیراوە ؟
ـ کوڕم گیراوە. خوێندکارە ئەی تۆ کێت گیراوە ؟
ـ منیش کوڕم گیراوە. کرێکارە.ناوی چیە ؟ ڤلاسۆڤ
ـ نایناسم دەمێکە لێرەیە ؟حەوت حەوتووە.

- كوڕی من دەمانگە.

دایك هەستی كرد كە نازایەتییەك لە دەنگی دا هەیە. ژنێكی بالآبەرزی ڕەش پۆش و ڕەنگ بزڕكاو بە هێدی گوتی: بەو زووانە هەمووكەسی بە شەرەف دەگرن ئیتر لە تامدا نەماوە.

كابرای كەچەڵ وەڵامی داوە :

بەڵێ بەڵێ. لەوزەدا نەماوە هەموو كەس تووڕە و بێزار هاوار دەكەن و هەمووشت گران دەبێ. لە ئەنجامدا نرخی مرۆ دێتە خواری. ˇ هیچ دەنگیكی ڕەوا نابیسرێ.

كابرای سەرباز گوتی: بەڵێ راستە وەزعێكی زۆر نالەبارە ئاخرەكەی دەبێ دەنگێكی قەوی فەرمان بدا "دەنگ" بن ئەوە پێویستە دەنگیكی قەوی.......

قسەكان گەرمتر دەبوون هەر كەس بیرو ڕای خۆی لە بارەی ژیانەوە دەردەبڕی بەڵام سەبر قسەیان دەكرد. لەم و تووێژانە دا دایك هەستی بە شتێك دەكرد. كە بۆ ئەو بێگانە بوو لە ماڵی ئەوان بە جۆرێكی تر قسە دەكرا. یانی ساكارتر و ئاشكراتر و ڕەپ و راست .

پاسەوانێك بە ریشێكی پانەوە هاواری كرد:

خوشكە ڤلاسۆڤا تەماشایەكی كرد و گوتی: وەرە

بە شەلە شەل وەدەركەوت. دایك دەیویست خۆشتر بڕوا و وەپێشی بكەوێ ˇ ئاخرەكەی لە هۆدەیەكی بچووك چاوی بە پاڤێلْ كەوت. دەستی بۆ ڕاكێشا بوو و بزەی دەهاتێ. دایك دەستی گرت و لە قاقای پێكەنینیی دا. لە كاتێكدا مژوڵی لێك دەدان لە سەرخۆ گوتی:

- ڕۆژ باش.

پاڤێلْ دەستی دایكی گوشی و گوتی: دایە گیان لە سەرخۆ بە.

- بە چاوان بەچاوان.

پاسەوان گوتی: دایە تۆزێك وەدووركەوە. بە ینێكتان هەبێ، ڕەسم وایە، باوێشكی هاتێ و هەناسەیەكی هەڵكێشا. پاڤێلْ پرسیاری لە ساخی و سلامەتی دایكی و وەزعی ماڵێ كرد و دایك چاوەروانی پرسیاری دیكەش بوو، لە چاوەكانی كوڕەكەیدا بۆیان دەگەڕا بەڵام هیچ نەبوو. وەك هەمیشە ئارام و لە سەرخۆ بوو تەنیا تۆزێك ڕەنگی پەڕیبوو چاوەكانی گەورەتر دەهاتنە بەرچاو.

دایك گوتی: ساشێنكا سلاوت لێ دەكا .

پاڤێلٚ چاوی لە سەر یەك دانان و بە زەردەخەنەیەك دەم و چاوی گەشبوونەوە و پەژارەیەکی توند دڵی دایکـی ئازار دا. دایك بە توورەییەکی کوت و پڕ گوتی: بەم زوانە ئازادت دەکەن ؟ بۆچـی تۆیـان گرتـووە ؟ خۆدیـسـان بەیاننامە بڵاو کرانەوە .

پاڤێلٚ لە خۆشیان چاوەکانی زەق بوون و گوتی: بەڕاستیتە ؟

پاسەوان بە دەنگێکی گیراو گوتی : باسی ئەو قسانە قەدەخەیە تەنیا باسی کاروباری ماڵێ بکەن .

دایك گوتی: بۆ ئەوانە کاروباری ماڵێ نین ؟

ـ نازانم ئەوەندەی دەزانم قەدەخەیە. دەبێ باسی جل و بەرگ و خواردن بکەن, نەك شتی تر .لە گەڵ ئـەوەش وا دیار بوو بە لایەوە گرنگ نییە . پاڤێلٚ گوتی: باشە دایە گیان با قسە لە وزعی مـاڵێ بکـەین تـۆ خـۆت چ دەکەی ؟ دایك لە کاتێکدا هەستی بە غیرەتی لاوێنی دەکرد. لە وەڵامدا گوتی : هەموو شتێك دەبەمەکارخانە ........... هەرچی ماریا لێی بنێ ........ هەمو جۆرە چێشتێکی دیکەش ......

پاڤێلٚ تێگەیشتبوو بە پێکەنینە وە قژەکانی لادا و بە دەنگێکی دڵ بزوێن کە دایك تا ئەو کاتە نەیبیستبوو گوتی :دایە گیان، دایکی خۆشەویستم کارێکی چەند باشە. خۆشە کارت هەیە، ماندوو نابی، نـا مانـدوونابی. دایك بە فیزێکەوە گوتی: کاتێکی نووسراوەکان بڵاو کرانەوە منیشیان پشکنی.

پاسـەوان خەریك بوو توورە ببێ. هاواری کرد. دیسان لەو قسانە دەکەن. دەڵێم قەدەخەیە. بۆیە خەڵك دەگرن و لە ئازادی بێ بەشیان دەکەن تا ئاگایان لە هیچ نەبێ. دایە تۆ زۆر قسە دەکەی دەبێ بزانی ئـەوەی قەدەخەیـە، قەدەخەیە .

پاڤێلٚ گوتی: دایە گیان ئیتر باسی ئەو قسانەمەکە. "ماتڤێی ئیڤـانۆڤیچ" پیـاوی چـاکە نـابێ نارەحـەتی کەی، پێکەوە باش سازاوین. ئەمرو بە رێکەوت لێرەیە. رۆژەکانی دیکە بەرێوەبەری زیندان لێرە دەبێ ماتڤیێ ئیڤانۆڤیچ دەترسێ.

پاسەوان تەماشای سەعاتەکەی کرد و گوتی: ماوەی چاوپێکەتن تەواو بوو.

پاڤێلٚ گوتی: سوپاس، دایە گیان سوپاس. دڵگیر مەبە. بەم زووانە ئازاد دەکرێم .....

توند لەئامێزی گرت و ماچی کرد. دایك لە خۆشیا ن دەگریا. پاسەوان هاواری کرد : جیا بنەوە. مەگری، بـەم زووانە ئازاد دەبێ و دێتەدەر. زۆر کەس ئازاد دەکەن. ئیتر جێگا نەماوە. ژمارەی گیراوەکان زۆر بووە بـە بۆڵـە بۆڵ دایکی بەرێ کرد ........

دایك لە ماڵێ بە ئەندرێی گوت: بە ژێری قسـەم لە گەڵ کـرد ......... تێگەیشـتووە پاشـان بـە خـەمناکی هەناسـەیەکی هەڵکێشا، بەڵێ تێگەیشتووە دەنا وای ماچ نەدەکردم...... هەوەڵێن جاربوو .........

ئەندریی بزەیەکی هاتێ وگوتی: ئای! خەڵکی تر ئاواتیان هەمووشتێکە، بەڵام چاوەڕوانی دایکان تەنیا لاواندنەوەیە.

دایك گوتی: خۆزگە ئەوانی دیکەشت دیبان کە بۆ چاوپێکەوتن هاتبوون. هەر دەڵێی بەو وەزعە راهاتون. منداڵەکانیان لێ ئەستاندوون و گرتویانن، بەڵام ئەوە هیچ کاری تێ نەکرون. دێن و دادەنیشن و چاوەروان دەبن. پێکەوە قسە دەکەن. کاتێکی خوێندەوارەکان واباش بەم وەزعە رادێن،ئیتر چاوەروانی چی لە کرێکاران دەکرێ ؟

ئەندریی بە پێکەنینەوە گوتی: شتێکی تەواو ئاساییە هە رچۆنێك بی قانون لە بارەی ئەوانەوە نەرمترە تا لە بارە ی ئێمە. پێداویستیان لە ئێمە پترِ بە قانون هەیە. هەر بۆیەش کاتێك قانون زیانێکیان پێ دەگەیەنی هەر بەوەندە وازدێنن کە نێو چاوانیان گرژ بکەن و لەوە تێ ناپەڕێ. قانون تا رادەیەك پشتیوانی ئەوانە لە کاتێکدا دەست و پێی ئیمە دەبەستیتەوە تا دەست نەبزێوین.

## (٢٠)

شەوێك لە کاتێك دا دایك لە نزیك میزدانیشتبوو شتێکی دەچنی و ئەندرییێش بە دەنگی بەرز مێژوی شۆرشی کۆیلەکانی رۆمی دەخوێندەوە. یەکێك توند لە دەگاری دا. کە ئەندریی دەرگای کردەوە ڤێسۆڤشیکۆڤ وەژوور کەوت. بوخچەیەکی لەبن هەنگلی دا بوو. کلاوەکەی تا سەر برۆیان داکێشابوو. تا ئەژنۆیان قوراوی بوو .

بە دەنگێکی سەیر گوتی: بێرەدا تێدەپەریم دیتم چراتان داگیراساوە هاتم سلاوێکتان لێ بکەم. ئێستا لە زیندان هاتومە دەرێ. پاشان بە توندی دەستی دایکی گوشی و گوتی: پاڤێل سلاوی لێ دەکردی. خۆی هاویشتە سەرکورسی و بە چاوێکی دردۆنگانە هۆدەکەی پشکنی. دایك خۆشی نەدەویست. سەری تاشراو و چاو چکۆلەکانی شتیکیان تێدا بەدی دەکرا کە پیرەژن هەمیشە لێی دەترسا، بەڵام لە گەڵ ئەوەش بە دیتنی شاد بوو. بە مێهربانی و پێکەنینە وە گوتی :

ـ زۆر کز بووی. ئەندریی با چای بۆ ساز کەین.

ـ ئەوە خەریکم سەماوەرە تێداوێم.

ـ باشە پاڤێلّ چۆنە؟ بێجگە لە تۆ کەسی دیکە ئازاد کرا؟

سەری بەرداوە و گوتی: پاڤێلّ هەرگیراوە ......... زۆر هێدی و بە سەبرەوە، بێجگە لە من کەسیان بەرنەدا.

چاوی هەڵێنان و تەماشای دایکی کرد و بە شێنەیی گوتی :

ـ پێم گوتن: "لێم گەڕێن بابروم لەمە پتر خۆڕاناگرم. دەنا یەکێکی دەکوژم و خۆشمَ دەکوژم." منیان ئازاد کردکارێکی باشیان کرد. دەنا قسەی خۆم دەبردە سەر..........

دایك لێی وەدورکەوت و گوتی: بەڵێ ......... کاتێکی چاوی لە گەڵ نیگای توندی ئـەو تێـك هەڵـدەنگوت بێ ئیرادە مژولی لێك دەدان. ئەندرێی لە چێشتخانەوە بانگی کرد: فێدیا مـازین حـاڵی چـۆنە ؟ هـەروا شـیعر دەڵێ؟

سەری راوەشاند و گوتی: بەڵێ من سەر لە کارەکانی دەر ناکەم چما دەعبایە لە قەفەسیشی دەکەن و دیسـان هەر دەخوێنی تەنیا شتێك دەزانم ئەویش ئەوەیە کە نامەوێ بچمەوە ماڵێ....

دایك تۆزێك داما و گوتی: ئێستا دەبی کێ لەوی بی ؟ چۆلە ئاگریشی لێ هەڵنەکراوە.دەبـی زۆر سـارد بـێ ڤیسۆڤشیکۆڤ مات بوو چاوەکانی لە سەر یەك دانان پاشان قوتووە سیغارەکەی لە گیرفـانی دەرهێنـا و دەسـتی کرد بە سیغار کێشان. چاوی لە و دوکەڵە شینە دەکرد کەدە حەوای هەڵدەبوو. لە پڕ وەك حەپەی سەگێکی تورە قاقایەکی سەیری لێیدا :

ـ بەڵێ ژوورەکەم رەنگە سارد بێ. بێ گومان قالۆجەی سەرما بردوو لەوێ کەوتون. ڕەنگـە مشـکەکانیش لـە سەرمان ڕەق هەڵاتبن. پێلاگێیا نیلۆڤنا ڕێگا بدە ئەمشەو لە مالی ئێوە بم. دەتوانم .

دایك خێرا وەڵامی داوە : دیارە دەتوانی. لە رووداماني ناوێ. دایك بەو پرسیارە نارەحەت بوو.

ـ ئێستا زەمانە وای لێهاتوە منداڵ بە دایك و باوکی خۆیان شەرمە.

دایك هەستا سەرپێ و گوتی چی ؟

چاوێکی لێکردو برژانگی لە سەر یەك دانان و دەم چاوە گرویێەکەی وەك کوێرانی لێهات :

دەلێم منداڵی ئەم زەمانەی بە دایك و بابی خۆیان شەرمە. مەترسە، مەبەستم تۆ نییە .

قەت تۆ نابی بە هۆی شەرم و ڕیسوایی بۆ پاڤێل، بەڵام من بابی خۆم شەرمە.

نامەوێ بچمەوە ماڵەکەی. ئیتر نە بابم هەیە و نەماڵ و حـاڵ . ئێسـتا لـە ژێـر چـاودێری پـۆلیس دام. دەنـا دەچوومە سیبریا. لام وایە کەسێك زەحمەتکێش بێ دەتوانی لە سیبریاش زۆر کاربکا ..........دوور خراوەکانم ئازاد دەکرد و یارمەتیم دەدان کە ڕابکەن. دایك لە بە رئەوەی زۆر دڵ ناسك بوو هەسـتی دەکـرد کـە ئـەو لاوە ئازار دەکێشی بەڵام بەزەیی بەو گڕوێ یە دا نەدەهات بۆ ئەوەی بە وەڵام نەدانەوە دڵی نەیەشێنی گوتی :

بەڵێ، دیارە کەوابوو باشتر ە بچی .

ئەندرێی لەچێشتخانە هاتە دەر و بە پێکەنینەوە گوتی: ئەو فلتە فلتە چییە؟ دایك هەسـتاو گـوتی: دەچـم نانی ساز دەکەم. ڤیسۆڤشیکۆڤ تەماشایەکی ئەندرێی کرد و گوتی:

_دەڵێم زۆر کەسی ئەوتۆ هەن کە دەبێ بکوژرێن!

_بۆچی......لەبەرچی؟

_بۆ ئەوەی ئیتر نەمێنن!

_کەوابوو تۆ حەقی ئەوەت هەیە کەسێکی زیندوو بمرێنی؟کێ ئەو حەقەی داوە بە تۆ؟

_خەڵك ئەو حەقەیان داوە بەمن.ئەندرێی لە نێوەڕاستی ژوورەکە راوەستا و لەکاتێك دا قەدو باڵای بەرزی دەجوڵاند،سەر تا پێ لێی وردبووەوە.ڤێسۆڤشیکۆڤ دانیشتبوو. تەمێك لە دووکەڵی جگەرە دەوری دابوو. سوورایی لە روومەتی بزرکاویدا خۆی دەنواند. مستی کردە گرێ و دووپاتی کردەوە.

_خەڵك ئەو حەقەیان داوە بەمن.کاتێکی شەقم لێدەدەن،حەقم هەیە تۆڵەی خۆم بکەمەوە. لەدەم و لوتیان بدەم.ئەگەر دەستم لێ نەدەن،منیش دەست لە کەس نادەم.ئەگەر لێم گەڕێن بە دڵخوازی خۆم بژیم،سوێند دەخۆم بەهێدی و هێمنی دەژیم و کەس ئازارنادەم. وای دابنێین کە بمەوێ لە نێو لێڕەوارێك دا بژیم.لە لێواری جۆگەیەك بۆخۆم کۆڵێتێك دروست دەکەم بەتاقی تەنیا لەوێ دەژیم.ئەندرێی شانی هەڵتەکاند و گوتی!باشە.....وابکە.سەری ڕاوەشاند و مستێکی لە ئەژنۆی خۆی دا و گوتی: ئێستا ئیتر دەرەتان نییە!

_بۆچی......کێ ناهێڵێ؟

_خەڵك!تا دووا هەناسە لەگەڵ خەڵك کەوتوم.بە هەودای قین لە دڵی من هاڵاون.بەخراپە منیان بەخۆیانەوە بەستودتەوە. هەودایەکی قایمە.لێیان بێزارم و بچمە هەر جێگایەك ناهێڵم بە ئاسودەیی بژین.بوون بەهۆی زەحمەتی من و منیش دەبم بە هۆی زەحمەتی ئەوان. من بەرپرسی خۆمم .....تەنیا بەرپرسی خۆمم ....ناتوانم بەرپرسی کەسی دیکە بم....تەنانەت نی باوکیشم کەدزە.....ئەندرێی لە ڤێسۆڤشیکۆڤ وە نزیك کەوت و گوتی: ئاخ!

_ڕاوەستە....دەبینی ....سەری ئیسای گرۆبۆڤ پان دەکەمەوە.ئەندرێی لە سەرخۆ پرسی :بۆچی؟

ڤێسۆڤشیکۆڤ چاوێکی دوژمنانەوە سەیرێکی ئەندرێی کردو گوتی:

_بۆئەوەی ئیتر جاسوسی نەکا و قسان نەهێنێی و نەبا. ئەو بووەتە هۆی بێ ئەخلاقی باوکم.....بابم بۆ ئەوەی ببێ بە پۆلیسی نهێنی ،هیوای بەیارمەتی ئەو هەیە!ئەندرێی دەنگی بەرز کردەوە:شتێکی سەیرە!کێ لە سەر ژیانی باوکت تۆی سەرکۆنە کردووە؟ ئەحمەقەکان!

_ئەحمەقەکان و پیاوە تێگەیشتووەکانیش .بۆنمونە تۆ کوڕێکی وریا و ژیری ،پاڤێلیش وایە. باشە ئەو بیرو ڕایەی لە سەر فێدیا مازین و سامۆیلۆڤ و لەسەر یەکترتان هەیە،لەسەر منیشتان هەیە؟درۆ مەکە. ئەگەر واش بڵێی بڕوات پێ ناکەم..ئێوە هەمووتان خۆ لەمن دەپارێزن و دووریم لێدەکەن.ئەندرێی لە پەنای دانیشت و بەدەنگێی نەرم و دڵسۆزانە وەڵامی داوە:

_هاورێ،گیانت نەخۆشە!

_بەڵێ ئێوەش گیانتان لەئازار دایە، بەڵام پێتان وایە ئازاری ئێوە لە ئازاری من نەجیب ترە.هـەمووومان وەك ناجسنان لەگەڵ یەکتر دەبزووینەوە. قسەی من ئەوەیە .فـەرمو وەڵام دەوە! چـاوی لـە ئەنـدرێی بـڕی و ددانـی دەرخستن و چاوەڕوانی وەڵام بوو .ڕەنگی بزرکابوو.لێوە ئەستورەکانی وەك بەئاوێکی تیژ سوتابن هەڵقرچـابوون و دەلەرزین. ئەندرێی بەزەردەخەنەیەکی گەش و خەمناك،نیگای دوژمنانەی ڤێسۆڤشیکۆڤی لاواندەوە و گوتی :

_وەڵامت نادەمەوە.باش دەزانم قسەکردن لەگەڵ کەسێك کەدڵی پڕە لەخوێن تەنیا دەبێتە هـۆی ناڕەحـەتی و تێکچوونی. دەزانم براگیان. لاوەکە چاوی بەردا ئەوە و بۆ لەیەکی لێهات: بەڵێ لەگەڵ من قسـەش ناکـەن.مـن باس و وتووێژ نازانم.ئەندرێی گـوتی: لام وایـە هـەر یـەك لەئێمـە بەشـی خـۆی کـوێرەوەری دیـوەو لـە ڕۆژە تاریکەکانی ژیانی دا وەك ئێـستای تۆ ڕای بواردووە....ڤێسۆڤشیکۆڤ گوتی :ناتوانی هیچـی وا بڵێـی کـەمن هێدی کاتەوە،هیچ شتێك...گیانم وەك گورگ دەلورێنێ....

_مەبەستم ئەوە نییە ،ئەوەندەی دەزانم حاڵت ئاوا نامێنێ.ناڵێم ئێـستا ،بەڵام چـاك دەبـێ.....دەسـتی کـرد بەپێکەنین و دەستەکانی لە شانی ڤێسۆڤشیکۆڤ دا و گوتی:

_برا گیان ئەوە لە ئەخۆشییەکانی منداڵانە،وەك سوورێژە وایە،هەموومان زۆر یا کەم،گران یا سوك بەگوێرەی لاوازی و بەهێزیمان توشی بووین....ئەو ئەخۆشییە هەموومان دەگرێ.کاتێکی تـەنیاین و هێشـتا مانـای ژیـن نازانین و جێگا و ڕێگای خۆمان ناناسین،وا دێتە بەرچاو کەلە سەر ئەم زەوییە مرۆڤی بەڕاسـتی هـەر ئێمـەین و مەگەر بۆ قوت دان دەنا کەس لەفکری ئێمە دا نییە،پاش ماوەیەك ،کەدەبینی بێجگە لە سـینگی تۆ،سـینگی دیکەش گیانێکی پاك و خاوێنیان تێدایە،هێدی دەبیەوە....لەوەی کە پێت وابووە لە کۆنسێرتی جیهان دا تەنیا تۆ دەتوانی نۆتی ڕاست لێبدەی و ویستوتە بچیە سەر بورجی ناقوس ،لەکاتێکدا زەنگەکەت هێندە بچووکە کە لەنێو ناقوسەکانی شادمانی ڕۆژی جێژن دا کەس گوێی لێ نـابێ،تۆزێکیش بـەخۆدا دەشـکێیەوە.ئـەو دەم تـێ دەگەی کەتەنیا دەنگێکی بچوکی،بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا ،لەنێو کۆڕی گۆرانی بێژانی بەهێزی ڕێگای حەقیقەت دا بوونت پێویستە....تێدەگەی دەڵێم چی؟

_بەڵێ تێدەگەم ،بەڵام بڕوام بەقسەکەت نییە! ئەندرێی پێکەنی و لە جێگای خـۆی هەسـتا ولـە ژوورەکـەدا دەستی کرد بەهاتوچۆ.

_منیش نەمویست بڕوات پێ بکەم.....ها!......تـۆ عارەبانـەی !ڤێسۆڤشـیکۆڤ بـەحاڵێکی پەریشـانەوە چاوێکی لە ئەندرێی کردو گوتی :.......بۆچی؟

_هیچ،وەك عارەبانە دەچێ! گرێ لە قاقای پێکەنینی دا .شەویلاگەی تابن گوێیان لێـك بوونـەوە. ئەنـدرێی شانەکانی هەڵتەکاند و گوتی:

_چۆن دەکرێ سوکایەتی بەمن بکەن؟

_نازانم ،بەڵام ئەوەندە هەیە کەسێك سوکایەتی بەتۆ بکا،پاشان لەڕادە بەدەر بەخۆیدا دەشکێتەوە.بەپێکەنینەوە گوتی :تۆ خەریك بووی کارەکەی بگەیەنییە ئەو ڕادەیە! دایك بانگی کرد:ئەندرێی لەوەرە سەماوەرەکە بەرە.ئەندرێی وەدەرکەوت. کاتێکی ڤێسۆڤشیکۆڤ بەتەنیا مایەوە.سەیرێکی دەوروبەری خۆی کردو لاقەکانی لەنێو چەکمە قورسەکانی دا درێژکردن.خواربووەوە.دەستێکی لەبەلەکەکانی داو پاشان تەماشای بەرو پشتی دەستەکانی کرد.دەستی ئەستورو قامکی قوڵەبون.لەهەوا ڕایوەشاندن و هەستا. کەئەندرێی بەسەماوەرەوە گەڕاوە،گرویێ لەپێش ئاوێنە ڕاوەستابوو گوتی:

_ماوەیەك بوو سەرو سەکۆتی خۆم نەدیبوو،پاشان بەزەردەخەنەیەکەوە سەری ڕاوەشاند و گوتی:

_زۆر حەزناکەم. ئەندرێی تەماشایەکی کردو گوتی :گرینگ نییە. لاوەکە بەئەسپایی گوتی:

_ساشێنکا دەڵێ: سەرو روی جوان شوێنی درەوشانەوەی گیانە. ئەندرێی گوتی ئەوە ڕاست نییە،ساشێنکا خۆشی لوتی هەڵگەڕاوەتەوە،ئێسکی ڕومەتی وەك مەقەستی نوك تیژ وایە،گیانشی بۆ پاك و خاوێنی وەك ئەستێرەیە......دانیشتنە سەر نان و چا خواردن.ڤێسۆڤشیکۆڤ پەتاتەیەکی گەورەی هەڵگرت وپارووە نانێکی هێنا وخوێی پێوە کردو هێدی و ئارام گورگ تێی بەربوو،پاروی لەزاری دابوو دەستی کرد بەقسان:

_باشە......وەزعی ئێرە چۆنە؟ کاتێکی ئەندرێی بەگەرمی بۆی دەگێڕایەوە کەچۆن پڕوپاگاندەی سۆسیالیستی لەکارخانەدا بڵاوبووەتەوە،دیسان ڕەنگی گۆڕاو کزبوو و بە دەنگێکی ڕەق گوتی:

_ئەم قسانە زۆر درێژە دەکێشن !دەبێ زووتر بچینە پێش..... دایك سیلەیەکی چاوی دایەو هەستێکی نەیارانە لەدڵی دا بزووت. ئەندرێی گوتی: ژیان ئەسپ نییە وەبەر قامچیانی بدەی تا خۆشتر بڕوا! ڤێسۆڤشیکۆڤ سەری ڕاوەشاند و گوتی : زۆری پێ دەچێ ،حەوسەلەم نییە........دەبێ چ بکەم؟ بەدڵ ساردی باسکەکانی شۆڕکردنەوە.سەیرێکی ئەندرێی کردو بێ دەنگ بوو.چاوەڕوان بوو وەڵامی بدرێتەوە. ئەندرێی سەری بەردایەوەو گوتی:

_ئێمە هەموومان دەبێ فێربین، خەڵکیش فێربکەین،ئەوەیە ئەرکی ئێمە، ڤێسۆڤشیکۆڤ گوتی:کەنگێ خەبات دەکەین؟

_پێش ئەوەی بچینە مەیدانی خەبات چەند جار دەمانشکێنن،باش دەزانم ،بەڵام نازانم کەنگێ کاتی خەباتی ئێمەیە،دەزانی چییە؟من لەسەر ئەوباوەڕەم کەلەپێش دا مێشك ئامادە بکەین،پاشان چەکداربین..... لاوەکە مات بوو،دیسان دەستی کرد بەخواردن،بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ دایك تەماشای دەم وچاوە گرویەکەی دەکرد و هەوڵی دەدا شتێکی وای تێدا بدۆزێتەوە کەخۆی لەگەڵ ئاشت بکاتەوە،کەنیگایان تێك هەڵدەنگوت دایك بڕۆی

دەبزاوتن،ئەندرێی دەستی بەسەری خۆیەوە گرتبوو،هێندێ جار بەگەرمی قسەی دەکردو پێدەکەنی و هێندێ جار لە پڕ قسەکانی دەبڕی وبەفیکە گـۆرانی دەگـوت.دایـك لای وابـوو هـۆی دڵگـیری و پـەژارەی ڤێسۆڤشـیکۆڤ دەزانێ،ئەو لاوە کەم دوو بوو.کاتێکی ئەنـدرێی لـەبارەی مەبەسـتێك پرسـیاری لێکرد،بـەکورتی و بـەبێزاری وەڵامی دەداوە.هەردوو خانە خوێ هەستیان بەوە دەکرد،ئاخرەکەی ڤێسۆڤشیکۆڤ هەستاو گوتی:

_دەمەوێ بنووم زۆر لەزیندان دا بووم،لەپڕ ئازادیـان کـردم وهاتمـە دەرێ ،مانـدووم... ..کـاتێکی دەچـوە چێشتخانە،تۆزێك خۆی بزاوت و بێ دەنگ بوو،پاشان دنیا کش و مات بوو،دایك بەئەسپایی بە ئەندرێی گوت:

_بیرو باوەڕێکی سامناکی هەیە! ئەندرێی سەری لەقاند و گوتی:

_کوڕێکی هێدی نییە،بەڵام چاك دەبێ ،منیش وەك ئەو وابووم ،ئەگـەر دڵ بەگـەرمی نەسـوتێ،دووکەڵی زۆر دەکا،دایە گیان بڕۆ خوارەوە،من دەمەوێ تاوێك کتێب بخوێنمەوە.دایك هەڵسا چـووە قوژبنێـك قەرەوێڵەیـەکی لێبوو چیتی تێ گیرابوو.ئەندرێی کەلەکن مێزەکە دانیشتبوو،گوێی لەورتـە ورتـی پاڕانـەوە و ناخـەکانی دایـك بوو.لەکاتێك دا کتێبەکەی خۆش خۆش پەڕە پەڕە دەکرد،نێو چاوانی دەسڕییەوە و سمێڵـی بەقامکـە درێـژەکانی بادەدا و لاقیشی دەبزاوتن...چرکە چرکی سەعات لە ژوورەکەدا بڵاو دەبووەوە ،با لەشوشەی پەنجـەرەکانی دەدا و ناڵەی دەهات.دایك بە ئەسپایی دەیگوت:

_خوایە خەڵکی دنیا چەند زۆرن .....هەرکەسـێك بـەجۆرێك لـە دەسـت زەمانـە سـکاڵایەتی ....ئـەوانی بەختەوەرن لەکوێن؟ ئەندرێی گوتی: خەڵکی بەختەوەریش هەن.بەم زووانە ژمارەیان زۆرتریش دەبێ .زۆر زۆرتر!

## (٢١)

تەمەن خێرا تێدپەڕی .ڕۆژەکان جۆر بە جۆر بوون.هەر ڕۆژە شتێکی تـازە ڕووی دەدا.دایـك ئـیتر نیگـەران و ناڕەحەت نەدەبوو.ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵکی نەناسیاو پتر بە شەو دەهـاتن و بەسـرتە لەگـەڵ ئەنـدرێی دەدوان و شـەو درەنگ لەسەر خـۆو بـێ دەنـگ دەچـونەوە نێـو تاریکـایی .لـەکاتێك دا یەخـەیان هەڵدەداوە و کڵاوەکـەیان دادەکێشا،پیاو هەستی دەکرد هەموویان دەیانەوێ گۆرانی بڵێن،بەڵام دەرەتانیان نییە و پێشـی نشـە و سـۆزی خۆیان دەگرن.هەمیشە بەتاڵوکە بوون.هێندێکیان بەتەوس و توانج ،هێندێك گەنج و شاد وبەگوڕو ژمارەیەکیش مات وخاوەن بیر دەهاتنە بەرچاو.دایك نیشانەی تێکۆشان و بڕوا بەخۆبوونی لە هەموان دا بەدی دەکرد.تەواوی ئەو قەدو باڵاو سەر و چاوانە،هەرچەند لێك جیاوازبوون ،بەڵام لەبەر چاوی دایـك بەشـێوەیەك لاواز و هێـدی و بەزیبك و ئیرادە و خاوەن نیگای قوڵ و شێلگیر و لاوێنەر، وەك سیمای مەسیح لە ڕێگای "ئیمائۆس" دا خۆیان دەنواند.دایك ئەوانی دەژمارد و وای دەهاتە بەرچاو کەوەك کۆمـەڵێك دەورەی پاڤێلیـان داوە و بوونـە هـۆی

ئەوەی کە دووژمن کەمتر  پاڤێلْ ببینیْ. شەوێك کیژێکی گورج و گۆڵ و قژ بادراو لە شارەوە هات،پاکەتێکی بۆ ئەندرێی هێنابوو.وەختی  ڕۆیشتن بەنیگایەکی بەکەیف و پرشنگدارەوە بە دایکی گوت:

_هاوڕێ ، خوا حافیز! دایك پێش زەردەخەنەی خۆی  گرت و گوتی :بەخێرچی! تا بەردەرگا لە گەڵی چوو.لە پەنجەرەوە  تەماشای  "هاوڕێی " ی کرد کە تەڕ و تازە وەك گوڵی بەهار و وەك پەپولە گورج و سوك بە کۆڵاندا تێپەڕی .کەلەبەرچاوانی وون بوو،دایك لە بەرخۆیەوە گوتی :

_ئاخ ! گیانەکەم یا خوا بۆ  تەواوی ژیانت هاوڕێیەکی باشت بەنسیب ببیْ. دەیدیت و زۆربەی ئەوکەسانەی لە شارەوە دێن،شتێکی منداڵانەیان لەسەر و چاویان دیارە .پاشان بزەیەکی دەهاتیْ و هەر لەو کاتەدا سەرسوڕمانێك لەبارەی ئەو باوەڕەی کەڕۆژ بە ڕۆژ هەستی بە پتەوبوونی دەکرد،کاری تێدەکرد و ئاواتی ئەوان لەبارەی سەرکەوتنی دادپەروەرییەوە، دڵخۆشی دەکرد و گەرمی دادەهێنا ،کاتێك لەو بارەوە قسەیان دەکرد، بیْ ئیرادە هەناسەی هەڵدەکێشا و پەژارەیەکی نامەعلوم دایدەگرت.بەڵام ئەوەی بەتایبەتی کاری تێدەکرد ،ساکاریی و لەخۆ بوردوویی پیاوانەو لە ڕادەبەدەری ئەوان بوو.  کاتێك میوانەکان لە بارەی  ژیانەوە قسەیان دەکرد ،زۆر شت تێدەگەیشت .هەستی دەکرد بەڕاستی سەرچاوەی  ڕاستەقینەی چارەڕەشی مرۆڤیان دۆزیوەتەوە.خۆی بەوە ڕادەهێنا کە بڕوا بە بیرو باوەڕیان بکا.بەڵام لەناخی دڵەوە بڕوای بەوە نەبوو کەبتوانن بەگوێرەی بیر  و باوەڕی خۆیان ژیان بگۆڕن.یا ئەو هێزەیان هەبیْ کەتەواوی کرێکاران بۆ لای خۆیان  ڕابکێشن.هەموو کەسی  دەیەویْ هەر ئەوڕۆژە تێر بیْ و هیچ کەسیش ئەگەر بتوانیْ ئێستا نانەکەی  بخوا،حازر نییە تەنانەت بۆ حەوتویەکیش وە دووای بخا .ژمارەی ئەو کەسانەی ئەم ڕێگا دوورە دەگرنە بەر کەم دەبیْ .هەموو چاوێك ئەوە نابینیْ کەئەم ڕێگایە بۆڵای وڵاتێکی ئەفسانەیی برایەتی مرۆڤ  ڕێنوێنی دەکا .هەر لەبەر ئەوە،لەگەڵ  ڕیش و سمێلْ و سەروچاوی ماندووشیان،تەواوی ئەو کەسانەی بە منداڵ دەهاتە بەرچاو. سەری دەلەقاندو لە دڵی خۆیدا دەیگوت : خۆشەویستەکەم !  هەمووی ئەوانە جاریْ ژیانێکی خۆشیان هەبوو کە لەگەڵ ژیریی و وریایی تێکەڵ بووبوو.هەموویان باسی چاکەیان  دەکردو ئاواتیان ئەوەبوو ئەوەی دەیزانن فێری خەڵکیشی بکەن.بەبیْ درێخی ئەو کارەیان دەکرد.دایك تێدەگەیشت کە دەکریْ مرۆڤ سەرەڕای مەترسیش ئەو ژیانەی پیْ خۆش بیْ و بە داخ و خەفەتەوە ئاوڕی وەرابردوو دەدایەوە کە تەمەنی وەك هەودایەکی باریك و تاریك بیْ بەرهەم و بەروبوو تێپەڕیوە.بیْ ئەوەی تیْ بگا کەم کەم هەستی بە پێویست بوونی ئەو ژیانە تازە دەکرد .پێشتر هەرگیز هەستی بەوە نەکرد بوو کە بوونی خۆی  بۆ هیچ کەس پێویستە.بەڵام ئێستا باش دەیزانی کەزۆرکەس پێویستیان پیْ هەیە.ئەو هەستە تازەو بەتامە ،دەبوو بەهۆی ئەوە کەدیسان سەری بەرز ڕابگریْ.دیسان بەهەستی ئەوە  کە ئەرکێك بەجیْ دەگەیەنیْ،نوسراوەکانی دەگەیاندە کارخانە.بیری لە زۆر فڕوفێڵی ژیرانە کردبووەوە.پاسەوانەکان

لەبەر ئەوەی بەدیتنی راهاتبوون،ئیتر سەرنجیان نەدەدایە.لەگەڵ ئەوەش چەند جاریان پشكنی .هەمیشە ئەو رۆژە دەیان پشكنی كەرۆژی پێشتر بەیاننامە لەكارخانەدا بلاو كرابووەوە.دەیزانی.ئەگەر هیچی پێ دەبوو، جاسوس و پاسەوانەكانی لەخۆی دڕدۆنگ دەكرد.دەیانگرت،دەیگەڕان،ئەویش چونكە هیچی پێ نەبوو،تووڕە دەبوو،جنێوی پێدەدان،گاڵتەی پێ دەكردن.كە پاسەوانەكان بە خۆدا دەشكانەوە ،شانازی بە وریایی خۆی دەكرد.ئەو بەزمەی پێ خۆش بوو. ئیتر ڤێسۆڤشیكۆڤیان لە كارخانەدا رانەگرت. لەكن دارفرۆشێك دامەزراو كاری دەركرد.لە بەیانیەوە تائێواریێ بە دووای بارەدار و تەختەدا دەگەڕا.دایك هەموو رۆژێ چاوی پێ دەكەوت.جوتە ئەسپێكی رەش لاقیان لە ژێر قورسایی باردا دەلەرزی و بە خۆیان رادەگرت .پیرو كەوتوو هەر ئێسك و پێست مابوون و بەزەحمەت سەریان هەڵدەتەكاند.لە ماندوویان مژۆڵی چاوە سیسەكانیان لێك دەدا.بە دووای ئەوان دا داری ئەستورو درێژ بەتەقەتەق لە عەرزی دەخشان و تەق و هۆڕیان دەنگی دەدایەوە.ڤێسۆڤشیكۆڤ گڕویێ،چڵكن،پیس،بەجلی شڕ وشۆڵ و چەكمەی قورسەوە،لەكاتێكدا كلاوەكەی تاسەر برۆیان دادەكێشا،نالەبارو شل و شەپرێو ،بێ ئەوەی هەوساری ئەسپەكان بگرێ،پێ بە پێی ئەوان دەرۆیشت.سەری بەردەداوە و چاوی لە عەرزی دەبرین تا هیچ شتێك نەبینێ.ئەسپەكان كوێر كوێرانە راست بەرەو ئەو خەڵك و عارەبانانە دەرۆیشتن كە رۆبەڕویان دەهاتن.جنێو،قسەی سوك،تێوە خوڕین و هاواری بەتوڕەیی وەك هەنگ لە دەوری سەرو گوێی ڤێسۆڤشیكۆڤ دا وزە وزیان بوو.بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ و وەڵام بداتەوە، بە ئاهەنگێكی دڵتەزێن و خەفەتبار فیكەی دەكێشا و توند ئەسپەكانی دەنگ دەدا:

_باشە، ئەو جنێوانە بخۆ، نۆشی گیانت بێ !

كاتێكی هاورێیان بۆ خوێندنەوەی ئاخرین ژمارەی رۆژنامە لە ماڵی ئەندرێی كۆدەبوونەوە، ڤێسۆڤشیكۆڤ دەهات و یەك دوو سەعات گوێی دەدایە.پاش رۆژنامە خوێندنەوە باس و لێكۆڵینەوە دەست پێ دەكرا.بەڵام گڕویێ لەباس و وتووێژدا بەشدار نەدەبوو. دووای هەمووان دەرۆیشت كەبەتەنیا لەگەڵ ئەندرێی دەمایەوە ،وەبەر پرسیارانی دەدا:

_كێ لە هەمووان تاوانبارترە؟

_ئەو كەسەی پێش هەموو كەس گوتویە:"ئەمە ئی منە".ئەندرێی بەپێكەنینەوە دەیگوت:

_هەزاران ساڵ بەسەر مردنی ئەو كابرایەدا تێ پەڕیوە،كەوابوو خۆ ماندوو كردنی فایدە نییە!

_باشە،ئەی دەوڵەمەند و خاوەن دراو و دەسەڵاتدارەكان چۆن؟ ئەوان حەقیانە؟ ئەندرێی دەستی بەلاسەری دەگرت و كەمێك سمێڵەكانی بادەدا و بە ساكاری بەڵام ڕاست و ڕەوان ماوەیەكی زۆر لە بارەی ژیانی مرۆڤەوە قسەی بۆ دەكرد.كەچی هەمیشە دەگەیشتە ئەو ئەنجامە كەهەموو خەڵك تاوانباران.ڤێسۆڤشیكۆڤ ئەم بەشەی

بە دڵ نەدەبوو.لێوە ئەستورەكانی توند پێكەوە دەنوساند و سەری رادەوەشاند.بە دەنگێگ كە بێ بڕوایی لێ دیار بوو دەیگوت: وانییە و پاشان بە رووگرژی و نارەزایی دەڕۆیشت. جارێكیان هاواری كرد: نا،وانییە، دەبێ لەم نێوەدا تاوانبار هەبن....ئەم جۆرە كەسانە هەن،پێت دەڵێم،دەبێ بەبێ زەیی تەواوی ژیانیان لە رەگ و ریشەوە دەربێنین .هەر وەك زەوییەكی بژار و گیا و گوڵی بێ كەڵك داپۆشیبێ ، دەبێ وەری گێڕین.دایك گوتی: رۆژێك نیسای ئەوەی بەرپرسی بەسەر كردنەوەی كرێكارانە،باسی تۆی دەكرد و ئەم قسەی دەكرد.ڤێسۆڤشیكۆڤ تۆزێك مات بوو،پاشان پرسی: نیسای؟

_بەڵێ!چەند كابرایەكی ناجسنە.خۆی لە خەڵك مات كردووە و زۆر بەقسە و باس و بە پرسیارە. لەم دوواییانەدا زۆر جار دێتە گەڕەكی ئێمە و لە پاش پەنجەرانەوە تەماشا دەكا. بەڵێ! لە پشت پەنجەرەكانی ئێوەش! دایك لەسەر جێگاكەی خۆی راكشابوو،سەر و سەكوتی ئەوی پێ نەدەبینرا، بەڵام كاتێكی ئەندرێی بە توندی گوتی:

_جا چیە؟ با بێتە كۆڵان و تەماشای پەنجەرەی ئێمەش بكا،رێگای هەیە و بۆ خۆی دەخولێتەوە. دایك هەستی كرد كە لەو بارەوە زۆر بلێی كردووە. ڤێسۆڤشیكۆڤ بە دەنگێكی گیراو گوڕاندی:نا، راوەستە ، ئەوە تاوانبارێك! ئەندرێی پرسی :تاوانبار؟ لە چ بارێكەوە؟ لەبارەی ئەحمەقییەوە؟ گڕوێ وەڵامی نەداوە و رۆیشت.ئەندرێی لە كاتێك دا وەك جاڵجاڵۆكە لاقە باریكەكانی بە دووای خۆی دا رادەكێشا،بە ماندوویی و لەسەرخۆ بە نێو ژوورەكەدا دەهات و دەچوو.چەكمەكانی دەرهێنا بوو تا دەنگیان نەیە و دایك نارەحەت نەكا،بەڵام پیرەژن خەوی لێنەدەكەوت.دووای رۆیشتنی ڤێسۆشیكۆڤ ،دایك بە نیگەرانیەوە گوتی:

_من لەو پیاوە دەترسم،هەر دەڵێی كورەیە زوو دادەگیرسێ و سوور دەبێتەوە.

_بەڵێ وایە.كوڕێكە زوو تووڕە دەبێ. دایە گیان لەبارەی نیسای قەت قسەی لەگەڵ مەكە.نیسای بەڕاستی جاسوسە و تەنانەت دراویش وەردەگرێ.

_سەیر نییە ، دۆستی هەرە باشی ژاندارمێكە. ئەندرێی بەنیگەرانییەوە قسەكانی درێژە پێدا.ئاخرەكەی ڤێسۆڤشیكۆڤ ملی نیسای هەڵدەبڕێ.بزانە چینی دەسەڵاتدار چ هەستێك لەنێو چینی خوارەوودا پێك دێنن.كاتێكی تەواوی ئەو كەسانە وەك گڕوێ هەست بە وەزعی نالەباری خۆیان بكەن و حەوسەلەیان نەمێنی،بزانە چ دەقەومێ؟ خوێن بە ئاسماندا هەڵدەپرژێ و عەرزیش وەك قەوزەی سوور داپۆشرابێ وای لێ دێ. دایك وەك تا گرتبێتی گوتی : ئەندرێی گیان: زۆر جێگای ترسە! ئەندرێی بەئەسپایی گوتی :مێشیان قوت نەدابایە،نەدەڕشانەوە.دایە گیان ناوایە.بەڵام هەر دڵۆپە خوێنێكی ئەوان لە پێش دا بە چۆمێك فرمێسكی كۆمەڵانی گەڵ شۆراوەتەوە.لە پڕ بزەیەكی هاتێ و گوتی:

_ئەم بەشە دادپەروەرانەیە،بەڵام جێگای دڵخۆشی نییە.

## (٢٢)

رۆژێکی یەك شەمۆ کاتێکی دایك لە دووکانی بەقاڵی دەهاتەوە، دەرگای کردەوە و لە پر شادیو خۆشییەك وەك بارانی بەهاری بەسەری دا باری .گوێی لە دەنگی بەرزی پاڤێڵ بوو قسەی دەکرد. ئەندرێی هاواری دەکرد ئەوەتا هاتەوە! دایك دیتی کوڕەکەی بۆ لای دێ و هەستێك دەم و چاوی روون کردووتەوە کە جێگای هیوا و هومێدە، لەکاتێك دا لە خۆشیان حەپەسابوو گوتی: شوکر هاتیەوە ماڵێ! دانیشت. پاڤێڵ بە رەنگی بزرکاو خۆی بۆ خوار کردەوە و فرمێسکی دەچاوان گەڕان و لێوەکانی دەلەرزین.تاوێکی مات بوو.دایك بێ ئەوەی قسە بکا لە باڵای هەڵدەڕوانی.ئەندرێی سەری بەرداوە و بە فیکە کردن بەپێشیان دا تێپەڕی و وەدوورکەوت. پاڤێڵ بە پەنجەی لەرزۆك دەستی دایکی گوشی و بە دەنگێگی نەرم و بەسۆز گوتی:

_دایە گیان سوپاس! دایك لەخۆشی دیتنی کوڕەکەی و ئاهەنگی دەنگی،دەلەرزی.دەستێکی بەقژەکانی دا هێنا و لە کاتێك دا دەیویست بێتەوە سەرخۆ و دڵە کوتەی خۆی بووەستێنێ گوتی:

_خوا ئاگادارت بێ، سوپاس بۆچی؟

_بۆئەوەی کەلە بەجێ گەیاندنی کارێکی گرینگ دا یارمەتیمان دەکەی !سوپاس خۆشەویستم.شانازیەکی گەورەیە پیاو بتوانێ بڵێ دایکی لە باری مەعنەویشەوە خزمیەتی... دایك وەڵامی نەداوە.قسەکانی پاڤێلی بە دڵێکی ئاواڵە و گوشادەوە وەرگرت و بەتاسەوە تەماشای کرد. پاڤێلی وەك تیشکێکی روناك و نزیك دەهاتە بەرچاو.

_دایە گیان ،بێ دەنگ بووم ...باش دەمزانی لە ژیانم دا هێندێ شت هەن کەتۆ نیگەران و خەمبار دەکەن.سکم پێت دەسوتا،بەڵام چارم نەبوو،نەمدەزانی چ بکەم.پێم وابوو هەرگیز لەگەڵ ئێمە ناکەوی و بیروباوەڕی ئێمە وەرناگری. بەڵام مات و بێ دەنگ بووی.ئەم مەسەلە بۆ من خەفەت هێنەرە. دایك زۆری پێخۆش بوو ئەندرێی وەبیر کوڕەکەی بێنێتەوە گوتی:

_ئەندرێی زۆر شتی فێری من کرد. پاڤێڵ بە پێکەنینەوە گوتی:هەموو کارەکانی تۆی بۆ گێڕاومەوە.

_پێگۆریش هەروا.ئێمە خەڵکی گوندێکین....ئەندرێی دەیویست پێم بخوێنێ.

_باشە،شەرمت دەکرد.بەدزی و بەتەنیای دەتخوێند. دایك بەشەرمەوە گوتی :وادیارە هەمیشە ئاگای لێم بووە.لە کاتێك دا دڵی پڕ بوو لە خۆشی و شادی،پێشنیاری کرد:

_با بانگی بکەینەوە.وەدەرکەوت تا لێمان نەبێتە دلۆ.دایکی نییە. پاڤێلْ دەرگاکەی کردەوە و بانگی کرد:ئەندرێی!.....لەکوێی؟

_لێرە دار ورد دەکەم....

_درەنگ نابێ....وەرەوە!

_بە چاوان.... بەڵام ئەندرێی دەست بەجێ نەهات و لەبەر دەرگای چێشتخانە وەك یەكێکی پڕ كار گوتی:

_دەبێ بە ڤێسۆڤشیکۆڤ بڵێین دارمان بۆ بێنی.هێندەمان نەماوە. دەزانی زیندان بۆ پاڤێلْ چەندی کەڵك بووە.لەجیاتی تەمبێ،یاخییەکانی قەڵەو دەکا....دایك پێکەنی.دڵی بەهێدی لێی دەدا.دەتگوت سەرخۆشی بەختەوەرییە.بەڵام ئاواتی ئەوە بوو کە هەمیشە کوڕەکەی بەهێدی و هێمنی ببینێ.گیانی لە رادەبەدەر شادبوو.دەیویست هەوەڵێن شادی و خۆشی تەمەنی،هەروەك هاتوە هەمیشە لەدڵی دا بمێنێتەوە.وەك لەوە بترسێ کەشادی و خۆشییەکەی کەم بێتەوە.وەك راوچیەك کەباڵندەیەکی سەیر بگرێ،بە پەلە ترسەکەی شاردەوە و پێشنیاری کرد:

_ پاڤێلْ هێشتا نانت نەخواردووە،با بچین نان بخۆین!

_نا،دوێنێ بەڕێوەبەری زیندان پێی گوتم بڕیار دراوە ئازادت بکەن.لەو دەمەوە تائێستا برسیم نەبووە.بۆ ئەندرێی گێڕایەوەو گوتی:هەوەڵ کەسێکی لێرە توشی بووم سیزۆفی پیربوو.کەچاوی بەمن کەوت،هات چاك و خۆشی لەگەڵ کردم.لەبەرئەوەی لەژێر چاوەدێری پۆلیس دام،پێم گوت ئاگای لە خۆ بێ.لە وەڵام دا گوتی:"گرینگ نییە".دەزانی لەبارەی برازاکەیەوە چی پرسی؟:"کردەوەی فێدیا لەزیندان باش نەبوو؟".پێم گوت:مەبەستت لە کردەوەی باسی زیندان چییە؟گوتی :مەبەستم ئەوەیە کە پیاو لە بارەی هاوڕێکانییەوە زۆر قسەنەکا.کاتێکی پێم گوت:فێودۆر کوڕێکی ژیر و راستە،دەستی بە ریشی دا هێناو گوتی:ئێمە-بنەماڵەی سیزۆڤ_ پیاوی دەغەڵ و خراپمان تێدا هەڵنەکەوتوو". ئەندرێی سەری هەڵێنا و گوتی : ئەو پیرە مێردە بێ عەقل نییە....زۆر جار پێکەوە قسەدەکەین .پیاوێکی باشە.فێدیا بەم زووانە ئازاد دەبێ؟

_ڕەنگە هەر لەم رۆژانەدا ئازاد ببێ...لام وایە هەمووان بەرەڵلادەکەن. بێجگە لە قسەکانی نیسای،بەڵگەی تریان لەدژی ئێمە بە دەستەوە نییە.نیسایش ئاگاداری چی لە سەر ئێمە هەبووە؟ دایك دەهات و دەچوو و تەماشای کوڕەکەی دەکرد.ئەندرێی لە پێش پەنجەرە ڕاوەستابوو،دەستی لەپشتەوە گرتبوو،گوێی بۆ قسەکانی پاڤێلْ راگرتبوو، پاڤێلْ لە ژووری دا دەهات و دەچوو.ریشێکی هێشتبووەوە،وەك ئاڵقەی وردی رەش و جوان رومەتی داپۆشیبوو.چاوەکانی نیگایەکی خەمباریان هەبوو. دایك نانی دانا و گوتی : دانیشن! ئەندرێی لەسەر

نان خواردن مەسەلەی ڕێبینی هێنا گۆڕێ.پاش ئەوەی تەواوی بەسەرهاتەکەی گێڕاوە، پاڤێلٚ بە پەژارەوە گوتی:

_ئەگەر لێرە بام،ئەمدەهێشت ئاوا بڕوا.بێجگە لە هەستێکی سەربزێوی بێرو باوەڕێکی ئاڵۆز چی لەگەڵ خۆی بردەوە؟ ئەندرێی بەپێکەنینەوە گوتی:کابرایەك تەمەنی گەیشتبێتە چل ساڵ و ماوەیەکی زۆر لەگەڵ دڕدۆنگی و بەدگومانی گیانی خۆی لە کیشەدا بوبێ،گۆڕانی دژوارە... .ئەندرێی و پاڤێلٚ دەستیان بە قسان کرد.وشەو زاراوەی ئەوتۆیان بەکاردەهێنا کە دایك لێیان تێنەدەگەیشت.نان خواردن تەواوبووبوو،ئەوان هێشتا بە وشە و زاراوەی زانایانە یەکتریان دەکوتا.هێندێ جار قسەی ساکاریشیان دەکرد. پاڤێلٚ بە پێداگرتن گوتی:

_ئێمە ڕێگای خۆمان درێژە پێدەدەین و تەنانەت هەنگاوێکیش لانادەین.ئەگەر لەو ڕێیەدا توشی دە هەزار دوژمنیش ببین. دایك گوێی دەدایە.وا تێگەیشت کە پاڤێلٚ وەرزێڕی خۆش ناوێن و ئەندرێی لایەنگریانە.لەسەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێ فێری چاکەیان بکەین. دایك باشتر لەقسەکانی ئەندرێی تێدەگەیشت و لای وابوو حەقی ئەوە.هەموو جارێ کەئەندرێی قسەیەکی بە پاڤێلٚ دەگوت،دایك گوێی قوت دەکردەوە و پشوی رادەگرت و چاوەڕوانی وەڵامی کوڕەکەی دەبوو،تا بزانێ لە قسەکانی ئەندرێی دڵی یەشاوە یان نا.بێ ئەوەی لێك توورەبن،قسەیان دەکرد.دایك هێندێ جار لە کوڕەکەی دەپرسی :

_ پاڤێلٚ، وایە؟

_بەڵێ وایە. ئەندرێی بە تەوس و لاتاو دەیگوت:

_کاکە وادیارە زۆرت خواردووە و نەتجویوە.پاروت لە گەرودایە و ئێلنج دەدەی. پاڤێلٚ ئامۆژگاری دەکردو دەیگوت: قسەی قۆڕ مەکە.

_من ئەوەندە جیددیم،هەروەك لە ئاشتنی مردوویەك دا بەشداری بم وایە... .دایك سەری دەلەقاند وپێدەکەنی.

## (٢٣)

بەهار نزیك دەبووەوە،بەفرەکان دەتوانەوە و قوڕو قوڕمی دووکەڵکێشەکانی کارخانە کە لەژێر بەفری سپی دا شارابوونەوە،دەردەکەوتن.ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ پتر دەبوو و گەڕەك قوڕ وچڵپاو تر و پیس تر دەبوو.بەرۆژ لە گوێسوانان ئاو دەچۆڕایەوە و خانوەکان وەك ئارەقیان کردبێ هەڵمیان لێ هەڵدەستا.بەشەو شیشە سەهۆڵ بە زۆر جێگاوە

شۆڕ دەبوونەوە و بەحاڵ دەتروسکانەوە.خۆر زیاتر دەردەکەوت و جۆگەلەکان بە هێدی و ئارامی ئاواتەکانی بەهاری لە گەڕەك دەنگی دەداوە.خەڵك خۆی بۆ جێژنی هەوەڵی مانگی ئەیار ئامادە دەکرد. لە کارخانە و لە گەڕەك دا نووسراوە بڵاو کرابوونەوە و گرنگی و مانای ئەو جێژنەیان تێدا رون کرابووەوە.تەنانەت ئەو لاوانەش کە لەگەڵ سۆسیالیستەکان هیچ شتێکی هاوبەشیان نەبوو،کاتی خوێندنەوەی نوسراوەکان دەیانگوت:پێویستە بۆ ئەو جێژنە خۆ ئامادە بکەین.ڤیسۆڤشیکۆڤ بە زەردەخەنەیەکی خەمبارەوە هاواری کرد:زۆر زۆر نییە.یاری خۆشارەوەکێ بەسە. فێدیا مازین کەیفی دەکرد.زۆر لاواز بووبوو.لە بارەی تووڕەیی و خۆگرتن و قسەکردنەوە دەتگوت چووڕە پۆپنەیە کەوتوەتە قەفەسەوە.هەمیشە لەگەڵ یاکۆڤسۆمۆڤ کە سەرەڕای منداڵی،کوڕێکی کەم دوو و جیددی بوو و تازە لە شار کاری دیتبووەوە،پێکەوە دەهاتن.سامۆیلۆڤ کە لەزینداندا ریشی سورتر بووبوو. لەگەڵ ڤاسیلی گۆسیڤ و بوکین و دراگونۆڤ و چەند کەسی تر، چەکیان بە پێویست دەزانی.بەڵام پاڤێل و ئەندرێی و سۆمۆڤ لە سەر ئەوە بڕوایە نەبوون. لەو کاتەدا ییگۆر گەیشتەجێ.وەك هەمیشە ماندوو،بەهەناسەبڕکە و چۆڕاوگەی ئارەق،بە پێکەنیەوە گوتی: هاوڕێیان!گۆڕینی ڕێکخراوی ئێستا کارێکی گەورەیە.بەڵام بۆ ئەوەی هاسانتر ئەنجام بدرێ،پێویستە من پێڵاوێکی تازە بکڕم.پۆتینە دڕاو و پڕ لە ئاوەکانی نیشان دا.گالۆشەکانم هیچیان پێوە نەماوە.هەموو ڕۆژێ لاقم تەڕ دەکەن.بەر لەوەی بەئاشکرا و بە چەشنێکی گشتی دنیای کۆن وەربگێڕین،نامەوێ بچمە ژێر خاك.هەر بۆیەش،لەگەڵ رەت کردنەوەی پێشنیاری هاوڕێ سامۆیلۆڤ لە بارەی خۆنواندنی چەکدارانەوە،پێشنیار دەکەم جوتە چەکمەیەکی قایم بۆمن بکڕن،چوونکە دڵنیام ئەو کارە بۆ سەرکەوتنی سۆسیالیزم لەبەربڵاوترین پێك هەڵپڕژان کەڵکی پترە!هەروەها بەزمانی گیراو مێژووی جوڵانەوەی چینی کرێکاری رون کردەوە و نیشانی دا کەچۆن لەوڵاتەکانی تردا کۆمەڵانی خەڵك خەریکن ژیانی خۆیان باشتر دەکەن. دایك قسەکانی ییگۆری پێخۆش بوو.وتارەکەی بەچەشنێکی سەیر کاری تێکرد.ئەو دەم بەرچاوی خۆی کەدووژمنە هەرە خراپەکانی گەل،ئەوانەی ئەویان فریوداوە،ئەو زگ زل و بێ بەزەیی وفێڵبازانە بوون کە کولمەیان سوور دەچوون.کاتێکی دەسەڵاتی قەیسەر ژیانی ئەوانی ناخۆش دەکرد،کرێکاریان هان دەدان تا دەسەڵات بگرنە دەست.پاشان کە خەڵك ڕادەپەڕی ودەسەڵاتیان لە دەست ئیمپراتۆر دەردەهێنا،هەر ئەو ورگ زلانە بە ژێری دەسەڵاتەکەیان دەگرتە دەست و کرێکاریان بۆ کۆلیت و خانووە قوڕەکان دەناردن.ئەگەر ویستبایان باس و وتووێژیان لەگەڵ بکەن،بەسەدان و هەزارانیان لێ دەکوشتن. جارێك کە باسی ییگۆریان دەکرد، پاڤێل گوتی:

_تۆ دەزانی ئەندرێی،ئەوانەی زۆر پێدەکەنن،دڵیان هەمیشە لە ئازاردایە؟ئەندرێی تاوێك مات بوو،مژۆڵەکانی لەسەر یەك دانان و گوتی:

_وانییه،ئەگەر وابایە دەبوو خەڵكی روسیا بە پێكەنین مردبان....

ناتاشاش گەڕاوە.ئەو لەشارێكی تر گیرابوو.بەڵام هیچ نەگۆڕابوو.دایك دەیدیت ئەندرێی بەچاوپێكەوتنی ئەو كیژە دەكرێتەوە و شادتر دەبێ.بەلاتاوێك كەلەبەر ناجسنی نەبوو لەگەڵ هەمووان گاڵتەدەكا.وادەكا ناتاشا پێبكەنێ .بەڵام پاش ڕۆیشتنی ناتاشا بەپەژارەوە سرودە زۆرەكانی خۆی بە فیكە دەگوت و لە ژووریدا لاقی بەدووای خۆیدا ڕادەكێشا و هاتوچۆی دەكرد.ساشێنكا زۆر جار دەهات و هەمیشە بەپەلە بوو.رۆژ بە رۆژ روگرژتر دەبوو.جارێك كە پاڤێلَ لەگەڵی وەدەركەوت بەڕێی بكا ودەرگای لە دەرێ ڕا پێوە دا ،دایك گوێی لە وتوێژێكی توند بوو. كچكەكە بەئەسپایی پرسی :

_تۆ ئاڵا هەڵدەگری ؟

_بەڵێ.

_بڕیارت داوە؟

_بەڵێ حەقی خۆمە.

_دیسان دەتگرنەوە. پاڤێلَ مات بوو.ساشێنكا قسەكەی درێژە پێدا:

_شتی وا نابێ.....پاشان بێ دەنگ بوو. پاڤێلَ پرسی :چی؟

_با یەكی دیكە.... پاڤێلَ بە لێبڕان و ئیرادەوە گوتی :نا!

_تۆزێك بیربكەوە.قسەت دەڕوا....خۆشیان دەوێی....تۆ و ئەندرێی لێرە رابەرن....بزانە ئەگەر ئازاد بن دەتوانن چەندە كاربكەن....بیربكەوە....چونكە لەوانەیە بۆ شوێنێ زۆر دوور،دوورت بخەنەوە.بۆماوەی چەند ساڵ.... دایك واتێگەیشت كە هەستێك لە دەنگی كچكەكە دا هەیە كەخۆشی ئاگای لێیەتی،وەك ترسێك،پەرێشانییەك.قسەكانی ساشێنكا وەك دڵۆپەی بەفراو دەڕژانە دڵی دایكانەی. پاڤێلَ گوتی:نا لێبڕاوم.بەهیچ جۆر لەو بڕیارە پاشگەز نابمەوە.

_ئەگەر منیش تكات لێ بكەم ....تەنانەت ئەگەر.... پاڤێلَ بە دەنگێكی زۆر جیددی قسەكەی پێ بڕی وگوتی:

_نابێ تۆ وا قسەكە بكەی ....چۆن بیر دەكەیەوە؟ تۆ نابێ ئەو قسانە بكەی.

_هەرچی بێ ئینسانم! پاڤێلَ زۆر لەسەرخۆ ،بە دەنگێكی نەرم،هەر وەك بە زەحمەت هەناسە هەڵكێشێ ،لە وەڵامدا گوتی:

_ئینسانێكی باش و مێهرەبان،ئینسانێكی لای من خۆشەویست.....ئەوەندە خۆشەویست....هەربۆیەش ،ابێ ئەو قسانە بكەی.كیژەكە گوتی:خوا حافیز.

دایك له دەنگی پانییەكانی تێگەیشت كە ساشێنكا خۆش دەڕوا , لەوانەیە غار بدا. پاڤێلْ تا دەركی حەوشە وەدوای كەوت. ترسێكی خەفەت هێنەر و پشت شكێن بە سەر دایك دا زالْ بوو.لەمەسەلەكە نەگەیشتبوو.بەلاّم هەستی دەكرد كەبەلاّیەكی تازە وكارەساتێكی گەورە خۆی لە بۆسە ناوە.ئەو پرسیارەش"دەیەویّ چ بكا"وەك بزمارێك لە مێشكی دەدا.

پاڤێلْ لەگەلْ ئەندرێی گەڕانەوە چێشتخانە.ئەندرێی سەری ڕادەوەشاند و دەیگوت:

_ئاخ! هاوار لە دەستی ئەو"ئیسای"یە،بووەتە بەلاّ.چی لیّ بكەین؟

پاڤێلْ بە گرژی وەلاّمی داوە:دەبیّ ئامۆژگاری بكەین تا دەست لە جاسوسی هەلْبگریّ.

ئەندرێی كلاوەكەی بۆ قوژبنێك توڕ هەلْداو گوتی:ئەو كەسەی ئامۆژگاری بكا بە گرتنی دەدا.

دایك سەری بەرداوە و پرسی :

_ پاڤێلْ دەتەویّ چ بكەی؟

_كەنگیّ ....ئێستا؟

_هەوەلْی مانگی ئەیار.

پاڤێلْ دەنگی كز كرد وگوتی:

_ئای! دەمەویّ ئالاّ بە دەست وە پێش خەلْك كەوم.بیّ گومان دیسان دەمگرنەوە و زیندانیم دەكەن.

دایك چاوی سوور هەلْگەران.وەك كەسێكی لەرزو تا دایگریّ لە پڕ زاری وشك بوو. پاڤێلْ دەستی گرت و لاواندیەوە:

_دایە گیان !پێویستە ئەو كارە بكەم.بەختەوەری لەوە دایە !دایك سەری هەلْێنا و بەخەمناكی گوتی:من هیچم نەگوتووە!بەلاّم كەچاوی بە نیگای لێبڕاوی پاڤێلْ كەوت،دیسان سەری بەرداوە. پاڤێلْ دەستی دایكی بەردا و هەناسەیەكی هەلْكێشا و بەسەر كۆنە كردنەوە گوتی:

_تۆ دەبیّ حەزبكەی .نەك خەم بخۆی .كەنگیّ وای لیّ دیّ كە دایكەكان بەخۆشی و شادییەوە رۆلْەكانیان بەرەو مردن بەڕیّ كەن.

ئەندرێی بۆلْەیەكی لێهات :

_هەی......هەی.مندالْی ئێمە تەماشاكە،سواری ئەسپە دارینە بووە و لَینگی دەدا. دایك دووپاتی دەكردەوە: من هیچم نەگوتووە.ریگات لێناگرم.ئەگەر سكم بە تۆ دەسوتیّ پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە. پاڤێلْیّ تۆزێكی لیّ دوور كەوتەوە.دایك بیستی كەقسەی جیددی و بە تانوتەوە دەكا:

_هێندێك لەبەر خۆشەویستی دەبنە كۆسپی سەر ریگای مرۆڤ. دایك لەرزی و لەترسی ئەوەی نەكا دیسان قسەی دڵتەزێن بكا،بەدەنگ بانگی كرد:

_ پاڤێڵ ئەم قسانە مەكە....دەزانم لەبەر خاتری هاورێیان ناچاری .....

_نا ! لەبەر خاتری خۆم.....دەمتوانی ئەو كارە نەكەم ،بەڵام پێم خۆشە و دەیكەم!ئەندرێی لەبەر دەرگا راوەستا بوو ،هەر دەتگوت لەچوارچێوە گیراوە.بەژنی لە دەرگاكە بەرزتر بوو.لاقی نوشتاندبووەوە.شانێكی وەلا شیپانەی دابوو،سەر و مل وشانەكەی دیكەی هێنا بوونە پێشێ.بە تورەیی چاوی لە پاڤێڵ بری وگوتی:

_كاكە باشتر بوو هێندەی لەسەرنەرۆی .وەك مارمێلكە دەچوو كەلە قەڵشتە بەردێك دا خۆی شاردبێتەوە. دایك خەریك بوو بگری،بەڵام چونكە نەیدەویست پاڤێڵ بزانێ ،لەپڕ لەبن لێویەوە گوتی:

_ئاخ! لەبیرم چوبووەوە...... وەدەركەوت و لە ژێر گوێ سوانە سەری بە دیواریەوە نا وپێشی فرمێسكانی بەرەڵلا كرد.بێ دەنگ وبەئاستەم دەگریا.دەتگوت خوێنی دڵی بەچاواندا دێتە خوارێ.لە خۆ دەچوو.دەرگا باش جوت نەكرابوو.لە كەلێنی دەرگاوە گوێی لە دەمە تەقە بوو.ئەندرێی دەیگوت:

_پێت خۆشە ئازاری بدەی!

_حەقت نییە وا لەگەڵ من قسەبكەی !

_ئەگەر لەبەرامبەر كردەوە بێ جێیەكانی تۆدا بێ دەنگ بم،هاورێیەكی باش نابم.بۆچی ئەو قسەت كرد؟....دەزانی؟.....

_پیاو هەرقسەیەكی هەیبێ،پێویستە دەری ببڕێ.

_لەگەڵ دایكت؟

_لەگەڵ هەموو كەس.ئەو خۆشەویستیەی پێشم بگرێ و بمبەستێتەوە نامەوێ.....

_قارەمانێكی سەیری.لوتت بسترەو بچۆ ئەم قسانە بە ساشێنكا بلێ....دەبوو لەگەڵ ئەو بەم جۆرە قسەبكەی.

_هەر ئاوام قسەكردووە!

_هەر ئاوا بەتوندی! راست نییە.بە دڵدانەوە و مێهرەبانی و خۆشەویستی قسەت لەگەڵ كردووە.گوێم لە قسەكان نەبووە،بەڵام دەزانم.لەبەرامبەر دایكت دا ئازایەتی دەنوێنی.وا نییە؟كەوابوو حەیوان تێبگە،ئازایەتی تۆ هیچ ناهێنێ .دایك فرمیسكەكانی سڕیەوە.دەترسا ئەندرێی كوڕەكەی نارەحەت بكا.دەرگای كردەوە و هاتەوە چێشتخانە وبەخەمناكی و ترس و لەرزەوە گوتی:

_ئای! هەوای چەند ساردە،ئەوە لای خۆی بەهاریشە.لە کاتێکدا بەئانقەست تەقەی لە هەورەکان دەهێنا تا گوێی لە دەمە تەقەی ئەوان نەبێ،بە دەنگی بەرز گوتی:

_هەموو شت گۆڕاوە....خەڵك وە جموجۆڵ دەکەون و هەواش ساردە.جاران لەم وەرزەدا هەوا گەرم و ئاسمان ساف وخۆ بەدەرەوە بوو.ماتی و بێ دەنگی ژوورەکەی داگرت. دایك لەناوەڕاستی چێشتخانە دا ماتی کردبوو.چاوەڕوانی شتێکی نامەعلومی دەکرد.

ئەندرێی بە ئەسپایی پرسی :تێگەیشتی؟.....دەبێ تێبگەی.....تۆ پیاوێکی سەیری.دایك لە تۆ ئازاترە!...

دایك بە دەنگێکی گیراو پرسی:چای دەخۆنەوە؟بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێ ،بۆشاردنەوەی خەم و نیگەرانی خۆی بانگی کرد:

_چم لێ قەوماوە.....لەسەرمان ڕەق بوومەوە.

پاڤێڵ لە ژوورەکە وەدەرکەوت.لەبنەوە تەماشای دایکی دەکرد و بەزەردەخەنەیەکەوە کە لێوەکانی دەلەرزاند گوتی:

_دایە گیان بمبورە.من هێشتا منداڵ ونەفامم. دایك سەری پاڤێلی بە سینگی خۆیەوە نا وبەسۆزێکەوە گوتی:

_ئیتر پرتەو بۆڵەم لەگەڵ مەکە.ئیتر هیچم پێ مەڵێ.....خوا پشتیوانت بێ !ژیانی تۆ پەیوەندی بەخۆتەوە هەیە،بەڵام دەست لە دڵی منیش مەدە.چۆن شتی وا دەبێ دایك سکی بەکوڕی خۆی نەسوتێ؟نابێ دژوارە.سکم بەهەمووتان دەسوتێ...ئاخ......سەیر ئەوەیە هەمووتان لە ڕەگەزێکن.هەمووتان باشن.بێجگە لەمن کێ دڵی بۆ ئێوە دەسوتێ؟تۆ ئەم ڕێگایەت گرتووەتەبەر.....ئەوانی دیکەش بە دووای تۆ دا هاتوون.....هەموو شتیان بەجێ هێشتووە،وە ڕێکەوتوون ....ڕۆیشتوون..... پاڤێڵ......فکرێکی گەورە لە مێشك و دڵی دا دە جوڵایەوە و پڕی دەکرد لەخۆشیەکی نازار دیتوو و تێکەڵ بەخەم و خەفەت.دایك بۆ دەربڕینی ئەو فکرە قسەیەکی نەدەدۆزییەوە.بەدەردو ژان و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە تەماشای کوڕەکەی دەکرد.

پاڤێڵ سەری بەرداوە و بە ئەسپایی گوتی:

_باشە .دایە گیان ببەخشە.....باشم نەکرد!بزەیەکی هاتێ و چاوێکی لێکرد و پاشان روی وەرگێرا.بەشەرمەوە، بەڵام بەدامرکاوی گوتی:

_بەڵێنی شەرەف دەدەم کەهەرگیز ئەو بەشەی لە بیر نابەمەوە.

دایك پاڤێلی لە خۆی دوور خستەوە و چووە ژوورێ و بە پاڕانەوە بە ئەندرێی گوت:

_ئەنـدرێی پرتـەو بۆڵـەی لەگـەڵ مەكـە.....دەزانم لـەو گـەورەتری ....بـەڵام.....ئەنـدرێی كـە پشـتی تێبوو،نەبزووت و بە دەنگێكی سەیر و بەگاڵتەوە دەستی كرد بە هاوار:

_های ،های،چ بووە؟ لەگەڵیشی بە شەڕ دێم، لێشی دەدەم!

دایك بۆلای چوو،دەستی درێژكرد و گوتی:دۆستی خۆشەویستم.....

ئەندرێی روی وەرگێڕا،وەك گایەك سەری بەرداوە و لە كاتێكدا دەستی لە پشتەوە گرتبوو چووە چێشتخانە و دیسان بە گاڵتە و بە گرژی دەنگی هەڵێنا:

___ پاڤێڵ!ئەگەر ناتەوێ سەرت بپەڕێنم بڕۆ گیر مەبـە.....دایـە گیـان گاڵتـەی دەكـەم.بـڕوام پێبكـە ،سەماوەری تێداوێم!

بەڵێ ،هەروایە...خەڵوزم بۆ بێنە.....شێ دارە......بەزیاد نەبێ!.....

بێ دەنگ بوو.كەدایك چووە چێشتخانە لە سەر عەرز دانیشتبوو ،سەماوەری تێداویشت.بێ ئەوەی تەماشای بكا گوتی:

_دایە گیان مەترسە.دەستی لێنادەم.وەك شێلمی كوڵاو نەرم و باشم.منـیش خۆشـم دەوێ!ها،قارەمـان گـوێ مەدەیە.بەڵام سوخمەكەیم خۆش ناوێ كە تازەی لەبەر كـردووە و زۆریشـی خـۆش دەوێ.ورگـی وە پـێش دەدا و دەڕوا و هەمووكەس وە دووایە دەدا تاسوخمەكەی ببینن.راستە جوانە،بـەڵام پـاڵ پێوەنـانی هاوڕەگـەزی خـۆت فایدەی چییە.هێشتا هیچ نەبووە جێگا وەگیر ناكەوێ.

پاڤێڵ بە پێكەنینەوە گوتی:

_دیسان دەستت بە پرتەو بۆڵە كرد.سەركۆنەت كردم ئیتر بەسە.

ئەندرێی هەروا لەسەر عەرزی دانیشتبوو،سەماوەرەكەی دەنێو لینگان گرتبوو تەماشای دەكرد.دایك لـە كـن دەرگا راوەستابوو،چاوە مێهرەبان و خەمبارەكانی لەسەر و ئەستۆی ئەندرێی بڕیبوو.

ئەندرێی دەستی دادان و خۆی بەپشتەوەدا خواركردەوە و بە چاوە سوورەكانی تەماشای دایك و كوڕی كـرد و بە ئەسپایی گوتی:

_بەڕاستی ئینسانی باشن!

پاڤێڵ داهاتەوە باسكی گرت.

_باسكم مەكێشە،دەكەوم .....بەرم دە......

دایك بەخەمناكیەوە گوتی:بۆ شەرمێ دەكەن.باشترە توند یەكتری ماچ بكەن.

پاڤێڵ لەسەر خۆ گوتی: ئامادەی؟

ئەندرێی هەستاو لە وەڵامدا گوتی:بۆ ئامادە نەبم؟

پاڤێلْ ئەژنۆی دادا و ئەو دوو پیاوە توند یەکتریان لە ئامێز گرت.تاوێك ئەو دوو لەشە یەك گیانیان هەبوو کە لە خۆشەویستییەکی گەرم دا دەسوتا.

دایك فرمێسکی بە چاوان دا دەهاتە خوارێ،بەڵام تاڵ و سوێر نەبوون.لە کاتێکا فرمێسکەکانی دەسڕییەوە گوتی:

_ژنان پێیان خۆشە بگرین.هەروەك لە خەم و خەفەتان دەگرین,لە خۆشیانیش هەر فرمێسك دەڕێژن.

ئەندرێی بە تۆزێك خۆبزاوتن دەستی پاڤێلی لەخۆی جیا کردەوە،چاوەکانی گوشین و گوتی:

_بەسە.ئەگەر گوێلك ماوەیەك بەرەڵڵابوون،کەبابیان لێ سازدەکەن.ئاخ!خەڵوزێکی خراپە.ئەوەندەم فو پێدا کردووە،چاوم پڕ بوون لە ئاو.

پاڤێلْ لە کن پەنجەرە دانیشت و لە کاتێکدا سەری بەردابووەوە بەئەسپایی گوتی:

_نابێ لەو فرمێسك ڕشتنە بەخۆدا بشکێینەوە.

دایك چوو لە پەنای دانیشت و دڵی لە هەستی گەرمی ئازایەتی پڕ بووبوو.دەستی بەسەری کوڕەکەی دا هێنا و لە دڵی خۆیدا گوتی:قەیدی چییە؟دەبێ هەروابێ! ئەندرێی هەستا چووە ژوورەکەی تر و گوتی:

_دایە گیان دانیشە من قاپەکان کۆدەکەمەوە.تۆ بحەسێوە.زۆر هیلاك و ماندوو بووی .پاشان دەنگی بەرزتر کردو گوتی:

_فڕ و فیشاڵ باش نییە.بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەمێکی خۆش و ئینسانی و پڕ لە خۆشەویستیمان رابوارد.....ژیانی ئاوا زۆر خۆشە.... پاڤێلْ تەماشایەکی دایکی کرد و گوتی :بەڵێ! دایك گوتی : هەموو شت گۆڕاوە.خەم و خەفەت وەك ئی پێشێ ناچن و خۆشی و شادییش لەگەڵ رابوردوو فەرقیان هەیە.ئیتر ئەوەی من زیندوو رادەگرێ نەدەیناسم و نە ڕێی تێ دەبەم.بە قسەش ناتوانم هیچ دەربڕم.

ئەندرێی گوتی:بەڵێ هەموو شت گۆڕاوە .هەردەبێ واش بێ .هەر لەبەر ئەوەشە دایە گیان دڵێکی تازە لە ژیان دا سەری هەڵدەدا.تەواوی دڵەکان لەبەر ناکۆکی سود و قازانج تێك شکاون.تەماعی کوێر کوێرانە دەیانجوێ،ئیرەیی و حەسودی برینداری کردوون و پڕبوون لەزووخا و کێم.چەپەڵ و درۆزنن.خەڵك هەموو نەخۆشە و لە ژیان دەترسێ.هەر دەڵێی لە تەم و مژدا سەریان لێشێواوە .بێجگەلە دەردی خۆیان کەس ئاگای لە کەس نییە .بەڵام لەپڕ ئینسانێك پەیدادەبێ و بەتیشکی عەقل ژیان ڕوون دەکاتەوەو هاوار دەکا: دا وەرن دەعبا هەژارو گومڕاکان.کاتی ئەوە هاتوە تێبگەن کەقازانجی هەمووتان یەکە و هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە بژی و پێ بگا. ئەو ئینسانەی ئەم هاوارە دەکا تەنیا یە.هەربۆیەش بەدەنگی بەرز هاواردەکا دۆست و هاوکاری دەوێ

خۆی بەتەنیا و غەمبار دەبینێ. بەدەنگی ئەو باشترین بەشی هەموو دڵەکان لێک نزیک دەبنەوە و دەبن بە دڵێکی زۆر گەورەو بەهێز و بەهەست پێ دەکەنن کەوەک زەنگوڵەیەکی زیو دەچێ.ئەو زەنگوڵە بەخەڵک دەڵێ خەڵکی گشت وڵاتەکان یەک بگرن وەک خێزانێک وماڵێک خۆبنوێنن. خۆشەویستی دایکی ژیانە نەک ڕق و قین. براکان!من هەر لەئێستاوە گوێم لە دەنگی ئەم زەنگوڵەیە!.

پاڤێل گوتی منیش:

دایک لێوەکانی توند پێکەوە دەگوشی تانەهێڵی بلەرزی. چاوەکانیشی لەسەر یەک دادەنا تا پێشی فرمێسکەکان بگرێ.

- لەخەودا بم و بەخەبەر بم و بچمە هەرجێگایەک دەنگی ئەو زەنگوڵەم لە بن گوێیە.بەبیستنی شاد دەبم .دەزانم زەوی لەبەر زووڵم وزۆر وەزاڵە هاتووە و دەنگێکی لێ هەڵدەستێ،وەک وەڵامی دەنگی زەنگۆڵەکە بداتەوە وایە.تۆزێک دەلەرزێ،تا بەخێرهاتنی ئەو ڕۆژە تازەیە بکا کەخەریکە لە سینگی مرۆڤ بێتە دەرێ.
- پاڤێل دەستی ڕاوەشاند وهات وەدەنگ بێ،بەڵام دایک دەستی گرت و بۆلای خۆی راکێشا و بەسرتە پێی گوت:

_قسەکەی مەبڕە!......

ئەندرێی لەنزیک پەنجەرە راوەستاو لە کاتێکدا چاوی دەتروسکاند گوتی:

_دەزانن؟دیسان دەرد و ئازاری زۆر و بەکۆمەڵ بۆ خەڵک هەیە.دیسان دەستە تەماعکارەکان دەستی خەڵک دەگرن.بەڵام تەواوی ئەوانە،تەواوی خەم و خەفەتی من،لەبەرامبەر ئەوەدا کەمێشک و سەرو سینگم هەیە زۆر بێ نرخن.من ئیتر وەک ئەستێرەیەکی پڕشنگدار دەوڵەمەندم.خۆم لەبەر هەموو شت ڕادەگرم.لەبەر هەموو شت دا تاقەت دێنم.چونکەجۆرە شادییەک لەمن دا هەیە کە هەرگیز هیچ شتێک ناتوانێ بیکوژە.ئەو شادییەش هێز و توانای منە.

تا نیوە شەو وتووێژو قسەکانیان بە چەشنێکی دۆستانەو رێک و پێک،لەبارەی دوارۆژ و ژیانی خەڵکەوە درێژەی هەبوو. کاتێکی دایک لەسەر شتێک فکری رون دەبووەوە ،هەناسەیەکی هەڵدەکێشا و لە ژیانی ڕابوردووی خۆی دا شتێکی هەڵدەبژارد.ئەو شتە هەمیشە قورس و خەفەتاوی بوو.دایک بۆ قایم ڕاگرتنی ئەو فیکرە،ئەو شتەی وەک بەردێک لە دڵی خۆیدا رادەگرت.لە ژێر کاریگەری گەرمی ئەم وتوێژەداخەم و خەفەتەکەی دەرەوەی ، ئەو ڕۆژەی وەبیر دەهاتەوە کەباوکی بەتوڕەو تۆسنی پێی گوتبوو:

_مەكران مەكە.كابرایەكی ئەحمەق هاتووەتە خوازبێنیت شوی پیێبكە.هەموو كچێك مێردی دەكا و هەموو ژنێك منداڵی دەبێ.منداڵەكانیان هەموو بۆ دایك و بابیان خەم وخەفەتن.مەگەر تۆ نینسان نی؟ دووای ئەو قسانەی باوكی ،هەستی كردبوو كەلە تەنگە بەراییەك دا گیری خواردووە كەبەبێ ئامانج بەرەو جێگایەكی چۆڵ و تاریك دەچێ.ئەو ڕۆیشتنە بەتۆبزییە بەرەو ئەم چۆڵ و كوێرەوەریە ،هێمنایەتییەكی كوێر كوێرانەی لە سینگی دا كۆكردەوە.ئێستاش هەر ئاوا،بەڵام هەستی بەخەم و خەفەتێكی تازە كرد.لە دڵی خۆیدا دیار نەبوو بەكێ دەڵێ:"وەرن بیبەن!" بەم چەشنە خەم و خەفەتی خۆی كەلەكاتی پشو هەڵكێشان دا وەك سیمێكی راكێشراو لەسینگی دا دەنگی دەهات ،هێدی دەكردەوە.لە قوڵایی گیانی دا كە خەم و پەژارەی چاوەروانی دایگرتبوو هیوایەكی كزو كەم تروسكە دەجوڵایەوە كە هەمو شتێكی لیێ ناستێنن ، هەموو شتێكی لیێ جیا ناكەنەوە . رەنگە .... شتێكی هەر بۆ بمێنێتەوە........

## (٢٤)

بەیانی زۆر زوو كەتازە ئەندرێی و پاڤێل لەماڵێ وەدەركەوتبوون،ماریا كۆرسونۆڤا توند لە پەنجەرەی هاواری كرد:

_ئیسای كوژراوە. وەرە بابچین بزانین.

دایك ڕاپەڕیو ناوی قاتڵەكەی وەك گوللە بە دڵیدا تێپەڕی.دەسماڵێكی هاویشتە سەر شانی و پرسی:

_كێ كوشتویەتی؟

_قاتڵەكەی ڕای كردووە.

لە كۆڵانێ قسەكانی درێژە پێدا .

_بۆئەوەی قاتڵەكە بدۆزنەوە،هەموو شوێنێك دەگەڕێن،شانست هێناوە كەپیاوەكانی تۆ هەردووكیان لە ماڵێ بوون،....دەتوانم شاهیدی بدەم....دووای نیوەشەو بە پێش ماڵەكەی ئێوەدا تێپەڕیم،تەماشای پەنجەرەم كرد،ئێوە هەرسێكتان لە دەوری مێز دانیشتبوون.

دایك بەترسەوە هاواری كرد:ماریا! چۆن دەتوانن ئەوان تاوانبار بكەن؟

ماریا بە بڕاوە وەڵامی داوە:

_كێ كوشتویە؟بێ گومان یەكێك لەدەستەی ئێوەبووە.هەموو كەس دەزانێ جاسوسی لەسەر ئەوان دەكرد....

دایك وە هەناسە بڕكێ كەوت وراوەستا.دەستی لەسەر سینگی دانا.

_چیتە؟مەترسە؟......ئیسای بەسزای خۆی گەیشت....خۆش بڕۆین.....ئێستا هەڵیدەگرن.....

دایك بێ ئەوەی بزانێ کاری چی بە دیتنی تەرمی ئیسای هەیە،وە دووای کەوت.لـە کاتێکـدا هـەر لـەبیری ڤێسـۆڤشکۆڤ دا بوو،هەر بەلادا دەهات.بە پەشۆکاوی بیری کردەوە!

_بەناواتی خۆی گەیشت.

لە نزیك کارخانە خەڵك لەسەر کاولی خانووە سوتاوێك کۆ بووبوونەوە.وەك مێش هەنگوین هەر ویزەیان بوو و پاشماوەی قسڵ و گەچی خانوودەکەیان دەشێلا و پەڵە هەورێکیان لە تەپ وتۆز وە هەودا خست.ژمارەیـەکی زۆر ژن و لە وان پتریش منداڵی لێبوون.دووکانداردەکان،گارسۆنەکانی ئاردق فرۆشتنی ئـەو دەوروبـەرە، پاسـەوانەکان "پێتلین"ی ژاندارمەش کەپیرە پیاوێکی کەڵەگەت و ریش ماش و برنجی بوو وچەند میداڵیشـی بـە سـینگیەوە بوون،هاتبوونە ئەو شوێنە.

نیوێکی تەرمی ئیسای کەوتبووە سەر عەرزی و پشتی بە دیرەگێکەوە بوو کە بەتینی ئاگر رەش هەڵگەرابوو. سەری کەوتبووە سەر شانی راستی، دەستی راستەی لە گیرفانی پانتۆڵەکەی دابوو . قامکی دەسـتی چـەپی لـە زردە خۆڵ چەقیبوون.

دایك تەماشای سەرو چاوی کوژراوەکەی دەکرد . کوژراو چاویکی بریبوە کلاّودکەی کـە کـەوتبوە نێـو لاقـە کشاوەکانی و دەمی لێك کرابووە وە و ریشە سوورەکەی زۆر ناحەز شۆر بوو بووە وە. وا دەهاتـە بـەر چـاو کـە لەشی لەڕ و لاواز و سەری درێژ و باریك و دەم و چاوی رەق و تەقی پاش گیان دەرچـوون بچـووکتر بوونەتـەوە. دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و خاچێکی لەسەر سینگی کێشا . ئەو کابرایە بەزیندووی لە پێش چـاوان ئیسـك گران بوو، بەڵام ئیستا تۆزێك بەزەیی پێدا دەهات.

یەکێك لەسەرەخۆ گوتی : خوێنی لێنەهاتووە، رەنگە بەمست لێیان دابێ ...

- رەنگە هێشتا زیندوو بێ ،ها؟

ژاندارم پالێکی پێوەنا و دەنگی دا ... بکشێوە ...

یەکی تر گوتی: دکتۆر هاتووە و گوتوویە تەوا و بووە.

- دەمی جاسوس و دووزمانێکیان بەست ... کارێکی باشیان کرد.

ژاندارم تووره بوو . ئەو ژنانەی لەدەوری کۆ بووبوونەوە، دریّ پێدان و بەهەرەشە گـوتی : کێیـە ئـەو قسـانە دەکا؟

خەلك دەکشانەوە و هێندێك رایان دەرکرد . قاقایەکە بەد خوازانە دەنگی دایەوە.

دایك بۆ ماڵی خۆیان گەرایەوە . فکری کردەوە کە هیچ کەس بەزەییی پێدا نایە! بەژن و بالاّی زەلامی گرۆیی هاتە بەر چاو ، چاوە بچووکەانی بەساردی دەدرەوشان و هەروەك بریندار بووبێ دەستی راستەی رادەوەشاند.

کاتێکی ئەندرێی و پاڤێلٚ هاتنەوە ، دایك بە پێشوازیانەوە چوو و پرسی :

- باشە! کەسیان بە تاوانی کوشتنی نیسا نەگرتووە؟

- هیچمان نەبیستووە .

هەردووکی بەکز و خەمبار هاتە بەرچاو . بەنەسپانی پرسی؟

- باسی ڤێسۆ ڤیشکۆڤ نییە؟

کورەکەی بە مۆنەوە چاوی لێکرد و لەسەرەخۆ وەڵامی داوە:

- نا. تەنانەت لەبیریشیان نییە. بزرە .. دووێنێ نیوەرۆ چووەتە سەر چۆمی و هێشتا نەگەراوەتەوە . هەوالٚم پرسیوە....

دایك هاتەوە سەخۆ و هەناسەیەکی هەلٚکێشا و گوتی : زۆر شوکر ... زۆر شوکر ....

ئەندرێ چاوێکی لێکرد و سەری بەرداوە.

دایك لەکاتێك دا بیری دەکردەوە ، قسەکانی درێژە پێ دا:

_نیسای لەسەر عەرزی کەوتووە.کەس پەرۆشی نییە.کەس دانی بەخێری پێدا ناهێنێ.زۆر بچووك و لاوازە.دەڵێی لەتکی شتێکە لەوێ کەوتووە. پاڤێلٚ لەسەر نانی نیوەڕۆ لە پڕ کەوچکەکەی لەسەر مێزی دانا و گوتی:

_لەمە تێ ناگەم؟ ئەندرێی کەتا ئەو دەم بێ دەنگ مابوو،گوتی:لەچی تێ ناگەی؟

_دەعبایەك یا حەیوانێکی دڕندە بکوژن شتێکە....لام وایە دەتوانم یەکێك بکوژم کە لە ئاست هاوڕەگەزەکانی خۆی دڕندە بێ.بە لامنازانم چۆن توانیویانە دەست لەکەسێك بووەشێنن کە ئەوەندە خوێڕی و هیچ و پوچ بێ؟ ئەندرێی شانەکانی هەڵتەکاند وگوتی:هێندێ حەیوانێکی دڕندوە بەزەر بوو.....

_دەزانم......

ئەندرێی لێی زیاد کرد وکوتی:مێشوله کەتۆزێك خوێنمان دەمژێ پانی دەکەینەوە.

_بەڵێ راستە.مەبەستم ئەوە نییە....دەڵێم خوێڕی و بێز هەستێن بوو.

ئەندرێی دیسان شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی: چار چییە؟

پاڤێلٚ پاش ماوەیەك بە ماتی پرسی: دەکرێ تۆ گیان لەبەرێکی ئاوا بکوژی؟ ئەندرێی بە چاوە خڕەکانی تەماشایەکی کرد و پاشان لەپڕ سەیرێکی کرد و بەخەمباری و لەسەرخۆ وەڵامی داوە:

_ئەگەر پەیوەندی هەربەخۆمەوە هەبێ،دەست لە هیچ کەس نادەم،بە لاملەبەر خاتری هاوڕێیان و لە پێناوی ئامانج دا هەموو کارێك دەکەم.تەنانەت ئەگەر پێویست بێ کوڕی خۆشم دەکوژم.

دایك هەناسەیەكی هەڵكێشا و گوتی:ئاخ!

ئەندرێی زەردەخەنەیەكی هاتێ و گوتی:

_بێجگە لەمە رێگای دیكەمان نییە.ژیان وا دەخوازێ.

پاڤێل دووپاتی كردەوە:بەڵێ،ژیان وا دەخوازێ. ئەندرێی هەروەك شتێك هـانی بدا،لـە پـڕ راسـت بـووەوە و گوتی:

_چار چییە؟ پیاو ناچارە مرۆڤی ناخۆش بوێ تا ئەو سەردەم زووتر دابێ كەبێ قەید و شەرت مرۆڤـت خـۆش بوێ.كەسێك ببێ بە كۆسپی سەر رێگای ژیانی خەڵكی دیكەو بۆ سود و قازانجی خۆی بیانفرۆشێ، دەبـێ لـەنێو ببرێ.ئەگەر یەهودایەك بێتە سەر رێگای خەڵكی دادپەروەر و خەریك بێ خەیانەتیان پێ بكا،ئەگـەر نـەیكوژم ، خۆشم خائین دەبم.تاوانە؟مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە؟چما ئەربابەكانی ئێمە حەقیان هەیـە بـۆ پاراسـتنی قـازانج و ئاسودەیی خۆیان سەرباز و جەللاد و جندەخانە و زیندان و شـكەنجەگا بەكاربێنن؟ئەگـەر جارێـك مـن ناچـار بم داریان لێ دەست دەمێ، چ بكەم....دەستی دەدەمێ و درێخی ناكەم.ئەربابەكانی ئێمە سەدان و هەزاران كـەس لە ئێمە دەكوژن.ئەم كارە مافی ئەوەش دەدا بەمن كە دەست لە دووژمنێك بووەشێنم كـە زیـاتر بەربـەرەكانێم دەكاو بۆ كار و ژیانی من پتر زیانی هەیە.دەزانم كـە خـوێنی دوژمنـانم هـیچ شتێك پێـك نـاهێنێ.خوێنیـان بەرهەمێكی نییە ....بێ ئەوەی شوێنەوارێكی لە پـاش بـەجێ بێنێ،لەبـەین دەچێ،چـونكە بۆگـەن بـووە.بـە لامكاتێك خوێنی ئێمە وەك باران زەوی تـاو بدا،راسـتی حەقیقـەتی لێ پەیـدادەبێ.منـیش ئـەوەی دەزانم،بـە لامئەگەر بزانم كوشتن پێویستە،دەكوژم وبەر پرسی تاوانەكەش وە ئەسـتۆ دەگرم،چـونكە لـەو حاڵەتـەدا تـەنیا لەبارەی خۆمەوە قسەدەكەم.تاوانەكەم لەگەڵ من دەمرێ و پەڵەكانی دوارۆژی كەس چڵكن ناكەن.بێجگە لـەخۆم كەس تێوەر نادەن. بەهەنگاوی توند دەهات و دەچوو،باسكی ڕادەوەشاند و بەرزی دەكردەوە و دەتگوت لەهـەوا شتێكی بڕیوە.دایك بە خەمناكی تەماشای دەكرد.هەستی دەكرد كە ئەندرێی فەنەرێكی تێدا شـكاوە و ئـازاری دەدا.ئیتر بە تەنگ قەتڵەكەوە نەبوو.بیری دەكردەوە." پاڤێڵ سەری بەردابووەوە و گوێی بۆ قسەكانی ئەنـدرێی راگرتبوو كە بە توندی دەیگوت:

_ئەگەر مرۆڤ بییەوێ بچێتە پێش ،دەبێ لەگەڵ خـۆی خـەبات بكـا.دەبـێ بتـوانێ هـەموو شـت و هـەموو هەستێكی خۆی فیدا بكا.دژوار نییە كەتەمەن بكەیە وەقفی ئامانج و لەپێناوی دا گیان بەخت بكـەی.لەمـەش زیاتر پێویستە ئەوەی لە ژیان داخۆشەویستە پێشكەشی بكەی.ئەو دەم ئەوەی لە هەموو شت خۆشەویسـت تـرە یانی راستی،پەرە دەگرێ وپێدەگا.لەنێوە راستی ژوورەكە راوەستا.رەنگی بزڕكابوو.چاوی وێك هێنان و هـەروەك بەڵێنێكی گەورە بدا،دەستی بەرزكردەوە و قسەكانی درێژە پێ دا:

_دەزانم ئەو سەردەمەش هەردادێ کەخەڵك بەخۆشەویستی چاو لێك بکەن.وەك ئەستێرە لەبەر چاوی یەکتر بدرەوشین و هەموو کەس هەروەك گوێ بۆ مۆسیقا رادەگرن،ئاواش گوێ بۆ قسەی ئەوی تر رابگرن.خەڵکێکی ئازاد لەسەر عەرز دەژین.ئازادی خۆیان لەکن گەورەتر دەبێ.دڵی هەموو کەس پاك و خاڵی لە تەماع و ئێرەیی دەبێ.ئەو دەم ئیتر ژیان هەر ژیان نابێ،بەڵکو ستایش دەبێ لە ئاست مرۆڤ.پەیکەری مرۆڤ لەوپەڕی پەرستن دا دەبێ.چوونکە خەڵکی ئازاد دەرەتانی ئەوەی دەبێ بگاتەپلەی بەرز.ئەو دەم ئیتر مرۆڤ لەئازادی و بەرامبەری دا بۆ جوانی دەژی .ئەو دەم ئەو کەسانە لەهەموو کەس باشتر دەبن کەپتر خەڵکیان خۆش بوێ.ئەو کەسانە دەبن کەئازاد ترن.ئەو دەم ژیان مەزن دەبێ.ئەو کەسانەش ئەو ژیانەیان هەیە،مەزن دەبن. بێ دەنگ بوو،قەدی راست کردەوە،خۆی راوەشاند.دەنگێکی تەواو لەرزۆك قسەکەی درێژە پێدا.

_بەناوی ئەو ژیانەوە بۆ هەموو شت ئامادەم.ئەگەر پێویست بێ دڵی خۆم دەردێنم وخۆم پێشێل دەکەم .

_سەر وچاوی دەلەرزین و رەگی ملی هەڵدەستان.دڵۆپەی فرمێسکی یەك لە دووای یەك بەچاوان دا دەهاتنە خوار.

پاڤێڵ سەری هەڵێنا و چاوی تێبڕی.ئەویش رەنگی بزرکابوو.چاوی سوور هەڵگەڕابوون.دایك لەسەر کورسیەکە هەستا.هەستی کرد کە ترس و نیگەرانی پتر لێی وەنزیك دەکەوێ.

پاڤێڵ بە هێدی پرسی :ئەندرێی چتە؟

ئەندرێی سەری ڕاوەشاند،وەك سیمێك خۆی لەبەر یەك کیشاوە و تەماشای دایکی کردو گوتی:

_دیتومە......دەزانم.

دایك کەبەتەواوی دەلەرزی .هەستا بۆلای هات و دەستەکانی گرت.

ئەندرێی خەریك بوو دەستی ڕاستەی دەرێنێ،بە لامدایك توند دەستی گرت و گوتی:

_ئەندرێی گیانلرۆڵەکەم ڕاوەستە.......

راوەستە.ئەندرێی بە دەنگێکی گیراو ورتەیەکی لێهات:

_راوەستن،دەمەوێ بۆتانی بگێڕمەوە کەڕوداوەکە چۆن بوو....

دایك بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی:نا....نا....نا... ..

پاڤێڵ لە هاوڕێکەی وەنزیك کەوت.دەنگی دەلەرزین و رەنگی بزرکابوو. لەسەرخۆ بەپێکەنینێکی سەیر گوتی:دایك لەوە دەترسێ نەکا تۆ ئەو کارەت کردبێ....

_ناترسم....دەزانم ئەو نەی کردووە.بەچاوی خۆم دیبام،بڕوام نەدەکرد!

ئەندرێی بێ ئەوەی تەماشایان بکا گوتی:ڕاوەستن! سەری ڕادەوەشاند وهەوڵی دەدا کەدەستەکانی لەناو دەستی دایك دەربێنێ.

_من ئەم کاردم نەکردووە...بە لامدەمتوانی پێشی بگرم...

. پاڤێلێ گوتی:ئەندرێی بێ دەنگ بە!دەستی ئەندرێی گرت و دەستێکی هاویشتە سەرشانی.دەیویست نەهێڵێ لەشی بلەرزێ.ئەندرێی سەری خوار کردەوە و بە ئەسپایی قسەکانی درێژە پێدا :

_ پاڤێلێ! تۆ باش دەزانی من بەتەما نەبووم ئەو کارە بکەم.بزانە چۆن بوو.کاتێکی تۆ ئێمەت بەجێهێشت،من و دراگونۆڤ لە قوژبنێکی کۆڵانەکە ماینەوە.لە پڕ ئیسای پەیدا بوو.دراگۆنۆڤ گوتی:"دەیبینی؟ ئەوە هەموو شەوێ وەدووای من دەکەوێ.ئاخرەکەی دەستێکی لێدەوەشێنم."لەمن دوور کەوتەوەو لام وابوو دەچێتەوە ماڵی خۆیان....پاشان ئیسای لێم وەنزیك کەوت. ئەندرێی هەناسەیەکی هەڵکێشا:

_لە ژیانم دا کەس هێندەی ئەو سەگە سوکایەتی پێنەکردووم.

دایك بێ ئەوەی وەدەنگ بێ ،ئەندرێی بۆ لای کورسی ڕاکێشا و توانی لە سەر کورسییەکەی دابنێ.بۆخۆشی لە پەنا پاڤێلێ دانیشت . پاڤێلێ لە پێشی ڕاوەستا و بە پەرێشانییەوە توکی ریشی خۆی هەڵدەکێشا.

_پێی گوتم."پولیس هەردووکتان دەناسێ و ژاندارمەکان ئاگادارتانن و پێش هەوڵی مانگی ئەیار هەردووکتان دەگرن."وەڵامم نەداوە و پێکەنیم.بە لامحەریك بوو هەڵدەچووم .پاشان پێی گوتم کە کوڕێکی وریام و نابێ بەو ڕێگایەدا بڕۆم.... .

ئەندرێی ڕاوەستا.بە دەستی چەپەی دەم و چاوی سڕیەوە.چاوەکانی وشك و بریقەداربوون.

پاڤێلێ گوتی: دەزانم؟

_بەڵێ،پێی گوتم: باشترە بچمە خزمەتی شاردوانی و ببم بە پۆلیس...

.ئەندرێی دەستی ڕاوەشاند و مستی کردە گرێ: گیانێکی لە عنەتی و ناپاکی هەبوو....پۆلیس... خۆزیا لە جیاتی ئەم قسە زللەی لێدابام.کەمترم پێ ناخۆش دەبوو.ڕەنگە بۆنەویش باشتر بوایە.بە لامکاتێك ئاوی بۆگەنی زاری خۆی وەك تف بەروومەتم دا دا،ئیتر ئاگام لەخۆ نەما.

ئەندرێی بە پەشۆکاوی دەستی لە دەستی پاڤێلێ هێنا دەرێ و بە دەنگێکی گیراو گوتی:

_مستێکم لە نێو چاوانی دا و ڕۆیشتم.گوێم لێبوو لە پشتەوە دراگونۆڤ گوتی:"باش لە گیر کەوتووی"وادیار بوو لەپشتی کۆڵانەکە خۆی شاردبووەوە.

ئەندرێی پاش تاوێك بێ دەنگی قسەکەی درێژە پێدا.

_نەگەڕامەوە....هەرچەند هەستم دەکرد کە گوێم لە دەنگی لێدان دەبێ.لەسەرخۆ هەوەك بە لاق بۆقێکی بۆپاش خۆم فڕێ بدەم،تێپەڕیم....کە گەیشتمە کارخانەهاواریان دەکرد:"ئیسای کوژراوە".نەمدەویست بڕوا بەم قسە بکەم.بە لامدەستم وەژان کەوت.ئیتر بەخۆم نییە،ژانەکەم پێ هیچ نییە،بە لامەدڵێی دەستم کورت بووەتەوە. خێرا چاوێکی لە دەستی کرد و گوتی:

_دیارە قەت ناتوانم ئەم پەڵەپیسە بشۆمەوە.

دایك بە گریانەوە گوتی:گیانەکەم ئەوەندە بەسە کە دڵت پاك بێ! ئەندرێی لەسەرخۆ قسەکانی درێژە پێدا:خۆم تاوانبار ناکەم....نا ....بە لامناحەزە...خۆش نییە پەڵەیەکی ئاوات لە سینگی دابێ .پێویستم پێی نییە.

پاڤێلێ بە دڕدۆنگیەوە تەماشای کردو گوتی:دەتەوێ چی بکەی؟

_دەمەوێ چی بکەم؟ بیری لێکردەوە...سەری بەرداوە...پاشان سەری هەڵێنا وبەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

_لەوە ناترسم بڵێم من لێم داوە،بە لاملە کردنی ئەو کارە بەخۆمدا دەشکێمەوە . پاڤێلێ شانی هەڵتەکاندن و گوتی:لە قسەکانت تێناگەم.تۆ نەتکوشتووە... .ئەگەر.....

_برام!لەگەڵ ئەم قسانەش ئینسانێکە...کوشتن شتێکی ناحەزە.ئەگەر پیاو بزانێ خەریکی پیاو کوشتنە و پێشی پێ نەگرێ،ڕەنگە بێ غیرەتی کردبێ...

پاڤێلێ وەڵامی داوە:

_بە هیچ جۆر لە مەبەستی تۆ تێناگەم. پاش تاوێك بیرکردنەوە گوتی:

_بەڵکو دەتوانم تێبگەم،بە لامناتوانم هەستی پێبکەم.

دەنگی ئاژێری کارخانە هات.ئەندرێی کە دەنگی ئاژێری بیست،سەری بەسەر شانی داخوار کردەوە و خۆی راوەشاند وگوتی:

_نامەوێ بچمە کارێ....

پاڤێلێ گوتی:منیش ناچم... ....

ئەندرێی پێکەنی و گوتی: دەمەوێ بچمە حەمام...بەپەلە جلەکانی کردە بەر و لەماڵێ وە دەرکەوت.دایك بەچاوێکی هاودەردانە بە ڕێی کرد و بە کوڕەکەی خۆی گوت:

_ پاڤێلێ!هەرچی دەڵێی بڵێ.دەزانم کوشتنی مرۆڤ ناحەقە.....لەگەڵ ئەوەش دا دەزانم کەس تاوانبار نییە ....کاتێکی تەماشای ئیسایم دەکرد،وە بیرم هاتەوە کەهەڕەشەی لە داردانی تۆی لەمن دەکرد.ئیتر نەپەرۆشم

بوو و نه بەکوشتنی شاد بووم.بە لامراست و رەوان سکم دەسوتا.....نیستا سکیشم پیّ ناسوتیّ... .قسـەکانی بڕی ،تاویّك بیری کردەوە.لە کاتیّکدا بزەیەکی لەسەر لیّوان بوو قسەکانی دریّژە پیّدا.

_خوایە...... پاڤیّلّ گویّت لیّ بوو چیم دەگوت؟

بیّ گومان پاڤیّلّ گویّی لەقسـەکانی نـەبووبوو.سـەری بـەردابووەوە و لـە ژووریّ دا دەهـات و دەچـوو.بـە دەنگیّکی کزەلۆکە هاواری کرد:

_وایە.ژیان هەروایە.دەزانی چۆن خەلّك لەدژی یەکتر هان دەدەن.بتەویّ و نەتەویّ پیاو ناچارە لیّ بدا .

نەویش لە کیّ؟لە کەسیّك کە بەئەندازەی خۆی لە مافە کۆمەلاّیەتییەکان بـیّ بەشـە.لـە کەسـیّك کەلـەخۆی چـارەرەش تـرە.چـوونکە کـەرە.....پاسەوان،ژاندارمە،جاسـوس،هەموویان دووژمنـی ئیّمـەن.لەگـەلّ ئـەوەش هەموویان وەك ئیّمە مرۆڤن.ئەوانیش دەچەوسیّنەوە.ئـەوانیش بـەمرۆڤ نـازانن.بـەم چەشـنە خـەلّکیان تیّـك بەروداوە.بە ئەحمەقی و بە ترس کویّریان کردوون و دەست و پیّیـان بەسـتوون.دەیـان چەوسـیّننەوە و زوولّمیـان لیّدەکەن.پانیان دەکەنەوە.بە هیّندیّکیان لەوانی دیکە دەدەن.خەلّکیان کردووەتە تفەنگ وبەرد ودار . ئەمەشیان ناو ناوە شارستانەتی .ئەمەیە دەولّەت و ولاّت... ..

لە دایك نزیك بووەوە:

_دایە گیان تـاوان ئەمەیـە! کوشـتنی میلیۆنهـا کـەس .....کوشـتنی گیانلەبـەر....تیّدەگـەی ؟گیانـان دەکوژن؟فەرقی نیّوان ئیّمە و دووژمنـانی ئیّمـە دەبینـی.کاتیّـك یـەك لـە ئیّمـە لـە کەسـیّك دەدا،لـەو کـارە شەرمەزارە،بیّزارە و خەفەت دەخوا.....خەلّکی تر بە هەزار هەزار دەکوژن،بیّ ئەوەی وەسەر خـۆبیّنن.شـادن و بە شادی خەلّك دەکوژن.بەمجۆرە زوولّم لە خەلّك دەکەن.تەنیا بۆ ئەوەیە کە شت و مەك و کەل وپەل ومالّ و زیّڕو زیو و کوتە کاغەزی بیّ کاری خۆیان بپاریّزن.لـە وبـارەرەوە بیربکـەوە.بـۆ پاراسـتنی خۆیـان نییـە کـە خـەلّك دەکوژن،بەلّکو بۆ بەرگری لە خاوەن مولّکیەتی خۆیانە. پاڤیّلّ دەستی دایکی گرت وبۆی دا هاتەوە و لەئامیّزی گرت:

_ئەگەر توانیبات رادەی بیّ شەرمی و چەپەلّی و بۆگەنی کردەوەی ئەوانە بزانی تیّدەگەیشتی کە ئیّمە لەسـە حەقین.دەتزانی ئەو کارەی ئیّمە چەند جوان و مەزنە.

دایك لە کاتیّکدا زۆر خەمناك بوو.هەستا.ئاواتی ئەوەبوو دلّی خۆی و کوڕەکەی بکاتـە کورەیـەکی سـوورەوە بوو.بەهەناسە بڕکە لەژیّر لیّوەوە گوتی:

_ پاڤیّلّ راوەستە.....راوەستە.....دەزانم،تیّدەگەم،هەست پیّدەکەم......راوەستە .

## (٢٥)

لەبن گوێسەوانەی ماڵەکەیان یەکێك دەنگی دەهات.هەردووکیان ڕاست بوونەوە و چاویان لەیەکتر کرد.دەرگا لەسەر خۆ کرایەوە و ڕیبین خۆی خوار کردەوە و وەژوور کەوت.سەری هەڵێنا و پێکەنی:

_ها ،ئەوەم دەویست.زۆر لەخەمی ئێوە دا بووم.بە چاوپێکەوتنتان زۆر شادم.چاکەتێکی کورتی لەبەردابوو.قەترانی ڕەش هەموو پەڵە پەڵە بووبوو.پێڵاوێکی حەسیری لە پێدابوو،دەستەوانەیەکی ڕەشی بێ قامکی بە قایشی کەمەریەوە هەڵواسیبوو و کڵاوێکی کەوڵی لەسەر نابوو.

_چۆنی پاڤێل ؟بەریان داوی؟دایە تۆ چۆنی؟ ددانە سپیەکانی وەدەرخست و بزەیەکی هاتێ.دەنگی لەجاران نەرمتر بوو.ریشی هاتبوو.دایك بەخۆشیەوە پێشوازی لێکرد.دەستە ڕەش و گەورەکەی گوشی و لە کاتێکدا بۆنێکی توندی قەترانی هەڵدەمژی کە ڕیبین لەگەڵ خۆی هێنابوو، گوتی:

_ئای .ئەوە تۆی .باشە،زۆر شاد بووم!

_ پاڤێل بە پێکەنینەوە گوتی:

_قەڵافەتێکی دێهاتیانەی جوانت هەیە.ڕیبین بە کاوەخۆ پاڵتۆکەی دەرهێنا و لە وەڵامدا گوتی:

_بەڵێ،بوومەوە بە دێهاتی.ئێوەش وردە وردە دەبن بە ئاغا.بە لامەن بۆ دوواوە دەگەڕێمەوە . ئاوایە. لە کاتێکدا بلوزەجاوەکەی بەری ڕێك و پێك دەکرد،هاتە ژووریّ و سەیرێکی چواردەوری ژوورەکەی کردو گوتی:

_وەك دەبینم شت و مەکی ماڵەکەتان زیادی نەکردووە.تەنیا ژمارەی کتێبەکان پتربووە.هەرئەوەندە کتێب لەم زەمانەدا لە هەموو شت بەنرخترە.ئەوە ڕاستە .باشە کاروبار چۆنە ؟بۆم بگێڕەوە! دانیشت و لاقی لەبەر یەك بڵاوکردن .بەری دەستی لەسەر ئەژنۆیان دانا و زۆر بەوردی چاوێکی لەخانەخوێکەی کرد و بەخۆشی و هەروەك گەشا بێتەوە،بەزەردەخەنەوە چاوەڕوانی وەڵامی پاڤێل بوو. پاڤێل گوتی: کارەکان باشن.

_زۆرم پێخۆشە.پیاڵەیەکی بچوکیش ڤۆدکا.....ئەگەر خواردن هەبێ،ئەویش خراپ نییە.بەدیتنی ئێوە خۆشحاڵم.....هەرئاوا!! پاڤێل بەرامبەری دانیشت و دەستی کرد بە قسان:

_میخائیل ئیڤانۆڤیج حاڵت چۆنە؟

_خراپ نییە.لە "یێگیلدێیڤ" گیرساومەوە.ئەو گوندە شارەزای؟ گوندێکی باشە.هەموو ساڵێ دوو جار بازاڕی لێ دادەنرێ .دوو هەزار کەسی خەڵك هەیە.خەڵکێکی ناجسنی تێدایە.بەکاری کشت و کاڵ نایە،زەوییەکانی باش نین.زەوییەکان لە تیوڵدارەکان بە ئیجارە وەردەگرن،بە لامباش نین.من لای چەوسێنەرێکی کۆمەڵ بە کرێگرتەیی دامەزراوم.ژمارەی ئەو خوێن مژانە لە وڵاتی ئێمەدا کەم نییە .وەك مێش و مەگەسی

دەوری زەلکاو وان.قەتران دەگرین،خەلۆز دەکەین.دوو ئەوەندەی ئێرە کاردەکەم و هەقدەستەکەشم چووار ئەوەندە کەمترە.ئاوایە.لای ئەو خوێن مژە حەوت کەس کاردەکەن.بێجگە لەمن ئەوانی دیکە هەموویان خەڵکی گوندن.هەموویان خوێندەوارن یەکیان ناوی "یێفیم"ە.کوڕێکی زۆر وریا و ژیرە.

پاڤێڵ بە گەرمی پرسی :زۆر جار قسەیان لەگەڵ دەکەی؟

_دیارە.هەموو بڵاوکراوەکانی ئێوەم لەگەڵ خۆم بردووە.سی و چوار دانەم هەیە.بە لامکەڵك وەرگرتن لە تەوراتم پێ باشترە.هەرچی بخوازی لە تەورات دا هەیە.کتێبێکی گەورەیە.لەلایەن ئەنجومەنی موقەددەسەوە چاپ کراوە.بوونیشی ئازادە.دەکرێ بڕوای پێ بکەی.بەگاڵتە برژانگەکانی لێکدا و قسەکانی درێژە پێ دا .

_بە لامنەوەندە بەس نییە .بۆیە هاتوومە ئێرە، شتی خوێندنەوە وەربگرم.لەگەڵ یێفیم دەچوین قەتران تەسلیم بکەین.ڕێگامان گۆڕی تاسەر لە تۆ بدەین.پێش ئەوەی یێفیم بێ ،کتێبەکانم بدەیە.پێویست نییە ئەو لە هەموو شت ئاگادار بێ.....

دایك چاوی لە ڕێبین کرد و لای وابوو کە لە کاتی داکەندنی چاکەتەکەی دا،شتێکی دیکەشی لەبەر خۆی داکەند.کەمتر لە جاران بە ئەدەب بوو.مەکری پتر لە نیگای دا دەبینرا. پاڤێڵ گوتی:دایە بچۆ کتێبەکان بێنە.....بڵێ بۆ گوندین.بۆ خۆیان دەزانن چت دەدەنێ.

_باشە .با سەماوەرەکە بگاتێ ،دەچم.

ڕێبین بە پێکەنینەوە پرسی : دایە! تۆش خەریکی ئەو کارانەی ؟لە گوندی ئێمە زۆر کەس کتێبی دەوێ.مامۆستاش کتێب خوێندنەوەی پێخۆشە.هەرچەند لەفێرگەی قەشەکان دا پەروەردەکراوە،دەڵێن کوڕێکی باشە.هێندێك دوورتر لە گوندی ئێمە مامۆستایەکی ژن هەیە.بە لامنەوانە نایانەوێ کتێبی قەدەخەکراو بخوێننەوە.چوونکە موچە لە حکومەت وەردەگرن،دەترسێن....ئاوایە.....کتێبی زۆر توند و قەدەخەم گەرەکە.بەنهێنی بڵاویان دەکەمەوە.ئەگەر قەشەو پاسەوان بزانن، لایان وا دەبێ مامۆستاکان پڕوپاگەندە دەکەن .هیچ کەس شکی من ناکا. لەوفێڵی سازی کردبوو کەیف خۆش بوو،قاقا دەستی کرد بە پێکەنین. دایك لە دڵی خۆیدا گوتی:دەزانی تۆ لە ورچ دەچی ،بە لامرێوی .....

پاڤێڵ هەستا و لە کاتێکدا لە ژووری دەهات و دەچوو، بەسەرکۆنەوە گوتی: میخائیل ئیڤانۆڤیچ! کتێب دەدەین بە تۆ ،بە لامنەم شێوە کارەی تۆمان پێ باش نییە.

ڕێبین چاوی زەق کردن و پرسی :بۆچی؟

_چونکە پیاو کەکارێك دەکا،دەبێ بەرپرسییەکەشی وە ئەستۆی خۆی بگرێ....نابێ جۆرێك کارەکە ڕاپەڕێنێ کە خەڵکی تر بکاتە بەر پرس! پاڤێڵ دەنگی هەڵێنا. ڕێبین چاوی لە عەرزی بڕی .سەری ڕاوەشاند و وەڵامی

داوە:لە قسەکانت تێناگەم. پاڤێلْ لەبەر دەمی راوەستا و پرسی :لەو بارەوە چۆن بیر دەکەیتەوە؟ئەگەر لەبەر بڵاوبوونەوەی کتێبی قەدەخەکراو لە مامۆستاکان وەشك کەون،دەگیرێن یان نا؟

_بەڵێ ،دەگیرێن.....گرنگ نییە.

بە لام چونکە تۆ کتێبەکانت بڵاوکردوونەوە،حەق وایە تۆ بچیتە بەندیخانە،نەك ئەوان.

رێبین لە کاتێك دا بە پێکەنینەوە لە ئەژنۆی خۆی دەدا،دەنگی بەرز کردەوە:

_کابرایەکی سەیری .من کەدێهاتییەکی سادە و ساکارم،کێ شکم لێ دەکا کە خەریکی ئەو کارەم؟شتی وا دەبێ؟ کتێب کاری ئاغایە،هەر دەبێ ئەوانیش بەرپرسی بن.

دایك هەستی بەوە کرد کە پاڤێلْ لە مەبەستی رێبین تێناگا،چاوی لەسەر یەك داناون،دیارە تووڕەیە.بە هێدی کەوتە نێو باسەکەیان و گوتی:

_میخائیل ئیڤانۆڤیچ بۆ هەموو کارێك ئامادەیە،بەو شەرتەی لە جیاتی ئەو خەڵکی تر ئازار و شکەنجە بدەن.

رێبین دەستێکی بە ریشی دا هێنا و گوتی: هەر وایە.

پاڤێلْ بە وشکی وەڵامی داوە: ئەگەر یەکێك لە ئێمە ،بۆنموونە ئەندرێی کارێکی بە پێچەوانەی قانون بکا و من لە جیاتی ئەو بگرن،تۆ چ دەڵێی؟

دایك تێکڕابوو. چاوێکی لە کوڕەکەی کرد و لە کاتێکدا پەشۆکا بوو،سەری راوەشاند و گوتی:

_چۆن لەگەڵ هاورێی خۆی دا وا دەجولێتەوە؟

رێبین گوتی: ئاخ.....ئاخ. پاڤێلْ ئێستا ئەوە لە قسەکانی تۆ حاڵی دەبم.بەزەردەخەنەیەکی وەك گاڵتە بە دایکی گوت:

_دایە مەسەلەکە قوڵە. پاشان روی کردە پاڤێلْ و بە دەنگێکی بە فیز و خۆپەرستانە قسەکانی درێژە پێ دا:

_برام تۆ هێشتا ساویلکەی! کاتێکی مرۆڤ بۆ ئامانجێکی نهێنی کاردەکا،نابێ بەتەنگ شەرەفەوە بێ.باش بیر بکەوە:یەکەم،ئەو کەسە دەگرن کە کتێبی لەکن بدۆزنەوە نەك مامۆستاکان.دوهەم،ناوەڕۆکی کتێبە ئازادەکانیش کە مامۆستاکان بڵاویان دەکەنەوە،هەروەك کتێبە قەدەخەکانە.ئەوەندە هەیە وشەکانیان فەرقی هەیە،لەوان دا راستی کەمتر دەبینرێ.کەوابوو مامۆستاکانیش لەگەڵ ئێمە ئامانجیان یەکە،بە لامبەرێگای خۆیان دا دەڕۆن.لە کاتێك دا من رێگای راست ترم گرتوتەبەر.بەو حاڵەش،لای کاربەدەستانی دەوڵەتی تاوانمان یەکە.وانییە؟سێهەم،برا گیان من کارم بەوان نییە.سوار و پیادە رێك ناکەون.رەنگە لەگەڵ وەرزێرێك ئەوەی

نەکەم.مامۆستا(موعەللیم) کوڕی قەشـەیە،یان کچـی خـاوەن مولکـەنازانم ئـەوان بـۆ داوا لـە خـەڵك دەکـەن کەشۆرش بکەن.من کـە وەرزێـرم نـاتوانم لـەبیرو بـاوەڕی ئـەو خوێندەوارانـە تێبگـەم.خـۆم دەزانم چ بکەم،بـە لاملەمەبەستی ئەوان ئاگادار نیم.گەورەکان هەزاران ساڵ خوای بەڕاستی بوون و خوێنی وەرزێرانیان مژیوە.لە پڕ وە خەبەر دێن و دەیانەوێ چاوو گوێی قوربانیەکانی خۆیان بکەنەوە.

برام،من بەیت و بالۆرەم پێ ناوێ.ئەوەش بەیت و بالۆرەیە.من لاموایە خوێندەوار و دەوڵەمەنـد هەرکەسـێك بێ،لە من دوورە.لەزستان دا کاتێك مرۆڤ بە مەزرایەك دا دەڕوا،لە دوور چاوی بەشـتێك دەکـەوێ کەزینـدووەو دەجولێتەوە.زۆر دوورە و ناتوانێ بزانێ ڕێوییە، گورگە، یان سـەگە. دایـك تەماشـای کوڕەکـەی کـرد. پاڤێـڵ خەمبارو کز دەهاتە بەرچاو. چاوەکانی ڕێبین بەتروسکەیەکی لێڵ دەدرەوشان. لە کاتێك دا لـە خـۆ ڕازی بـوو، دەستی لە ریشی وەردەدا و قسەکانی درێژە پێدا.

_من دەرفەتی مرۆڤایەتیم نییە.وەختەکە لە ڕادەبەدەر ناسکە.هەرکەس دەبێ بەگوێرەی ویـژدانی خـۆی کـار بکا....هەر دەعبایەك دەنگی تایبەتی خۆی هەیە .دایك کەوتە نێو باسەکەیان و گوتی:

هێندێك کەسی دەوڵەمەندیش هەن کە خۆیان فیدای کۆمەڵ دەکەن وهەموو ژیانیان لە زیندان دا رادەبوویرن .

_ئەوە مەسەلەیەکی ترە.وەرزێر کە دەوڵەمەند دەبێ خۆی بەئاغاوە دەچەسپێنێ . ئاغـاش کـەلێی قـەوما و فەقیر بوو،دەبێتە دۆستی وەرزێران .کاتێك گیرفان خاڵی بوو،ڕۆح ناچارە پاك و خـاوێن بـێ. پاڤێـڵ لـە بـیرت ماوە....جارێکی بۆت رون کردمەوە کـەبیر و بـاوەڕ پەیوەنـدی بەچۆنییەتی ژیانـەوە هەیـە. ئەگـەر کرێکـار بلێ"نا"،ئەرباب ناچارە بلێ "بەڵێ"،چوونکە ئەربابە.لە بارەی وەرزێر و خاوەن مولکیشەوە هەر وایە.کـاتێکی وەرزێر ڕازییە، ئاغا خەوی لێناکەوێ.باش دەزانم خەڵکی ناجسن لەهەموو شوێنێك هەن و نامەوێ بە تێکڕایـی دیفاع لە هەموو وەرزێرێك بکەم.

ڕێبین هەستابوو .دەم و چاوی رەش هەڵگەڕابوون.هەروەك ددانان لێك بدا،ریشی دەلەرزی .دەنگی دانەوانـد و درێژەی پێ دا:

_ماوەی پێنج ساڵە لەم کارخانەوە چومە ئەو کارخانە .رێ و شوێنی ژیانی دێهـاتم لـە بـیر چـووبووەوە.کـە گەڕامەوە سەر ئەو ژیانە و وەزعی ئەوانم دی ،بەخۆم گوت ئیتر ناتوانم وەك ئەوان بـژیم .تێدەگـەی؟ پـێم وابـوو ناتوانم.ئێوە نازانن برسیەتی چییە....برسیەتی ئێوە ئازار نادا.بە لاملـە لادێ برسـیەتی وەك سـێبەر بـەدووای ئینسـانەوەیە.هیچ هومێدێك نییە کەپیاو بتوانێ نانی تەواو پەیدا بکا.برسیەتی گیانی خەڵکی تێك شکاندووە و داب و شـــوێنی مرۆڤایـــەتی کوێرکردووەتـــەوە.ژیـــانی خـــەڵك دژوارە.لـــە برســـیەتی و هـــەژاری دا دەتلێنەوە.کاربەدەستانی دەوڵەتی وەك قەلە رەشە لە کەمین دان،تا بزانن کام وەرزێـر نـانێکی هەیـە.....هـەر

لەگەڵ پارووە نانێکی زیادیان دی، لە خاوەنەکەی دەڕفێنن و زللەیەکیشی لێدەدەن. ڕێبین چاوێکی لە دەورو پشتی خۆی کرد و پاشان خوار بووەوە، ئانیشکی وەسەر مێزەکە دا و گوتی:

_کاتێك سەر لە نوێ توشی ئەو ژانە بوومەوە،بێزار بووم ،خەفەتم دەخوارد.پێم وابوو دەر نابەم.لەگەڵ ئەوەش دا بەسەر خۆم دا زاڵ بووم و بەخۆمم گوت:"نابێ بێڵم گیانم فریو بدا.لێرە دەمێنمەوە و ئەگەر نانیش نەدەمە وەرزێرەکان دەیان وروژێنم.کارێك وە دەست دێنم.من وەك برایان بۆ ئەوان کار دەکەم.من بۆ خەڵك و لە دەست خەڵك خەفەت دەبینم....خەفەت وەك کێردێك لە دڵم رادەچێ." نێو چاوانی ئارەقی لێ دەچۆڕا.لەسەر لە خۆ پاڤێڵ نزیك بووەوە. دەستی لەسەر شانی دانا.دەستی دەلەرزی:

_یارمەتیم بدە.کتێبی ئەو تۆم بدەیە کەخوێنەر وەجۆش بێنێ.دەبێ ژیشك وە بن سەری خەڵك بدەی.ئەوانەی شت دەنوسن،پێیان بڵێ بۆ دێهاتیش بووسن،با دێهاتییەکان وا هەڵبەزن وەك ئاوی کولیویان پێدا کرابێ.تا میللەت بە پێشوازی مەرگەوە بچێ.باسکی راکێشا و بە دەنگێکی لەرزۆك و وشەی پچڕ پچڕەوە لێی زیاد کرد:

_تۆڵەی مەرگ دەبێ بە مەرگ بدرێتەوە.ئاوایە.کەوابوو دەبێ بمری تا خەڵك بژین.دەبێ هەزاران کەس بمرن،تا میلیۆنەها کەس بژین.مردن هاسانە.بە لاحۆزیا خەڵك زیندوو دەبوون و رادەپەڕین.

دایك سەماوەری هێنا.چاوێکی لەرێبین کرد.قسە توندەکانی دایکیان خەمناك دەکرد.ئەو پیاوە زۆر شتی وەك مێردەکەی ئەو دەچوو.هەردووکیان وەك یەك یەك ددانیان دەردەخست و قۆڵیان هەڵدەماڵی.تووڕەیی و بزۆزیان وەك یەك وابوو.فەرقیان ئەوەندە بوو کە رێبین قسەی دەکرد و لەبەر چاوانی هێندە بەسام نەبوو.

پاڤێڵ سەری راوەشاند و گوتی:بەڵێ پێویستە،دەبێ ڕۆژنامەیەکیش بۆ دێهات ساز بکەین.مەتڵەب و خەبەرمان بدەنێ ،تا ڕۆژنامەتان بۆ چاپ کەین.

دایك بە پێکەنینەوە تەماشای کوڕەکەی کرد.پاشان جلی کردە بەر و بێ ئەوەی شتێك بڵێ وەدەرکەوت. ڕێبین گوتی: بەچاوان.هەرچی پێویست بێ بۆتان ئامادە دەکەین.سادە بنوسن ،تا گوێرەکەش تێی بگەن. دەرگا کرایەوە و یەکێ وەژوور کەوت.رێبین چاوێکی لە چێشتخانە کرد و گوتی: یێفیم! وەرە ئێرە.ئەمە پاڤێڵە ،ئەوەی باسم بۆ کردی.

.پیاوێکی چوارشانەی باڵا بەرزی دەم و چاو پان و مو زەرد وچاو شین بوو.چاکەتێکی کورتی لەبەر دابوو،کڵاو بە دەست لە پێش پاڤێڵ راوەستا و لەبنەوە چاوی تێبڕی.بە دەنگێکی گیراو گوتی:رۆژ باش.پاشان دەستی پاڤێڵی گوشی و دەستێکی بە قژەکانی خۆیدا هێنا.چاوێکی لە ژوورەکەی کرد وبۆ لای کتێبخانە چوو کەپڕ بوو لە کتێب.

ڕێبین گوتی: پاڤێلْ ئەمانەی خوێندوەتەوە. یێفیم ڕۆی وەرگێڕا و چاوێکی لێکرد و سەیرێکی کتێبەکانی کرد وگوتی:

_چەند کتێبت هەیە ؟بێ گومان وەختی خوێندنەوەت کەمە؟ لە لادێ وەخت بۆ خوێندنەوە پترە. پاڤێلْ گوتی: ڕەنگە مەیلی خوێندنەوە کەمتر هەبێ؟

دەستێکی بەچەناگەی داهێنا و گوتی:بۆچی؟ بە پێچەوانەوە، ئێستا مرۆڤ ناچارە بیر بکاتەوە.دەنا ڕێگای تری نییە.کە وانەبێ،دەبێ دەست و لاقی ڕاکێشێ و بمرێ.چونکە میللەت نایەوێ بمرێ،مێشکی وەکار خستووە.......زەوەی ناسی یانی چی ؟ پاڤێلْ بۆی ڕون کردەوە.

یێفیم کتێبەکەی لە جێگای خۆی داناوە و گوتی:ئەمەمان پێویست نییە!

ڕێبین هەناسەیەکی توندی هەلْکێشا و گوتی:

_وەرزێر نایەوێ بزانیٚ زەوی لە کوێڕا هاتووە.دەیەوێ بزانێ چۆن بەش کراوە.ئەو خاوەن موڵکانە چۆن زەوییان لەو خەلْکە ئەستاندووە.زەوی بخولێتەوە یا بسەکنێ، گرنگ نییە.هەر ئەوەندە بەسە کە نانی لیٚ پەیدادەبیٚ!..... یێفیم تەماشای کتێبی مێژووی کۆیلەکانی کرد وبە پاڤێلی گوت:ئەم کتێبە باسی ئێمە دەکا. پاڤێلْ کتێبێکی تری دایە و گوتی:ئەمەش لەبارەی"سرواژ"ەوە.یێفیم وەری گرت ولە دەستی وەردا و پاشان داینا و لەسەر خۆ گوتی:

_ئەم بابەتە زۆر کۆنە .

_زەویت هەیە؟

_ئێمە سێ براین.چووار هێکتار زەویمان هەیە.هەمووی وردە زیخە.بۆ گەنم لێ چاندن ناشێ،بە لامبۆمس خاوێن کردنەوە زۆر باشە.تۆزێك مات بوو ،پاشان گوتی:

_خۆم لە چنگ زەوی ڕزگار کرد .نانی لێ پەیدا نابێ ،تەنیا دەست و پێ ی مرۆڤ دەبەستێ.ئێستا چووار ساڵە کرێگرتەم.پایز دەبێ بچمە خزمەتی سەربازی .مامە میخاییل دەڵێ مەچۆ،چونکە ئێستا سەربازەکان وا فێر دەکەن کە لە خەڵك بدەن.بە لامبەو حاڵەش دەمەوێ بچم.کاتی ئەوە هاتووە ئەو مەسەلە کۆتایی پێ بهێنرێ. بێ ئەوەی چاو لە پاڤێلْ وەرگێڕێ پرسی :بیر و ڕای تۆ چییە؟

پاڤێلْ بزەیەکی هاتێ و گوتی:

_بەڵێ کاتی ئەوە هاتووە،بە لامدژواریش دەبێ.پیاو دەبێ بزانێ لەگەڵ سەربازەکان چۆن دەدوێ .

_فێر دەبین و شارەزا دەبین!

پاڤێلْ بە وردی سرنجی یێفیمی دا و گوتی:

_ئەگەر بتانگرن، گوللە بارانتان دەکەن .

_راستە لێمان خۆش نابن.

دیسان دەستی کرد بەتەماشا کردنی کتێبەکان.

ڕێبین گوتی:هاوڕێ چایەکەت بخۆرەوە.دەبێ بڕۆین.

_ئێستا.پاشان پرسی :شۆڕش یانی یاخی بوون؟

ئەندرێی شەکەت و شێواو گەیشتەوە.بێ ئەوەی قسەبکا دەستی یێفیمی گوشی و لە پەنا ڕێبین دانیشت. تەماشایەکی کرد ودەستی کرد بە پێکەنین.

ڕێبین دەستێکی لە ئەژنۆی دا و گوتی:بۆچی وا تێکچووی؟

_هیچ. یێفیم بە ئیشارە ئەندرێی نیشان دا و پرسی :ئەمەش کرێکارە؟

ئەندرێی گوتی:بەڵێ،مەبەستت چییە؟

ڕێبین ڕونی کردەوە: هەوەڵ جارە کە کرێکاری کارخانە دەبینێ.لای وایە کۆمەڵێکی تایبەتین.... پاڤێل پرسی: لەچ بارێکەوە؟

یێفیم بەوردی سەرنجی ئەندرێی دا و گوتی: ئێسکی ئێوە نوك تیژە،کەچی ئێسکی وەرزێران خڕترە.

ڕێبین قسەکەی تەواوتر کرد:

_وەرزێر لە سەر پێیان لە ئێوە قایمترە.هەست بەوە دەکا زەوی لە ژێر لاقی دایە.هەرچەند زەویەکە نی ئەویش نەبێ،ئەو هەستەی هەیە.بە لامکرێکاری کارخانە وەك پەلەوەر وایە .نە ماڵی هەیە و نە نیشتیمان ونە خاو و خێزان.ئەمڕۆ لێرەیە و سبەی لە شوێنێکی تر ....تەنانەت ژنیش ناتوانێ بەجێگایەکیەوە ببەستێتەوە. هەر کەر کێشەیان لی پەیدابوو،ژن بەجێ دێڵێ و بۆ دۆزینەوەی بەختەوەری ڕو لەشوێنێکی تر دەکا.کەچی وەرزێر دەیەوێ جێگای خۆی خۆشتر بکا و نایەوێ لە جێگای خۆی ببزوێ....ئاخ .....دایك ئەوە هاتەوە..... ڕێبین چووە چێشتخانە .یێفیم لە پاڤێل وە نزیك کەوت و بە گومانەوە پرسی :

_دەکرێ کتێبێکم وێ بدەی؟

_بە چاوان.

وەرزێر لە خۆشییان چاوی دەتروسکاند و بەدەنگ گوتی:

_وێت دەدەمەوە. هاوڕێکانمان بەم زووانە قەتران دێنن،بەوان دا دەینێرمەوە.سوپاس!ئێستا کتێب بە ئەندازەی چرا بۆ شەو پێویستە.

ڕێبین گەڕاوە.پاڵتۆکەی کردە بەر و توند کەمەرەکەی بەست.....

_با برۆین وەختی رۆیشتنە. یێفیم بە پێكەنینەوە كتێبەكانی پێ نیشاندا و گوتی:بزانە،شتم هەیە بیخوێنمەوە.

كەئەوان رۆیشتن  پاڤێلٚ بە ئەندرێی گوت:

_ئەم شەیتانانەت دیت؟

_بەلێ.دەڵێی هەورن لەبەرەبەیان دا ،مات وتاریك و سەبر بۆ پێشەوە دەچن.

دایك قسەكەی بڕی: مەبەستت ؟ پیاو بڕوا ناكا كە ئەوە لە كارخانەدا كاری كردبێ.

_سەر لەنوێ بووەتەوە بە وەرزێر.مەترسیدارە.

پاڤێلٚ روی كردە ئەندرێی كە لەنزیك پەنجەرە دانیشتبوو،بەكزی تەماشای ئیستیكانە چایەكەی دەكرد. پێی گوت:

_حەیف لێرە نەبووی.تۆ كە هەمیشە باسی دڵ دەكەی تەماشای یارییەكی دڵت كردبایە.رێبین هەڵایەكی وای سازكردبوو،بۆڕی دابووم.خنكاند بوومی.نەمدەتوانی ڕەخنەی لێبگرم.چەند بەخەڵك بێ بڕوایە و نرخی كەمیان بۆ دادەنێ.دایكم حەقیەتی كە دەڵێ:هێزێكی ترسێنەر لەو پیاوەدا هەیە.

ئەندرێی بە ناڕەحەتی وەڵامی داوە:ئەمەی دەزانم.خەڵكیان دەرماندا و كردووە.كاتێكی ڕاپەڕن،بێ ئەوەی فەرق و جیاوازی دابنێن هەموو شت دەڕوخێنن.زەوی روت و قوتیان گەرەكە.هەرچی لەسەر زەوی بێ، لە رەگ و ریشەوە دەری دێنن. سەبر قسەی دەكرد.دیاربوو بیر لە شتێكی تر دەكاتەوە. دایك پێی گوت:

_ئەندرێی ڕاوەستە.پێویستە تۆزێك بحەسێیەوە. بەنەرمی وەڵامی داوە: دایە گیان،ڕاوەستە،ڕاوەستە،هەرچەند مەبەستم ئەوە نەبوو، بە لامدیسان جوان نییە. لەپڕ وەخۆ كەوت و مستێكی لەمێزەكە دا و گوتی:

_بەلێ،  پاڤێلٚ راست دەكەی .رۆژێك كەوەرزێری ئێمە شۆڕش بكا،زەوی روت دەكاتەوە.هەروەك پاش بڵاوبوونەوەی تاعون و وەبا،واباوە كە هەموو شت دەسوتێنن تا شوێنەواری خەم و خەفەتی رابووردوو ببێتە خۆڵەمێش.  پاڤێلٚ بە ئەسپایی گوتی:كەوابوو دەبنە كۆسپی سەر ڕێگامان!

_ئەركی ئێمە ئەوەیە رێگای نەدەین پشتی بگرین.ئێمە لەو نزیكترین.بڕوا بەقسەكانی ئێمە دەكا.وە دووامان دەكەوێ .

_دەزانی؟رێبین دەیەوێ رۆژنامەیەك بۆ دێهات ساز بكەین.  پاڤێلٚ بە پێكەنینەوە گوتی:شەرمەزارم لەوە كەنەمتوانی باسی لەگەڵ بكەم. ئەندرێی دەستێكی بە سەری خۆی دا هێنا و بە هێدی وەڵامی داوە:

_دیسان توشی دەبینەوە.بلوێر لێبدە،ئەوانەی قاچیان ساخەو بەعەرزیـەوە نەنوسـاوە،بە هـەوای بلـوێری تـۆ هەڵدەپەڕن.ڕێبین حەقیـەتی کە دەڵێ ئێمە هەست بەوە ناکەین زەویمان لـە ژێـر پێـدا بـێ.نـابێ هەستیشـی پـێ بکـەین.چـونکە جوڵانـەوەی ئـەو لـە ئەسـتۆی ئێمەیـە.....ئەگـەر جارێکمـان راوەشـاند خـەڵک لێـی جیـا دەبنەوە....جاری دووهەم....... دایك دەستی کرد بە پێکە نین و گوتی:ئەندرێی لەبەر چـاوی تـۆ هـەمـوو شـت هاسانە.

_بەڵێ هاسانە!و بەدەنگێکی خەمبارانە لێی زیاد کرد:

_هەروەك ژیان! تاوێك راوەستا و پاشان گوتی:

_دەچم لە دەرێ تۆزێك دەگەڕێم. دایك گوتی:دوای خۆ شوشتن ؟ باکەی توندە، با پەڕ دەبی.

_هەر ئەوە بۆمن پێویسـتە. پاڤێـل بەخۆشەویسـتی گـوتی: ناگـات لـەخۆت بێ،سـەرمات دەبـێ.باشـترە راکشێی،بەڵکو خەوت لێبکەوێ.

_نا ، دەمەوێ وەدەرکەوم.

جلی لەبەر کرد و بێ ئەوەی هیچ بڵێ وەدەرکەوت. دایك هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و گـوتی: خەفـەت دەخـوا. پاڤێل گوتی:زۆر باش بوو بە"تۆ" ت بانگ کرد و لەگەڵی روخۆش بووی. دایك پاش تۆزێك بیرکردنـەوە بەسـەر سوورمانەوە گوتی:

_هیچ نەمزانیوە کە"تۆ"م پێگوتووە. بەرێکەوت بووە.ئەوەندەم لێ نزیك بووەوە.... نازانم بڵێم چەند......

_دایە گیان تۆ دڵێکی باشت هەیە.

_ئەگەر وابێ باشتر ،بە لاخۆزگە توانیبام یارمەتی ئێوە بدەم.....یارمـەتی تـۆ، یارمـەتی هـەموو کـەس . خۆزیا لە دەستم هاتبایە.

_مەترسە ،شارەزا دەبی.

دایك دەستی کرد بە پێکەنین وگوتی:

_ها، ئەترسم .خۆمن هەر نازانم!

_باشە دایە گیان.قسەلەمە ناکەین.بە لامبزانـە زۆر زۆر مـەمنونی تـۆم و سوپاسـت دەکـەم. دایـك چـووە چێشتخانە، تا بە فرمێسکەکانی پاڤێل نارەحەت و خەمبار نەکا

.ئەندرێی درەنگێك گەڕاوە.هیلاك بوو.دەست بەجێ راکشاو گوتی:

_ لاموایە دە کیلۆمەتر رێگا رۆیشتوم.

پاڤێل پرسی:حاڵت باشترە؟

_نازانم.دەنگە دەنگێ مەکە،دەمەوێ بنوم.

هێندەی پێنەچوو ڤێسۆڤشیکۆڤ وەك جاران بە چلکنی و جلێکی دڕاو و پیسەوە وە ژوور کەوت.لەکاتێك دا هەر بەلادا دەهات گوتی:

_دەزانی کێ نیسای کوشتووە؟

_نا.

_رەنگە یەکێك پەیدا بووبێ ئەو کارەی پێ تاوان نەبێ.سەیری من کە ،لای خۆی من خۆم ئامادەکرد بوو بیخنکێنم!ئەو کارە پتر بۆ من دەبوو.

پاڤێلێ بە روخۆشی گوتی: هاورێ ئەم قسانە مەکە!

دایك بە دەنگێکی دڵسۆزانە گوتی:ڕاستیت دەوێ تۆ پیاوێکی باشی،بە لامقسەکانت هەمیشە بێ ڕەحمانەن....بۆچی؟ لەو دەمەدا دایك دیتنی ئەو لاوەی پێ خۆش بوو.تەنانەت چڕ و چاوە گرۆیێکەشی پێ جوان بوو.

گرۆیێ شانی هەڵتەکاندن و بە دەنگێکی لاڵەپەتی وەڵامی دایەوە:

_بێجگە لەو کارانە بەکاری هیچی تر نایەم.هەمیشە لەخۆم دەپرسم کەجێگاو رێگای من کوێیە.قەت نایدۆزمەوە.پێویستە خەڵك بدوێنی.منیش ئەوەی نازانم، پێم ناکرێ.هەموو شتێك دەبینم...هەست بە هەموو خەم و خەفەتێکی مرۆڤ دەکەم....ناتوانم دەریانبڕم.گیانێکی کڕ و گێژم هەیە.

پاڤێلێ لێ وەنزیك کەوت.سەری بە ردابووەوە،بەنینۆك جوغزی بە مێزەکە دا دەهێنا .بە دەنگێکی بە خەم و گریاناوی کەوەك دەنگی منداڵان دەچوو گوتی:

_براکانم،کارێکی قورس بدەن بەمن.هەر کارێك بێ قەیدی نییە.ناتوانم هەروا بێ کار بژیم.هەمووتان بۆ ئامانجێك تێدەکۆشن،دەبینم دەچێتە پێش....بە لامن دوورم......تەختە و دار دەگوێزمەوە...ئایا دەکرێ هەروا بژیم؟کارێکی دژوارم پێ بسپێرن تا ئەنجامی بدەم.

پاڤێلێ دەستی گرت و بۆلای خۆی راکێشا:

_بیری تۆش دەکەینەوە.

ئەندرێی لەو دیوی وە دەنگ هات:

_فێرت دەکەم پیتەکانی چاپ لێك جیابکەیەوە.دەبی بە پیت رێکخەری چاپخانەی ئێمە.دەیکەی؟

ڤێسۆڤشیکۆڤ لێی نزیك بووەوە و گوتی: ئەگەر فێرم بکەی کێردێکت دەدەمێ....

ئەندرێی بە سەریدا نەڕاندی:برۆ بۆخۆت و بە کێردتەوە!

_کیردی چاکە!

ئەندریی و پاڤێلّ دەستیان کرد بەپێکەنین.ڤێسۆڤشیکۆڤ لە نێوەراستی ژوورەکە راوەستا و پرسی :گاڵتەم پێ دەکەن؟ ئەندریی لەسەر تەختەکەی هاتە خوارێ و گوتی:

_بەڵێ! شەوێکی جوانە.....مانگە شەوە.دەڵێن چی بچین لە مەزرا بگەڕێین.....دێن؟

پاڤێلّ گوتی: بەڵێ! گرویّ گوتی: منیش دێم.پێکەنینی ئەندرییم پێخۆشە.

ئەندریی بزەیەکی هاتێ و گوتی:منیش زۆرم پێخۆشە کە قەولی دیاریم پێ دەدەی. کاتێکی جلی لەبەر کرد،دایک بە ئەسپایی گوتی:پتر لەبەر کە،با سەرمات نەبێ. کاتێك هەر سێك هاورێ وەدەرکەوتن،چاوی تێ بڕیبوون.پاشان سەیرێکی وێنەی مەسیحی کرد و لە سەرخۆ گوتی:خوا یارمەتیتان بدا.....

## (٢٦)

رۆژەکان یەك لەدووای یەك ئەوەندە خێرا تێدەپەڕین،دەرفەتیان نەدەدا کەدایك بیر لە هەوەڵی مانگی ئەیار بکاتەوە.تەنیا کاتێك بەشەو،لەکاری رۆژانە دەحەسایەوە و تۆزێك لەگێرە و کێشەی رۆژانەی سەری سوك دەبوو،دەیگوت:

_"خۆزیا زوو تێپەڕیبا"!

بەری بەیانی دەنگی ئاژێری کارخانە دەهات.ئەندریی و پاڤێلّ بەپەلە پاروو نانێکیان بە چای دەخوارد و هێندێك وردەکاریان بە دایك دەسپارد.ئەو ژنە تەواوی رۆژ وەك سمۆرەیەك لە قەفەس دابێ،دەهات و دەچوو،هەدای نەدەدا.نان و چێشتی ساز دەکرد،هێندێ کەل و پەلی بۆ چاپ کردنی بەیاننامەکان ئامادە دەکرد.خەڵك دەهاتن و هێندێ نووسراوەیان دەدایە کە بیاندا بە پاڤێلّ و پاشان ون دەبوون. هەموو شەوێك ئەو نووسراوانەیان لە دارو دیواری کارخانە و پۆلیسخانە دەدا کە داوایان لە کرێکاران دەکرد خۆیان بۆ جێژنی هەوەڵی مانگی ئەیار ئامادە بکەن.بەیانی ئەو نووسراوانەیان لە کارخانەکان دەدیتەوە.بەیانی زوو پاسەوان بە کۆڵانان وەردەبوون و بە جنێودان و بۆڵە بۆڵ نووسراوەکانیان لە دیواری دەکردەوە.وەختی نیوەڕۆیە سەر لەنوێ لە کۆڵانان بڵاو دەکرانەوە و لەژێر پێی رێبوارانداا دەهاتن و دەچوون.لە شارەوە پۆلیسی نهێنیان دەنارد.ئەو پۆلیسانە خۆیان لە کەلێن و قوژبنی کۆڵانان مات دەکرد و ئەو کرێکارانەیان هەڵدەنا کە بە شادی و پێکەنینەوە بۆنان خواردنی دەچوون یا لە کارخانە دەگەڕانەوە.هەموویان لە دەستە وستانی پۆلیس خۆشحاڵ بوون.تەنانەت پیرە پیاوەکانیش بە پێکەنینەوە بە یەکتریان دەگوت.

_بزانن چ وەزعێکە!

لـە دەسـتەو پـۆلی بچـوك كۆدەبوونـەوە و لـەبارەی بەیاننامەكانـەوە قسـە و باسـیان دەكـرد.ژیـان وكـوڵ دەهات،بەهار لەبەر چاوی خەڵك زۆر جوانتر بوو،شتی تازەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.بۆ هێندێكیان دەبوو بە بیانوو كە لە ئاژاوەچییەكان تووڕەبن و جنێویان پێبدەن.بۆ هێندێكی تـر لەگـەڵ تـرس ونیگـەرانی هیوایـەكی كـەمی بەدوواوە بوو.هێندێكی دیكەش كەژمارەیان كەم بوو،دڵی خۆیان بەوە خۆش دەكرد كە هێزێكن و دنیا وەخەبـەر دێنن. ئەندرێی و پاڤێڵ شەوانە خەویان لێ نەدەكەوت.هیلاك و ماندوو. بەرەنگی بزركاو،تۆزێـك پـێش ئـەوە ئاژێری كارخانە لێبدرێ،دەهاتنەوە ماڵێ.دایك دەیزانی كە لـە نێـو مێشـە و لێـڕەواردا شـانەی حیزبـی پێـك دێنن.ئاگای لەوەش هەبوو كە دەستە سوارێكی پۆلیس لە گەڕەكی ئەوان كێشك دەكێشن و پۆلیسی نهێنـی لـە هەموو و كون و قوژبنان.دەسووڕێنەوە و ئەو كرێكارانە دەپشكنن كە بەتەنیا هاتوچۆ دەكەن.كۆبوونەوەكان بـلاوە پێ دەكەن و جار و بار كەسانێكیش دەگرن.دەیزانی هەموو شەوێك لەوانەیە ئەندرێی و كوڕەكەی بگیرێن.هێندێ جار لای وابوو پۆلیس بیانگرێ باشترە.

كوشتنی ئیسای بەچەشنێكی سەیر پـوش بەسـەر دەكـرا .ئیـدارەی پـۆلیس دوو رۆژان دە كەسـی گـرت و پرسیاری لێكردن و پاشان بێ دەنگەی لێكرد و خۆی لە مەسەلەكە گێل كرد.ماریا كۆرسونۆڤا كە لەگەڵ پۆلیس و هەموو كەس بە ئاشتی رایدەبوارد،رۆژێكی كاتی قسەكردن لەگەڵ دایك،بیر و رای پۆلیسی دەربڕی و گوتی:

_چۆن دەكرێ تاوانبار بدۆزرێتەوە؟ ئەوێ رۆژێ نزیكەی سەد كەس ئیسایان دیوە.نەوەد كەس لەوانەیە ئەگەر بۆیان كرابا سەریان پان دەكردەوە.لەم حەوت ساڵەدا ئەوەندەی بۆ كرابێ خەڵكی ئازار داوە....

ئەندرێی بەئاشكرا دەگۆڕا.رومەتی دەقوپان.وای لێهاتبوو هەر چـاوی زەق دەچـوون. زۆر بـە رێكـەوت بـزەی دەهاتێ .وەك پێشو ئیتر باسی شتی ئاسایی نەدەكرد.لەجیاتی ئەوە،شادی و كەیف خۆشییەكی ئەوتۆی بەسەردا دەهات كەكاری دەكردە سەر گوێگرەكانی .باسی دوارۆژی دەكرد.باسـی جێـژنی ئـازادی و جـوانی و رونـاكی و سەركەوتنی عەقڵ و ئازادی دەكرد. كەمردنی ئیسای لە بیر چووەو،رۆژێكی بـە زەردەخەنەیـەكی خەمبارانـەوە گوتی:

_دووژمنەكانمان نەك هەر كۆمەڵانی گەلیان خۆش ناوێ،بەڵكو لە خەمی ئەوانـەش دا نـین كـەبۆ ئـەوان وەك سەگ ئێمە راودەنێن و پێمان دەوەڕن.لە خەمی یەهودای بە ئەمەگی خۆشان دا نین.تەنیا لە خەمی پارەی خۆیان دان و هیچی دیكە...... تاوێك مات بوو......پاشان گوتی:

_هەرچەند بیر لە حاڵی ئەو كابرایە دەكەمەوە،پتر سكم پێی دەسوتێ.نەمدەویست بكوژرێ،نا،نەمدەویست.

پاڤێڵ لە سەرخۆ گوتی:ئەندرێی بەسە .لەو بارەوە بەسە.

دایك بە ئەسپایی گوتی:پێ لە قەیەك بە دارێكی گەندەڵ دا دراو كەوتە عەرزی.

ئەندرێی بە خەمەوە گوتی:ئەمە راستە ،بە لامدڵی پێ نارام نابێ.

زۆر جار ئەو قسانەی دووپاتە دەکردەوە کە لەزاری ئەودا مانایەکی تاڵ و سوتێنەریان هەبوو. ئاخرەکەی رۆژێ هەوەڵی مانگی ئەیار داهات.ئاژێری کارخانە وەك هەموو رۆژێ زیرەی هات.دایك تەواوی شەو چاوی لەسەر یەك دانەنابوو،نەنوستبوو.بەیانی لە جێگای خۆی هاتەدەر و سەماوەری تێهاویشت و خەریك بوو بچێ وەك جاران کورەکان هەڵبستێنێ.بیری کردەوە و دەستی بەخۆیدا بەردانەوە و لەپەنا پەنجەرە دانیشت هەر وەك ددانی ژان بکا،دەستی وەبەرلاچاوی خۆی دا. لەئاسمانی شین پەڵە هەوری بچوك و باریك و سپی خێرا لە هاتوچۆدا بوون.هەردەتگوت پەلەوەری گەورەن لەترسی گرمەی هەور بەملاو لادا رادەکەن.دایك سەری گران بووبوو.چاوەکانی لەبەر بێ خەوی ئاوسا بوون و سوور هەڵگەڕابوون.سینگی هێدی و نارام بوو.دڵی بەچەشنێکی ئاسایی لێی دەدا و بیری لە شتی ئاسایی دەکردەوە:سەماوەرەکەم زوو تێ هاویشت.ئاوی تێدا نامێنێ.با ئەمڕۆ تۆزێك پتر بخەون.هەردووکیان ماندوون. تیشکی تاوێ بە خۆشی لە پەنجەرەوە هاتە ژوورێ.دایك دەستی وەبەردا.کەتیشکی رۆژێ کەوتە سەر دەستی،بە پێکەنینەوە بە دەستەکەی تر لاواندیەوە.پاشان هەستاو دووکەڵکێشی سەماوەرەکەی هەڵگرت.بەبێدەنگی دەم و چاوی شوشت و خاچێکی لە سینگی کێشا و لە ژێر لێویەوە دەستی کرد بەپاڕانەوە.سەرو چاوی گەش بووەوە. ئاژێری دووهەمی کارخانە دەنگی لەوەی هەوەڵیان نەرمتر بوو.دەنگی دەلەرییەوە.دایك پێی وابوو کەدەنگی جاران درێژترە.لەژوورەوە دەنگی ئەندرێی دەهات:

_ پاڤێڵ گوێت لێیە؟بانگمان دەکەن.یەکێکیان لاقی روتی بەسەر عەرزدا کێشا و پاشان باوێشکی هاتێ.دایك بانگی کرد:سەماوەر سازە!

پاڤێڵ گوتی:ئەوە هەڵدەستین.

ئەندرێی گوتی:هەتاو هەڵاتووە.هەورەکان لادەچن،هەورەکانی ئەمڕۆ زیادین.بەپرچی ژاکا و دەم و چاوی نەشۆراو و خەواڵۆ لە چێشتخانە وەژوور کەوت.بەروخۆشی بە پێلاگێیای گوت:

_دایە گیان رۆژ باش!چاك نوستبووی؟

دایك خۆی لێ نزیك کردەوە و لەسەر خۆ گوتی: ئەندرێی تکا دەکەم هەر لە گەڵی بە.

_بە چاوان دایە.پێکەوە دەبین.لە هەموو شوێنێ لە پەنا یەکتر دەبین.بڕوابکە.

پاڤێڵ گوتی:ئەوە لەوێ پیلانی چی دەگێڕن؟

_هیچ رۆڵە گیان!

ئەندرێی گوتی: دایك دەڵێ دەست و چاوم خاوێن بشۆم،چوونکە کچەکان چاومان لێدەدەن. پاشان چوو دەست و چاوی بشوا.

پاڤێلٚ دەستی کرد بە خوێندنەوەی سرود:"رابە ئەی کۆمەڵی کرێکار!....." تا دەهات هەوا رونـاکتر دەبوو.هەورەکان بە تەوژمی با لە لەبەر یەك بڵاو دەبوون .دایك سفرەی ئامادە کرد و هەموو شتێکی پێ سـەیر بوو.سەری راوەشاند:

_ئەم دوو هەڤاڵەپێکەوە گاڵتە دەکەن،بە لام لای نیوەڕۆ چییان بەسەردێ؟ نەیدەزانی.تەنانەت هەستی بە حەسانەوە و خۆشحاڵی دەکرد.بۆ ئەوەی وەخت رابوێرن،ماوەیەکی زۆر لەسەر سفرە بوون. پاڤێلٚ وەك هەمیشە بە ئەسپایی کەوچکەکەی لە ئیستیکان وەردەدا و خوێی بە پاروە نانێك وەردەکرد.ئەندرێی لاقەکانی لەبن مێـز دا دەبزاوت و قەت نەیدەتوانی بە ئارامی لە جێیەکیان دابنێ. کاتێکی تیشکی هەتاو لە پەنجەران هاتـە ژوور و وە دیواری کەوت گوتی:

_کاتێك کەتەمەنم دە ساڵ بوو،رۆژێکی ویستم بە ئیستیکانەکەم تیشکی رۆژ بگرم دەستی خۆم بڕی و لێیـان دام .پاشان چوومە حەوشەو لە ناوەکەدا خۆرم دی .وەبەر پێلاڵەقانم دا.دیسان لێیـان دام،چونکە خـۆم قـوڕاوی کردبوو.بەسەر هەتاودا دەمزیڕاند:"شەیتانی سوور"هیچ کـوێم ژان ناکـا.زمـانم لێ دەردەهێنا،بـەوە دەهاتمـەوە سەرخۆ.

پاڤێلٚ بە پێکەنینەوە پرسی:بۆچی هەتاوت پێ سووربوو؟

_ئاسنگەرێك بەرامبەری ماڵەکەمان بوو.سەرو چاوێکی سوور و ئاحەز و ریشێکی سووری هەبوو کابرایـەکی سەیر و دڵ تەڕ بوو.هەتاوم وەك ئەو دەهاتە بەرچاو.

دایك وە دەنگ هات و گوتی: باشترە باسی کاری ئەمڕۆتان بکەن.

_هەموو شت بەتەواوی رێکخراوە.

ئەندرێی لە سەرخۆ گوتی:کاتێکی پیاو بیر لەو شتانە دەکاتەوە کەلە پێشدارێك و پێـك کراون،تـەنیا تێکیـان دەدا.دایە گیان ئەگەر هات و ئێمەیان گرت،نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ دێتە لات و پێت دەڵێ چی بکەی.

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: باشە.

پاڤێلٚ بە تاسەوە گوتی:دەمەوێ بچمە سەر شەقام .

ئەندرێی گوتی:نا .جارێ لە ماڵێ بە.سودی چییە سەرنجی پۆلیس رابکێشی ؟باشت دەناسن.

فێدیا مازین بە شادی وەژوور کەوت.سەر و چاوی سوور هەڵگەرابوو.هاتنی ئەو ناڕەحـەتی چـاوەڕوانی کـەم کردەوە.مزگێنی دانێ.

_دەست پێ دەکرێ.کۆمەڵ دەجولێ.کۆڵان هەر زمەی دێ.ڤێسۆڤشیکۆڤ،ڤاسیلی گوسێڤ و سامۆیلۆڤ لە بەیانییەوە لەبەر دەرگای کارخانە وێستاون و لەگەڵ کرێکاران قسەدەکەن.هێشتا هیچ نەبووە،هێندێك چوونەوە ماڵی خۆیان.....با بڕۆین .وەختی خۆیەتی .ئێستا سەعات دەیە .

پاڤێڵ بە لێبڕاوی گوتی:من دەڕۆم. ڤێدیا دڵنیای کرد.دەبینی ،دووای نیوەڕۆ هەموو کرێکارەکان دەست لەکار هەڵدەگرن.ئەمەی گوت و لێیدا ڕۆیشت.

دایك لەسەر خۆ گوتی:ئەم لاوە هەر دەڵێی شەمی کافورە کە لەبەر شنەی بادا دەسوتێ.هەستا و چوو لە چێشتخانە خۆی بگۆڕێ.

_دایە گیان بۆ کوێ دەچی؟

_لەگەڵ ئێوە دەبم.

ئەندرێی دەستێکی بە سمێڵی دا هێنا و چاوێکی لە پاڤێڵ کرد. پاڤێڵ بەگورجی قژەکانی ڕێك و پێك کرد و چووە چێشتخانە کن دایکی:

_دایە گیان لە دەرێ قسەت لەگەڵ ناکەم . تۆش حەقت بەسەر منەوە نییە.دایە گیان تێگەیشتی ؟

_تێگەیشتم،خوا ئاگادارت بێ .

## (٢٧)

کاتێکی دایك گەیشتە شەقام،گوێی لەدەنگی خەڵك دەبوو کە دەنگی دەدایەوە و دەیدیت لە هەموو شوێنێك ،لەپەنجەرەوە و بەردەرکانەوە.خەڵك بە سەرنجەوە چاو لە ئەندرێی و پاڤێڵ دەکەن.تارماییەك وەك پەڵە هەور بەری چاوی گرت،هێندێك جا ر سەوز و شەبەقدار بوو و هێندێ جاریش شین و تاریك دەهاتە بەرچاو.خەڵك سڵاویان لەو دوو لاوە دەکرد وهەستێکی تایبەتی لەو سڵاوانەدا هەبوو.دایك بیر وڕای جۆر بەجۆری لە بارەی ئەم دوو لاوە دەبیست:

_سەرۆکەکانی لە شکر ئەمانەن!......

_نازانم کامیان سەرۆکە.....

_من ئیتر هیچی خراپ ناڵێم.

لەبەر دەرگایەك یەکێك بە پەشۆکاوی هاواری کرد:ئەگەر وەچنگ پۆلیس کەون کاریان تەواوە. یەکی تر گوتی:"ئەگەر"ی بۆ چییە.لە گیر هەر دەکەون. ژنێکی تر بە تووڕەیی لە پەنجەرەوە نەڕاندی و لە کۆڵان دەنگی

دایەوە:دەڵێی شێت بووی؟تۆ ژن و منداڵت هەیە،ئەوان سـەڵتن،بۆ وان فـەرقی نییـە. کەلـە مـاڵێ وەردەکـەوتن کابرایەکی بێ لاق و نەقوستان بە ناوی "زۆسیمۆڤ"کە مانگانەی لە کارخانـە وەردەگرت،سـەری لـە پەنجـەرەوە هێنا دەرو بانگی کرد:

_ پاڤێلێ سەرت دەبڕن......ئەوەی تۆ دەیکەی دێتەوە ڕێت.

دایك لەرزی و راوەستا .ئەم قسانە یەکجار زۆر تووڕەیان کرد.چـاوێکی لەسـەرو چـاوی قەبـە و هەڵمەسـاوی کابرای ئیفلیج کرد کە لە پشت پەنجەرەوە خـۆی مـات کردبـوو و جنێـوی دەدان.بـۆ ئـەوەی بگاتـە کوڕەکـەی هەنگاوی توند کردن و دەیویست بەجێ نەمێنێ.وا دەهاتە بەرچاو کەئەندرێی و پاڤێلێ هـیچ شـتێك نـابینن و گوێیان لـەو تـەوس وتوانجـە نییـە کـەتێیان دەگـرن. هێـدی و لەسـەرخۆ دەڕۆیشـتن و باسـی مەسـەلەیەکیان دەکرد.کابرایەکی عاقل و بێ فیز و ساکار بە ناوی"میرۆنۆڤ"کەژیانێکی ئاسایی هەبوو و لەبەر ئـەوەی ئـارەقی نەدەخواردەوە ڕێزیان لێدەگرت،هاتە پێشیان. پاڤێلێ لێی پرسی :

_دانیلۆ ئیڤانۆڤیچ تۆش کار ناکەی؟

_خێزانم لە سەر مانگ و ڕۆژی خویەتی.ئەمڕۆش هەروا ئاڵۆز دێتە بەرچاو .بە وردی چاوێکی دۆستانەی لـەو دوو هاوڕێیە کردو گوتی:

_کوڕینە،دەڵێن ئەمڕۆ دەتانەوێ ئابڕوی بەڕێوەبەری کارخانە بەرن و شوشەکان بشکێنن....

پاڤێلێ گوتی: خۆ سەرخۆش نین.

ئەندرێی گوتی تەنیا ئاڵا هەڵدەگرین و بە شـەقامدا دەڕۆیـن و سـرودی ئـازادی دەخوێنینـەوە.گـوێ بدەنـە سرودەکان و لەرێگای ئەوانەوە لەبیرو باوەڕیشمان ئاگادار بن.

میرۆنۆڤ گوتی:لەبیر و باوەڕتان ئاگادارم.بڵاوکراوەکانی ئێوەم خوێندووەتەوە پاشان لـە کاتێـك دا چـاوی لـە دایك بڕیبوو،بە پێکەنینەوە گوتی:

_ها،نیلۆڤنا،تۆش لەگەڵ یاخییەکانی؟!

_پیاو کە لاقیشی لە سەر لیوێ قەبر بێ،دەبێ لەگەڵ راستی و حەقیقەت بێ.

میرۆنـۆڤ گـوتی:بزانـە چ بەزمێکـە!کـەوابوو حەقیانـە دەڵـێن تـۆ نووسـراوە قەدەخـەکانت لـە کارخانـە بڵاوکردوونەوە.

پاڤێلێ پرسی:کێ وا دەڵێ؟

_هەموو کەس ،باشە ،خوا حافیز،خۆتان کەر نەکەن!

دایك بزەیەکی هاتێ وئەم باسەی پێ خۆش بوو. پاڤێلێ بە پێکەنینەوە گوتی:

_دایه دەتگرن!

_ئامادەم قەی ناکا.

خۆر هەر دەهات و بەرز دەبوو.گەرمای خۆی لەگەڵ جوانی رۆژەکانی بەهار تێکەڵ دەکرد.هەورەکان سەبر درۆیشتن.سێبەریان رونتر دەبوو.لە کاتێك دا دەورەی کۆمەڵیان دەدا و بەسەر بان و کۆلانان دا دڕەوەین،وا دەهاتە بەر چاو کە بە خاوێن کردنەوەی تۆز و خۆڵی بانەکان و لابردنی خەم و خەفەت لەسەر روی خەڵك،گەڕەك دەڕازێرێتەوە.دەنگەکان شادتر و بەتین تر دەبوون و ئاوازی دوور و گرمەی کارخانە و زیق و هۆڕی ترۆمبێلەکانیان بێ دەنگ دەکرد. لەهەموو شوێنێك،لە پەنجەران،لەماڵانەوە،هاواری توورەیی یا پەرێشانی ،شاد یا خەمناك،بەرز دەبووەوە و وەگوێی دایك دەکەوت.دەیویست وەڵامیان بداتەوە و سوپاسیان بکا.بۆیان رون بکاتەوە و خۆی بخاتە نێو ژیانی ئەو رۆژە کە دوو رەنگییەکی سەیری پێوە دیاربوو.لە سوچێکی مەیدانی گەورەدا،لە کۆلانێك ،سەد کەس لە دەوری ڤێسۆڤشیکۆڤ کۆبووبوونەوە و قسەی بۆ دەکردن و دەیگوت:

_رێکمان دەگوشن.قسە بێ سەروبەرەکانی بەسەر خەڵك دا دەبارین.چەند دەنگی تێکەڵ بوو کەدەبوون بە گرمە و هەڵلا ،خێرا وەڵامیان دەداوە: راستە!

ئەندرێی گوتی:فەقیرە چی لە دەست بێ دەیکا.بچین یارمەتی بدەین.

پێش ئەوەی پاڤێڵ بتوانێ پێشی بگرێ ،لەشی نەرم و درێژی لە نێو خەڵك راکرد و دەنگی بەرزبووەوە:

_هاوڕێیان!دەڵێن زۆر نەتەوە لە سەر زەوی دەژین:جولەکە،ئەڵمانی،فەرانسەیی،ئینگلیزی،تاتار....بە لامـن بڕوا بەوە ناکەم .تەنیا دوو تایفە و میللەت هەن کە قەت لەگەڵ یەك ئاشت نابنەوە .هەژار و دەوڵەمەند.خەڵك قسەکردن و جل و بەرگیان لەگەڵ یەك فەرقی هەیە،بە لامەوەختێك دەبینین دەوڵەمەندەکانی فەرانسە وئینگلیز و ئەڵمان چۆن لەگەڵ کۆمەلانی زەحمەتکێش دەبزوونەوە،دەزانین ئەوان ئەربابن و وەك ئێسك وان لە گەروی خەڵك دا.دەنگی قاقای پێکەنین لە نێو کۆمەڵ بەرزبووەوە.

_ئەگەر بڕوانین،لە لایەکی دیکەوە دەبینین کە کرێکارانی فەرانسەیی و تاتاری و تورك،هەروەها کرێکارانی روس هەموو وەك سەگ دەژین.

تا دەهات خەڵك پتر کۆ دەبوونەوە و پاڵیان پێکەوە دەنا و مات و بێ دەنگ خۆیان هەڵدەکێشا و ملیان درێژ دەکرد و لەسەر نوکی پێ رادەوەستان.

ئەندرێی دەنگی پتر بەرزکردەوە:

_کرێکارانی هەندەران پێشتر ئەو راستییەیان بۆ دەرکەوتووە ئێستا لە ژێر تیشکی رۆژی هەوەڵی مانگی ئەیار پەیمانی برایەتی پێکەوە دەبەستن.

یەكێك هاواری كرد: پۆلیس!

چوار پۆلیسی قامچی بەدەست لە كۆلانێ راست رویان لە كۆبوونەوە كردو هاواریان كرد:بلاوەی لێ بكەن!ئەم قسانە چن؟كێ بوو قسەی دەكرد؟ خەلك رویان گرژ كردو بە ناچاری كشانەوە تا رێگا بۆ ئەسپەكان چۆل بێ.هێندێ دەچوونە سەر دیوار و بەرهەیوان.دەنگی گالتەی خەلك بەرز دەبووەوە.

یەكێك هاواری كرد:"بەرازیان سواری ئەسپ كردن و ئەوانیش خۆ بە گەورە دەزانن"!

ئەندرێی بەتەنیا لەنێوە راستی كۆلان دا مابووەوە.دوو ئەسپ بەسەر هەلتەكاندن بۆ لای دەچوون.لە پەنایەك رادەرپەری.لەو كاتەدا دایك باسكی گرت و بە بۆلە بۆل رایكێشا:

_تۆ بەلێنت دابوو لەگەل پاڤێل بی و لەو جیا نەبیەوە.ئێستا هەوەل كەسی بەتەنیا خۆت خستوەتە مەترسیەوە!

ئەندرێی لە كاتێك دا بە دایك پێدەكەنی گوتی:ئاخ.......ببورن.....

ماندووییەكی تێكەل بە خەم وپەژارە بەسە ردایك دا زال بوو.سەرەگێژەی گرتبوو.خەم و خۆشی بە دووای یەك دا،لە دلی دایك دا جێیان دەگرتەوە.ئاواتی ئەوەبوو كەزوو ئاژێری نیوەرۆ لێبدرێ.ئاخرەكەی گەیشتە ئەو مەیدانە گەورەی كلیسای لێبوو.لە پێش دەرگای كلیسا نزیكەی پێنج سەد كەس ،لە لاوانی بە كەیفەوە بگرە تا ژنی خەفەتبار و مندالی بچووك ،كۆبووبوونەوە.هەموویان دەجولانەوە و سەریان هەلدەبڕی و چاویان دەگێرا و سەیری هەموو لایەكیان دەكرد.خۆشی و نشەیەك لە هەوا دیاری دەدا.ئەو كەسانەی بە بڕتر بوون لەگەل ترسەنۆك و نەفامان بەگژ یەكدا دەچوون.دەنگی پێك هەلپڕژانێكی دوژمنانە دەهات.ژنێك كە تەواو دەلەرزی،تكای دەكرد:میتیا،ئاگات لەخۆبێ.

_لێم گەڕێ بحەسێمەوە!

دەنگی دلسۆزانەی سیزۆڤ بە هێدی و دلنیایی دەهات و دەیگوت:

_نا....نابێ لاوەكان بەجێ بێلین.لە ئێمە عاقلترن و غیرەتیان پترە.لە سەر كەم كردنەوەی كەپێكێك بۆ وشك كردنی زەلكاو كێ وەدەنگ هات؟ئەوان.نابێ لە بیرمان بچێ.لاوەكان لەسەر ئەو مەسەلەیە گیران.بە لامكەلكیان لە غیرەتی خۆیان وەرگرت .

_زیرەی ئاژێر لە سەر دەنگەكان كەوت.كۆمەل لەرزی.ئەوانەی دانیشتبوون هەستان.دەمێك هەموو شت مات بو.هەروەك چاوەڕوانی شتێك بن،زۆر كەس رەنگیان بزركا.

پاڤێلّ به دەنگێکی توند و لێبڕاوانه بانگی کرد:هاوڕێیان!مژێکی وشك و بەگڕ چاوەکانی دایکی دەسوتاند.خێرا هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە و بەبازێك خۆی گەیاندە پشت کوڕەکەی.دەستە دەستە لە دەورەی پاڤێلّ کۆدەبوونەوە.هەروەك وردە ئاسن بن و مەگناتیس رایکێشا بن ،لەدەورەی هالآن.

_برایان! کاتی ئەوە هاتووە که ئەم ژیانە تاریك و پڕ له تەماع و قینه،ئەم ژیانە پڕ لەزوڵم و زۆرە،ئەم ژیانە که ئێمە هیچ جێگاو پلەیەکمان تێی دا نییە،وەلا بنێین. قسەکانی بڕی.کرێکاران مات بوون و پتر دەوریان گرت.دایك تەماشای کوڕەکەی کرد و بێجگەلە چاوی روون سەری بەرز و بە غیرەتی ئەو،هیچی دیکەی نەدەدیت.

_هاوڕێیان!ئێمه بڕیارمان داوە ئەمڕۆ بە ئاشکرا رابگەیەنین کەئێمه کێین.ئەمڕۆ ئێمە ئالآمان،یانی ئالآی عەقلّ و راستی و ئازادی بەرزدەکەینەوە.

دارێکی سپی و درێژ بەرزبوودوە و پاشان ئەوی بوودوە ولەنێو کۆمەڵدا ون بوو. پاش تاوێك ئالآی کرێکاران وەك پەلەوەرێکی سوور لەسەر سەران شەکایەوە....

پاڤێلّ باسکی هەڵێنا و داری ئالآکەی راژا.پاشان دەیان دەست ئەو دارە سپییەیان گرت.دەستی دایکیش لەنێو ئەو دەستانەدا بوو. پاڤێلّ هاواری کرد:بژی کۆمەڵی کرێکار.

سەدان دەنگ بەلێبڕاوی بۆیان ئەستاندەوە.

_هاوڕێیان ! بژی حیزبی ئێمە،راوەستاوبێ ئازادی گەلآنی روسیا!

کۆمەڵ هەر شەپۆلی دەدا.ئەوانەی مانای ئالآیان دەزانی.ڕێگایان دەکردەوە،لێی وەنزیك دەکەوتن.مازین و سامۆیلۆڤ و ئەو دوو برایەی ناویان گۆسێڤ بوو،لە پەنا پاڤێلّ بوون.ڤێسۆڤشیکۆڤ سەری بەردابووەوە و خەڵکی بۆ پشتەوە پالّ پێوە دەنا.لاوەکانی تر که دایك نەیدەناسین،بەچاوی زەقەوە خۆیان دەگەیاندە ڕیزی پێشەوە. پاڤێلّ درێژەی پێدا:

_بژی گەلی زۆر لێکراو،بژی ئازادی!

هەزاران دەنگ بە شادی و بەهێزی بە تەوژمەوە بۆیان دەستاندەوە.ئەم هەرایە گیانی دەجولآند.

دایك دەستی گڕویّ و یەکی دیکەی گرت.کولّی گریانی هەستابوو،بە لامنەدەگریا.بەدەنگێکی لەرزۆك گوتی:

_بەلّیّ،دۆستەکانم راستە.

پێکەنینێکی بەردەوام دەم و چاوە گڕوێکەی ڤێسۆڤشیکۆڤی گەش کردەوە.لە کاتێك دا بەقسەی تێکەلّ پێکەلّ ئەرەی دەهات و دەستی بۆلای نیشانەی ئازادی راداشتبوو،تەماشای ئالآکەی دەکرد.پاشان لەپڕ دایکی لەئامێز گرت و ماچی کرد و له قاقای پێکەنینی دا.

ئەندرێی بە دەنگی نەرم و دڵڕفێنی ،بەسەر هەڵلاو بگری کۆمەڵدا زاڵ بوو و دەستی پێکرد:

_ئێمە بەشانازی خوایەکی تازە راپەریوین.خوای روناکی و راستی،خوای عەقڵ و چاکە.هاوڕێیان ئێمە دەچینە غەزایە.رێگایەکی دژوار و درێژمان لە پێشە.ئامانج دوورە،بە لاخونچەی درو نزیکە.ئەوانەی حاشا لە هێزی حەقیقەت دەکەن.ئەوانەی غیرەتیان نییە کە تا دووا هەناسە بەرگری بکەن،ئەوانەی بڕوایان بەخۆیان نییە ,لە دەردو کوێرەوەری دەترسێن،با وە دووای کاری خۆیان بکەون.ئێمە تەنیا ئەو کەسانەمان دەوێ کەبڕوایان بە سەرکەوتنمان هەیە.ئەوانەی ئامانج نابینن،نابێ وە دووای ئێمە بکەون.چوونکە خەم و خەفەت چاوەڕوانیانە.هاوڕێیان لریز ببەستن.راوەستاو بێ هەوەڵی مانگی ئەیار،یانی جێژنی مرۆڤی ئازاد!

هەردەهات و خەڵك زۆرتر دەبوو. پاڤێل ئالاکەی راوەشاند و ئالا کرایەوە.لە کاتێك دا هەتاو لێی دەدا،کەوتە شەکانەوە. فێدیا مازین بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:با دەست لە دنیای کۆن هەڵبگرین!

وەڵامی ئەو وەك لافاوێکی بە تەوژم لە هەوادا دەنگی دایەوە:

_با تۆزو خۆڵی لاقمان بتەکێنین!

دایك لە کاتێك دا زەردەخەنەیەکی سوتێنەری لەسەر لێوان بوو،خۆی گەیاندە پشت فێدیا.لەسەر سەری فێدیاوە،ئالا و کوڕەکەی دەدیت.لە دەوروبەری ئەو سەر و چاوی داگیرساو دەردەکەوتن و نەدیو دەبوون.چاوی دەدرەوشان.ئەندرێی و کوڕەکەی لە ریزی پێشەوەدا بوون.گوێی لە دەنگیان دەبوو.دەنگی ئەندرێی نووسابوو.بە لاموەك برایان لەگەڵ دەنگی کوڕەکەی کەتوندتر بوو،تێکەڵ دەبوو.

_ڕاپەڕە ئەی کۆمەڵی کرێکار!ڕاپەڕە ئەی خەڵکی برسی!.......

خەڵك بۆلای ئالای سوور غاری دەدا.دەنگی کۆمەڵ لەگەڵ ئاوازی سرود،سرودێك کە لە ماڵێ سەبرتر دەخوێندرایەوە،تێکەڵ دەبوو.ئەو سرودە بەهێزێکی سامدار لە کۆلان وەك زەنگۆڵە دەنگی دەدایەوە.خەڵکی بۆ رێگایەك بان دەکرد کە بەرەو پاشەرۆژی دەبردن.بە لامپیاوانە ئەوانی لە تەنگ و چەڵەمەی ئەو رێگایە ئاگادار دەکرد:

_میتیا!....... بۆ کوێ دەچی!

دایك بێ ئەوەی راوەستێ وەڵامی داوە:

_لێی گەڕێ با بڕوا،نیگەران مەبە .ئی من لە ریزی پێشەوە دایە.ئەو ئالا هەڵگرە کوڕی منە .

_بۆ کوێ دەچن؟ئەوەتا سەرباز لەوێن! ژنە بالا بەرز و لاوازەکە لەناکاو دەستی هاویشتە سەر شانی دایك و هاواری کرد:

_خۆشەویستم،بزانە چۆن گۆرانی دەڵێن...."میتیا"ش گۆرانی دەڵێ.....

دایك به ئەسپایی گوتی:نارەحەت مەبە .کارێکی پیرۆزە .عیسا خۆشی ئەگەر خەڵك لە پێناویدا نەمردبا،ناوی نەدەما.لە پڕ ئەو فیکرەی بە مێشکی دا هاتبوو،بە حەقیقەتی ساکارو روناکی خۆی خستیە سەرسوڕمانەوە.دایك تەماشایەکی ئەو ژنەی کرد کەباسکی دەگوشی و بە زەردەخەنەیەکی سەرسووڕمانەوە بۆی دووپاتە کردەوە:

_خوای ئێمە، عیسای مەسیح ئەگەر خەڵك بەشانازی ئەو خۆیان بە هیلاك نەدابا،لەم دنیایەدا نەدەما.سیزۆڤ گەیشتە لای دایك .لە کاتێك دا کلاوەکەی بەدەستەوە گرتبوو و بەهەوای سرود رای دەوەشاند،بە دایکی گوت:

_ها،دایە،بە ئاشکرا کەوتونە کار.سرودێکیان سازکردووە .چ سرودێك ،ها دایە،قەیسەر پێویستی بە سەرباز هەیە .کوڕەکانتانی بدەنێ....... سیزۆڤ قسەکەی درێژە پێدا :

_لە هیچ شتێك ناترسن.کوڕەکەی من لە قەبری دایە.کارخانە کوشتی.....

بەڵێ دڵی دایك توند لێی دەدا.لێی گەڕا وەپێشی بکەوێ.لەتەنیشتەوە بۆلای دیوار پاڵیان پێوەنا و لافاوێکی بە تەوژمی خەڵك لە پشتی دا شەپۆلی دەدا.دایك دیتی کە خەڵك زۆرە .لەم مەسەلە زۆر کەیف خۆش بوو."رابن،رابن، ئەی زۆرلێکراوان",دەتگوت شەیپورێکی گەورەیە لە گوێی خەڵك دا دەنگ دەداتەوە.لای هێندێ کەس مەیلی خەبات و لای هێندێکی تر بەختەوەرییەکی نادیار و هەستی پێش روودانی شتێکی تازەی وەخەبەر دەهێنا.لە جێیەکە هیوایەکی بڕوا نەکراوی پێك دەهێنا و لە شوێنێکی تر دەرگای بۆ لافاوی قین و تووڕەیی کەلە مێژ ساڵ بوو کۆبووبووەوە،دەکردەوە.هەموو تەماشای ئەو شوێنەیان دەکرد کە ئاڵای سووری لێدەشەکایەوە.

دەنگێك چریکاندی :ئافەرین،کوڕینە!هاودەنگ بەرێگادا دەڕۆن.

خاوەنی ئەو دەنگە لەبەر ئەوەی هەستێکی لەخۆدا شك دەبرد و نەیدەتوانی بە قسەی ئاسایی دەری ببڕێ،دەستی کرد بەجنێودان .بە لامتووڕەیی ئەو ،قینێکی کوێر کوێرانەبوو،ددانی لەسەر یەك دادەنان و وەك مار دەیزریکاند و هێندێ وشەی تێکەڵ و پێکەڵی دەردەبڕی کە نیشانەی تووڕەیی و بێزاری بوو. یەکێك مستی بۆ لای پەنجەرە درێژکرد و هاواری کرد:

_لامەزەبینە!

لولەیەکی کاریگەر وەك سێپەڕە گوێی دایکی کون کرد:

_چۆن! شۆڕش دژی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆر.......شۆڕش دژی قەیسەر.....؟

سەرو چاوی پەشۆکا و خێرا بەبەر چاوی دایك تێدەپەڕین.ژن وپیاو بەپەلە رادەبورن و هەموو بەتوندی سروودیان دەخوێندەوە.کاتێك لە دوورەوە تەماشای ئاڵای سووری دەکرد،دەم و چاو و نێو چاوانی کوڕەکەی و

چاوەکانی کەتیشکی بیرو باوەڕیان تێدا دەدرەوشایەوە،دەهاتنە بەرچاوی،بێ ئەوەی بە تەواوی لێکیان بکاتەوە.لەو کاتەدا کەوتبووە ریزی دووایە و بەسەبرو دڵنیایی پێکەوە قسەیان دەکرد:

_پۆلێك سەرباز لەنزیك قوتابخانە و دەستەیەکیش لە کارخانەن.....

_حاکم هاتووە......

_بەڕاستیتە؟

_بە چاوی خۆم دیتم.... یەکێك دوو سێ جنێوی دا و گوتی:

_بەو حاڵەش لە براکانمان دەترسین!......سەرباز و حاکم دەنێرن....و.....!

دایك لەدڵی خۆیدا گوتی:کەس و کارەکانم!دڵی توند لێی دەدا.بە لاملەدوربەری دا قسەی سارد بڵاو دەبوونەوە.هەنگاوی توند کرد تا لەنێو ئەو کۆمەڵە وەدەرکەوێ و دوور کەوێتەوە.دەکرا وەپێشیان کەوێ،چونکە بە تەمبەڵی و بەشێنەیی دەڕۆیشتن.لە پڕ هەروەك کۆمەڵ سەری وەشتێك بکەوێ،بەرەو دووا گەڕایەوە.دەنگێکی گڕو لەزۆك بەرز بووەوە.لافاوی شەپۆلی دەنگەکان دیسان نیشتەوە.دەنگەکان یەك لە دووای یەك کپ دەبوون.لێرەو لەوێ هەوڵیان دەدا کەدەنگەکە وەك هەوەڵ جار بەرزبێتەوە: هەستن،هەستن ڕەش و ڕوتەکان! لەدوژمن ڕاپەڕن ئەی برسییەکان!بە لامنیتر ئەو تەوژم ودڵنیاییە گشتییە هەوەڵی لە دەنگەکەدا نەمابوو.نیگەرانی و پەشۆکاوییەکی لەگەڵ تێکەڵ بووبوو. دایك نەیدەتوانی رووداوی ریزی پێشەوە ببینێ،بە لامهەستی دەکرد.پاڵی بەخەڵکەوە دەنا،ڕێگای بۆخۆی کردەوە و چووە پێشەوە.کۆمەڵ بەرەو دووا گەڕایەوە.سەر شۆڕ دەبونەوە و برۆ تێك دەنران.بزەی ناهۆمێدی دەبینرا و فیتەی گاڵتە پێکردن دەبیسترا.دایك بەخەفەتەوە سەیری دەم وچاوی خەڵکی دەکرد.چاوەکانی،پرسیارو پاڕانەوە وبانگ هێشتنیان لێ دەباری.....

پاڤێڵ دەنگی هەڵێنا:هاوڕێیان!سەربازەکانیش وەك ئێمە ئینسانن.لێمان نادەن!بۆچی لێمان دەدەن؟لەسەر ئەوەی ئێمە راستی بەخەڵك دەڵێین؟ئەوانیش پێویستیان بەو راستیە هەیە ....هێشتا تێ ناگەن.بە لامنەو ڕۆژە نزیکەلەژێر ئاڵای پیاو کوژو چەوسێنەران بێنەدەر و بێنە ژێر ئاڵای ئێمە،ئاڵای ئازادی و چاکە،بێنە ریزی ئێمەوە.بۆ ئەوەی زووتر لەئازادی ئێمە تێبگەن،پێویستە بچینە پێشێ!بۆ پێشەوە هاوڕێیان!هەموو بۆ پێشەوە!

دەنگی پاڤێڵ بە هێز بوو،قسەکانی رون و رەوان بوون،بە لامکۆمەڵ بڵاوەی دەکرد.خەڵك بەدووای یەکتر دا دەڕۆیشتن.هێندێ بەراست و هێندێ بە چەپدا فیزماڵکیان دەدایە.لەو کاتەدا کۆمەڵ وەك سێ گوشەیەك بوو کە پاڤێڵ لەسەر گۆشەیەك راوەستابوو.لەسەری پاڤێڵ ئاڵای چینی کرێکار دەدرەوشایەوە.کۆمەڵیش وەك باڵندەیەکی رەش دەچوو کەباڵەکانی لێك کردبێتەوە و خەریك بێ بفڕێ. پاڤێڵ سەری ئەو باڵندەیە بوو.

# (٢٨)

دایك لە ئاخری كۆڵان دا چاوی بە دیوارێكی رەنگ خۆڵەمێشی كەوت كە لە ئینسانی بێ سەرو چاو پێك هاتبوو و ریزەوی مەیدانەكەیان گرتبوو.لەسەر شانی یەكەیەكەیان پۆڵایەكی باریكی تیژ دەدرەوشا.ئەو دیوارە ئارام و چەقیوە ساردییەكی بەسەر كۆبونەوەكەدا بڵاودەكردەوە.پێلاگێیا هەموو لەشی وشك بوو.رووی كردە ئەو لایە كە ناسیارەكانی لە پێشەوە بوون و لەگەڵ خەڵكی نەناسیاو تێكەڵ دەبون.دەتگوت دەیەوێ پشت بەوان ببەستێ. پاڵی بە كابرایەكی كەڵەگەت و یەكچاوەوە نا.كابرا ئاوڕی دایەوە و پرسی :

_تۆ كێی ؟چت دەوێ؟

_دایكی پاڤێل ڤلاسۆڤ.

هەستی دەكرد كەچۆكی دەچەمن نا لێوی خوارەوەی دادەچۆڕێ.كابرای یەك چاو گوتی:ئاخ!

پاڤێل قسەكانی درێژە پێدا:هاوڕێیان!تەواوی ژیان لەبەر چاومانە.رێگای ترمان نییە .با سرود بخوێنینەوە!

ماتییەكی خەفەتبار بەسەر وڵاتدا هات ئاڵا بەرز بووەوە وراشەكا و لەكاتێك دا لەسەر سەری خەڵك دەلەریەوە،بۆلای دیواری سەربازان رۆیشت.دایك لەرزی .چاوەكانی لەسەر یەك دانا وناڵاندی.تەنیا چوار كەس لە خەڵك جیابووبوونەوە: پاڤێل و ئەندرێی و سامۆیلۆڤ و مازین.لەپڕ دەنگی ئاشكرای فێدیا مازین لە هەوا دەنگی دایەوە و هاواری كرد:

_بوون بە قوربانی. دوو دەنگی گەورە و گڕ وەك دوو هەناسە كە بەزەحمەت بێنە دەر،درێژەیان پێدا:

_لە خەباتێكی شێلگیر دا. خەڵك چەند هەنگاویان بۆ پێشەوە هاویشت و بەهەوای سرود لاقیان هەڵدێناوە و گۆرانییەكی تازەیان بە لێبڕاوی و شادی دەخوێندەوە.

فێدیا مازین كەلە دوورەرەوە دەنگی دەبیسرا،هاواری كرد:

_گیانتان كردوە بەقوربانی !لەرێگای ئەودا...

بەدووای ئەودا تێكڕا دەنگیان هەڵبڕی:لەپێناوی ئازادی دا.

یەكێك بەدەنگێكی بەد خوازانە هاواری كرد:ئاخ!سەگ باوكانە سرودی مەزهەبی یش دەڵێن؟

دەنگێكی دیكە بەتووڕەیی وەڵامی داوە:لێیان دەن!

دایك هەردوو دەستی لەسەر سینگی دانا.گەڕاوە،دیتی ئەو كۆمەڵەی ماوەیەك پێشتر كۆ بووبووەوە و كۆڵانی پڕ كردبوو،ئێستا بە دڕدۆنگی راوەستاوە تەماشای ئەو كەسانە دەكا كەلێی جیا دەبنەوە و ئاڵاكەی لە نێو خۆ دەگرن.بەدووای ئەواندا دەیان كەس دەڕۆیشتن،بە لاملەگەڵ هەر هەنگاوێك بۆ پێشەوە یەكێك جیادەبووەوە و

لای دەدا.دەتگوت نێوەڕاستی کۆڵان سوور بووەتەوە و پێڵاو دەسوتێنێ. دەنگێک لەسەر لێوی فێدیا دەزرینگایەوە:"دیکتاتۆر دەڕوخێ"......

دەستەیەکی تر بەدەنگی بەهێز و توند وبە هەڕەشەوە وەڵامیان داوە:"کۆمەڵ رادەپەڕێ"لبە لامهێندێك قسەی نهێنی و بەئەسپایی دەنگ و هەوای سرودەکەیان کون دەکرد.هێندێك قسەی کورت دەنگیان دایەوە:

_ئەمر دراوە.....سەرە نێزەکان بۆ پێشەوە!

لەهەوا سەرە نێزە تێك هاڵان و هاتنە خوارێ و هەر وەك پێکەنینێکی بەدرۆ،بەرەو ئاڵا وەڕێکەوتن.

_بۆ پێشەوە! کابرای یەك چاو دەستی لە گیرفانی ناو وگوتی:ئەها،هاتن.پاشان بە توندی وەڕێ کەوت. دیواری خۆڵەمێشی بزووت و تەواوی پانایی کۆڵانی داگرت.بەساردی،بەهەنگاوی وەك یەك دەچوونە پێش و نوکی نێزەکانیان کە وەك زیو دەدرەوشا،بۆ پێشەوە رادەدا.دایك لە پاڤێلێ نزیك بووەوە.دیتی ئەندرێی هات لە پێش کوڕەکەی راوەستا،تا لەپەنا خۆی بگرێ و بیپارێزێ.

پاڤێلێ بەدەنگێکی لێبڕاو هاواری کرد:هاوڕێیان! لە تەنیشت من!

ئەندرێی دەستی لە پشتەوە گرتبوو،سەری بەرز کردبووەوە و سرودی دەگوت!

پاڤێلێ کشاندیەوە پاش و دیسان بانگی کرد:بۆ تەنیشت من!حەق نییە لێرە بێ.ئاڵاهەڵگر دەبێ لە پێش هەموان بێ. ئەفسەرێکی بچوك شیری بریقەداری راوەشاند و بەدەنگێکی ناسك لەگەڵ هەر هەنگاوێك پانییەی چەکمەکانی بە تووڕەیی لەعەرزی دەدا،بێ ئەوەی ئەژنۆیان وەنوشتێنێ.چەکمە بریقەدارەکانی سەرنجی دایکیان رادەکێشا.لەپەنا ئەو کەمێك دوورتر پیاوێکی کەڵەگەتی ریش تاشراوی سمێڵ گەورەی سپی دەڕۆیشت.پاڵتۆیەکی درێژی شینکی بەر سووری لەبەر دابوو.خەت خەتی زەرد پاتۆڵە گوشادەکەی جوان کردبوو.هەروەك ئەندرێی دەستی لە پشتەوە گرتبوون،برۆ سپی و بە پشتەکانی هەڵگەڕابوونەوە و تەماشای پاڤێلی دەکرد.دایك ئەوانەی هەموو دەبینی .هاوارێك لەسینگی دا وەستابوو.نامادەبوو لەگەڵ هەناسەیەك بێتەدەرێ.ئەو هاوارە دایکی دەخنکاند،بە لامبە هەردوو دەستی سینگی دەگوشی و پێشی هاوارەکەی دەگرت،بێ‌ئەوەی بزانێ بۆ وادەکا.لە هەموو لایەکەوە پاڵیان پێوە دەنا،لاترەی دەبرد.وەك بێهۆشان بۆ پێشەوە دەچوو.هەستی دەکرد کە تادێ خەڵکی لە پشت سەری کەم دەبێتەوە.لافاوێکی سارد بە پێشوازیانەوە دەهات و بڵاوی دەکردن. لاوانی ئاڵاسوور و سەربازانی شینکی پۆش هەردەهات و لێك نزیك دەبوونەوە.سەرو چاوی سەربازکان بە جوانی لێك دەکرایەوە.بە پانایی کۆڵانێ خەتێکی زەردی ناحەز و چلکن پان بووبووەوە.لەو نێوەدا چاوەکان بەرەنگی جیاواز و بە چەشنێکی نابەرامبەر زەق دەچوون.سەرەنێزە تیژ و باریکەکان بێ ڕەحمانە

بریقەیان دەهات و بەرەو سینگەکان درێژبووبوونەوە.خەڵکیان لە کۆمەڵ جیا دەکردەوە و بێئەوەی بیانگەنێ بلاوەیان پێ دەکردن.

دایك گوێی لە دەنگی لاقی ئەو کەسانە دەبوو کەرایان دەکرد.هێندێك دەنگی گیراو بە نیگەرانی و ترسەوە بەرز دەبوونەوە:

_هاوڕێیانلراکەن!

_ڤلاسۆڤ!....وەرە.....

_ پاڤێلّ!

بکشێوە! ڤێسۆڤشیکۆڤ بەحالێکی خەفەتبارەوە گوتی:

_ پاڤێلّ ئالآکەی بۆ لای من باوێ.بیدە بە من تاقەتی دەکەم... ..داری ئـالآی گرت،ئـالآ راژا و لـەراوە. پاڤێلّ هاواری کرد:بەری دە!

وەك پۆلویان بە دەستیەوە نابێ،بەری دا.دەنگ نەمابوو.لاوەکان راوەستان و وەك جوغزێك دەورەی پاڤێلّیان دا،بە لامنەو بۆ پێشەوە هەنگاوی هاویشت و توانی لەو جوغزە تێپەڕێ.ماتی بەسەر کۆمەڵ دا زاڵ بوو.جارێکی تر خەڵك وەك هەوری رون یەکتریان لە ئامێز گرت.بیست کەس پتر نا،لەبن ئالآکە راوەستا بوون وباش بەربەرەکانیان دەکرد.دایك لەتاوی ئەوان دەلەرزی.بە ئاوات بوو بتوانێ شتێکیان پێ بلێ.

دەنگی کابرای پیری کەڵەگەت لەهەوا بیسترا:لەدەستی بێنەدەر!

دەستی بۆ ئالآکەی راداشت.ئەفسەرە گەنجەکە رای کرد و داری ئالآکەی گرت و دەنگی دا:

بێنە ئەم ئالآیە!

_نایدەم! بمرن زۆرداران!

ئالآ لـە هـەوا دەلەرییـەوە و جارێـك بـەلآی راسـت و جارێـك بـەلای چـەپی دا خـوار دەبـووەوە و دیسـان هەڵدەستایەوە.

ڤێسۆڤشیکۆڤ بەدەستی درێژ و مستی گرێ دراو،وەك بروسك بـەپێش دایـك دا تێپـەڕی .کـابرا پـیرە لاقـی لەعەرزی دا و نەڕاندی:بیانگرن!

چەند سەرباز رایان کرد.یەکێك لەوان قونداخی تفەنگەکەی بلند کرد.ئالآکە لەرزی.خوار بووەوە ولەنێو پـۆلی سەربازە رەنگ خۆڵەمێشییەکان دا بزر بوو.دەنگێکی خەفەتاوی

ئالآندی:ئاخ!

_خواحافیز دایە!خواحافیز گیانەکەم! ئەم دوو فیکرە بە دڵی دایك دا هاتن:

زیندووە.....منیشی لەبیرە.....

_خواحافیز دایە گیان!

دایك هەستا سەر پەنجەی پێ و باسکەکانی راوەشان.دەیویست کوڕەکەی و هەڤاڵەکانی ببینێ.لەسەر سـەری سـەربازەکانەوە چـاوی بـە ئەنـدرێی کـەوت.لەگـەڵی پێدەکـەنی و سـڵاوی بـۆ دەنـارد.هـاواری کرد:خۆشەویستەکانم....منداڵەکانم....ئەندرێی!.... پاڤێلێ !خواحافیز هاورێکانم! چەند جار،بە لامنـەك هـەر بە زمانێك،وەڵامیان درایەوە.دەنگەکان لە سەربان ولە پەنجەرەوە و لەدەرگاوە دەهـاتن و سـەر و چـاوەیان دیـار نەبوو.

## (٢٩)

یەکێك لە پێشەوە پاڵی بەدایکەوە نا.لە پشت تارماییەکەوە کە بەرچاوی گرتبـوو.ئەفسـەرە بچـوکەکەی لـە بەرامبەری خۆی دی, بەسەر و چاوێکی سوور و درێژەوە هاواری کرد:

- برۆ پیرێژن تێپەڕە

_دایك سەیری ئەفسەرەکەی کرد،دیتـی کـە داری ئاڵاکـە شـکاوە و لـەت بـووە وکەوتووەتـە بـەر پێیـانی. .پارچەیەکی بچوکی سوور بەسەری لەتێکەوە دیاربوو.داهاتەوە کە هەڵیگرێتەوە،ئەفسەر دارەکەی لـە دەسـتی دەرهێنا و بە عەرزی داداو هاواری کرد: دەڵێم برۆ تێپەڕە!

لە نێو سەربازەکان دا لەناکاو دەنگێك بەرزبووەوە:"راپەڕن ئەی زۆر لێکراوان"!

هەموو شت سووڕا،لەرزی ،نسکۆی برد.دەنگێك لە هـەوا وەك سـیمی تێلگـراف لەرزیـیـەوە.ئەفسـەر خێـرا گەڕاوە و زیڕاندی:

_کڕاینۆڤ بێ دەنگی کەن!........

دایك بەلارەلار ئەو لەتە دارانەی ئەفسەر بەعەرزی دادابوون کۆی کردنەوە و دیسان بەرزی کردنەوە.

_زاری ببەستن!

سرودەکە تێکدراو پاشان بێ دەنگ بوو.یەکێك شانی دایکی گرت،سووڕاندی و پشتاوپشت پاڵی پێوەنا:

_دەبڕۆ تێپەڕە!

ئەفسەر بانگی کرد:کۆڵان گەسك دەن!

دە هەنگاو لەولاتر،دایك دیتی سەرلەنوێ کۆمەڵێك کۆ بوونەتەوە.هاواریان دەکرد.فیکـەیان دەکێشـا وسـەبر سەبر دەکشانەوە و لەنێو حەوشەکانی دەوروبەردا بڵاو دەبوون.

سەربازێکی گەنج بە گوێی دایکی دا نەڕاند:بڕۆ لاکەوە! پاڵێکی پێوەنا. بۆئەوەی نەکەوێ خۆی هاویشتە سەری داری ئاڵاکە و دەستەکەی دیکەشی بە دیواری گرت و سەبر هەنگاوی داویشت.نەیدەتوانی بڕوا،ئەژنۆی دەلەرزین.لەپێش ئەودا،خۆپیشاندەرەکان هەروا بۆ دوواوە دەکشانەوە.سەربازەکانیش بە دووایان دا بەرەو پێش دەچوون و جاروباریش هاواریان دەکرد:" تێپەڕە......تێپەڕە.....!"

وەپێش دایك کەوتن .ئەویش راوەستا و تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد.هێزێکی چەکدار لەوسەری کۆڵان دا وەك پەرژین پێشی خەڵکی گرتبوو،نەیدەهێشت بگەنە مەیدانەکە کەتازە چۆڵ بووبوو.

زەڵامی رەنگ خۆڵەمێشی بە کاوەخۆ بەرەو کۆمەڵ دەچوونە پێش.

دایك ویستی بگەڕێتەوە .بە لامبێ ئەوەی خۆی بزانێ بۆ پێشەوە دەڕۆیشت.گەیشتە کۆڵانێکی تەنگ و چۆڵ،بای داوە و لەوێ راوەستا.هەناسەیەکی هەڵکێشا ،گوێی لە دەنگەدەنگی خەڵك بوو.لە کاتێك دا بڕۆی دەبزاوت و لەتکە دارەکەی بە دەستەوە بوو،وەڕێکەوت.لەپڕ گەرم داهات.لێوەکانی سوور هەڵگەران،دەستی راوەشاند.دیار نەبوو چ وشەیەك وەك بروسکە گڕی لەدڵی دا هەڵگیرساندووە و پاڵی پێوە ناوە.بە ئاوات بوو هاوار بکا.کۆڵانەکە بۆ لای چەپ بای دەدایەوە.لە قوژبنێکی ئەو کۆڵانە،چاوی بە کۆمەڵەخەڵکێك کەوت.یەکێك لەوان دەیگوت:

_برایان ! ئەوەندە ئازان کەلەبەر سەرە نێزەیش نابزوون! هۆوەتا.دەیانبینن؟سەرباز بۆیان دەچوون و ئەوان نەدەکشانەوە.بێ ترس لەوێ راوەستابوون!.......

_بەڵێ.......

_ئەوە پاڤێل ڤلاسۆڤە.

_ئەندرێیش ئەوەتا دیارە.

_دەستی لەکەلەکەی ناوە،شەیتانە پێدەکەنێ.

دایك چووە نێو خەڵك هاواری کرد:ئەی دۆستانم !ئەی خەڵکی خۆشەویست! بەڕێزەوە رێگایان بۆ چۆڵ دەکرد.یەکێك بە پێکەنینەوە گوتی:

_بزانن ئاڵای پێیە!دارەکەی بەدەستەوەیە. دەنگێك بەتوندی وەڵامی داوە:بێ دەنگ بە. دایك بەفیزەوە باسکی هەڵێنا:

_بەناوی حەزرەتی عیسا گوێ بدەنێ! هەمووتان لەئێمەن.......هەمووتان خەڵکێکی راست بێژو دروستن....چاوتان بکەنەوە و بێ ترس تەماشا بکەن....چ قەوماوە؟ منداڵەکانمان بەهێدی و هێمنی رادەبن.رۆڵەکانمان،یانی جگەر گۆشەکانمان،بەناوی حەقیقەت رادەبن....بۆ گەیشتن بە شەقامی

تازە،بەشەقامێکی راست و بەرین کە تایبەتی هەموومانە،پیاوانە ڕێگا دەکەنەوە.بۆ هەموانتان،بۆ ڕۆڵـەکانتان دەستیان بە غەزا کردووە....

دڵی دەگوشرا،پشوی نەدەهات،گەروی وشك بووبوو،گەرم داهاتبوو.لە ناخی دەرونی قسەی ئەو تۆ هەڵـدەقوڵێن کەپڕ بوون لە ئەوینێکی بێ‌پایان.ئەوینێك کەهەموو کەس وهەموو شتی گەرم دادەهێنـا.زمانیـان دەســوتاند و بەهێزێك بە تەوژم دەیانبزوواند.دەیزانی کە گوێ بۆ قسەکانی رادەگرن.هەموو بێ دەنگ بـوون.دایـك هەسـتی کرد کەبیر دەکەنەوە و لەدەورەی کۆدەبنەوە.ئاواتی ئەوەبوو کەخەڵکەکە بـۆلای ئەنـدرێی و پاڤێلێ و بـۆلای ئـەو هاوڕێیانـە رابکێشـێ کـە بـە جێیـان هێشـتون ولێیـان وەدوور کـەوتوون و داویـانن بـە سەربازان.چاوێکی بەسەر و چاوی گرژی خەڵکەکە دا گێڕا و بەهێزێکی نەرمتر قسـەکانی درێژە پێدا.

ڕۆڵەکانی ئێمە لە جیهان دا بەرەو شادی دەچن.بەناوی هەمووان وبەناوی حەقیقەتی مەسیح،دژی تەواوی ئـەو شتانە خەبات دەکەن کەبەهۆی ئەوانەوە خەڵکی ناجسن،فریو دەرەکان و بەتەماعەکان،ئێمەیان زنجیر کـردووە و لەکۆیلەتی دا رامان دەگرن.خۆشەویستەکانم! بۆ کۆمەڵانی خەڵکە،بۆ هەموو جیهانە وبۆ هـەموو زۆرلێکراوانـە کەلاوەکانمان، ڕۆڵەکانمان راپەڕیون.دەستیان لێ بەرمەدەن،بەجێیان مـەهێڵن.ئـەوانتان خـۆش بـوێ.بڕوا بـەدڵی ڕۆڵەکانتان بکەن.ئەوان حەقیقەتیان دۆزیوەتەوە.بەخۆشیەوە بە پێشوازی مردنەوە دەچن.بڕوایان پێ بکەن.دەنگی گیرا.هیلاك بوو،تێك هەڵگلا.یەکێك باسـکی گـرت..... دەنگێکـی لـەرزۆك هـاواری کـرد:خـوا تینـی وەبـەر دەنێ.خەڵکی نازەنین!خوا یارمەتی دەدا،گوێ بدەنە قسەکانی .یەکی دیکە سکی پێ دەسوتا:

_ها......خۆی دەکوژێ.

_خۆی ناکوژێ.ئێمەی ئەحمەقی مەبەستە،تێبگە! دەنگێکی نەرم بەنیگەرانی لە نێو خەڵك دا بەرزبووەوە:

_ئەی مەسیحییەکان!میتیای من،ئەو گیانە پاکە،چی کردووە؟

وەدووای هاوڕێکانی کەوتووە.دایك راست دەکا....بۆچی ئێمە دەست لـە ڕۆڵـەکانمان هەڵـدەگرین.چ کـارێکی خراپیان کردووە؟ ئەم قسانە دایکیان لەرزاند.بەفرمێسکی خۆشەویستی وەڵامی دانەوە.

سیزۆڤ بە دەنگێکی توند گوتی:بچووە ماڵێ....بڕۆ دایە......هیلاك بـووی .سـیزۆڤ چـلکن و پـیس بـوو و سەرو ریشی تەواو هاڵۆز بووبوو.لە پڕگرژ بوو.چاوێکی لە خەڵك کرد و خـۆی هەڵکێشـا و بـە دەنگێکـی رەوان گوتی:

_وەك دەزانن"ماتڤێی"ی کوڕم لە کارخانە دا کوژرا ئەگەر زیندوو بایە دەمنارد بچێتە ریزی ئەوانە.....پـێم دەگوت:تۆش بڕۆ لەگەڵیان کەوە.ئەمە مەرامێکی پیرۆز و راستە. قسەکەی بڕی.خەڵك بێ دەنگ بوون.هەستیان بەشتێکی نادیارو تازە و مەزن دەکرد کە ئیتر لێی نەدەترسان.سیزۆڤ دەستی هەڵێنا و قسەکانی درێژە پێدا.

_پیرە مێردێك لەگەڵ ئێوە قسان دەكا،تەمەنی پەنجاو حەوت ساڵە.لەسەر ئەم زەوییە دەژیم.برازای من كوڕێكی راست و وریا و ژیر بوو.ئەمڕۆ سەر لەنوێ گیرا.ئەویش لەگەڵ ڤلاسۆڤ لە پێشەوە لە پەنا ئالاّبوو. دەم و چاوی گرژ بوو.دەستی دایكی گرت و درێژەی پێدا:

_ئەم ژنە راست دەكا.رۆڵەكانمان دەیانەوێ بە شەرەف و بە عاقڵی بژین .ئێمە پشتی ئەوانمان بەرداوە....بەڵێ ئەوانمان خوڕایی كردووە.نیلۆڤنا بچووە ماڵێ،دارەكەت هەڵگرە.

دایك بەچاوی سوور و بەفرمێسكەوە تەماشای خەڵكی كردو گوتی:

-دۆستەكانم!ژیان هی رۆڵەكانی ئێمەیە.دنیا بۆ ئەوانە.

سیزۆڤ دارەكەی بۆ راداشت و گوتی:وەرە دارەكەت بگرە و بچۆ ماڵێ.بە خەمناكی و بە چاوی رێزەوە تەماشای دایكیان دەكرد.زەنا زەنایەكی نیشانەی هاودەردی بە دووایدا دەرۆیشت.سیزۆڤ بێ ئەوەی هیچ بڵێ رێگای بۆ دەكردەوە.خەڵك بێ پشتگیری رێگایان دەداو بەهێزێكی لە تەعریف نەهاتو بەقسەیان دەكرد.سەبر وەدووای دەكەوتن.لەگەڵ یەكتر سرت و خورتیان بوو. دایك لەنزیك ماڵێ ئاوڕی لێ دانەوە و پاڵی وەداری ئالاّكەی دا وبەدەنگێكی پڕ لە سوپاسەوە بانگی كرد:سوپاسی هەمووتان دەكەم!

دیسان ئەو فیكرەی لە دڵیدا پەیدا بووبوو،وەبیری هاتەوە و گوتی:

_خوای ئێمە، عیسای مەسیح ئەگەر لەبەر شانازی ئەو خەڵكێك بە هیلاك نەچووبان،نەدەهاتە ئەم جیهانە.

خەڵك بێ دەنگ تەماشایان دەكرد.دەستی راوەشاند و لەگەڵ سیزۆڤ چووە وە ماڵێ.ئەو خەڵكەی لەبەر دەرگا مابوونەوە،دیسان لە بارەی شتێكەوە قسەیان كرد و پاشان بە پەلە وەڕێ كەوتن .

# بەشی دووهەم
## (١)

پاشماوەی ئەو رۆژە لە مژێکی رەنگاورەنگی بیرەوەری ولە ماندوویییەکی ئەو تۆدا کەلـەش و گیانی ئازار دەدا،رابوارد،ئەفسەرە بچووکەکە وەك پەڵەیەکی خۆڵەمێشی لە بەرچاوی دایک بازی دەدا.دەم و چاوی گەنم رەنگی پاڤێلٚ و چاوە بە پێکەنینەکانی ئەندرێی دەهاتە بەرچاو.

بەناو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو،لەپێش پەنجەرە دادەنیشت،سەیری کۆڵانی دەکرد.هەڵدەستا،برۆی تێك دەنان،دەلەرزی ،چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد.بەمێشکی تاساو لە شتێك دەگەرا کەخۆشی نەیدەزانی .ئاوی خواردەوە،بێ ئەوەی تینوایەتی بشکێ، یا گڕی خەم و خەفەتی دەرونی دامرکێ.رۆژ کرابوو بە دوو بەش،بەشی هەوەڵیان مانا ونێوەرۆکی هەبوو،بەشی دووهەمیان وەك تالآیی و شتێکی بێ‌ناوەرۆك دەچوو.دایك نەیدەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە ئاڵۆزە بدۆزێتەوە کەبۆی هاتبووە گۆڕێ:

_ئێستا....دەبێ چ بکەی؟

لە پڕ کۆرسونۆڤا وەژوورکەوت.هاواریکرد،دەستی راوەشاند،پێی بەعەرزی دا دا ،ئەدای دەرهێنا،شتی نەزانراوی پێشنیار کرد،بەڵێنی دا،دیار نەبوو هەرەشە لەکێ دەکا.بە لامهیچ کام لە مانە دایکیان نارەحەت نەکرد.گوێی لە زیرەی ماریا کۆرسونۆڤا بوو دەیگوت:

_ئەو قسانە کاریان کردووەتە سەر گەل،میللەت راپەڕیوە،کرێکارانی کارخانە راپەڕیون!

دایك سەری بادا و بەنەرمی وەڵامی داوە:بەڵێ ،بەڵێ.چاوی بڕیبوونە شوێنێك و ئەو کاتەی دەهاتەوە بەرچاو کەلە پاڤێلٚ و ئەندرێی جیابووبووەوە.گریانی نەدەهات،دڵی گیرابوو.لێوەکانیشی وەك گەروی وشك بوون.دەستی دەلەرزین،تەزوو بە لەشیدا دەهات.

شەوێ ژاندارمی لیٚ وەژوور کەوتن.دایك بەبێ ترس و حەپەسان پێشوازی لێکردن. ئەفسەری زەردەڵە بە ددانی گڕەوە گوتی:

_باشە!چۆنی؟ئەمە جاری سێهەمە یەکتر دەبینین.وانییە؟

دایك بێ دەنگ بوو.زمانی وشکی بەلێوانی دا هێنا.ئەفسەرەکە بەشێوەیەکی زانایانە دەستی بەقسە کرد.دایك هەستی کرد کە کابرا قسەکانی خۆی زۆر پێخۆشە.بە لامقسەکانی ئەو نەدەچوونە گوێی ئەو و پێی

گرنگ نەبوون.کاتێکی ئەفسەرەکە گوتی:" تۆ تاوانباری، چونکە نەتتوانیوە رێزی خوا و ئیمپراتۆربەریبەمێشکی کوڕەکەت ". دایك بێ ئەوەی تەماشای بکا،لە وەڵامدا گوتی:

_منداڵەکان قازی ئێمەن.....ئەوانە بە حەق بەو تاوانەی کە لەو رێگایەد خۆڕایان کردوون،مەحکومان دەکەن.....

ئەفسەر گوڕاندی"چی؟بەرزتر قسە بکە.

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و دووپاتەی کردەوە:

_دەڵێم منداڵەکانمان قازی ئێمەن.....

ئەفسەر تووڕەبوو.وەك برێشکە وشەی لەدەمی دەرپەڕین،بێئەوەی کاربکەنە سەر دایك.ماریا کۆرسونۆڤا وەك شاهید بانگرابوو.لەپەنا دایك وەستابوو تەماشای نەدەکرد.کاتێکی ئەفسەرەکە پرسیاری لێکرد،سەری بۆ دانەواند و بە دەنگێکی ئاسایی وەڵامی داوە:

_بە گیانی تۆ نازانم .ژنێکی گێل و نەزانم.خەریکی کارو کاسبیم و ئاگام لە هیچ نییە.لەبەر نەفامی خۆم لەهەموو شت بێ خەبەرم .

ئەفسەر سمێڵی بادان و تێی راخوڕی :بێ دەنگ بە!

ماریا سەرێکی بۆ دانەواند و بێ ئەوەی ئەفسەرەکە بزانێ لاسایی کردەوە.لە ژێر لێویەوە گوتی:ئەوەش بۆ تۆ!

ئەمریان پێکرد کە دایك بپشکنێ.مژۆڵی لێك دان و چاوی بڕییە ئەفسەرەکە و بە دەنگێکی بەسام گوتی:بە گیانی تۆ نازانم!

ئەفسەر پێی بەعەرزی دا دا و تووڕەبوو.

ماریا گوتی:پێلاگێیا دووگمەکانت بکەوە.لەکاتێکدا سوور هەڵگەڕابوو،دایکی دەپشکنێ .دەستی لە جلەکانی داو بەسرتە گوتی:

_ها.....ئەوانە زۆر سەگەن!.....

ئەفسەر بەتووڕەیی گوتی:ئەو چت پێ گوت؟پاشان سیلەی چاوی دا ئەو شوێنەکە دەیپشکنی.

کۆرسونۆڤا بە ترسەوە گوتی:بە گیانی تۆ مەسەلەیەکی ژنانە بوو.

کاتێکی ئەفسەر بەدایکی گوت کە بەڵگەی پرسیارو پشکنین ئیمزا بکا،پێلاگێیا بە خەتێکی ناحەز ونەخوێندەوارانە ئەم وشانەی نووسی :"پێلاگێیا نیلۆڤنا ڤلاسۆڤا،بێوەژنی کرێکار"ئەفسەر بڕۆی تێك نان و دەنگی دا:چت نووسی؟ئەمەت بۆچی‌نووسی؟پاشان بەزەردەخەنەیەکی سوکەوە گوتی:وەحشی ...کێوی!

ژاندرمەكان رۆیشتن.دایك لەبەر پەنجەرە راوەستا.دەستی لەسەر سینگی دانا و ماوەیەكی زۆر بێ ئەوەی شتێك ببینێ چاوی بڕیە شوێنێكی بەرامبەری خۆی.برۆكانی هەڵكشابوون و لێوی پێكەوە نابوون.شەویلاگەی وا پێكدا دەگوشین،ددانی پێوە دەیەشا.چراكەیان نەوتی لێبڕا و دەستی بەپتەپت كردو هات بكوژێتەوە.دایك فویەكی پێدا كردو لەتاریكی دانیشت.تووڕەیی و خەفەتی دامركابوو. هەورێكی تاریكی خەم و خەفەت دیسان سینگی دادەپۆشی و لێدانی دڵی وەزەحمەت دەخست.تا چاو و لاقی ماندوو بوون راوەستا.گوێی لێبوو كەماریا لەبن پەنجەرە راوەستاوە و بەدەنگێكی مەستانە هاوار دەكا:

_پێلاگێیا نووستووی؟گیانە فەقیرەكەم......بنو.....بنو.....سووكایەتی بە هەموو كەس دەكەن.بەهەموو كەس!...

دایك بێ ئەوەی خۆی بگۆڕێ،لەسەر تەختەكە لێی راكشا.هەروەك كەوتبێتە نێو زەندۆڵێك خەوێكی گرانی لێكەوت.لەخەونی دا، لەوبەری زەلكاوەكە،تەپۆڵكەیەكی زیخی وردی زەردی لەسەر شەقامی شار دەدیت.لەقەراخ ئەو،لەسەر ئەو شێوەی بەرەو كانگا دەیڕوانی، پاڤێلْ بەهاودەنگی ئەندرێی سرودی دەخوێندەوە:

"رابن.....رابن.....ئەی زۆرلێكروان." دایك بەپێش تەپۆڵكەدا تێپەڕی،دەستی بەنێو چاوانی گرتبوو،تەماشای كوڕەكەی دەكرد.قەدو باڵای كوڕەكەی زۆر جوان دیاربوو.بە لامدایك شەرمی دەكرد بچێتە لای،چونكە سكی پڕ بوو.منداڵێكی دیكەشی بەئامێزەوە بوو.رێگای خۆی درێژە پێدا.منداڵان لەمەزرایە تۆپێنیان دەكرد.منداڵەكان زۆربوون و تۆپەكەیان سووربوو.ئەو منداڵەی لە ئامێزی دابوو دەیویست بێ یاری لەگەڵ ئەوانی دیكە بكا.دەستی كرد بەگریان.مەمكی لە زاری‌نا و گەڕایەوە.سەربازان تەپۆڵكەكەیان گرت.روی سەرەنێزەكانیان لە دایك بوو.لەو دەشتە كلیسایەك دروست كرابوو.كلیسایەكی زۆر بەرز و سپی و سوك،دەتگوت لەهەور دروست كراوە.دایك رای كرد بۆ كلیساكە.لەوێ مردوویەكیان دەناشت.تابوتێكی رەشی گەورەی دەرگا داخراو لەوێ دانرابوو،قەشەو جێگرەكەی بە جبەی بێ پەڵەوە لە سەریان دەخوێند:

_"مەسیح لەگەڵ مردووەكان زیندووبووەتەوە."

جێگری قەشە هات و لە نێوراستی كلیسا راوەستا هاواری كرد: بیانگرن! جبەی لەبەردا نەما، سمێڵی زەرد ونەستوری دەركەوتن. هەموو هەڵاتن تەنانەت جێگری قەشەكەش عودەكەی تووڕ هەڵدا و هەروەك عادەتی ئەندرێی بوو، سەری گرتە نێو دەستەكانی. دایك منداڵەكە روتە دەكرد و تێدەكۆشا پێی لێ نەنێن. دایك چۆكی دادان و هاواری كرد:

ئەوە منداڵەی هەڵگرنەوە ، بەجێی مەهێڵن ...

ئەندرێ دەستی لەکەلەکەی نابوو بە زەردەخەوەنەوە دەیگوت :

_"مەسیح لەگەڵ مردووەکان زیندووبووەتەوە."

دایك داهاتەوە،منداڵەکەی هەڵگرتەوە و لەسەر عارەبانەیەکی دانـا کـەباری لەســەر بـوو و ڤێسۆڤشـیکۆڤ بەکاوە خۆ لەگەڵی دەڕۆیشت.ئەو کەسە بەپێکەنینەوە دەیگوت:

_کارێکی زۆر دژوارتان بەمن سپاردووە.

کۆڵان پیس بوو.خەڵك لەپەنجەرەی ماڵەکانەوە خۆیان نیشـان دەدا و فیکـەیان دەکـرد وهاواریـان دەکـرد.ڕۆژ روناك بوو،تاو هەڵاتبوو.لەهیچ کوێ سێبەر وەگیر نەدەکەوت.

ئەندرێی دەیگوت:دایە گیان گۆرانی بڵـێ.ئـیتر ژیـان ئاوایـە.لـەکاتێك دا دەنگـی شـاد و دڵرفێنـی بەسـەر دەنگەکانی تردا زاڵ بوو،گۆرانی دەگوت.دایك وەدووای دەکەوت و گلـەیی دەکـرد:بۆچـی گاڵتـەم پـێ دەکا؟بـە لاملەپڕ پاشەوپاش گەڕایەوە و لە چاڵاوێکی بێ بن کەوت کەلە کاتی لێ نزیك بوونەوەی دا هاواری کرد.....

دایك بەلەرزە لەرز و شەلاڵی ئارەق لەخەو ڕاپەڕی.هەردەتگوت دەستێکی قورس و گران دڵی گرتـووە و بـەبێ بەزەیی وردە وردە دەیگوشێ.دەنگی ئاژێری کارخانە بەرز بووەوە.دایـك زانـی کـەئاژێری دووهەمـە.ژوورەکـەی شەپڕێو بوو.کتێب و جل وبەرگ و شت ومەك هەریەکە لە لایەك پەرش و بڵاو بووبوون.

هەستا وبەر لەوەی دەم و چاوی بشوا و تەنانەت نوێژیش بکا،دەستی کرد بە کۆکردنەوە و ڕێك و پێك کردنـی نێوماڵەکەی.دارێکی لەچێشتخانە دیت،هێشتا پەڕۆیەکی سـووری بەسـەریەوە بـوو.بـەتووڕەیی دەسـتی دایـەو خەریك بوو لە ئاوری باوێ،بـە لامەهەناسـەیەکی هەڵکێشـا و پـەڕۆ سـوورەکەی هـەڵگرت وجـوان پێچـایەوە و لەگیرفانی نا. جلی کردەبەر و سەماوەری تێهاویشت و پاشان لەکن پەنجەرەی چێشتخانە دانیشت و پرسیارەکەی شەوی ڕابووردووی دووپاتە کردەوە:

_ئێستا دەبێ چی بکەی؟

کەوە بیری هاتەوە هێشتا نوێژی نەکردووە،تاوێك لەبەرامبـەر وێنەی مەسیح ڕاوەستا و پاشان دانیشت.هیچـی لە دڵ دا نەبوو.

ڕەقاسی سەعات کەهەمیشە چکەچی بوو،لێدانی توندی خۆی سەبر کردبووەوە.مێشەکان بەنابەدڵی وزەوزیـان بوو،کوێر کوێرانە خۆیان بە شووشەکاندا دەدا. بێ دەنگ و ماتی بەسەر گـەڕەك دا زاڵ بـوو.وادیـار بـوو ئـەو خەڵکەی ڕۆژی پێشوو لەشەقامدا ئەوەندە هەراو هۆریایان کردبوو،لەماڵان دا خۆیان شاردبووەوە وبەماتی بیریان لەو ڕۆژە تایبەتییە دەکردەوە.

دایـك لـه پـڕ دیمەنێکـە هاتـەوە بـیر کەلـەکاتی لاوێتـی دا دیتبـووی.لـە بـاخی کـۆلانی ئـەو ئاغایانـەی ناویان"زانوسایلۆڤ"بوو،گۆلێکی گەورە هەبوو،نیلۆفـەری شـینی تێدا بـوون.لـەرۆژێکی سـاردی پایزدا،بەوێدا تێپەڕیبوو،لۆتکەیەك لەنێو گۆلەکەدا مات و مردوو لە سەر ئاو بوو و گەلای زەرد دەورەیان گرتبوو.ئەو لۆتکـە تاك وتەنیا راوەستاوە،لەنێو گەلای زەردو وەریودا خەم و خەفەت دەباری .دایك ماوەیەك لەوێ وێستابوو،لەخۆی پرسی بوو داخوا کێ ئەم لۆتکەی لەلێواری گۆلەکە وەدوورخستووە و بۆچی وای کردووە؟ هەرئەوێ رۆژێ ئێواری خەبەریان دا کەژنە ورد و بچـکۆلانەکەی زانوسـایلۆڤ کەهەیشـە بەپرچـی رەش و ئـالۆزەوە خـۆش بـە رێگـادا دەڕۆیشت،لەئاودا نوقم بووەو خنکاوە.

دایك دەستی بەدەم و چاوی خۆیدا هینا،لەکاتێك دا دەلەرزی و بـیری لەشـەوی رابـوردوو دەکردەوە،دەتگـوت دەیەوێ بیرەوەرییەکانی لەبیر بەرێتەوە.چاوی لەفنجانی چای سارد بڕین و ماوەیەك مـات بـوو.ئـاواتی ئـەوەبوو کەسێکی سادە و ژیر ببینێ و زۆر شتی لێ بپرسێ.نزیك نیوەڕۆبوو ،هەروەك بۆ وەدی هێنانی ئاواتەکەی دایـك بێ ،نیکۆلای ئیڤانۆڤیج پەیدا بوو.دایك بەدیتنی ئەو پەشۆکا و نیگەران بـوو.بـێ ئـەوەی وەلامـی سـلاوەکەی بداتەوە،بەدەنگێکی کزەوە گوتی:

_ئاخ!بابە گیان بۆ هاتی.کارێکی خراپت کرد هاتی .ئەگەر لێرەت ببینن دەتگرن.

نیکۆلای ئیڤانۆڤیج پاش ئەوەی بەگەرمی دەستی دایکی گوشی ،چـاویلکەکانی لەسـەر لـووتی قـایم کـرد و سەری بردە بن گوێی دایك و بەسرتە گوتی:

_لەگەلێ ئەندرێی و   پاڤێلێ قەرارمان دانابوو،ئەگەر ئەوان گیران،من بێم تۆ بەرمە شار.هاتن ئێرە بگەڕێن؟

_بەلێ هاتن،هەمو شوێنێك گەڕان،تەنانەت منیشیان پشکنی .ئەوانە هیچ حەیا وشەرمیان نییە .

نیکۆلای شانی هەلتەکاند وگوتی:حەیای چی؟پاشان هۆی مانەوەی دایکی لەشار رون کردەوە.دایك گـوێی بـۆ قسە مێهرەبان و دۆستانەکانی نیکۆلای رادەگرت و بە زەردەخەنەوە تەماشای سەرو چاوی بزرکاوی دەکردو لـەو هەموو بڕوایەی کە بەو کابرایەی پەیداکردبوو،سەری سووڕمابوو.

_ئێستا کە   پاڤێلێ بڕیاری داوە و ئەگەر نابم بە هۆی زەحمەتی ئێوە.....

_لەم بارەوە نیگەران مەبە ،من بە تەنیا دەژیم و خوشکم زۆر کەم دێتەلام.

_بە لامن دەمەوێ کاربکەم و نانی خۆم پەیدا بکەم.

_ئەگەر بتەوێ کاربکەی ،کار دەدۆزیتەوە.کار لای دایك پەیوەنـدی بـە تێکۆشـانی ئەنـدرێی و کوڕەکـەی و هاوڕێیەکانییەوە هەبوو.لەنیکۆلای نزیك بووەوە و چاوی لە چاوان بڕی و پرسی :

_پێت وایە کار وەگیر دەکەوێ؟

_کاری ماڵی من زۆر نییە .پیاو کەتەنیا بێ....

_مەبەستم ئەوە نییە،باسی مەسەلە گرینگەکە دەکەم....

لەوەی کەنیکۆلای لە مەبەستەکەی نەگەیشتبوو دڵی ناڕەحەت بوو.بەخەمناکی هەناسەیەکی هەڵکێشا.نیکۆلای هەستا و لەکاتێك دا بزەی لەسەر لێوان بوو،بەرێزەوە گوتی:

_ئەگەر چاوت بە پاڤێلێ کەوت،چۆنە لێی بپرسی ئەو وەرزێڕانەی ڕۆژنامەیان لێ داوا کردبوو لە چ شوێنێکن؟

دایك لەخۆشیان قیژاندی:شوێنەکەیان شارەزام.هەموان دەناسم و دەزانم لە کوێن.من ڕۆژنامەیان بۆ دەبەم،دەیاندۆزمەوە.چی بڵێن وا دەکەم .کێ دەزانێ کەمن کتێب و نووسراوەی قەدەخەکراو هەڵدەگرم .بەکیلۆ نووسراوی قەدەخەکراوم بردووەتە کارخانە.سوپاس بۆخوا.

لەپڕ ئەو ئاواتەی هاتە دڵی کەخورجین بە کۆڵ و داربەدەست بەنێو لێرەوار و بەشەقام و گوندان دا بگەڕێ و بۆ هەموو شوێنێك بچێ .بەنیکۆلای گوت:

_خۆشەویستم تکا دەکەم ئەم کارە بەمن بسپێرن.کوێتان گەرەکە دەچم.مەترسێن،لەهەموو ناوچەیەك ڕێگای خۆم دەدۆزمەوە.بەهاوین و بەزستان تاسەر لێوی قەبر ،بەرێگادا دەڕۆم......لەپێناوی ڕاستی و حەقیقەت دا دەبم بە پێغەمبەر.ئایا لەو حاڵەداچارەنووسی من بۆ ئێرەیی نابێ؟

بەوە خەفەتبار بوو کە لە دنیای خەیاڵدا خۆی بێکەس و داماو دەدیت،سەرگەردان لەبەر دەرگا و پەنجەران بەناوی مەسیح گەدایی دەکرد.

نیکۆلای بەنەرمی دەستەکانی گرت وبەقامکە گەرمە کانی لاواندیەوە.تەماشای سەعاتی کرد وگوتی:پاشان لەم بارەوە قسەدەکەین.باش بیری لێبکەوە ،کارێکی بەترس وەئەستۆی خۆت دەگری.

دایك هاواری کرد:دۆستی خۆشەویستم بیر کردنەوە فایدەی چییە ؟منداڵەکان،یانی پاکترین خوێنی ئێمە،جەرگ و هەناوی ئێمە،کەلامان لەهەموو کەس خۆشەویست ترن،سەربەستی و گیانی خۆیان فیدا دەکەن و بەبێ پەشیمان بوونەوە خۆیان بەکوشت دەدەن.کەوابوو منی دایك چۆن بۆ هەموو شت ئامادە نەبم.

نیکۆلای ڕەنگی بزڕکا،گوتی:

_دەزانی هەوەڵ جارە ئەم چەشنە قسانە دەبیستم.

دایك بەکزی سەری ڕاوەشاند وگوتی:دەتوانم چی بڵێم.بەنەدایەکی عاجزانەوە دەستی بەردانەوە.خۆزیا قسەی ئەو تۆم زانیبان کەباسی دڵی دایکانەی خۆمیان پێ بکەم....بەهۆی هێزێك کەلەدەرونی دا پەرەی دەگرت و قسەی گەرم و سوتێنەر ونیشانەی ناڕەزایی لەمێشکی دا بەهێز دەکردن،ڕاست بووەوە:

_زۆر کەس ،تەنانەت ئەوانەی ناجسن و بیّ ویژدانیشن،رەنگە بۆئەم حاڵە بگرین .

نیکۆڵای هەستاو دیسان تەماشای سەعاتی کرد:

_کەوابوو بڕیارمان دا بێیە شار،بێیە ماڵەکەی من! دایك بیّ ئەوەی قسەبکا سەری لە قاند :کەی؟

_هەتا زووتر باشترە.ئەمەشی لیّ زیاد کرد:راستی لەبارەی تۆوە نیگەران دەبم.

دایك بەسەر سوورمانەوە چاوی لیّکرد:دەبیّ لەبارەی من هەست بەچی بکا؟

نیکۆڵای سەری بەردابووەوە و بەپێوە زەردەخەنەیەکی ناهۆمێدانەی لەسەر لێوان بوو.نزیك بێن و کەمیّ کوڕ بوو.چاکەتێکی رەشی فەقیرانەی لەبەر دابوو.بیّ ئەوەی چاوی لیّبکا پرسی :دراوت هەیە ؟

_نا.

خێرا کیسەیەکی لەگیرفانی دەرهێنا و دەمەکەی کردەوە وبۆ دایکی راگرت و وتی:

_فەرموو بیّ زەحمەت وەرگرە...... دایك بیّ ئەوەی بیەویّ ،بزەیەکی هاتیّ و بەسەر بادانەوە گوتی:

_هەموو شت گۆڕاوە!دراویش لای ئێوە بیّ نرخە.خەڵك بۆ پەیداکردنی پارە هەموو کارێك دەکەن و تەنانەت گیانی خۆشیان فیدا دەکەن.....بە لاملەکن ئێوە دراو،وەك کاغەز یا لەتکە مسە.وادیارە دراوتان هەربۆیە گەرەکە چاکەی پیّ بکەن.

نیکۆڵای ئیڤانۆڤیج بە پێکەنینەوە گوتی:

_دراو زۆر هیچەو هۆی زەحمەت وسەریەشانە.وەرگرتن یان بەخشینی هەمیشە پیاو نارەحەت دەکا.دەستی دایکی گرت و توند گوشی ودووپاتەی کردەوە:هەتا زووترە دێی.وانییە؟وەك جاران بیّ هەراو خشپە وەدەرکەوت.پاش ئەوەی دایك ئەوی بەریّ کرد،بیری کردەوە:"ئەوەندە باشە!بە لاملەگەڵ ئەمەش دڵسۆزی بۆ ئێمە نەکرد". نەیتوانی تێبگا کە ئەم شتەی پیّناخۆشە،یان تەنیا پێی سەیرە؟

(٢)

پاش چووار رۆژ دایك بەرەو ماڵی نیکۆڵای وەریّ کەوت.عارەبانەیەکی بچووك کە شڕەوبڕەی ماڵی هاویشتبووە سەر،لەگەڕەکی خۆیان تێپەڕی و گەیشتە چۆڵی.دایك ئاوڕی دایەوە و هەستی بەوە کرد شوێن و جێگایەك بەجیّ دێڵیّ کەرۆژە هەرە رەشەکانی ژیانی و سەردەمی پڕ لەخەم و خەفەت و خۆشی و شادی ژیانی تازەی تێدا رابواردووە.

کارخانە وەك جاڵجاڵۆکەی سووری زۆر گەورە،لەسەر زەوییەك کەبەدووکەڵ رەش بووبوو،خۆی پان راکردبوو ودووکەڵکێشە گەورەکانی سەریان بۆ ئاسمان بەرز کردبووەوە.خانووی بچوکی کرێکارانیش لەدەوروبەری دەبینران.ئەو خانووە بۆر وپیسانە لە دەورو پشتی زەلکاوەکە وا دەهاتنە بەرچاو کەلە پەنجەرە بچووکەکانەوە،بە

داماوی تەماشای یەکتر دەکەن.کلیسایەکی سووریش وەك کارخانە لەنێو خانووەکان دا قوت بووبووەوە.بورجی زەنگوڵی کلیسا لە دوو کەڵکێشی کارخانە نزمتر بوو.دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و یەخەی تەنگی کراسەکەی کردەوە.خەمبار بوو.خەمەکەی وەك تۆز و غوباری هاوینان وشك بوو.

عارەبانە چی جڵەوی ئەسپەکەی دەکێشا و دەنگی دەدا ،کابرا لاقی خوارو خێچ بوون و دیار نەبوو تەمەنی چەندە.چاوی بێ رەنگ و مووەکانی تەنك بووبوون.خۆی با دەدا و لەتەنیشت ئەسپەکەیەوە دەڕۆیشت.باش هەست بەوە دەکرا کەسەفەر بۆهەرشوێنێك بێ،بۆ ئەو فەرق ناکا.قاچە خوار و خێچەکانی بە چەکمەی قوڕاوییەوە هەڵدیناوە و بە دەنگێکی نەرم دەیگوت:

_هەی ،هەی،دەی بڕۆ.

دایك چاوی بەدەورو پشتی خۆی دا دەگێڕا.بیابان هێندی گیانی ئەو خاڵی بوو.ئەسپەکە بە چەشنێکی دڵتەزێن سەری هەڵدەتەکاند و قاچەکانی لەنێو زیخ و خۆڵ ڕۆدەکرد کەتاو گەرمی داهێنابوو.عارەبانەکە چەور نەکرابوو،لەگەڵ هەر خولێك جیڕە جیڕەی دەهات و ئەو دەنگانە لەگەڵ تەپ و تۆزی ڕێگا تێکەڵ دەبوون.

خانووی نیکۆلای نیڤانۆڤیچ کەوتبووە قەراخ شارو لەکۆلانێکی چۆڵ و بێ دەنگ دا بوو.خانوویەکی بچووکی سەوزبوو کەپشتی بەخانوویەکی رەشی دووقاتەوە بوو و لەبەر کۆنی خەریك بوو بڕوخێ.باخچەیەك لەپێش خانووەکەبوو.لکەدار و گوڵی باخچەکە بەپەنجەرەی هۆدەکان دا دەهاتنە ژووری .ژوورەکان خاوێن و بێ هەرا بوون.بەدرێژایی دیوارەکان کتێب وچەند وێنەی پیاوی مەزن و بەرێز لە قەفەسەکان دا تێکەڵ بووبوون.

نێکۆلای دایکی بردە ژوورێك کەپەنجەرەیەکی بەلای باخچەو یەکی دیکەی بەلای حەوشەیەکی پڕ لە چیمەن دا دەکرایەوە.دیوارەکانی ئەم ژوورەش قەفەسەی پڕ لە کتێبی تێدا بوون.

دایك گوتی:باشترە من لە چێشتخانە بم .چێشتخانەکە روناك و خاوێنە.

دایك کەئەمەی گوت،لای وابوو نیکۆلای لەشتێك دەترسێ.نێکۆلای بە ناڕەحەتی بەرپەرچی دایەوە.کە دایك دەستی لە چێشتخانە هەڵگرت،ئەویش کەیف خۆش بوو. رەنگ و هەوایەکی تایبەتی لەم سێ رۆژەدا هەبوو.هەناسە هەڵکێشان لەو ژوورانەدا چێژێکی تایبەتی هەبوو.بە لامدەنگیان تێدا نزم و هێدی دەبوو.پیاو نەیدەویست توند قسەبکا و بیرکردنەوەی ئارامی وێنەکان تێك بدا کەلە نێو چوار چێوەکانیاندا بەسەرنجەوە دەیان ڕوانی .

دایك قامکی لە خۆڵی گوڵدانەکان وەردا وگوتی:گوڵەکان دەبێ ئاو بدرێن. خاوەن ماڵ بەشەرمەوە گوتی:ڕاستە.دەزانی گوڵەکانم خۆش دەوێ .بە لامدەرفەتم نییە پێیان رابگەم.

دایك دیتی كە نیكۆلای تەنانـەت لـەخانووی خۆشـیدا بـێ دەنـگ و لەسـەر خـۆ دەجولێتـەوە.وەك هـەموو دەوروبەری خۆی بێگانە بێ وایە .ئەگەر دەیویست تەماشای شتێك بكا،سەری لێوە نزیك دەخسـت و بەقامكـە باریكەكانی چاویلكەكانی راست دەكرد و لەبارەی ئەو شتەی مەبەستی بووپرسیاری دەكرد.هەر دەتگـوت تـازە لەگەلّ دایك گەویوەتە ئەم خانووەو هەموو شت بۆئەو بێگانەیە .كەدایك وا بە پەرێشانی دیت،هەر وەی زانی لە مالّی خۆیـەتی ئـەو خـانووەی پـێ وەك مـالّی وابـوو.وەدووانـی نێكـۆلای كـەوت و جێگـای هـەموو شـتێك شارەزابوو.لەبارەی شێوەی ژیانی پرسیاری لێ دەكـرد ونێكـۆلای وەلآمـی دەداوە.وەك كەسـێك كـەدەزانێ ئـەو جۆرەی پێویستە ناجولێتەوە،بە لامناشزانێ شێوەیەكی تر بگرێتە پێش.

پاش ئەوەی دایك گولّەكانی ئـاو دا و دەفتـەرو كتێبـەكانی مۆسـیقای كـۆكردەوە كەلەسـەر پیانۆكـە بـلآو كرابوونەوە تەماشای سەماوەرەكەی كرد وگوتی:

_دەبێ خاوێن بكرێتەوە!

نیكۆلای قامكی لەئاسنێكی ژەنگاوی دا وبۆلآی لوتی برد و تەماشای كرد.دایك بەو كارە پێكەنی.

شەو كەراكشا ،بیری لەرۆژی رابوردوو دەكردەوە.سەری هەلّێنا وتەماشایەكی دەوروبەری خـۆی كـرد.بۆیەكـەم جار خۆی لەكن بێگانەیەك دەدیت.بەم وەزعە نارەحەت نەبوو.بەزەیی بەحالّی خانە خوێكەی دا دەهات.مـەرجی لەگەلّ خۆی كرد كەتۆزێك خۆشەویستی گـەرم بخاتـە ژیـانی نیكۆلآیـەوە.سـاكاری و نـەزانی و بـێ ئـەزمونی خانەخوێكەی،دوور بوونی لەهەموو شتێكی ئاسایی و دیمەنی چاوە گەشـەكانی كەهـەم مندالّـە و هـەم ژیرانـە دەهاتنە بەر چاو،كاریان تێكردبوو.پاشان لە پڕكوڕەكەی هاتەوە بیر .كارەساتی رۆژی مانگی هـەوەلّی ئـەیاری هاتەوە بەرچاو.دەردی ئەو رۆژە هەروەك هەزار سوژن دلّی دەكۆلّی و دەرزی ئاژنی دەكرد و قینێكی نادیاری لـە دەرونی دا دەبزرواند كە پشتی چەماوی دایكی راست دەكردەوە.

گوێی بۆ دەنگی شەوانەی شار رادەگرت.ئەو دەنگانەی لە پەنجەرەوە دەهاتنە ژوور،بۆئەو بێگانە بـوون.لەبـەر خۆیەوە بیری دەكردەوە:"مندالآن بە دنیادا دەگەڕێن." بەیانی زوو دایك سەماوەری تێ هاویشت .قاپ وقاچاخی بەبێ دەنگی كۆكردەوە وبەچاوەڕوانی هەستانی خانەخوێ لە چێشتخانە دانیشت.دەنگی كۆكەیەك هات.نیكۆلای چاویلكە بەدەست هاتە ژووری.

دایك پاش ئەوەی رۆژ باشی پێگوت،سەماوەری بردە ژووری نان خواردن.نیكۆلای لە دەسـت وچـاو شوشـتن دا ئاوی دەڕشت و سابوون و فلچەی ددانی لیّ دەكەوت ولەبەر خۆیەوە بۆلّەی دەهات.لەسەر نان خواردن نیكـۆلای بە دایكی گوت:

- له ئیدارەی ناوچەكارێكی زۆر خەفەتاویم هەیە, دەبینم چۆن وەرزیرەكان هەژارومالّ ویّران دەبن , بەزەردەخەنەیەكی دەسكرد دووپاتی كردەوە:

_بەلّیّ،دەبینم خەلّك برسییە .لەبەر هەژاری جوانەمەرگ دەبن.منداڵەكانمان هەر بە ساوایی لەڕ و لاوازن،وەك مێشی پایز هەلّدەوەرن.ئەوانە هەمووی دەزانم .لەهۆی ئەو موسیبەت و بەلاّیانە ئاگادارین و پاش ئەوەی لێیان دەكۆلّینەوە موچەو بەرات وەردەگرین.....ناوایە....

دایك پرسی :تۆ چ كارەی ؟خوێندكار بووی ؟

_نا,لە گوندی مامۆستا بووم...باوكم لە "ڤیاتكا" بەڕێوەبەری كارخانەیە ومن بووم بە مامۆستا .كتێبم بە نێو خەلكدا بلاّوكردنەوە،بەو تاوانە گیرام.پاشان لەكتێبخانەیەك كارم دەكرد.لەوێش هەلّەشەییم كرد،سەرلەنوێ گیرام.ناردیانم بۆ ناوچەی "ئەخانگێكسك".لەوێ لەگەلّ دەولّەت هێندێ گیرو گرفتم بۆ هاتە پێش،دەولّەت بۆ قەراخی دەریای سپی ناردم و پێنج سالّ لە گوندێك مامەوە.لە ژووری روناك و بەرەو تاو،قسەكانی بەهێدی و بەرێك و پێكی دەنگیان دەدایەوە. دایك زۆر جار ئەم جۆرە بەسەرهاتانەی بیستبوو.نەیتوایبوو تێبگا كە بۆچی وا بە هێدی ئەوانە دەگێڕنەوە،بێ ئەوەی لەبارەی ئەو هەژاری و كوێرەوەرییە كەس تاوانبار بكا.

نیكۆلاّی‌گوتی:ئەمرۆ خوشكم دێ.

_بەمێردە؟

_نا ،بێوەژنە.مێردەكەی بۆ سیبیریا دوور خرابووەوە.دوو سالّە كۆچی دوایی كردووە.

_لەتۆ بچووكترە؟

_نا،شەش سالّ لەمن گەورەترە....زۆری پێ قەرزدارم.....بێجگەلەوە ،ئەم شتانەی لێرەن زۆریان هی ئەون. كتێبەكان هی خۆمن.....

_لە كوێ دەژی؟ بزەیەكی هاتێ و گوتی:لەهەموو شوێنێك! لە هەر جێگایەك كاریان بەمرۆڤێكی ئازا هەبێ،سەرو كەللەی دەردەكەوێ.

_ئەویش بەكاری ئێمەوە خەریكە؟

_ئاشكرایە.

نیكۆلاّی بۆ كاری خۆی رۆیشت.دایك بۆلای ژوورەكە رۆیشت و بیری لە بیرو باوەڕە دەكردەوە كەرۆژ بە رۆژ خەلّك هێدی تر و شێلگێرتر دەكا.لەبەرامبەر ئەوان دا وای هەست دەكرد وەك بەشەوە لەبەرامبەر چیایەك دا بێ.نزیكی نیوەڕۆ،ژنێكی بالاّبەرز و لەبار بەجلی رەشەوە پەیدابوو.كە دایك دەرگای لێكردەوە،ژنەكە جانتایەكی بچووكی زەردی لەوێ داناو توند دەستی دایكی گوشی و گوتی:

_تۆ دایکی  پاڤێل ڤلاسۆڤی .....وانییـه؟وەك بـیرم لێ کردبوویـەوە وای .براکـەم بـۆی نوسـیبووم کـەدێی لەماڵی ئەو دەژی.لە مێژە لەگەڵ کورەکەت هاورێین.زۆر جار باسی تۆی بۆ کردووم.

دەنگی گیرابوو.بەئەسپایی قسـەی دەکرد،بـە لاجولانـەوەی زینـدوو وبـەئیرادە و شـێلگیرانە بـوو.چـاوە بـۆرو گەورەکانی زەردەخەنەیەکی پاك و گەنجانەیان تێدا بوو.گنجی باریك و ورد لەنێو چاوانی دیـاربوون.پرچـی سـپی هەروەك زیو لەپشت گوێ چکۆلەکانی دەدرەوشا.

_برسیمە.زۆرم ئیشتیا لە پیاڵەیەك قاوەیە.

_ئێستا سازی دەکەم.لەنێو چەکمەجە قاوەی هێنا دەر و بە ئەسپایی پرسی:

_بەڕاستی  پاڤێل باسی منی دەکرد؟

_بەڵێ زۆر جاران

!خوشکی نیکۆلای قوتویەکی بچـوکی لـە گیرفـانی دەرهێنـا و سـیغارێکی داگیرسـاند ولـە کاتێکـدا بـە هەنگاوی بەرز لەژوورێ دا دەهات و دەچوو گوتی:زۆری لەخەمی دای؟

دایك کەتەماشای لەرزینی گڕی ئەو چرایەی دەکـرد کەقاوەکـەی لەسـەر بوو،زەردەخەنەیـەکی لەسـەر لێـوان بوو،لە خۆشیان خەم و خەفەتی رەوی بوو،بیری لەوە دەکردەوە:"دیارە رۆڵەکەم باسی منیش دەکا!"لەبەر خۆیەوە بەئەسپایی گوتی:

_دیارە هەروا هاسان نییە .لەپێش دا خراپتر بوو.پترم پەرۆش بوو.بە لامنێستا دەزانم ئەو بەتەنیا نییە. چاوی بڕییە ئەو میوانە تازەیە و پرسی:

_ناوت چییە؟

_سۆفیا.

دایك بە وردی سەرنجی دایە.ئازایەتی و گورج و گۆڵی و بزۆزیی لێ دیار بوو.بە دڵنیایی قسەی دەکرد.

_گرنگ ئەوەیە هاورێیانمان زۆر لەزینداندا نەمێننەوە و زوو موحاکەمە بکرێن.هەرکە  پاڤێل بگاتە سیبیریا دەیرفێنین......ناکرێ لەوێ خۆی لێ بێ دەنگ بکەین.

سۆفیا پاش ئەوەی چاوی گێڕا قونچکە سیغارەکەی لە شوێنێك فڕێ بدا،لـەخۆڵی گوڵدانەکـەی راکـرد.دایـك وەدەنگ هات:

_ریشەی گوڵەکە وشك دەکەی!

_ببورە.نیکۆلایش زۆر جار لەسەر ئەمە دەنگی داوم....قونچکە سیغارەکەی هێناوە دەر و لەپەنجەرەوە توڕی هەڵدا .

_تکا دەکەم ببورە.بیّ بیر کردنەوە دەنگم دای .من حەقم نییە رەخنە لە تۆ بگرم.سۆفیا شانەکانی هەڵتەکاند وبەهێدی وەڵامی داوە:کاتێك کارێکی نابەجیّ دەکەم،بۆچی دەنگم نەدەی؟قاوە سازە.سوپاس!بۆچی هەر پیاڵەیەك ،تۆ بۆ خۆت ناخۆیەوە؟ شانی دایکی گرت و بۆلای خۆی راکێشا وچاوی لە چاوی بری و پرسی:

_رەنگە شەرم بکەی ؟ دایك بەزەردەخەنەوە وەڵامی داوە:

_دوێنیّ گەیشتومە ئێرە.وەك ماڵی خۆم لێرە دەبزومەوە.وەك ماوەیەکی زۆر بیّ ئێوە بناسم وایە.لە هیچ شتێك ناترسم.....هەرچی بەویّ بیڵێم،دەیڵێم و تەنانەت رەخنەش دەگرم....

سۆفیا گوتی:هەروا باشە.

دایك قسەکانی درێژە پێدا :نازانم هۆشم لە کوێیە.....سەرم دەسووریّ و لەسەرخۆ نیم .جاران پیاو ماوەیەك بە دەوروبەری‌خەڵك دا دەهات و بە راشکاوی قسەی لەگەڵ دەکردن.ئێستا ئیتر گیان گویّ ناداتە هیچ شتێك.پیاو لە پڕ قسەی ئەو تۆ دەکا کە جاران بیریشی لیّ نەدەکردەوە......ئەویش قسەی چۆن......

سۆفیا سیغاری دوهەمی داگیرساند .بەچاوە بۆرەکانی سەرنجێکی دڵسۆزانەی دایکی دا. دایك گوتی:

_تۆ گوتت کارێکی وا دەکەین کە پاڤێلّ رابکا.....بە لامپاشان چۆن دەتوانیّ بژی؟

دایك توانیبووی ئەو پرسیارەی کەئازاری دەدا ئامادەی بکا.

سۆفیا قاوەیەکی تری بۆ خۆی تیّ کرد و وەڵامی داوە:زۆر هەسانە.هەروەك ژمارەیەکی زۆر لە هەلاتووەکانی تر دەژی.....تازە بەدوای یەکێکیان دا چوبووم،تا سەر سنور بەرێم کرد.ئەویش پیاوێکی زۆر بەنرخە.کرێکارێکی خەڵکی باشوورە.بە پێنج ساڵ و نیو دوور خستنەوە حوکم درابوو.سیّ سال و نیو لەو ماوەیە لە سیبیریا بوو.هەر بۆیە ئەوەندە قیت و قۆزم.پێشت وایە هەر عادەتم وایە؟حەز لە خشڵ و سلسلە و پلپلە ناکەم....پیاو سادەیە ،دەبیّ جلی سادە لەبەر بکا،جوان بیّ و سادەبیّ.....

دایك سەری هەڵتەکاند و بەئەسپایی گوتی:

_ئاخ‌لەم هەوەڵی مانگی ئەیارە بیر و هۆشی تێکداوم.خۆم بەخەفەتبار دەبینم.وام دێتە بەر چاو کەلەیەك کات دا بەدوو رێگای جیاوازدا دەڕۆم.....هێندیّ جار لاموایە هەموو شت دەزانم.هێندیّ جار ئاگام لەخۆم نییە ......مەسەلەن تۆ.....ژنێکی......بۆ مەرام کاردەکەی...... پاڤێلّ دەناسی ......رێزی لێدەگری.....سوپاست دەکەم.

سۆفیا بە پێکەنینەوە گوتی:سوپاسی خۆت بکە.......

دایك ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:سوپاسی خۆم؟ خۆ من ئەو شتانەم فێرنەکردووە.

سۆفیا قونچکە سیغارەکەی لەژێر پیاڵە هاویشت و سەری هەڵتەکاند.پرچە زێرینەکانی بەسەر شانی دا پەرش و بلا وکردن وبە قسەکردن وەدەرکەوت:

_بەڵێ ،کاتی ئەوە هاتووە ئەم هەموو زەرق و بەرقە لەخۆم دوور کەمەوە،دەستی لێ هەڵبگرم

## (٣)

نیکۆلای نێواریێ هاتەوە ماڵێ .لەسەر نان خواردن سۆفیا بە پێکەنینەوە بۆی گێڕایەوە کە چۆن سەری لە زیندانییەکان داوە و چۆن لە دیتنی ئەو هەموو جاسوسە لە هەموو شوێنێك سەری سوڕماوە و کابرایەك زۆر سەیر رای کردووە.قسەکانی چاو و راوی کرێکارێکی وەبیر دایك دەهێنایەوە کەکارێکی دژواری باش ئەنجام دابێ.شایی بەخۆی بوو وفیشاڵی دەکرد.

سۆفیا لەو کاتەدا کراسێکی گوڵداری تەنکی رەنگ ئاسمانی سادە و جوانی لەبەر دابوو.گنجەکانی لەسەر شانییەوە تا سەر پێیانی هاتبوونە خوارێ و تۆزێك کەڵەگەت تر دەهاتە بەرچاو.چاوەکانی مەست بووبوون و ئەدا و ئەتواری هێندی تر بووبوو.پاش نان خواردن نیکۆلای گوتی:

_سۆفیا تۆ دەبێ خەریکی کارێکی دیکە بی! دەزانی خەریکین رۆژنامەیەك بۆ دێهات چاپ بکەین.بە لامپاش خەڵك گیرانی ئەم دووایییە،پەیوەندیان لەگەڵ وەرزێڕەکان پچڕاوە.تەنیا دایك دەزانێ چۆن ئەو کابرایە دەدۆزێتەوە کە بلاوکردنەوەی رۆژنامەی لە ئەستۆ بوو،لەگەڵی بچۆ.

سۆفیا سیغارەکەی داگیرساند و گوتی:باشە .دایە باش تێگەیشتی ؟

_تێگەیشتم.....با بڕۆین!

_دوورە؟

_نزیکەی هەشتا کیلۆمەترە!

_زۆر باشە.....دەبێ ئەختێك پیانۆ لێ بدەم.....دەتەوێ تۆزێك مۆسیقات گوێ لێبێ؟

دایك لە قوژبنێك دانیشت و گوتی:هیچ لە من مەپرسە .چۆنت دەوێ وا بکە . هەروا بزانە من لێرەنیم . دایك هەستی دەکرد کە خوشك وبرا بێ ئەوەی بە ئاشکرا سەرنجی بدەنێ , دەیهێننە نێو وتووێژی خۆیان.

- نیکۆلای گۆی بدەیە! ئەم گۆرانییە."یۆنانی"یە .ئەمڕۆ هێناومە.پەنجەرەی پێوەدا.نۆتەکانی لێك کردەوە و بەدەستی چەپ نەرم لە "کلاویش"ەکانی دا.سیمەکان لەرزین.لە پێش دا هەناسەیەکی قووڵ و پاشان نۆتێکی دیکەش لەگەڵ نۆتەکانی هەوڵی کەوت.قامکەکانی دەستی راستی بە هەوایەکی رەوان.وەك دەنگی باڵندەی

ترساو بزووتن.لەسەر مەیدانی رەشی نۆتەكانی زیر كە بە شێوەیەكی رێك و پێك وەك شەپۆلی ماندووی دەریا دەنگیان دایەوە،باڵیان لێك دەدا.

- لە هەوەڵەوە مۆسیقا كاری نەدەكردە سەر دایك و لێی تێنەدەگەیشت .پێی وەك هەرا وهۆریا وابوو.گوێیانی نەیاندەتوانی لە نێو تەپەی تێكەڵ و پێكەڵی نۆتەكان دا ئاهەنگەكە وەربگرن.بە وێژنكاوی تەماشای نیكۆلای دەكرد كەلەو سەری نیوە تەختەكە لاقی هاویشتبوونە سەریەك .تەماشای لارومەتی سۆفیای دەكرد كەسەری لەبن بسكە پڕ و زێرینەكانی دا بەردابووەوە.رۆژ ئاوا دەبوو.تیشكێكی لەرزۆك لە پێش داسەر و شانی سۆفیای وەك گڕێكی نور داگرت وپاشان خزییە سەر پیانۆكە و لە ژێر قامكەكانی سۆفیا دا شەپۆلی دەدا.هەوای مۆسیقا ژوورەكەی داگرت.دایك بێ ئەوەی بزانێ ،دڵی وەخەبەر دەهات.سێ نۆتی لەرزیو هەروەك دەنگی فیێدیا مازین بەهەوایەكی نەرم بە دووای یەكتر دا دەهاتن و وەك سێ ماسی لە جۆگەلەیەكدا،یەكتریان لە بەرزایی رادەگرت و جاروبار لەبەر شەپۆلی دەنگەكان دەدرەوشان.نۆتێكی تریش هێندێ جار لەگەڵیان دەكەوت و هەموو بەیەكەوە سرودێكی سادەو خەماوی و دل لاوێنیان لێدەدا.دایك گوێی بۆ ئەمانە رادەگرت و لەوانی تری جیا دەكردنەوە.

دیار نەبوو بۆچی لە قوڵایی چاڵاوی تاریكی رابوردوودا،ئازارێكی وەبیر هاتەوە كەدەمێك بوو لە بیری چووبووەوە و ئێستا بە روناكی خۆی دەنواند.

جارێكی مێردە رەحمەتییەكەی شەو درەنگانێك بەسەرخۆشی هاتبووەوە.باسكی گرتبوو ولەسەر قەرەوێلە فڕێی دابووە خوارێ و پێ لاقەیەكی پێدا بوو و بە تووڕەیی گوتبووی:برۆ لەبەرچاوم وەلاكەوە ناجسن،ماندووم دەكەی ......لاچۆ لەبەرچاوم .بۆ ئەوەی خۆی لەبەر پێ لاقەكە دەرباز بكا،منداڵەكەی كە دوو ساڵان بوو،لە ئامێزی گرتبوو و كربوویە مەتاڵ بۆ پاراستنی خۆی . پاڤێل بە روتی لەترسان گریابوو،دەست و پێی راوەشاند بوو.میخائیل بەسەری دانەڕاندبوو:برۆ لاچۆ لەبەر چاوم.راست بووبووەوە و بۆلای چێشتخانە رای كردبوو.پاشان كراسێكی هاوشتبووە سەرشانی و منداڵەكەی پێچابووەوە و مات و بێ دەنگ ،بێ سكاڵا و پاڕانەوە،بە پێ خاوسی چووبووە كۆڵانێ.مانگی ئەیار بوو شەو فێنك بوو.تۆز و خۆڵی كۆڵانێ بە لاقیەوە دەنووسا.منداڵەكە دەگریا و دەست و لاقی رادەوەشاند .مەمكی خستە زاری و بەخۆیەوەی گوشی .لەكاتێك دا ترس هەڵی گرتبوو،بە كۆڵانی تاریك و نۆتەك دا دەڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە لای لایەی بۆ منداڵەكەی دەكرد تا خەوی لێبكەوێ .دنیا دەهات روناك دەبووەوە.شەرمی دەكرد،نەكا یەكێك بە نیوەروتی بیبینێ.چووبووە پەنا زەلكاوەكە و لەبن پۆلە دارێك هەڵتروشكابوو.ماوەیەكی زۆر لەوێ مابووەوە،چاوی لەتاریكایی بڕیبوو،بە ترسەوە لای لایەی بۆ منداڵە خەوتووەكەی دەكرد.

لە پڕ باڵندەیەک بە سەریدا فڕیبوو،دایکی ڕاپەڕاند بوو.لەسەرمان دەلەرزی .هەستا بوو گەڕابووەوە ماڵێ و بە پێشوازی ترس و لێدان وسووکایەتی پێ کردنەوە چووبوو.ئاوازێکی توند و ساردیپیانۆ بۆ ئاخر جار ناڵەی هات و بڕایەوە.

سۆفیا ڕوی وەرگێڕا و بە ئەسپایی لەبراکەی پرسی:ئەم هەوایەت پێ خۆش بوو؟هەروەک لەخەو ڕاپەڕێ، هەستا و وەڵامی داوە:بەڵێ زۆرم پێخۆش بوو. لە سینگی دایک دا ئاوازی بیرەوەرییەکان دەلەرییەوە.لە شوێنێک ،لەم لاو ئەولاوە بیرێکی بە دڵدا هات:

_"ئەوەتا،خەڵک بەهێدی و دۆستانە دەژین.بە شەڕ نایەن،ڤۆدکا ناخۆنەوە،لەسەر نان کێشە ناکەن.وەک لای خەڵکی چارەڕەش هەیە وا نین" . سۆفیا بێ پسانەوە سیغای دەکێشا و دووکەڵەکەی قوت دەدا.گوتی:

_"کۆستی "ی ڕەحمەتی ئەم مۆسیقایەی زۆر پێخۆش بوو.مژێکی لەدووکەڵەکەی دا و سووڕا و لەسەر خۆ قامکی لەپیانۆ کەی دا:چەندەم پێ خۆش بوو بۆی لێبدەم.چەندە بە زەوق بوو.دڵسۆزی هەموو شتێک بوو...

دایک لە دڵی خۆیدا گوتی:ڕەنگە باسی مێردەکەی بکا.بزەیەکی هاتێ.

سۆفیا لەکاتێک دا بەئەسپایی نارە ناری دەهات قسەکانی درێژە پێدا:چەندەی مـن بەختـەوەر کردبـوو.چـەند جوان دەیزانی بژی .هەمیشە ڕۆخۆش و شادبوو.

نیکۆلای لەکاتێک دا چەناگەی خۆی هەڵدەکەندەوە گوتی:بەڵێ،گیانێکی خۆش ئاهەنگ بوو.

سۆفیا سیغارەکەی فڕێ دا و ڕوی کردە دایک و گوتی:ئەم هەڵلا و بگرە ئێوە ماندوو ناکا؟

دایک بەکەمێک تووڕەییەوە کە نەیتوانی بیشارێتەوە،گوتی:

_پێم گوتی هیچ لەمن مەپرسە.من لە هیچ تێ ناگەم.....لێرە گوێ دەدەمێ و بیردەکەمەوە

_وانییە،دەبێ تێبگەی.کاتێک پیاو پەژارەی هەبێ،ناکرێ لەمۆسیقا تێ نەگا.توند پەنجەی لەپیانۆکەدا و ئاوازێکی توند دەنگی دایەوە.هەر دەتگوت خەبەرێکی بەترس گەیوەتە کەسێک و کاری کردووەتە سەر دڵی و دەناڵێنێ.دەنگی گەنج و بە ترس وسەر لێشێواو تێکەڵ بوون.سەر لەنوێ دەنگەکە توند بوو.ئەوانی تری داپۆشی.بێ گومان کارەساتێک قەومابوو کەبووبوو بە هۆی قین و تووڕەیی.پاشان دەنگێکی قەوی ،دڵ لاوێن بەرز بووەوە ودەستی کرد بە سرودی جوان و ساکار کە دڵگر و جێگای دڵنیایی بوو.نۆتەکانی زیر نەڕەیان دەهات.

سۆفیا ماوەیەک پیانۆی لێدا .دایک وەزعی تێک چووبوو.دەیویست بپرسێ ئەم مۆسیقایە کەهەست و بیری جۆر بە جۆری تێدا پێک هێنا،باسی چی دەکرد.خەم و خەفەت جێگای خۆیان دەدا بە بروسکەی شادی و هێمنی .وا دەهاتە بەرچاو کەپۆلە باڵندەیەکی ئەدیو لە ژوورەکەدا دەگەڕێن و لە کاتێک دا باڵی تەنکیان وەدڵ

دەکەوێ،سریوەکیان لەبەر دێتەدەر کەلە خۆوە بیر هان دەدەن قسەی نامەفهوم بکا.ئەو قسانە بە هومێدێکی خەیاڵی ورە وەبەر دڵ دەنێن و پڕی دەکەن لە هێز و شادی.

دایك زۆر حەزی دەکرد قسەیەکی خۆش بە دۆستەکانی بڵێ.مۆسیقا سەرخۆشی کردبوو.زەردەخەنەیەکی نەرمی لەسەر لێوان بوو.لە کاتێك دا چاوی دەگێڕان تا بزانێ چ کارێك هەیە بیکا،لەسەر پەنجان چووە چێشتخانە تا سەماوەر تێ باوێ.ئارەزووی خزمەت کردن لەدڵی دا نەمردبوو.ئەم هەستە لە دڵی دا دەجولاًیەوە.بزەیەکی هاتێ و گوتی:

_ئێمە خەڵکی رەش و روت هەست بە هەموو شت دەکەین،بە لامدەربڕینی هەستەکەمان بۆ دژوارە .بیر و باوەڕمان شەپۆل دەدا.لەوە شەرمەزارین کە ئەوەی دەیزانین ناتوانین دەری ببڕین.هێندێ جار دژی بیرو باوەڕی ئێوە و دژی ئەو کەسانەش کەئەو بیرو باوەڕەمان لەنێودا بلاًودەکەنەوە،تووڕە دەبین.دژیئەوان توند و تیژی دەکەین،وەدەریان دەنێین.ژیان پڕە لەشەپۆل .لە هەموو لایەکەوە لافاو لێمان دەدا.دەمانەوێ بحەسێینەوە ،بە لامبیرو باوەڕ گیانمان وەخەبەر دێنێ و ئەمری پێدەکا کە بڕوانێ .

نیکۆلاًی گوێی دابوویە،سەری بۆ دەلە قاند و جاروبار چاویلکەکەی خاوێن دەکردەوە. سۆفیا تەماشای دایکی دەکرد وسیغارەکەی لەبیر دەچووەوە و دەکوژایەوە.لەپێش پیانۆکە دانیشتبوو.جاروبار قامکی دەگەیاندێ.ئاوازی پیانۆ لەگەڵ قسەکانی دایك تێکەڵ دەبوو.

_ئێستا دەتوانم جۆرێك باسی خۆم و خەڵکتان بۆ بکەم.چونکە ئیتر تێدەگەم و دەتوانم بەراوردی بکەم و لێکی بدەمەوە.پێشتر نەمدەتوانی لێکی بدەمەوە.لە ژیانی ئێمەدا هەموو وەك یەك دەژین.ئێستا دەبینم خەڵکی تر چۆن دەژین.وە بیرم دێتەوە کە خۆم چۆن ژیاوم.ئەم بیرەوەرییە تاڵ و دژوارە .

دەنگی نزم کردو قسەکانی درێژە پێدا:

_رەنگە قسەکانی من بەجێ نەبن و پێویست نەبێ ئەم قسانە بکەم ،چوونکە ئێوە خۆتان هەموو شتێك دەزانن .

کوڵی گریانی لەئەوکی مابوو.بەچاوێکی پڕ لەزەردەخەنەوە تەماشای ئەوانی دەکرد ودەیگوت:

_دەمەوێ دڵی خۆم لە پێش ئێوە ئاواڵە بکەمەوە،تا بزانن چەندەم خێرو خۆشی ئێوە ئاواتە .

نیکۆلاًی بە ئەسپایی گوتی:ئێمە ئەوەی دەزانین.

دایك نەیتوانی هەستی دابمرکێنێ .دیسان ئەوەی بۆ خۆی بە تازەی دەزانی بۆ ئەوانی باس دەکرد و لای وابوو ئەمە بۆ ئەوان زۆر گرنگە.باسی ژیانی پڕ لەکوێرەوەری و هەژاری خۆی دەکرد.بە روخۆشی و بێ تووڕە بوون و ناڕەحەتی،بە وشەی ساکار و ئاسایی و بەزەردەخەنەیەکی شیرین،مێژووی یەکسان و رۆژە توشەکانی ژیانی خۆی

بۆ دەگێڕانەوە.ئەو زەبرانەی دەژمارد کەمێردەکەی لێی دا بوون.لەکاتێك دا خۆشی لە پەلپ وبیانۆی پوچی مێردەکەی و لەوەی کەنەیتوانیبوو خۆ لەو لێدانە بپارێزێ ،سەری سوورمابوو.

ئەوان بەماتی گوێیان بۆ قسەکانی دایك هەڵخستبوو.لەژیانی خەفەتباری ئینسانێك کە وەك حەیوان رەفتاریان لەگەڵ کردووە و ماوەیەکی زۆر هەستی بە ژیانی زۆر لێکراوانەی خۆی نەکردووە و دەنگی لەبەر نەهاتووەتەدەر،سەریان سوورمابوو.وایان دەهاتە بەرچاو کە ئەوەی لەزاری دایك دێتەدەر چارەنووسی هەزاران کەسە.لەم ژیانەی ئەودا هەموو شت بێ مانا وبێ نرخ بوو.بە لاخەڵکێکی بێ ئەژمار لەم سەر زەوییە ئاوا ژیاون.تا دەهات مێژووی ژیانی دایك لەبەر چاویان گرنگ دەبوو.نیکۆلای ئانیشکی هاویشتبووە سەر مێزەکەی و سەری لە نێو دەستانی گرتبوو.لەکاتێك دا جارو بار برژانگی لێك دەدان،بەبێ خۆ بزاوتن،بە چاویلکەوە تەماشای دایکی دەکرد.سۆفیا پاڵی وەکورسی دابوو،دەلەرزی و جاروبار سەری بۆ دەلەقاندو دیار نەبوو لەبەر خۆیەوە چ دەڵێ.نیتر سیغاری نەدەکێشا.دەم و چاوی کزو رەنگ پەڕیبوو. بەدەنگێکی نەرم گوتی:

_جارێك خۆم بەڵێ قەوماوی دیت، لام وابوو ژیانی من لەرز و تایە.ئەو کاتەبووکەدووریان خستبوومەوە.لە گوندێکی بچووك بێ کاربووم بێجگە لەخۆم لە فیکری هیچ کەس دا نەبووم.لەبەر بێ کاری چارەڕەشییەکانی خۆم کۆ کردەوە.لەگەڵ باوکم کە زۆرم خۆشدەویست بە شەڕهاتبووم.بەتاوانی خوێندنەوەی کتێبی قەدەخە لە مەدرەسەیان دەرکردبووم.پاشان نۆرەی زیندان و خەیانەتی هاوڕێیەکی خۆشەویستم هات.مێردەکەیان گرتم و دیسان گرتیانمەوە و دووریان خستمەوە و مێردەکەم کۆچی دوایی کرد.ئەو دەمی لام وابوو لەسەر ئەم زەوییە کەس لە من چارەڕەش تر نییە.بە لامدایەگیان ئەگەر تەواوی بەدبەختییەکانی من کۆبکرێنەوە دە ئەوەندەش زیاد بکرێن،هێشتا ناگەنە مانگێکی ژیانی تۆ.....نازانم ئەشکەنجەی رۆژانە لەماوەی چەند ساڵ دا .....ئەم خەڵکە هەژارە چۆن تاقەتی ئەم هەموو ئازارو جەزرەبەیان هەیە؟

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە وەڵامدا گوتی:پێی رادێن.

نیکۆلای بە بیر کردنەوە گوتی:من لام وابوو شارەزای ئەم ژیانەم ،بە لامنێستا کەدەبینم مەسەلەکە تەنیا تەنسیراتی جیاجیا نییە ،یان کتێبێك نییە کەباسی ئەم جۆرە ژیانی بکا،یان چاپکراوە کەم و کوڕەکانی خەم نین کەباسی دەکەن،بەڵکو بەسەرهاتی خوێنی دەیانگێڕێتەوە،بە ترسن.

وردە شتەکان،تەنانەت بەشە بچووکەکان و سانییەکانیش کەساڵیان لێ پێك دێ،هەموویان بەترسن. وتووێژ درێژەی هەبوو.هەموو بەشەکانی رەشی ژیانی دەگرتەوە.دایك لەخەیاڵاتی خۆیدا نوقم بووبوو.پەژارەی رۆژانەی رابوردووی دەهێنا گۆڕێ و پەردەیەکی خەفەتاوی لەترس و دزێوی دروست دەکرد کەسەردەمی گەنجایەتی تێدا نوقم بووبوو.ئاخرەکەی هاواری کرد:

_ئای!چەندەم قسەكرد.كاتی خەوتنە،بحەسێنەوە.هەمووی لەگوتن نایە. خوشك وبرا خواحافیزیان لێكرد.وا دەهاتە بەرچاو كەنیكۆلای لەجاران پتر سەری بۆ دادەنوێنێ.سۆفیا تا بەر دەرگا لەگەڵی چوو ،لەوێ راوەستا و بەئەسپایی گوتی:

_شەوباش ،ئێستراحەت بكە!

گەرمییەك لە دەنگی دا بوو.چاوە بۆرەكانی دایكیان دەلاواندەوە.

دایك دەستی سۆفیای گوشی و پێی گوت:سوپاستان دەكەم.

## (٤)

پاش چەند رۆژێك دایك و سۆفیا وەك فەقیران كۆنە كراسێكیان لەبەر كرد و هەریەكە تورەكەیەك بەشانەوەو گۆچانێك بە دەستەوە لەپێش نیكۆلای راوەستان.سۆفیا لەم جلە كۆنەدا بچووكتر دیای دەكردو حاڵەتێكی لێبڕاوانە و رەنگێكی زەردی هەبوو.

كاتی خوا حافیزی نیكۆلای بەگەرمی دەستی خوشكی گوشی.دایك دیسان ئەو سادەیی و ئارامییەی هاتە بەر چاو.ئەوانە ئەهلی ماچ و لەئامێزگرتن نەبوون،بە لاملەگەڵ ئەوەش پێكەوە دڵسۆز و راست بوون و بەزەییان بەخەڵكی دیكەش دا دەهات و خەڵكیان خۆش دەویست.ئەو دنیایەی دایك تێیدا ژیابوو،خەڵك : یەكتریان تێدا ماچ دەكرد و زۆر جار قسەی دۆستانەو خۆشیان لەگەڵ یەكتر دەكرد،بە لاموەك سەگی برسی یەكتریان دەگرت.

دوو رێبوار لەشاری وەدەركەوتن وگەیشتنە چۆڵی.جادەیەكی پان و كوتراویان گرتەبەر كەهەردووك بەری بە پیرە داری سپی چنار داپۆشرابوو.دایك لەسۆفیای پرسی :ماندوو نەبووی؟

_پێت وایە من بە رێگا رۆیشتن رانەهاتووم؟ بە هەڵە چووی.

سۆفیا بەخۆشی هەروەك شەیتانییەكانی سەردەمی منداڵیی بگێڕێتەوە،دەستی كرد بەباسی كردەوە شۆڕشگێڕییەكانی خۆی.ناوی خۆی گۆڕیبوو.پێناسی ساختەی بۆ خۆی ساز كردبوو.بۆئەوەی لەچنگ جاسوسان رزگاری بێ ،جل و بەرگی خۆی گۆڕیبوو.بەسەدان كیلۆ بڵاوكراوەی قەدەخەی بۆ شاری جۆر بەجۆر بردبوو.كار و باری راكردنی هاورێ دوورخراوەكانی راپەڕاندبوو.تاسەر سنوور بەڕێی كردبوون.جارێك چاپخانەی نهێنی لەماڵی خۆیان دا شاردبووەوە.كاتێكی ژاندارمە پێیان زانیبوو،هاتبوون ماڵەكەی بگەڕێن.پێش هاتنیان جلی كارەكەرێكی لەبەر كردبوو ولەبەر دەرگایە توشی ژاندارمان بووبوو.بێ پاڵتۆ،دەسماڵێكی بچووك بەسەرەوە،تەنەكەی نەوت بەدەستەوە،بەچلەی زستانێ تەواوی شار گەڕابووجارێكی دیكەش بۆسەردانی

هاوڕێکانی چووبووە شارێکی دوور،ڕاست لەو کاتەدا کەخەریك بووبوو لەپلەکانان وەسەرکەوێ ،دیتبووی ئەوە ماڵەکە دەگەڕێن.ڕێگای گەڕانەوەشی نەمابوو.بە ئازایی زەنگی دەرگای ماڵێکی نەناسیاوی لێدابوو،بەجانتاوە وەژوور کەوتبوو.بە دڵنیایی ڕەپ و ڕاست گوتبووی:

_ئەگەر بخوازن ئێستا دەتوانن من بدەن بە ژاندارم،بە لامدڵنیام ئەو کارە ناکەن.خەڵکی ماڵەکە ترسابوون و هەتا ڕۆژ لەو ترسانە کەلێیان وەژوور دەکەون،خەویان لە چاوی نەکەوتبوو.بە لامبەوحاڵەش سۆفیایان نەدابوو بەژاندارم.بەیانی پێکەوە گاڵتەیان بەژاندارمە کردبوو.جارێکیش جلی خوشکە تەرکە دنیاکانی لەبەر کردبوو و لەگەڵ جاسوسێك کە وەدووای شوێنی ئەو کەوتبوو،لە واگۆنێکی قەتاردا دانیشتبوو.جاسوسەکەش بۆ خۆڕانان بە چاو ڕا و بۆی باس کردبوو کەچەندە بە وریایی کاری خۆی ڕادەپەڕێنێ.لای وابووبوو کە سۆفیا لەو قەتارەدا لە ژمارە دوو دایە.لە هەموو ئێزگەیەك دەچووە دەرو کە دەگەڕایەوە بە تەرکە دنیای دەگوت:

_نای بینم.ڕەنگە ڕاکشابێ.ئەوانیش ماندوو دەبن.ژیانێکی دژواریان هەیە .

دایك بەو قسانە پێدەکەنێ بە چاوی خۆشەویستییەوە تەماشای سۆفیای دەکرد.سۆفیای باڵا بەرزی کز و باریك بە هەنگاوی سوك و توند ڕێگای دەبڕی.لەقسە و کردەوە و ئاکاری دا ئازایەتی دەبینرا.لەقەد و باڵای ڕاکشاوی دا ساخییەکی مەعنەوی لەگەڵ شادی دیار بوو.چاوەکانی بەخۆشی و شادییەکی گەنجانە دەیانڕوانییە هەموو شتێك.سۆفیا دارێکی بە دایك نیشان دا و گوتی:بزانە سنەوبەرێکی چەند جوانە.دایك ڕاوەستا کەتەماشای بکا،بە لامنەو دارە لەدارەکانی تر بەرزتر و جوانتر نەبوو.بە پێکەنینەوە گوتی:

_بەڵێ ،دارێکی جوانە و، دەیدیت کەچۆن با یاری بە قژەکانی پشت گوێی ئەو ژنە دەکا.

_چووە پۆپنەکی!

چاوەکانی سۆفیا لە خۆشیان دەتروسکان.هێندێ جار دادەهاتەوە،بەنەرمی گوڵێکی هەڵدەپساند و گەڵاکانی لەنێو قامەکە ناسکەکانی دەگرت و بەنەرمی گۆرانی دەگوت.

ئەوانە هەموویان دڵیان دەبزاوت و لەو ژنە چاو گەشەیان وەنزیك دەخست.دایك خۆی پێوە دەنوساند و لەگەڵ ئەودا هەنگاوی داویشت.بە لامهێندێ جار لە قسەکانی سۆفیا دا و شەی توند دەبیسران کەبەلای دایکەوە زیادی بوون و هێندێ بیری مەترسی داری بۆ پەیدا بوون:"بەکەیفی میخائیل نابێ".

پاش تاوێك سۆفیا سەرلەنوێ قسەی ساویلکەی دەکرد.دایك بەمێهرەبانی تەماشای چاوەکانی دەکرد.هەناسەیەکی هەڵکێشا وگوتی:

_هێشتا چەند گەنجی !

_ئاخ.من تەمەنم سی و دووساڵە.دایك پێکەنی.

_مەبەستم ئەوە نەبوو.بە دیمەن گەورەتر دیاری دەکەی.بە لامپیاو کە چاو لە چاوەکانت دەکا و گوێی لەدەنگت دەبێ،سەرسام دەمێنێ.هەر دەڵێی کیژی .ژیانێکی دژوارو بەترست هەیە،بە لاملەگەڵ ئەوەش دا دڵت هەرشاد و بە پێکەنینە .

_هەست بەوە ناکەم ژیانم دژوار و پەشێوبێ. لاموایە ژیان لەمە باشتر و خۆشتر نابێ......

_کێ پاداشتی ئەو زەحمەتەتان دەداتەوە؟

سۆفیا بە شێوەیەك کەبەلای دایکەوە پڕبوو لە بەرزە هیمەتی،گوتی: ئێمە پاداشتی خۆمان وەرگرتووە.ژیانێکی ئەو تۆمان سازکردووە کە مایەی خۆشیمانە.لەوە پتر چمان دەوێ؟

دایك تەماشای کرد و سەری بەردایەوە و لەبەر خۆیەوە دووپاتەی کردەوە:"بەکەیفی میخائیل نابێ......."

هەوای خۆشی و تازەیان هەڵدەمژی .بەکاوەخۆ بە لامبەردەوام ڕێگایان دەبڕێ.دایك ڕوای دەزانی بۆ زیارەت دەچێ.سەردەمی منداڵی وەبیر دەهاتەوە کەرۆژەکانی جێژن بۆ کلیسا دەچوو.

سۆفیا هێندێ جار بەو دەنگە خۆشەی سرودی دەخوێندەوە کە باسی ئەوین یا بەهەشتی تێدا بوو.جاری وابوو لەتەعریفی دەشت و چیمەن و مێرگ و میرغوزار و چۆم دا شیعری دەخوێندەوە.

دایك گوێی دەدایە و پێدەکەنی.بەهەوای شیعرەکانی کەزۆری پێ خۆش بوون،سەری دەلەقاند.هەموو شتێك لەدڵی دا وەك باخێکی بچووك و لەمێژینە لە شەوی هاویندا ،نەرم و هێدی وهێمن بوو.

## (٥)

ڕۆژی سێهەم گەیشتنە گوندی.دایك لەوەرزێڕێکی کە لەوێ کاری دەکرد پرسی:کارخانەی قەتران لەکوێیە.هەردووکیان خێرا بەرێگایەکی باریك دا کە ڕەگە دارەکانی لێ بووبوونە پلەکان،چوونە خوارێ.توشی جێگایەکی روتەنی بێ داربوون،پڕبوو لە زبڵ و خەڵوز و قەترانیشی لێ ڕژابوو.

دایك بە پەرێشانی تەماشای دەوروبەری خۆی کردو گوتی:

_گەیشتینە جێ.لەنزیك کەپرێکەوە چوار کرێکار لە دەورەی مێزێکی ڕەند نەکراو دانیشتبوون نانیان دەخوارد.یەکێك لەوان ڕێبین بوو.کراسێکی یەخە ناواڵەی لەبەر دابوو،تەواو ڕەش هەڵگەڕابوو.ئەوی دیکەیان یێفیم و دوو لاوی دیکەش دانیشتبوون.ڕێبین زووتر چاوی پێکەوتن.دەستی بە پێش چاوییەوە گرت و چاوەڕوان بوو .

دایك لە دوورەوە بانگی کرد:ڕۆژ باش کاك میخائیل!

رێبین هەستا و بەکاوەخۆ بۆلایان چوو.کەدایکی ناسی راوەستاو بەزەردەخەنەیەکەوە دەستی بە ریشی خۆی دا هێنا.دایك لێی چووە پێش و گوتی:دەچینە زیارەت،لامان دا چاومان بەتۆ بکەوێ.ئەمەش دۆستێکی منە ناوی"ئاننا"یە.......

شانازی بەم فیکرەی خۆی کرد و چاوێکی لەسۆفیا کرد کە بە ئەدەب و قیت راوەستا بوو.رێبین بزەیەکی هاتێ وگوتی:رۆژ باش .دەستی دایکی گوشی و سلاوی لە سۆفیا کردو درێژەی پێدا:درۆ فایدەی چییە؟ئێرە شار نیە،لێرە پیاو پێویستی بە درۆ نییە.بێجگە لە پیاوی باش کەدەیان ناسین کەسی دیکەی لێ نییە.

یێفیم هەروا لەسەر مێزەکە دانیشتبوو تەماشای میوانەکانی دەکرد.بە سرتە شتێکی بە هەڤاڵەکانی گوت.کە ژنەکان وەنزیك کەوتن ،هەستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێ رۆژ باشی کرد.دوو کەسەکەی تر هەروەك میوانەکانیان نە دیبن،مات بوون.رێبین دەستێکی لە شانی دایکی دا و دەستی پێکرد:ئێمە لێرە حەپسی تەنیاین.کەس سەرمان نادا.ئاغا لە گوندەو خێزانی لەنەخۆشخانەیە و من ئێستا نوێنەری ئەوم.....دانیشن.چای دەخۆنەوە؟یێفیم کەوایە شیریان بۆ بێنە.

لە کاتێك دا میوانەکان بە کاوەخۆ توورەکەکانیان لە عەرزی دادەنا،یێفیم چووە ژووری خانووەکە.یەکێك لەوەرزێرەکان کەزەلامێکی کەلگەت و لاواز بوو،هەستا یاریدەیان بدا،ئەوی دیکەیان یەکی روتە و خەپە خوڵە بوو،ئانیشکی وەسەر مێزەکەی دا تەماشای ژنەکانی دەکرد و سەری دەخوراند و نارەناری بوو.بۆنی توندی قەتران و بۆنی ناخۆشی گژرگیای رزیو سەری گێژ دەکرد.

رێبین کرێکارە بالا بەرزەکەی نیشان دا و گوتی:ئەمەیان ناوی"یاکۆڤ"و ئەوی دیکەیان ناوی"ئیگنات"ە.

_باشە کوڕەکەت چۆنە؟

دایك هەناسەیەکی هەلکێشا و گوتی: گیراوە.

_دیسان لوادیارە جاری پێشوو خۆشی رابواردووە.....ئیگنات ئیتر نارەناری نەدەکرد.یاکۆڤ دارەکەی لە دایك وەرگرت:

_پورێ گیان دانیشە.

رێبین روی کردە سۆفیا و گوتی:تۆش دانیشە.سۆفیا بێ ئەوەی هیچ بڵێ لەسەر تەختە دارێك دانیشت وبە وردی تەماشای رێبینی کرد:رێبین پرسی:

_کەنگێ گیرا؟پاشان سەری راوەشاند و گوتی: دایە تۆ بەختت نییە.

_گرنگ نییە.

_باشە وردە وردە رادێی.

_نا وانییە،بە لامباش دەزانم کەچاری دیکە نییە.

_هەروایە،باشە ،بۆمان بگێڕەوە.

یێفیم قاپێکی شیر هێنا.پیالەیەکی لەسەر مێزەکە هەلگرت و ناوەکەی رشت و پڕی کرد لەشیر و بۆ سۆفیای راداشت.بەبێ دەنگی کاری دەکرد و دەجولاوە و گوێی بۆ قسەکانی دایك هەلدەخست.کاتێك قسەکانی تەواو بوون،هەموویان مات بوون.نیگنات هەروا لەسەر مێزەکە دانیشتبوو و بەنینۆك جوغزی لەسەر تەختە دارەکە دەکێشا.یێفیم پالی وەشانی رێبین دابوو.یاکۆڤ لەسەر سینگی دانابوو و سەری بەردابووەوە.سۆفیاش بە وردی تەماشای سەر و چاوی وەرزێڕەکانی دەکرد.

رێبین بەشێنەیی قسەکانی لەبەر یەك دەکێشا و .گوتی:ئەگەر خۆپێشاندانێکی ئەوتۆیان لێرە سازکردبایە،وەرزێڕەکان بەنیازی کوشتن لێیان دەدان......

رێبین پرسی :گوتت پاڤێل موحاکەمە دەکرێ؟

_بەلێ ،بڕیار وایە.

_تاوانی چییە؟......نازانی؟.......بەچ سزایەك دەبێ حوکم بدرێ.

دایك بەئەسپایی وەلامی دایەوە:بەکاری دژوار یا دوورخستنەوەی هەمیشە بۆ سیبیریا.کرێکارەکان هەر سێك چاویان لەیەکتر کرد.رێبین قسەکانی درێژە پێدا:

_کاتێکی خەریکی ئەو کارە بوو،دەیزانی چ سزایەك چاوەڕێیەتی؟

سۆفیا گوتی:دەیزانی.......بەلێ دەیزانی.

هەموویان بێ دەنگ بوون و ئیتر جولەیان نەدەکرد.هەروەك لەبیرێکی سارددا بووبن بەسەهۆل.رێبین بە دەنگێکی زۆر جیددی قسەکانی درێژە پێدا:

_منیش لاموایە کەدەیزانی.پیاوێکی شێلگیرە.هەروا سەرسەرەکی کارناکا.هاوڕێیان بزانن،ئەو دەیزانی کەلەوانەیە بەسەرە نێزە ورگی هەلدڕن،یان بینێرن بۆ کاری دژوار .بەو حالەش کاری دەکرد.پێویست بوو وەکار کەوێ،وەکار دەکەوت.ئەگەر دایکیشیان لەسەر رێگا دانابایە پێی گرنگ نەبوو.دایە وانییە؟

دایك راپەڕی،وەلامی داوە:وایە......

پاش ئەوەی سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد لە ناخی دلەوە هەناسەیەکی هەلکێشا.سۆفیا بەنەرمی دەستەکانی دامالی و چاوێکی نارازییانەی لە رێبین کرد.رێبین تەماشایەکی دانیشتوانی کرد و دەستی بەقسان کردەوە. دیسان هەر شەشیان بێ دەنگ بوون.تیشکێکی کزی هەتاو وەك پەردەیەکی زێڕین لە هەوا هەلواسرابوو.قەلەرەشەیەك لە دوور قیڕە قیڕی دەهات.دایك لەبیرەوەری هەوەلی،مانگی ئەیار و وەبیر هاتنەوەی

پاڤێلۆ و نەندرێی حاڵی تێکچووبوو.لە دەوروبەری خۆی دەڕوانی .لەو شوێنە بچووك و روتە،چەلەنگە شکا و کەلە پێش دا قەترانیان تێدا بووبوو،کەوتبوونە سەریەك .پوش و پەڵاش بەدەم باوە دەهات ودەچوو.دار بەڕو و سپی دار لەهەموو لایەکەوە ئەو شوێنە روتەیان دەورەدابوو.هەر دەتگوت خەریکن ئەو زبلۆ و زاڵەی بووەتە هۆی سوکایەتی ئەوان،لەبەینی بەرن.لەو کاتەدا کەبەبێ دەنگی پەیوەندیان پێکەوە هەبوو،سێبەری گەرم و تاریکی خۆیان داویشتە سەر زەوی.

لەپڕ یاکۆڤ لەو دارە جیابووەوە کەپاڵی وێ دابوو،سەری راوەشاند و بەدەنگێکی وشك و قەوی گوتی:

_من و ییڤیم دەنێرن دژی ئەو جۆرە کەسانە شەڕ بکەین؟

رێبین بەخەفەتەوە گوتی:پێت وابوو دژی کێ شەرت پێ دەکەن . سەیر ئەوەیە هەردەستی خۆمان ئێمە دەخنکێنین . ییفیم بە ئەسپایی گوتی:

بەو حاڵەش دەچمە سەربازی!

ئیگنات بە ئەسپایی گوتی:کێ رێی لێ گرتوی.هەستە برۆ.چاوی بڕیە ییڤیم و بە پێکەنینەوە گوتی:بە لامکەتفەنگت بە منەوە نا،دەسەرمی گرە.بە جارێك بمکوژە،نەقوستانم مەکە!........

ییڤیم بەتووڕەیی گوڕاندی!پێشتریش ئەم قسانەت پێ گوتووم.رێبین قسەکەی قۆستەوە:هاوڕێیان راوەستن!بە فیزەوە دەستی هەڵێنا و دایکی نیشان دا:ئەم ژنە دەبینن،بێ گومان حیسابی کوڕەکەی تەواوە.دایك بە دەنگێکی خەمبارەوە گوتی:بۆ قسەی وادەکەی؟

_چوونکە پێویستە!دەبێ سەرت بەخۆڕایی سپی نەبێ و دڵت بە هیچی ئازار نەکێشێ.....باشە،خۆ ئەم قسە تۆی نەکوشت......کتێبت هێناون؟

دایك چاوێکی لێکرد و پاش تۆزێك ماتی وەڵامی داوە:بەڵێ!

رێبین دەستێکی لەمێزەکەی دا وگوتی:هەرکە چاوم پێت کەوت زانیم .ئەگەر ئەمە نەبا ،بۆچی دەهاتییە ئێرە؟......بزانن،کوڕیان لە مەیدان بردووتە دەر،دایك جێگای گرتووەتەوە.خۆی راست کردەوە و بە فیزەوە نەڕاندی:ئەو ناجسنانە نازانن کەبەدەستی شکاویان چ تۆوێك دەچێنن.دەیبیننەوە.کاتێکی هێزی ئێمە پەرەی گرت،کاتێکی دەستمان بەدروێنەی ئەو گیا مەلعونانە کرد،دەیبیننەوە.

دایك لەم قسانە ترسا.چاوێکی لەرێبین کرد،دیتی زۆر گۆڕاوە و لاواز بووە.ئیتر ریشی چوار گۆشە نییە و تێك چووە .ئێسکی رومەتی دەرپەڕیون،رەگی وردی سوور لەسپێنەی چاوی دا دەبینرێن و هەر دەڵێی ماوەیەکی زۆرە نەنوستووە.لوتی وەك دەندوکی باڵندەی راوکەر خواربووەتەوە.خەم و خەفەت دایگرتووە و تروسکەی چاوەکانی دەم و چاوی تاریکی بە تیشکی خەفەت و قین روناك دەکردەوە.

ڕێبین درێژەی پێدا:دوێنێ سەرۆکی ناوچە بانگی کردم و پرسی:" سەرسەری ئەوە چت بەقەشە گوتووە؟"گوتم:بۆ سەرسەریم.پشتم نەوی دەکەم و نان پەیدا دەکەم.کەسیشم ئازارنەداوە.دەستی کرد بەجنێودان و مستێکی لە دەم و لەوسی دام.سێ ڕۆژیش حەپسی کردم .ئاخ!ئاوا لە خەڵك دەکەن.باشە!بە لامنەی ناجسنەکان،ئیتر چاوەڕوانی لێخۆش بوون مەبن!ئەگەر منیش نەمێنم یەکی تر تۆڵەی ئەو سوکایەتییە لە ئێوە یا لە منداڵەکانتان دەکاتەوە.لەبیرتان نەچێ بە پەنجەی ئاسنی تەماعی خۆتان سینگی گەلتان کێلاوە و تۆوێکی خەراپتان لێ چاندووە!ئەی مەلعونینە....لە ئێوە خۆش نابین!

لەبەر تووڕەییان دەکوڵی .قسەکانی ترسیان وەبەر دایك نابوو.تۆزێك هاتەوە سەرخۆ و قسەکانی درێژە پێدا:باشە چیم پێ گوتبوو؟پاشان کۆبوونەوە لە گوندی قەشە بە وەرزێڕانی گوتبوو:خەڵك وەك مێگەل وایە و هەمیشە پێویستی بە شوان هەیە .منیش بەگاڵتە گوتم:ئەگەر ڕێویان کردبا بەسەرۆکی لێڕەوار،پەڕ زۆر دەبوو،چوونکە باڵندەی نەدەهێشت.بە مۆڕەوە چاوی لێکردم و دەستی بە قسەکرد:"خەڵك دەبێ زەحمەت و کوێرەوەری بکێشن،تەسلیم بن پشت بەخوا ببەستن.ئەوەندی دەتوانن پتر نوێژ بکەن،تا خوا هێزی خۆڕاگرتنیان بداتێ".من لەوە لامدا گوتم:خەڵك نوێژو دووعا زۆر دەکەن،بە لامواديارە خوا کاتی ئەوەی گوێیان بداتێ.هەرئەوەندە.

پاشان لێی پرسیم :دووعای چی دەکەی.لەوە لامدا گوتم:لەهەموو ژیانم دا تاقە دووعایەك فێربووم.ئەویش دووعای هەموو گەلە:"خوایە فێرم کە بۆ ئاغا کار بکەم،بەرد بخۆم و تۆزی دار قوت بدەم"!نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم.ڕێبین لەپڕ قسەکەی بڕی و لە سۆفیای پرسی:

_خانم ئێوە لە چینی نەجیبانن؟

بەسەر سوورمانەوە هەستاو گوتی:بۆچی وابیر دەکەیەوە؟

_بۆچی؟بزەیەکی هاتێ:چارەنووس ئەمەیە.هەروا لە دایك بووی .پێت وایە بە بەسەر دادانی کۆنە دەسماڵێك دەتوانی نەعیانەتی خۆت لەخەڵك بشاریەوە؟ئێمە قەشەی بە هەموو ڕەنگێك دەناسین.ئانیشکت وەسەر مێزی تەڕدا،نەدات دەرهێنا،پشتیشت لەپشتی ژنێکی زەحمەتکێش راسترە.

دایك لەترسی ئەوەی نەکا بەم قسە ڕەقانەو بەم تەوس و توانجانە دڵی سۆفیا بییەشێنێ،خێرا هاتە نێو قسەکانی:

_دۆستی منە.ژنێکی باشە.ئەوەندە بۆئەم مەرامە زەحمەتی کێشاوە،سەری هەموو سپی بووە.هێندە تۆسن مەبە.......

ڕێبین بەزەحمەت هەناسەیەکی هەڵکێشا:

_بۆ قسەی ناحەزم کردوون؟

سۆفیا چاوێکی لێکرد و بەناهەنگێکی وشك پرسی:دەتەویست قسەیەکم پێ بلێی؟

_من؟.بەڵێ!چەند رۆژە ئامۆزایەکی یاکۆڤ هاتووەتە ئێرە،نەخۆشە.زۆر تێگەیشتووە.دەکرێ بانگی کەین؟

_دەکرێ،بۆناکرێ؟

رێبین چاوی لەسەر یەك دانان و دەنگی نەرم کردەوە و گوتی:

_یێفیم!بچۆ بۆلای،بلێ شەو بێتە ئێرە.....

یێفیم کلاوەکەی هەڵگرت و بێ ئەوەی هیچ بلێ وچاو لە کەس بکا،بەهەنگاوی هێدی لەنێو مێشەدا ون بوو.رێبین چاوێکی لێکرد و سەرێکی بۆ لەقاند و گوتی:

_ئازار دەچێژێ!.....بێ گوێیە......بەم زووانە......دەبێتە سەرباز......یاکۆڤیش هەروا.تەنیا یاکۆڤ دەڵێ ناتوانێ بچێتە نێو تیپ.یێفیمیش ناتوانێ،بە لامهەردەیەوێ بچێ فیکرێکی هەیە.بەخەیاڵی خۆی دەتوانێ هەوێنی ئازادی لەنێو سەربازان دا بلاو بکاتەوە.من لەسەر ئەو باوەڕەم دیوار بەنێو چاوان کون ناکرێ.ئەوان سەرەنێزەیان بەدەستەوەیە ودەگرن ولێدەدەن.بەڵێ ئازار دەبینێ.ئیگناتیش دڵی ئازار دەدا.بەخۆڕایی فایدەی نییە.

ئیگنات بێ ئەوەی تەماشای رێبین بکا،بە تووڕەیی گوتی:ئەسڵەن وانییە.لەسەربازخانە!بیروباوەڕی دەگۆڕن و ئەویش وەك ئەوانی تر تفەنگ داوێ رێبین بە بیر کردنەوە وەڵامی دایەوە:

_نا، لام وانییە.بە لاملەگەڵ ئەوەش باشترە خۆی لەم کارە ببوێرێ.رۆسیا پان و بەرینە.کێ دەیبینێتەوە.دەبێ پسولە و پاسپۆرتت هەبێ جا دەتوانی بچیە گوندان .

ئیگنات بەچیلکەیەك لە لاقی خۆی دا و گوتی:من هەر ئەم کارە دەکەم.پیاو کەبڕیاری دا خەبات بکا،پێویستە بێ دوودڵی و بەشێلگیری وەکار کەوێ.

وتووێژ کۆتایی هات.مێش هەنگوین و ژەنگە سوورە،وەك ئینسانی پڕکار بەملاو لادا دەفڕین و وزەیان نەختێك بێ دەنگی دەشکاند.پەلەوەر دەیانخوێند.لە دوور دەنگێك دەهات و لەمەزرادا ون دەبوو.پاش تاوێك بێ دەنگی رێبین دەستی بەقسە کردەوە:

_هاورێیان دەبێ کاربکەین.....دەتانەوێ بحەسێنەوە؟تەختی سەفەریمان لە ژوورێ هەن.یاکۆڤ کەرەگەڵایان بۆ کۆبکەوە......دایە تۆش کتێبەکانم بدەیە.لەکوێن؟

دایك و سۆفیا تورەکەکانیان کردنەوە.رێبین سەری دانەواند کەتەماشایان بکا و بەخۆشییەوە گوتی:کوڵێکی سەیرت هێناوە.....بەسۆفیای گوت:تۆ لە مێژە خەریکی ئەم کارەی ؟

_دوازده ساڵه.

_باشه ناوت چییه.

_ئاننا ئیڤانۆڤا.بۆ دەپرسی؟

_هیچ،ڕەنگه زیندانیش کرابی،له زیندان دا چا هەبوو؟

_بەڵێ!

دایك بەئەسپایی و بەشێوەی سەرکۆنه گوتی:بزانه!تۆش بەتووڕەیی دەدوێنی.تاوێـك بـێ دەنـگ بـوو .پاشـان بەسته کتێبێکی وەبن هەنگەڵی دا و گوتی:لەمن تووڕە مەبه.وەرزێر وناغا وەك قەتران وئاو وان،لـه جێگایـەك کۆنابنەوە.

سۆفیا گوتی:من خانمێکی ئەعیان نیم ئینسانێکم.بزەیەکی هاتێ.

_ڕەنگه وابێ،دەچم ئەمانه دەشارمەوە.ئیگنات و یاکۆڤ لێی وەنزیك کـەوتن و دەسـتیان درێـژکرد.ئیگنـات گوتی:بەشی ئێمەبدە!

ڕێبین له سۆفیای پرسی :هەموویان یەکن؟

_نا،هەموویان یەك نین،ڕۆژنامەشیان لەگەڵه.....

_ئاخ!

هەرسێکیان له خانوەکه وەژوور کەوتن. دایك تەماشای کردن و به ئەسپایی گوتی:وەرزێر به گوڕ و چالاکه.

سۆفیا گوتی:ڕاسته ....من قەت بەژن و باڵای وام نەدیوە.دڵێی یەکێك له شەهیده مەزنەکانـه!بـا ئێمـەش بچینه ژوورێ.دەمەوێ تەماشایان بکەم....

دایك به ئەسپایی گوتی:تۆ لێی عاجز مەبه.ئەو ساویلکەیه.

سۆفیا بزەیەکی هاتێ و گوتی:نیلۆڤنا،تۆ چەند باشی.

کاتێك ئیگنات ئەو دوو ژنەی لەبەر دەرگا دیتن،سەری هەڵبڕی و خێرا چاوی لێکردن و قـامکی لـه قـژەکانی وەردان و سەری بەسەر ڕۆژنامەکەدا بەردایەوە که لەسەر ئەژنۆی بوو.

ڕێبین هەستا و ڕۆژنامەی وەبەر تیشکی هەتاو دا. بەقەڵشتی کەپرەکەی دا هاتبووە ژوور و دەیخوێندەوە.ئاکۆڤ ئەژنۆی دادابوون و سینگی به تەختەکەوە نابوو و خەریکی خوێندنـەوە بـوو.دایـك چـوو بەهێـدی لـەقوژبنێك دانیشت.سۆفیا باسکی لەشانی دایکی وەرهێنا،تەماشای دەکرد.یاکۆڤ بەئەسپایی گوتی:

_مامه میخائیل!لێرەدا جنێومان پێ دەدەن.ڕێبین ڕوی وەرگێڕا و بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

_چوونکه ئێمەیان خۆش دەوێ.ئەوانەی ئێمەیان خۆش دەوێ،بێ ئەوەی تووڕەبین،دەتوان هەموو شتێکمان پـێ بلێین .

ئیگنات چلمی هەڵلوشی و سەری هـەڵێنا و دەسـتی کـرد بەپێکـەنین.پاشـان چـاوی لـە سـەریەك دانـان و گوتی:_ئەوەتا،لێرەدا دەنووسن:"وەرزێر ئیتر ئینسان نییە"......دیارە ئینسان نییە.سێبەرێکی خـەم و خەفـەت بەسەر دەم و چاوی سادەی دا هات.

_تۆ تێگەیشتووی .وەرە نێو کەوڵی من،جا خۆت دەبینییەوە......

دایك بەسۆفیای گوت دەچم تاوێك رادەکشێم لەگەڵ هەمووی ئەم قسانە تۆزێك ماندووم.بۆنی ئـەو قەترانـەش گێژی کردووم......تۆ گێژ نەبووی؟

_نا.

دایك لەسەر قەرەوێڵەکە راکشا،زوو خەوی لێکەوت.سۆفیا لەپەنای دانیشت.مێشی لەسەرو چاوی دایك دەردە کرد و تەماشای رۆژنامە خوێنانی دەکرد.دایك بە چاوی نیوە خەواڵو ئاگای لەم بەشە بوو.

رێبین هاتە لای و پرسی:نووستووە؟

_بەڵێ.

تاوێك بێدەنگ بوو.تەماشای دەم وچاوی دایکی کرد.هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە سەرخۆ دەستی پێکرد:

_رەنگە یەکەم ژن بێ کەلەم رێگایەدا وەدوای کوڕی خۆی کەوتبێ.یەکەم ژن.سۆفیا گوتی:

_بالێرە لاچین وەخەبەری نەهێنین.

_دەبێ بچینە سەر کار.زۆرم پێخۆش بوو بتوانم لەگەڵ تۆ قسـەبکەم،بە لامدەبێ تا رۆژئاوا چـاوەڕوان بـین!بـا برۆین هاوڕێیان!

پیاوەکان هەرسێك وەدەرکەوتن و سۆفیایان بە تەنیا بەجێ هێشت .دایك لەدڵی خۆیدا دەیگـوت:سـوپاس بـۆ خوا،پێکەوە ئاشت بوونەوە.پێکەوە رێك دەکەون.لە کاتێکدا هەوای بۆن خۆشی لێرواری هەڵدەمژی ،بە ئـارامی خەوی لێکەوت.

## (٦)

ئێوارێ هەر چوار کرێکار بەخۆشی لەکار گەڕانەوە......دایك بە دەنگی ئەوان وەخەبەر هات و لەکاتێك دا زەردەخەنەی لەسەر لێوان بوو و باوێشکی دەهاتێ،لە خانوو وەدەرکەوت.بەخۆشەویستی چاوی تێبڕین و گوتی:

ئێوە کارتان کردووە و منیش وەك خانم لێی خەوتووم.

سۆفیا گوتی:بۆ تۆ باش نییە بەم درەنگە بەنێو لێڕەواردا هاتووی.هەوای لێڕەوار شێ دارە و دەبێتە هۆی تەنگە نەفەسی.بەهەناسە بڕکە وەڵامی داوە:بۆمن ئیتر باش و خراپ لە گۆڕێ دا نییە.بۆمن تەنیا مردن باش و لەبارە.

دەنگی بەزەحمەت دەبیسرا.هەموو ئەندامی لەشی پێکەوە ژانیان دەکرد.وەك لەوە بترسێ کەئەژنۆکانی دەشکێن،بەشێنەیی چۆکی نۆشتاندەوە.بەدەستێکی ئارەقی نێو چاوانی سڕییەوە.دەنگی وشك و بێ‌تین بوو.

لەو شوێنە روتەنەی نێو لێڕەواردا ئاگر هەڵبوو.لەسەروی ئاگرەکەوە سەرو چاوی خڕی نیگنات دەرکەوت.ئاگر کوژایەوە و هەموو دووکەڵیان بۆهات.سەر لەنوێ بێ دەنگی و تاریکی هەروەك گوێیان دابێتە قسەکانی ئەو نەخۆشە،کەوتنە ئەو جێگایە.

_وەك شاهیدی تاوانێکی گەورە،هێشتا دەتوانم قازانجم بۆ کۆمەڵ هەبێ.بڕواننە من،تەمەنم بیست وهەشت ساڵە.وەختە بمرم.پێش دە ساڵ بەهاسانی دوو سەد کیلۆم داویشتە سەر شانی.ئەو دەم لام وابوو بەو قەد و قەوارەیە،لانیکەم خەفتا ساڵ دەژیم.دەساڵ تێپەڕیەوە،لەمە زیاتر بڕوان ناکەم.....

ڕێبین بە ئەسپایی گوتی:ئەمە گۆرانی ئەم پیاوەیە! ئاگر سەرلەنوێ هەڵ بووەوە.سێبەرەکان دووبارە هەڵاتن.دار بێ گیان لەژێر گڕی ئاگردا قرچەی دەهات و دەینالاند.شەپۆلێکی هەوای گەرم هەوای دارەکانی دەبزاوت و خشەیان لێدەهات.پڕیشکی سووری ئاگر لە هەوا یارییان دەکردو یەکتریان لە ئامێز دەگرت.ئەستێرەکان لەئاسمان بە پڕیشکەکان پێدەکەنین و بۆ لای خۆیانیان رادەکێشان.

_ئەمە تەنیا گۆرانی من نییە،هەزاران هەزار کەسی وا هەن لە ناخی خۆیان دا ئەم گۆرانییە دەڵێن.لەدەروونیان دا دەیڵێن،چونکە نازانن کەژیانی پڕ لە هەژاری و کوێرەوەریان بۆ گەل دەرسی تەمبێ و تۆڵەیە.زۆر گیان لەبەری کەنەفت و نەقوستان هەن لەبرسان دەمرن بێ ئەوەی سکاڵا بکەن و دەنگیان لەبەر بێتە دەر.کۆکەی لێ پژا.دەلەرزی و بۆ پێشەوە خوار بووەوە.

یاکۆڤ سەتڵە"کڤاس"ێکی لەسەر مێزەکە داناو دەسکە پیازێکی شینی لەکن دانا و بە نەخۆشەکەی گوت:

_ئەمەتا ساڤێلی،شیرم بۆ هێناوی .

ساڤێلی بە نیشانەی نەویستن سەری هەڵتەکاند.یاکۆڤ باسکی گرت و تا بەردەرگای برد.

سۆفیا بەشێوەی سەرکۆنەو بە ئەسپایی بەرێبینی گوت:باشە،بۆچی هێناوتانەتە ئێرە.هەموو سەعاتان لەوانەیە بمرێ.

یاكۆڤ یاریدەی دا كەهەستێ و لەئاگر وەنزیك كەوێ.ئاگرەكە خـۆش بووبـوو .سـێبەری بـێ شـكڵ دەورەیـان دابوو،تەماشای گەمەی گڕی ئاگریان دەكرد.ساڤێلی لەسەر چوار پایەیەك دانیشت ودەستە چرچ و وشكەكانی لە ئـاگری كـرد.ڕێـبین بەنیشـارەی سـەر نەخۆشـەكەی نیشـان دا و بەسـۆفیای گـوت:ئەمـە لـەكتێبێك گـرنگ ترە....پێویستە ئەمە بزانین كاتێك مەكینەیەك باسكێك بپەڕێنێ یا كەسێك بكـوژێ.ئـەوە خـەتای مرۆڤە،بـە لامئەمە كەخوێنی مرۆڤێك بمژن و پاشان وەك كەلاكی مردار دوور فڕێی دەن،ئیتر هیچ مانی نییە....سـەرم لـە شكەنجە و ئازاردان دەرناچێ.بۆچی گەل ئازاردەدەن؟لەبـەر چـی ئێمـە هـەموان ئـازار دەدەن؟هـەر بـۆ گاڵتـەو گەپ،هەر بۆ كەیف كردن،تا لەسەر ئەم عەرزە بەكەیف بژین.تا بتوانن بەخوێنی خەڵك ئەسپ و چـەقۆی زیـو و قاپ و هەوری زێڕ وئەسباب یاری بەنرخ بۆ منداڵان بكڕن.تۆ كاربكە و پتر كاربكە،منیش بە پارە كارەكەی تـۆ دەكڕم و دیاری ئاڵتونیش بۆ یارەكەم دەدەم.

دایك گوێی دابوویەو تەماشای دەكردو جارێكی دیكەش ئەو ڕێگایـەی پاڤێـل و هەڤاڵـەكانی گرتوویانەتـە پێش لەبەر چاوی دەتروسكا و دەركەوت.

دووای نان خواردن هەموویان لەدەورەی ئاگرەكـە كۆبوونـەوە.ئاگرەكـە لەبـەر دەمـی ئـەوان خێـرا دارەكـانی هەڵدەلوشـی و دارەكـان دەسـوتان.لەپشـت سـەری ئـەوان تاریكـایی بـەری ئاسمـانی گرتبـوو،لێڕەواری داپۆشـیبوو.نەخۆشـەكە چـاوی زەق كردبـوون و تەماشـای ئاگرەكـەی دەكـرد.بـێ پسـانەوە دەكـۆكی و دەلـەرزی.دەتگـوت لـەتك و پـەتكی گیـانی كـە ناچـاربوون لەشـی بـێ گۆشـتی بـە جـێ بێڵن،لەسـینگی هەڵدەكەنـدرێن.شـەوقی ئاگرەكـە بـێ ئـەوەی كاربكاتـە سـەر پێسـتی مـردووی ،لەسـەر دەم و چـاوی سەمای‌دەكرد.تەنیا چاوەكانی دەتروسكان.

یاكۆڤ سەری بردە بن گوێی و پرسی:وادیارە پێت خۆشە بچییە ژووری؟

بەزەحمەت وەڵامی داوە:بۆچی؟نا......دەمەوێ لێرە بم.ئـیتر ئەوەنـدە لـەنێو خـەڵك دا نـاژیم.مـاوەم هێنـدە نەماوە....چاوێكی لە دەروبەری خۆی كرد،تاوێك بێ دەنگ بوو،بە زەردەخەنەیـەكی بـێ ڕەنگـەوە دەسـتی بـە قسان كرد:

_لەنێو ئێوەدا خۆم بەخۆشحاڵ دەبینم.تەماشای ئێوە دەكەم. لاموایە ئێوە تۆڵەی ئەو كەسانە دەستێننەوە كە ئازار و شكەنجە دراون و كوژراون.تۆڵەی هەموو گەل....

كەس وەڵامی قسـەكانی نەدایەوە .زوو وێژینگی هاتێ.سەری كەوتە سەر سینگی.ڕێـبین ماوەیـەك تەماشـای كردو لەسەرخۆ گوتی:

مەعنەویان لەگەڵ تەواوی گەلانی جیهان پەرەی دەسەند.لەم جیهانەدا دڵێکی تازەیان بۆ پەیدا بـوو.ئارەزوویـان بوو لەهەموو شوێنێك تێبگەن و هەموو شت لەو دڵەدا یەك بخەن. سۆفیا بـەدەنگێکی بڵنـد گـوتی:ڕۆژێـك دێ تەواوی گەلانی ژێر دەست سەر بەرز کەنەوە و هاوار بکەن:"بەسە! ئیتر ئەم ژیانەمان ناوێ!".ئـەو دەم کۆشـکی دەسەڵاتی ئەو کەسانە تێك دەڕوخێ کە بەتەماعی خۆیان پشت ئەستورن.زەوی لەژێر پێیـان دەردەچـێ و ئـیتر نازانن پاڵ وەچی بدەن....

ڕێبین هەروا کەسەری بەردابووەوە گوتی:هەروا دەبێ .سکتان بەحاڵی خۆتان ئەسوتێ،سەردەکەون.

دایـك بـرۆی زۆر هەڵکێشـا بـوون و بەزەردەخەنەیـەکی پـڕ لەسـەر سـوورمان و تووڕەییـەوە گـوێی ڕاداشتبوو.دەیدیت ئەو چالاکی و ئازایەتییەی لە سۆفیادا دیاربوو،نەماوە و دەتگوت لەگەڵ لێشـاوی قسـەکانی بوون بەئاو.بێ دەنگی شەو گڕی ئاگرو ڕومەتی جوانی ئـەو ژنـە مەسـتیان کردبـوو.لەوانـەش خۆشـتر سـەرنجی وەرزێڕەکـان بـوو.خۆیـان نـەدەبزاوت .تێدەکۆشـان بـەهیچ جـۆر وەزعـی هێـدی و هێمنـی وتووێژەکـە تێـك نەدەن.دەتگوت ترسیان لەوە هەیە ئەوەك ئەو هەودا ئاسکەی ئەوانە بەدنیاوە دەبەستێتەوە،بپسێ.یەکێك لـەوان جار و بار بڕە دارێکی دەخستە سەر ئاگرەکە.پیاوەکان دەستیان ڕادەوەشاند تا دووکەڵ و پریشکی ئـاگر بـۆ لای سۆفیا نەیە .لای بەیانی سۆفیا ماندوو بوو.بەزەردەخەنەوە تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد.

دایك گوتی:کاتی ئەوە هاتووە بڕۆین!

سۆفیا بەهیلاکی وەڵامی داوە:بەڵێ!

یەکێك لەکرێکاران هەناسەیەکی هەڵکێشا.

ڕێبین گوتی:حەیفە کە دەڕۆن.باش قسە دەکەی.ئەوە کارێکی گەورەیە کەخەڵك بکەنە خزمـی یـەکتر.کاتێـك مرۆڤ تێ دەگا کەمیلیۆنەها کەس هەر ئەوە دەخوازن کە ئێمە دەمانەوێ،دڵی خۆشـتر دەبـێ .هێزێکـی گـەورە لەخۆشەویستی دا هەیە.

یێفیم بەگورجی هەستا و بەپێکەنینەوە گوتی:بە لامکاتێك مرۆڤ بەنەرمی دەجولێتەوە بەتوند و تیژی وەڵامی دەدەنەوە!مامە میخائیـل!بـەر لـەوەی کـەس بیانبینێ،ئەمانـە دەبـێ بـڕۆن.کاتێـك کتێـب لـەنێو خـەڵك دا بڵاوکرانەوە،کاربەدەستانی دەوڵەت دەگەڕێن تا بزانن لە کوێوە هاتوون.ڕەنگەڕێبوارانیش یەکێکیان وەبیر بێتەوە و لەبارەیەوە قسەبکەن.

ڕێبین قسەکانی یێفیمی بڕی و گوتی:دایە!بۆ ئەو زەحمەتەی کێشاوەتە سوپاست دەکەین.هەر کاتێك تۆ دەبینم پاڤێلم وەبیر دێتەوە.....ڕێگایەکی باشت گرتووەتە بەر.سۆفیا هـاتبووەوە سـەرخۆ،بزەیەکی دۆسـتانەی لەسـەر

ترسە.خەڵکی لێ کۆبووەتەوە.شەمەکان هەڵدەکرێن.گەرم دادێ.پاش دەمێك تاریکایی دەڕەوێ,ماڵی خوا روناك دەبێ.

سۆفیا بەخۆشی وەڵامی داوەتراستە.بە لاملێرە ماڵی خوا تەواوی زەوییە. دایك بە بیرکردنەوە سەری راوەشاند و گوتی:تەواوی زەوی؟کەوا بوو ئەوە باشە.تەنانەت بڕواکردن دژوارە.خۆشەویستم زۆر باشت قسەکرد.زۆر باش!

سۆفیا بە ئەسپایی و بە خەمباری وەڵامی داوە:

_لەگەڵ ئەوان خواحافیزیمان کرد.......

دایك و سۆفیا دەستیان کرد بەباسی رێبین و نەخۆش و گەنجەکان کەوا بەبێ دەنگی سەرنجیان دەدا و هەستی خۆشەویستی و حەق ناسیان لەئاست ئەو دوو ژنە دەردەبڕی.گەیشتنە مەزرایە و هەتاو بۆ پێشوازییان سەری وەدەرنا.هێشتا هەتاو بڵند نەبووبوو تیشکی ئەرخەوانی بەئاسمان دا بڵاوبووبووەوە.لەنێو مێرگ و مێر غوزاردا دڵۆپەی ئاونگ وەك پریسکی رەنگا و رەنگی بەهاری ،بەسەر گیاکانەوە دەدرەوشان.پەلەوەرەکان وەخەبەر هاتبوون و بە چریکەی شادی و خۆشی,گیانیان وەبەر بەیانی دەنا.قشقەڵە بە قارە قاڕ بەملا و لادا دەفڕین.لەمەزرایەك دا کەپازی داچێندرابوو,قەلە ڕەشەو قاژو هەڵفڕ هەڵفڕیان بوو.دیمەنی دووریش وەدەردەکەوتن و بەنەمانی تاریکایی شەو بە پێشوازی هەتاوەوە دەچوون.

دایك بەبیرکردنەوە دەستی بەقسەکرد:

_مرۆڤ جارێکی تر قسەدەکا وقسە دەکا,بە لامتۆ لێی تێ ناگەی.هەتا پێی دەڵێی ئەو قسە ساکارانە چین,ئەو جارێکی تر هەمووت بۆ رون دەکاتەوە.ئەو نەخۆشەش ئاوایە .من بیستوومەو خۆشم دەزانم کەلەکارخانەو لە هەموو شوێنێك چۆن خوێنی کرێکار دەمژن.بە لامبەوە ڕادێی.ئەوە زۆر لە دڵ نادا.بە لامئەو هێندە بە فەقیری دەیگێڕێتەوە,مەگەر خوا بزانێ.بەراستی خەڵك تەواوی ژیانی کاردەکا تا ئاغا رێگای گەمە و رابواردنی هەبێ؟ئەمە دادپەروەری نییە!من خاوەن موڵکێك دەناسم وەرزێرەکانی ناچار دەکرد کاتێك ئەسپەکەیان دەبردە گوندی سڵاوی لێ بکەن.ئەو کەسانەی سڵاویان لە ئەسپەکەی نەکردایە,زینیدانی دەکردن.چ پێویستی بەو کارە هەبوو؟پیاو تێ ناگا بۆچی؟

سۆفیا بەئەسپایی گۆرانی دەگوت:دڵ شادم وەك بەیانان.....

## (٧)

ژیانی دایك بەهێدی و هێمنی رادەبوورد.بۆخۆشی لەو ئارامییە سەری سووڕمابوو.کوڕەکەی لەبەندیخانەبوو.دەیزانی سزایەکی توند چاوەڕوانییەتی.هەموو جارێ کەبیری لەوە دەکردەوە,بێ ئیختیار سیمای ئەندرێی و فێدیا مازین و پاڤێڵ و ئەوانی دیکەی دەهاتە بەرچاو .سیمای پاڤێڵ کەبۆ ئەو رەمزی سیمای

دەهات.ڕۆژ بە ڕۆژ نیکۆلای لای دایك خۆشەویست تر دەبوو.سەعاتی نۆ دەچوو بۆ ئیدارە.دایك ماڵی هەڵدەوێژارد و نانی ساز دەکرد,خۆی دەشوشت وجلی دەگۆڕی .پاشان لەژووری خۆی دادەنیشت و تەماشای وێنەی کتێبەکانی دەکرد.خوێندنەوە فێربووبوو.بە لامپاش خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەك ماندوو دەبوو.ئیتر مانای وشەکانی بۆ لێك نەدەدرایەوە,بەپێچەوانەوە,وەك منداڵێك دڵی بەتەماشاکردنی وێنەکان خۆش دەبوو.دنیایەکی تازە و سەیری دەهاتە بەر چاو کەبۆ تێگەیشتن وناسین دەبوو.شاری گەورە,کۆشکی بەرز,مەکینەو پاپۆڕ و سامانی بێ ئەژمار کەخەڵك وەسەر یەکیان ناوە و دەسکردە ڕەنگاو ڕەنگەکانی سروشتی دەدیت.ژیان بەچەشنێکی بێ پایان بەرین دەبوو.هەموو ڕۆژێ شتی تازە و نەناسرا و ئەفسانەیی بۆ دەردەکەوت.پێی خۆش بوو تەماشای کتێبی حەیوان ناسی بکا.هەرچەند ئەو کتێبە بەزمانی بێگانە نووسرابوو,بە لاموێنەکانی بەجوانترین شێوە سامان و جوانی و پان و بەرینی زەوییان نیشان دەدا.

ڕۆژێك نیکۆلای گوتی:زەوی زۆر گەورەیە.

_بەڵێ ,گەورەیە,بە لامخەڵك جێگای تەنگە.

پەلەوەرەکان و بەتایبەتی پەپولەکان سەرنجی دایکیان ڕادەکێشا.بەسەر سووڕمانەوە تەماشای دەکردن و دەیگوت:

_چەند جوانن,وانییە نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ؟لەهەموو شوێنێ ئەم جوان و خۆشەویستانە هەن.بە لاملەپێش چاوی ئێمە بزرن و بێ ئەوەی بیانبینین  بە پێش ئێمەدا تێدەپەڕن.خەڵك ئاوات و ئارەزوویان هەیە,بە لامهیچ نازانن.ناتوانن هیچ شتێکیان خۆش بوێ.چونکە نە وەختیان هەیە و نە دەیانەوێ.ئەگەر زانیبایان زەوی چەندە دەوڵەمەندە و چەندە شتی سەیری تێدایە,لەوانەبوو بتوانن خۆشییەك بۆ خۆیان پێك بێنن.هەموو شت بۆ هەموو کەس و هەموو کەسیش بۆ هەموو شت .وانییە؟

_بەڵێ وایە.نیکۆلای بەزەردەخەنەیەکەوە وەڵامی داوە وکتێبێکی بە وێنەی بۆ هێنا.

شەوانە زۆرجار میوانیان دەهات: ئەلێکسێی ڤاسیلۆڤیچ کەپیاوێکی جوان چاك,بێ قسەو مەند و هێدی بوو و ڕەنگێکی بزڕکاو ریشێکی ڕەشیشی هەبوو,دەهاتە لایان.

ڕۆمان پترۆڤیچ بە دەم و چاوێکی خڕو سووڕ کەڵە و پڕ لەڕەگ,هەمیشە بەشێوەی بەزەیی پێدا هاتن قسەی دەکرد.ئیڤان دانیلۆڤیچ پیاوێکی لاواز و بچووك بوو و ریشێت باریك و دەنگێکی ناخۆش و تیژ وەك درێشەی هەبوو.یێگۆر هەمیشە باسی خۆی و دۆستەکانی دەکرد و گاڵتەی بەوەزعی نالەباری خۆی دەکرد.هێندێ جار لەشارەکانی جۆر بەجۆر و دووریشەوە میوانی دیکەش دەهاتن.نیکۆلای هەمیشە لەگەڵ ئەوان باسی شتێکی دەکرد,باسی کرێکارانی جیهان.دەمەتەقەیان دەبوو,ناکۆکیان لێ پەیدا دەبوو,چایان زۆر دەخواردەوە.لەنێو زەنا

وان.بە لامبەوەندە نەدەحەسایەوە.دەیدیت کەکرێکاری میوان خۆی کۆدەکاتەوە و وەك لەنێو خۆیدا بەسترابێتەوە ناتوانێ بەو ساکاری و لەخۆڕادیوییە قسەی لەگەڵ بکا کەلەگەڵ ژنێکی سادەقسە دەکا.ڕۆژێك کەنیکۆڵای چووبووە دەرێ,بەکرێکارێکی گوت:

_بۆچی شەرمێ دەکەی؟چما منداڵی ئیمتیحان دەدەی؟

کرێکار بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

_ڕانەهاتووین.هەرچۆنێك بێ لەگەڵ برای خۆمان قسە ناکەین.

هێندێ جار ساشێنکا دەهات,قەت زۆر نەدەمایەوە .هەمیشە وەك کەسێکی پڕکار بە لێبڕاوی قسەی دەکرد.هەموو جارێ وەختی ڕۆیشتن لەدایکی دەپرسی:

_ پاڤێلْ چۆنە؟سلامەتە؟

_شوکر باشە!

سلاوی پێ بگەیەنە.....دەڕۆیشت.

هێندێ جار لەلای ئەو سکالای دەکرد کەبەخۆڕایی ماوەیەکی زۆرە پاڤێلیان ڕاگرتووە وکاتی موحاکمەی دیاری ناکەن.ساشێنکا نێو چاوانی تێك دەنا و بێ دەنگ دەبوو.لێوەکانی دەلەرزین و لەبەر تووڕەیی قامکی رادەوەشاندن.دایك دەیویست پێی بڵێ.

_خۆشەویستم,دەزانم خۆشت دەوێ.....دەزانم.بە لامنەی دەوێرا.وا وێ دەچوو کە کیژەکە حاشا بکا.دایك دەستی دەگوشی و لەدڵی خۆیدا دەیگوت:

_گیانەکەم!......

ڕۆژێك لە پڕ ناتاشا هات.لەوکاتەدا بە ماچ کردنی دایك خۆشحاڵ بووبەکاوەخۆ لەنێو قسەکانی دا بەدایکی گوت:

_دایکم مرد.....دایکە فەقیرەکەم کۆچی دوایی کرد.خێرا چاوی سڕینەوە و قسەکانی درێژە پێدان:

_زۆرم پەرۆشە.تەمەنی نەگەیشتبووە پەنجا ساڵ....دەکرا ماوەیەکی دیکەش بژی.بە لامکاتێك مرۆڤ لەهەموو لایەکەوە لێکی دەداتەوە,دێتە سەرئەو باوەڕە کەمردنی لە ژیان باشتر بوو.هەمیشە تەنیابوو.لای هەموو کەس بێگانەبوو.کەس پێداویستی پێ نەبوو.باوکم بەهەرا هەرای هەمیشەیی خۆی ترساند بووی.دەکرێ بڵێین ژیانی هەبوو؟....پیاو کاتێك دەیەوێ بژی کە چاوەڕوانی شتێکی باش بێ.بە لامنەو بێجگە لە سووکایەتی پێکران چاوەڕوانی هیچ شتێکی دیکە نەبوو.

دایك له دیتنی وێنەی مەسیح و لەو چیرۆكانەوە كەلە بارەی ئەو بیستبووی,دەیزانی كەدۆستی هەژاران بووە.جل و بەرگی ئاسایی كردووەتەبەر و بێ فیز بووە.بە لامنێستا دەیدیت لەكلیساكان دا مەسیح لەزێڕ و زیو گیراوە و خۆی بە ئاوریشم داپۆشیوە و لە ئاست ئەو هەژارانەی بۆ دڵ دانەوەی خۆیان دێنەلای ,خۆی گێل دەكا.قسەكانی ڕێبینی وەبیر دەهاتەوە كە دەیگوت:

_تەنانەت خواش بۆ فریودانی ئێمە بەكاردێنن.جل و بەرگی درۆو بوختانیان لەبەر كردووە تاگیانی ئێمەی پێ بكوژن.....

بی ئەوەی پێ بزانن,كەمتر نوێژی دەكرد.بە لامپتر بیری لەعیسا و لەو كەسانە دەكردەوە كە بێ ئەوەی باسی عیسا بكەن یا بیناسن,بەگوێرەی ئینجیل دەژیان و هەر وەك عیسا زەوییان بە موڵكی هەژاران دەزانی و دەیانویست تەواوی سامانی سەر زەوی,وەك یەك و بەرامبەر لەنێوانیان دا بەش بكرێ.ئەمانەی لەگەڵ ئەو شتانەی دیتبوونی لێك دەدایەوە و زۆری بیر لێ دەكردنەوە.ئەم بیركردنەوە پەرەی دەگرت ,شكلێكی نورانی لێ پەیدابوو,روناكی دەخستە سەر تاریكایی جیهان و ژیانی مرۆڤ,هەمیشە بە ئەوینێكی نادیار و هەستێكی ئالۆزەوە كەلەگەڵ ترس و هیوا و ئازار و بەزەیی تێكەڵ دەبوو,مەسیحی ناسیبوو,خۆشی ویستبوو.بە لامنێستا وای دەهاتە بەرچاو كەمەسیح خۆی گۆڕیوە و لێی وەنزیك تر دەكەوێ و بەسەفایەكی شادترەوە دێتە بەرچاوی.ئێستا چاوەكانی مەسیح بە دڵنیایی و هێزێكی زیندووی دەروونییەوە لەگەڵی پێدەكەنن,هەر دەڵێی بەڕاستی زیندوو بووەتەوە و بەخوێنی گەرمی ئەو كەسانە خۆی شوشتووەتەوە كە عاقڵ بوون وبێ ئەوەی ناوی ئەو بەرن,خۆیان لەرێگای ئەودا فیدا دەكەن.

بەمجۆرە دایك بەخۆشی و بەختەوەری,بەشادی لەو شتانەی دیتبوونی و بیستبوونی ,بەخۆشحاڵی لەوە كەئەركی خۆی بەجێ گەیاندووە,لەسەفەرەكانی دەگەڕایەوە.

شەوێك بەنیكۆڵای گوت:سەفەری ئەملاو لا و دیتنی ئەو هەموو شتە زۆر خۆشە.پیاو لەچۆنیەتی ژیان شارەزا دەبێ.كۆمەڵی دوواخراو وەلا دەنێ,لە سووكایەتی و هەژاری دا گینگڵ دەدا و بەخۆی دەڵێ:"بۆچی من دوور خرامەوە؟لەكاتێك دا هەموو شت زۆرە ,من بۆچی برسیم؟لەكاتێك دا ئەو هەموو تێگەیشتن و فام و زانستە هەیە,من بۆچی نەزان و تێنەگەیشتوو و دوواكەوتووم؟ئەو خوا مێهرەبان و مەزنە لەكوێیە كە لای ئەو دەوڵەمەند و هەژار وەك یەكن و هەموو بەندەی خۆشەویستی ئەون؟"كۆمەڵانی خەڵك وردە وردە دژی ژیانی خۆیان رادەپەڕن......هەست بەوە دەكەن كە ئەگەر فریای خۆیان نەكەون,زووڵم و زۆر دەیانفەوتێنی پتر لە جاران هەستی بەوە دەكرد كە پێویستی خۆی لە بارەی زووڵم و ژیانەوە قسەبكا.

دایك هاواری کرد:

-منیش دەچم.

نیکۆلای گوتی:

-تۆ بچۆ ماڵی بێگۆر، رەنگە ئەو خەبەری هەبێ. دایك دەسماڵێکی بەسەری دادا و بە هیوایەکی زۆرەوە پاش نیکۆلای خێرا لە ماڵێ وەدەرکەوت. چاوی کردبوونە چوار، دڵەکوتەی گرتبوو، هەر رای دەکرد. سەری بەردابووەوە، بێ ئەوەی لە دەوروبەری خۆی بڕوانێ، بە پێشەوازی دەرفەتەوە دەچوو. ئەم بیرە بۆ پێشەوە پاڵی پێوەدەنا: "دەچم و ئەویش لەوێیە".

هەوا گەرم بوو، دایك لەبەر ماندوویی پشووی دەرنەدەهات. کاتێك گەیشتە بەر دەرگای ماڵی بێگۆر راوەستا. ئیتر نەیدەتوانی بڕوا. ئاوڕی دایەوە. لەپڕ زیڕاندی. چاوی لێك کردنەوە، وای هاتە بەرچاو کە نیکۆلای ڤێسۆڤشیکۆڤ لە بەر دەرگا راوەستاوە و دەستی ناوەتە گیرفانی. بەڵام کە سەر لە نوێ چاوی گێڕان، کەسی لێ نەبوو....

"هەر خەیاڵ بوو!" لەبەر خۆیەوە گوتی. هەر وا بە گوێ هەڵخستنەوە لە پلەکانەکان سەرکەوت و لە دڵی خۆیدا گوتی: دنیای خەیاڵە! لە خوارێ لە بەردەرگایە، هەستی رۆیشتنێکی نەرمی هاتە بەر گوێ. دایك لە پێچی سەر پلەکانەکان راوەستا و تەماشای کرد. دیسان سەروچاوێکی گرۆیی هاتە بەرچاو کە پێی پێدەکەنی.

-نیکۆلای! نیکۆلای .... ئەوە تۆی؟

لە خۆشیان کەم مابوو دڵی راوەستێ. بە ئەسپایی و بە دەست راوەشاندن وەڵامی داوە: بڕۆ ..... بڕۆ.

دایك لە پلەکانەکان سەرکەوت و چوو بۆ ماڵی بێگۆر و دیتی لەسەر کەرەویتەیەك راکشاوە. بە هەناسەبڕکە لە بن لێوەوە گوتی:

-ڤیسۆڤشیکۆڤ رای کردووە.

-کێ؟ سەری هەڵێنا و بە دەنگێکی گیراو پرسی: ئەوی گرۆیێ؟ ئەوان دوو بوون.

-خۆیەتی. ئێستا دێتە ئێرە!

-زۆر باشە!

نیکۆلای وەژوور کەوت. دەرگای پێوەدایەوە و بزەیەکی هاتێ و کڵاوی لەسەر کرد و پاشان ئانیشکی وەسەر مێز دا. بێگۆر سەری هەڵێنا و بەسەر لەقاندنەوە گوتی:

-فەرموو!

-"بەم قەد و قەوارەوە زوو دەكەومە دەستی عەدالەت". لەپڕ دایك فریام كەوت، بە پەنامدا تێپەڕی. خۆمم لادا، رووم وەرگێڕا، وەدوای كەوتم...... .. ئیتر. .. .. .

دایك بەخۆیدا شكایەوە و گوتی: بڕوانە من؟ هەر ئاگام لەتۆ نەبوو. بە وردی تەماشای نیكۆلای دەكرد و لای وابوو تەواو گۆڕاوە.

ڤێسۆڤشیكۆڤ سەری خوراند و قسەكانی درێژە پێدا: بێگومان هاوڕێیان نیگەران دەبن و لە خۆیان دەپرسن دەبێ لە كوێ بێ .... .

یێگۆر گوتی: باشە پەرۆشی ژاندارمەكانت نییە؟ چونكە ئەوانیش نیگەرانن. پاشان نەخۆش دەمی لێك كردەوە و هەر وەك بخوازێ هەوا هەڵدەمژێ، لێوی بزاوتن و درێژەی پێدا:

-گاڵتە بەسە! دەبێ تۆ بشارینەوە. دیارە ئەمە كارێكی خۆشە، بەڵام زۆر هاسان نییە. .... خۆزگە توانیبام هەستابامایە سەر پێ. پشووی سوار بوو، بە ئەسپایی دەستێكی بە سینگی داهێنا.

ڤێسۆڤشیكۆڤ گوتی: یێگۆر زۆر نەخۆشی!

دایك هەناسەیەكی هەڵكێشا و بە ناڕەحەتی چاوێكی لەم لاولای ژوورەكە كرد. یێگۆر وەڵامی داوە:

-ئەو مەسەلە پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە. پورێ گیان لە روودامەمێنە، دەنگوباسی ساخ و سلامەتی پاڤێلی لێ بپرسە.

ڤێسۆڤشیكۆڤ پێكەنی و گوتی: پاڤێلْ حاڵی باشە، ساخ و سلامەتە. سەرۆكی ئێمەیە. لەلایەن ئێمەوە لەگەڵ كاربەدەستانی پۆلیس قسە دەكا. هەموو شت بە دەست ئەوە. رێزی لێدەگرن. حەقی خۆیەتی.

دایك قسەكانی گرێیی هەڵدەمژی. هێندێ جار لە بنەوە چاوێكی لە دەموچاوە ئاوساوەكەی یێگۆر دەكرد. وەك ماسكێكی نەبزووێ. زۆر پان دەهاتە بەرچاو. تەنیا چاوی زیندوو بوون و دەتروسكان. لەپڕ ڤێسۆڤشیكۆڤ گوتی:

-بەڕاستی زۆرم برسییە، خۆزگە شتێكتان دابامێ بیخۆم.

یێگۆر گوتی: پورێ گیان لە دۆڵابەكەدا نان هەیە بۆی بێنە. پاشان بچۆ لە داڵانێ لە دەستی چەپ لە دەرگای دووەم بدە، ژنێك دەرگا دەكاتەوە، بڵێ بێتە ئێرە و خواردەمەنیش چی هەیە بیهێنێ.

ڤێسۆڤشیكۆڤ وەدەنگ هات: پێویست ناكا!

-لەخۆوە خۆت ناڕەحەت مەكە، شتێكی وا نابێ. .. . . رەنگە هیچ نەبێ.

دایك رۆیشت و لە دەرگای دا. بە وردی گوێی هەڵخست و بە خەمناكی گوتی: "لە حاڵی خۆی دایە".

-ئەوە كێیە؟ لە پشت دەرگاوە پرسیان.

دەجوولایەوە. رەنگی پەڕیبوو. برۆ رەشەکانی تێکەڵ بووبوونەوە. دایك کەمێك بە فیزی دەهاتە بەرچاو، پێی خۆش نەبوو رووناکی و بزەی لە چاواندا نەدەدی. دەنگی وەك فەرماندەران دەچوو.

-دەڕۆم و زوو دەگەڕێمەوە. تۆش کەوچکێکی چێشت لەم شەربەتە بدە بە بێگۆر. مەهێڵە قسە بکا.. ..و دەرکەوت و گرۆیی لەگەڵ خۆی برد.

بیگۆر هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: چەندە ژنێکی نازدارە هەتا تەعریفی بکەی کەمە پوریْ گیان دەبوایە بچییە لای ئەو. زۆر کار دەکا. زۆر ماندووە.

دایك بە مێهرەبانی وەڵامی داوە: قسان مەکە. وەرە دەرمانەکەت بخۆ. دەرمانەکەی قوت دا و چاوی لەسەر یەك دانان:

-فایدەی چییە! قسەش نەکەم هەر دەمرم. .. .

لە کاتێکدا بزەی دەهاتیْ و لێوەکانی تۆزێك لێك دەکردنەوە، تەماشای دایکی کرد. دایك سەری بەدایەوە و هەستی بەزەیی پێداهاتن چاوەکانی تەڕ کرد. .. .

-پوریْ گیان مەگری. ئاشکرایە چێژەی ژیان تالیی مەرگیشی بەدوواوەیە.

دایك دەستی لەسەر سەری دانا و بە ئەسپایی گوتی:

-بێدەنگ بە.

چاوی لەسەر یەك دانان و هەر وەك بییەویْ گویْ بداتە خینەخینی سینگی، قسەکانی درێژە پێدان:

-بێدەنگ بوونم نەفامییە. .. . فایدەی چییە؟ تەنیا گیان کێشانم چەند دەقیقەیەك وەدووا دەکەویْ. تام و خۆشی قسەکردنیشم لەگەڵ مرۆڤێکی باش لە کیس دەچیْ. پێم وانییە لەو دنیادا مرۆڤی وا باش هەبن وەك لەم دنیایەدا.

دایك قسەکانی پیْ بڕی:

-خانم ئێستا دەگەڕێتەوە و بۆڵەبۆڵ بەسەر مندا دەکا، چونکە تۆ قسان دەکەی.

-ئەو خانم نییە. ژنێکی شۆڕشگێڕە. هاوڕێیەکە و مرۆڤێکی شەریفە. .. . بەڵام هەر چۆنێك بیْ بۆڵەبۆڵ هەر دەکا. هەمیشە بەسەر هەموو کەسدا دەبۆڵێنیْ.

بێگۆر کە بە زەحمەت لێوی دەبزاوتن، دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی دراوسێیەکەی. چاوی پێدەکەنی. دایك بە دیتنی سەروچاوی شین هەڵگەڕاوی، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: خەریکە دەمریْ!. .. .. .

لیودمیلا هاتەوە و پاش ئەوەی دەرگای پێوەدا بە دایکی گوت:

دەیتوانی لەنێو خەڵکیشدا جاسووسەکان بناسێ، بەڵام ئەو جار کەسی ناسیاوی نەدی. بەکاوەخۆ ڕێگای کۆڵانی گرتە پێش. پاشان سواری عارەبانە بوو و بە عارەبانەچی گوت: بەرەو بازاڕ لێخوڕە! دەستێك جلی بۆ ڤێسۆڤشیکۆڤ کڕی. هێندێکی جنێو بۆ مێردە ئارەقخۆرەکەی نارد کە گۆیا هەموو مانگێك دەبێ جلی تازەی بۆ بکڕێ. چەقەیەکی زۆری کرد. ئەو داستانە هیچ کاری نەکردە سەر کابرای دووکاندار، بەڵام دایك لە کارەکەی خۆی ڕازی بوو. لە ڕێگایە بە خۆی دەگوت: ڕەنگە پۆلیس پێی وابێ کە ڕاکردوو جلی خۆی دەگۆڕێ، جا لەوانەیە لەو بارەوە لە بازاڕ پرسیار بکەن. دایك چووەوەماڵی ییێگۆر و پاشان لەگەڵ ڤێسۆڤشیکۆڤ ڕووی کردە ئەو سەری شار. هەر یەکە بە بەرێکی شەقامدا دەڕۆیشتن. دایك خۆشحاڵ و سەرگەرم تەماشای نیکۆلای دەکرد کە بە لەقەلەق دەڕۆیشت و لە ئاتەگی پالتۆ درێژەکەی هەڵدەنگوت و کڵاوەکەی دەکەوتە سەر لوتی و هەڵی دەکێشایەوە. ساشێنکا لە کۆڵانێکی چۆڵ بە پێشوازیانەوە هات. دایك پاش ئەوەی بە سەرلەقاندنێك خواحافیزی لە ڤێسۆڤشیکۆڤ کرد، چووە ژوورێ. بەخەمباری بیری کردەوە: پاڤێل گیراوە. .. . ئەندرێیش هەروا. .. .. .

## (١٠)

نیکۆلای بە نیگەرانی و بە هاوارەوە پێشوازی لە دایك کرد:

-دەزانی ییێگۆر حاڵی خراپە! بردیانە نەخۆشخانە. لیودمیلا هاتبوو دەیگوت لە نەخۆشخانە بچییە لای.

-لە نەخۆشخانە؟

نیکۆلای پاش ئەوەی بە تووڕەیی چاویلکەکانی ڕێك کردن، چاکەتی بۆ دایك ڕاگرت کە بیکاتە بەری. بە قامکە وشك و گەرمەکانی دەستی دایکی گوشی و بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی:

-بەڵێ. ئەم بەستەیەش لەگەڵ خۆت بەرە. ڤێسۆڤشیکۆڤ لە جێگایەکی ئەمنە؟

-بەڵێ، وەزعی زۆر باشە. .. ..

-منیش دەچم سەر لە ییێگۆر دەدەم.

دایك ئەوەندە هیلاك بوو سەری دەسووڕا. لە نیگەرانی و پەشۆکاوی نیکۆلای دا چاوەڕوانی کارەساتێکی دەکرد. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

-دەمرێ . .. . دەمرێ. .. . ئەم بیرۆە خەفەتاوییە وەك چەکوش مێشکی دەکوتا.

-باشە، کە رۆیشتی رادەکشێم!

-دایە مەهێڵە. سەرینەکانی بۆ چاك کە. .. . تکات لێدەکەم بە تایبەتی مەهێڵە قسان بکا. قسەکردن بۆ ئەو زۆر خراپە.

دایك سەری هەڵتەکاند. دکتۆر بە گورجی وەدەرکەوت. یێگۆر سەری بە پشتەوەدا بەردایەوە و چاوی لەسەر یەك دانان و ئیتر نەبزووت. تەنیا تۆزێك قامکی دەبزاوتن. لە دیوارە سپییەکانی ئەو ژوورە بچووکەدا سەرمایەکی وشك و خەمێکی رەش هەڵدەستا. لە پەنجەرە گەورەکەوە دارە بەرزەکانی "زیزەفون" دەبینران. لە نێو گەڵا تاریك و تۆزاوییەکاندا پەڵەی زەرد دەدرەوشان.سەرمای پاییزی داهاتوو هەست پێدەکرا.

یێگۆر بێ ئەوەی ببزوێ یان چاو هەڵێنێ گوتی: مەرگ بە پەرۆشەوە بە کاوەخۆ بۆلای من دێ. وادیارە ئەوەندە کوڕێکی باش و خۆش ئەخلاقم سکی پێم دەستووتێ.

دایك بە نەرمی دەستی داماڵی و تکای لێکرد قسە نەکا.

-راوەستە، دایە گیان. .. . ئێستا بێدەنگ دەبم.

لە کاتێکدا زۆر بە زەحمەت قسەی بۆ دەهات و هەناسەی سواربوو، لەسەر هەموو وشەیەك تاوێك رادەوستا، قسەکانی درێژە پێدان:

-دایە گیان زۆر باشە کە لەگەڵ ئێمەی. .. .. . دیتنی سەروچاوت، چاوە وەریاکانت، ساکاریت، بۆ من زۆر خۆش و بەتامە. کە تۆ دەبینم لە خۆم دەپرسم: "دوارۆژ چۆن دەبێ؟" کە بیریش لەوە دەکەمەوە زیندان و دوورخستنەوە و بەڵا و کوێرەوەری چاوەڕوانی تۆ و کەسانی وەك تۆن، خەفەتبار دەبم. لە گیران ناترسی؟

-دایك بە ساکاری وەڵامی دایەوە: نا!

-ئاشکرایە. بەڵام بەو حاڵەش زیندان پیاو جاڕز دەکا. زیندان منی کوشت. ئەگەر راستییت دەوێ نامەوێ بمرم. ...

دایك دەیویست بڵێ: "لەوانەیە نەمری" بەڵام رووی لێوەرگێڕا و بێدەنگ بوو.

-دەکرا دیسانیش بە قازانجی کۆمەڵ کار بکەم، بەڵام پیاو کە ئیتر هیچ لە دەست نەیێ، ژیانی کەڵکی نییە. نەفامییە.

دایك لەپڕ ئەم قسەیەندرێی وەبیرهاتەوە: "راستە بەڵام بۆ دڵخۆشی نابێ".

هەناسەیەکی هەڵکێشا. زۆر برسی وهیلاك بوو. ورتە ورتی یەك هەوای نەخۆش ژوورەکەی پڕ کردبوو و بێ هێز لە دیوارە لووسەکان دەخشان. گەڵای دارەکان پیاویان دەخستە بیری ئەو هەورانەوە کە زۆر نەوی دەبن و بە

لەپڕ وەك مستیّ لەسەری بدەن لەخۆ چوو، کەوتە سەرچۆکان و دەستی بە چاوان گرت و هەناسەیەکی هەڵکێشا. دایك پاش ئەوەی باسکە قورسەکانی پێگۆری وەك خاچ خستە سەر سینگی و سەرە گەرمەکەی خستە سەر سەرین، لە لیودمیلا وەنزیك کەوت. چاوی سڕینەوە و دەستی بە قژە نەرمەکانیدا هێنا. ئەو ژنە بە ئارامی، چاوەکانی کە لەبەر گریان هەڵماسی بوون، بۆ لای دایك وەرگێڕا و بە لێوی لەرزۆکەوە گوتی:

-دەمێك بوو دەمناسی. کاتێك دوورخرابووینەوە پێکەوە بووین. لە زیندانیشدا پێکەوە بووین. هێندێ جار شکەنجە زۆر توند و لەتوانا بەدەر دەبوو، زۆر لە هەڤاڵان ورەیان بەردەدا. چەند کەس شێت بوون.

قینێکی توند گەرووی گرت. پاشان روومەتی خۆی کە بە رەنگی خۆشەویستی و ئازار جوان بووبوو، لە روومەتی دایك وەنزیك خست و بە ئاوازێکی توند و بە ئاخ هەڵکێشانی بێ فرمێسکەوە درێژەی پێدا:

-بەڵام هەمیشە شاد بوو. دەرد و کوێرەوەری خۆی بە ئازایەتی دەشاردەوە. بێ ئەوەی ماندوو بێ گاڵتەی دەکرد. پێدەکەنی. .. . هەمیشە هەوڵی دەدا غیرەت وەبەر ئینسانی زەعیف بنێ. ئەوەندە هێدی و باش و بەهەست بوو. ... . لە سیبریا بێکاری پیاو دەفەوتێنێ. خۆزگە دەتزانی چ هاوڕێیەك بوو. ژیانی تایبەتی خۆی پڕ بوو لە دەرد و داخ و کوێرەوەری، بەڵام دەزانم هەرگیز کەس گوێی لە سکاڵای ئەو نەدەبوو. ... . هەرگیز کەس. .. . . من دۆستێکی نزیکی ئەو بووم. .. . زۆر بە خۆشەویستی ئەو قەرزدارم. ئەوەندەی توانی لەو رەوشتەی خۆی بەشی منی دا. هیلاك و تەنیا بوو، بەڵام قەت داوای هیچی نەدەکرد، نە لاواندنەوە و نە دڵدانەوە. .. . .

لە مردووەکە وەنزیك کەوت و دەستی ماچ کرد. بە دەنگێکی سەبر و خەمبارەوە گوتی:

-هاوڕێ. .. . هاوڕێی خۆشەویستم، لە کانگای دڵمەوە مەمنوونی تۆم. خواحافیز، هەر وەك رەوشت و ئاکاری تۆ بوو، هەتا زیندووم، بێ ماندووبوون و بێ پرینگانەوە، بۆ زەحمەتکێشان کار دەکەم. خواحافیز. .. .. خواحافیز. .. ..

قینێکی توند هەموو لەشی دەلەرزاند. بە هەناسەبڕکە لە سەر قەرەوێڵە سەری هاویشتە سەر لاقی پێگۆر. دایك دەگریا. دەیویست بە لاواندنەوەیەکی تایبەتی و بەهێز دڵخۆشی لیودمیلا بداتەوە. بە قسەی نەرم و خۆش باسی پێگۆری لەگەڵ بکا. لەنێو فرمێسکەکانی خۆیدا سەیری چاوە پڕووشاو و لێوە شین هەڵگەڕاوەکانی دەکرد. هەموو شت مات و بێدەنگ بوو و رووناکییەکی دزێوی هەبوو.

دوکتۆر وەك جاران بە هەنگاوی توند و وردی هاتە ژوورێ. لە نێوەڕاستی ژوورەکە راوەستا. خێرا دەستی لە گیرفان نان و بە تووڕەیی پرسی:

پێشبینی ڕووداوێکی ناخۆش بکا، هەنگاوی توند کردن. ئازایەتییەکی خەمبارانە لە دڵیدا پەیدا دەبوو و هانی دەدا. لەگەڵ ڕۆیشتن بیری لێ دەکردەوە: "دەبێ بەرەو پێش بچین!".

## (١١)

تەواوی ڕۆژەکەی دوایی، دایك خەریکی پێڕاگەیشتنی کاروباری ناشتنی بێگۆر بوو. ئێوارێ کە لەگەڵ سۆفیا و نیکۆلای چای دەخواردەوە، لەپڕ ساشێنکا وەژوور کەوت. بە وەزعێکی سەیر و زیندوو ڕوومەتی سوور هەڵگەڕابوون. چاوی هەر دەدرەوشان. دایك وای هاتە بەرچاو کە ئەو کیژە هیوایەکی شادی بزوێنی هەیە. ئەو گیانە پڕشنگدارە، لە جەنگەی خەم و خەفەتدا وەك ڕووناکییەك بوو کە لەپڕ لە تاریکاییدا پەیدا دەبێ.
نیکۆلای بە بیرکردنەوە مستێکی لە مێزەکەدا و گوتی:
-ساشێنکا ئەمڕۆ بە جارێك گۆڕاوی!. .. .. .
ساشێنکا بە زەردەخەنەیەکی کەم و بە خۆشییەوە وەڵامی داوە: ڕەنگە!
دایك بە چاوی سەرکۆنەکردنەوە تەماشای کرد. سۆفیا وەبیری هێنانەوە: باسی بێگۆرمان دەکرد.
ساشێنکا وەدەنگ هات: چەندە پیاوێکی شەریف بوو. وانییە؟ هەمیشە بە شاد و ڕووخۆشم دیوە. .. . چەندە باشی کار دەکرد! لە کاری شۆڕشدا هونەرمەند بوو. وەك مامۆستایەکی گەورە فیکری شۆڕشگێڕانەی هەبوو. بە چ هێز و توانایەکەوە تابلۆی درۆ و ناڕاستی و زوڵم و زۆری دەکێشا.
چاوەکانی ساشێنکا پڕ لە بزەیەکی زانایانە بوون و هێدی قسەی دەکرد. ئەو بزەیە گڕی ئەو شادییەی دانەدەمرکاند کە زۆر ئاشکرا بوو و کەسیش مانای نەدەزانی. هێندێ جار هەڵدەکەوێ کە مرۆڤ لە خەمدا کەیف دەکا و بۆ خۆی دەیکاتە یارییەکی ئازاردەر کە خوێنی دڵ دەخواتەوە.
سۆفیا و دایك و نیکۆلا نەیاندەویست خەم و خەفەتەکەیان لەگەڵ ئەو شادییە لە بەین بچێ کە ساشێنکا لەگەڵ خۆی هێناوە. بێ ئەوەی تێبگەن، پشتگیرییان لە مافی خەمناکی و تازیەداری خۆیان دەکرد و هەوڵیان دەدا کچەکەش بێننە ڕیزی خۆیان.
سۆفیا بە وردی چاوێکی لە ساشێنکا کرد و گوتی: ئێستا مردووە!
ساشێنکا خێرا چاوێکی بە پرسیاری لە دانیشتوان کرد و سەری بەردایەوە. بە دەنگێکی بەرز دووپاتەی کردەوە: مرد؟ ناتوانم باوەڕ بکەم. بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. پاشان ڕاوەستا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

پیاڵەی چا لە دەستی دایكدا لەرزی و لەسەر مێزەكەی دانا. ساشێنكا برۆی تێكنان و پێشی هەڵچوونی خۆی گرت و تاوێك مات بوو. پاشان بە دەنگێكی جیددی بەڵام بێ بەزەی جاران، بە دوودڵی درێژی بە قسەكانی دا و گوتی:

-راستە ئەگەر وەزعەكە وابێ وەك ئەو دەڵێ. .. دەبێ هەوڵ بدەین. ئەركی سەرشانمانە....

سوور هەڵگەڕا، كەوتە سەر كورسی و بێدەنگ دانیشت.

دایك بە زەردەخەنەیەكەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: "خۆشەویستم. ... .. گیانەكەم". سۆفیاش زەردەخەنەیەكی هاتێ. نیكۆلاش پێكەنی و بە خۆشەویستی چاوێكی لە كچەكە كرد. ساشێنكا سەری هەڵێنا و بە شەرمەوە چاوێكی لە دایك كرد  بە رەنگی بزركاو و چاوی گەشەوە، بە ئاهەنگێكی وشك گوتی:

-پێدەكەنن، دەزانم بەچی. لاتان وایە من لەبەر خۆم حەز لە راكردنیان دەكەم. وانییە؟ سۆفیا لەرووی فیڵبازییەوە پرسی: ئەی بۆچی، ساشێنكا؟

هەستا و لە كچەكە وەنزیك كەوت. دایك ئەو پرسیارەی پێ بێ جێ بوو و بۆ ساشێنكای بە سووكایەتی دەزانی. هەناسەیەكی هەڵكێشا و بە شێوەی سەركۆنەكردن تەماشای سۆفیای كرد.

ساشێنكا گوتی: بەڵام من نامەوێ بەو كارەوە خەریك بم. ئەگەر باسی ئەم مەسەلە بكەن، ئامادە نیم لە وتووێژدا بەشدارم بم. ... .

نیكۆلای بە هێمنی گوتی: ساشێنكا بێدەنگ بە!

دایك چووە كن كیژەكە و هێدی دەستی بەسەریدا هێنا. ساشێنكا دەستی دایكی گرت و سەری هەڵێنا. خوێن دە روومەتانی گەڕابوو. بە شەرمەوە چاوی لێكرد. سۆفیا كورسییەكی هەڵگرت و لە كن ساشێنكا دانیشت و باسكی لە شانی وەرهێنا و بە زەردەخەنەوە بۆی روانی و گوتی:

-چەندە ئینسانێكی سەیری!

-بەڵێ، پێم وایە قسەكانم نەحمەقانە بوون. .. . بەڵام من خەیاڵی پووچم خۆش ناوێ.

نیكۆلای بە ئاهەنگێكی پڕكارانە و بە رێزەوە قسەكەی پێ بڕی:

-ئەگەر دەرەتانی راكردنیان هەبێ، بێگومان دەبێ ئەو كارە بكەن. بەڵام بەر لە هەموو شت دەبێ بزانین داخوا هاوڕێیانی زیندانی رازین یان نا.

ساشێنكا سەری بەردایەوە! سۆفیا سیغارەكەی تێكرد و چاوێكی لە براكەی كرد و بە فیزێكەوە شقارتەكەی هەڵكرت.

چەکێکی تریان نەبوو. ئاسمانی شینی کەمڕەنگی پاییز، کۆڵانە بەردرێژەکانی ڕووناك دەکرد. ئەو گەڵایانەی با وەراندبووی لە شەقامەکاندا دەرکەوتنە ژێر پێی ڕێبواران.

دایك کەوتبووە نێو کۆمەڵ. لەکاتێکدا خەڵکی نەناسراوی دەژمارد، بە خەمەوە دەیگوت:

-ژمارەتان زۆر نییە. .. .. . نا، زۆر نین.

دەرگا ئاسنەکە کرایەوە. تابووتەکەیان هێنا دەر کە بە تاج و ڕووپۆشی سوور ڕازابۆوە. پیاوەکان تێکڕا بە بێدەنگی کڵاویان لەسەرخۆ هەڵگرت. هەر دەتگوت پۆلێك باڵداری ڕەش لەسەر سەریان هەڵدەفڕن. ئەفسەرێکی کەڵەگەتی پۆلیس بە سمێڵی زل و دەموچاوی سوورەوە کە سەرباز و پاسەوان دەوریان دابوو، خۆی هاویشتە نێو خەڵك و بێ ئەوەی گوێ بداتە کەس، پاڵی بە خەڵکەوە نا و بە دەنگێکی فەرماندەرانە گوتی:

-تکا دەکەم ڕووپۆشەکە هەڵگرن!

ژن و پیاو دەورەیان دابوو، قسەیان دەکرد و پاڵیان پێکەوە دەنا. لەبەر چاوە ئاڵۆزەکانی دایك، سەروچاوی ڕەنگ بزرکاو و پەشۆکاو کە لێویان دەلەرزین، تێکیانەوە داویشت. فرمێسکی گەورە گەورە کە نیشانەی زەبوونی بوون، بەسەر ڕوومەتی ژنێکدا دەهاتنە خوارێ.

لاوێك کە دەنگەکەی لە نێو زەنا زەنای خەڵکدا خنکا، هاواری کرد:

_بمرێ ملهوڕی و زۆروێژی.

دایك هەستی کرد کە لە ناخی دڵیدا خەمێك دەکولێ. کابرایەکی ڕوتەڵەی لەکن ڕاوەستابوو، ڕووی تێکرد و گوتی:

-ڕێگای خەڵك نادەن تەنانەت هاوڕێشیان بە کەیفی خۆیان بنێژن.

تووڕەیی و قین پەنگی دەخواردەوە. تابووتەکە لەسەر دەستان دەڕۆیشت. با یاری بە ڕووپۆشەکە دەکردو سەروچاوی تابووت هەڵگرەکانی پێ دادەپۆشی. خشەخشی وشك و تووڕەی ئاوریشم دەبیسرا.

دایك لە پێك هەڵپڕژان دەترسا، بە ئاسپایی بەوانەی دەورووبەری خۆی دەگوت:

-گرنگ نییە، ئێستا کەوایە با ڕووپۆشەکە هەڵبگرین. دەبێ تەسلیم بین، فایدەی چییە؟..... .

دەنگێکی گڕ و بەتین بەسەر هەرا و هوریادا زاڵ بوو و لە هەوا دەنگی دایەوە:

-ئێمە دەمانەوێ لێمان گەڕێن تا ئارامگای ئەبەدی لەگەڵ ئەو هاوڕێیە بڕۆین کە زۆرتان ئازار و شکەنجە داوە.

کچێك بە دەنگێکی ناسك هاواری کرد:

-ئێوە لە خەباتدا بوونە قوربانی. .. .. .

-تکایە ئەو رووپۆشە لابەرن! یاکۆڤلێڤ لای بەرە!

خرمەی شیرهەڵکێشان هات. دایك کە چاوەڕوانی هەرایەکی دەکرد، چاوی لەسەر یەك دانان. بەڵام هەراوهوریا بێدەنگ بوو. خەڵك هاوروژا وەك گورگی راونراو ددانی گڕکردن. پاشان سەریان داخست و بێدەنگ و ناڕەحەت لە هەستی بێ هێزی خۆیان، وەڕێ کەوتن. دەنگی لاقانیان کۆڵانی پڕکرد. تابووتەکە رووپۆشی لەسەر هەڵگیرابوو و بە تاجی ژاکاو لە هەوادا دەبزووت. پاسەوانەکانیش کە بە سواری ئەسپ بەملاولادا دەلەقین، بەدووای تابووتدا دەهاتن. دایك بە بن دیواردا دەڕۆیشت و لەبەر زۆری خەڵك نەیدەتوانی تابووتەکە ببینێ. ژمارەی خۆپیێشاندەران تا دەهات زۆر دەبوو و پانایی شەقامی دەداگرت. بە دووای کۆمەڵدا قەڵافەتی وەك یەك و خۆڵەپۆتینەی سوارەکان خۆی دەنواند. پاسەوانەکان لە هەموو لایەك دەستیان لەسەر دەسکی شیرەکانیان بوو. دایك جاسووسەکانی دەدیت کە بە وردی سەرەنجی خەڵکیان دەدا.

دوو دەنگی نەرم بەرز بوونەوە:

-خواحافیز، هاوڕێ . .. . خواحافیز!

یەکێك هاواری کرد: برایان بێدەنگ. .. .. . . . ئێستا با بێدەنگ بین. ئەوەندە هەڕەشە و توندی و تێڕاخوڕین لەو دەنگەدا هەبوو کە خەڵك بە قسەی کرد. سروودی تازیە بێدەنگ بوو، هەراوهوریا دامرکایەوە. تەنیا دەنگی هەنگاوی ڕێبواران تێکەڵ دەبوو، لە هەوا گرمەی دەهات و بەرەو ئاسمانی ساف دەڕۆیشت و وەك دەنگدانەوەی هەور هەوای دەلەرزاندەوە. با، کە تا دەهات ساردتر دەبوو، بە تووڕەیی تەپوتۆزی بە دەموچاوی خەڵکدا دەدا، لە کراسی ژنان دەهاڵا و وەسینگی ڕێبواران دەکەوت.

ئەو مردووناشتنە بێدەنگ و بێ قەشە و سروودی تازییە، ئەو چڕوچاوە مۆڕ و تووڕە و داماوانە، دەنگی ئەو هەنگاوە بە ئیرادانە، هەموویان خەم و خەفەتیان لە دڵی دایکدا پێك دەهێنا، مێشکی بە زەحمەت کاری دەکرد و خەم و خەفەتی خۆی بە قسەی داخدار دادەپۆشی:

-گیانبازانی ئازادی! ژمارەتان زۆر نییە. ... .. ژمارەتان زۆر نییە و دیسانیش لێتان دەترسێن!

پێی وابوو ئەو بێگۆڕەی ئەو دەیناسێ نایینێژن، بەڵکو شتێکی ئاسایی بە خاك دەسپێرن کە لێی نزیکە و پێویستی پێی هەیە. هەستێکی دڵسووتێن و خەمهێنەر بە سەریدا زاڵ دەبوو. لەگەڵ ئەوانەی بێگۆڕیان بەڕێ دەکرد، موافیق نەبوو. بیری کردەوە:

-دەزانم بێگۆر بڕوای بەخوا نەبوو، ئەمانەش باوەڕیان پێی نییە.

بەڵام نەیدەتوانی فیکری خۆی ساخ کاتەوە. هەر وەك بییەوێ گیانی خۆی لەژێر بارێکی گران بێنێتە دەر، هەناسەیەکی هەڵدەکێشا:

-خوایە. .. . خوایە. .. . ئەی حەزرەتی مەسیح. .. .. . بڵێی منیش هەر ئاوا بنێژن؟

گەیشتنە قەبرستان و ماوەیەکی زۆر لەنێو قەبران گەڕان تا جێگایەکی چۆڵیان دۆزییەوە کە هێندێ خاچی سپی بچووکی لێبوون. خەڵك لە دەرەوەی قەبر کۆبوونەوە و بێدەنگ و ماتی دایگرتن. ئەو بێدەنگییەی خەڵك لەنێو قەبران، نیشانەی پێشهاتێکی بەترس بوو کە دڵی دایکی دەلەرزاند. لە چاوەڕوانیدا مابووەوە. با خاچەکانی رادەوەشاند و ویزەیان لێدەهات. گوڵە سیسەکان بە خەمناکی لەسەر تابووت کەوتبوون. پاسەوانەکان بە ئامادەیی بەڕێز راوەستابوون و چاویان لە ئەفسەرەکەیان بوو. لاوێکی باڵابەرز، سەر رووت و رەنگ بزرکاو، بە برۆی رەش و قژی درێژەوە، هات لە نزیك قەبرەکە راوەستا. لەپڕ دەنگی گیراوی ئەفسەری پۆلیس بەرز بۆوە.

-ئاغایان!

لاوە برۆ رەشەکە بە دەنگێکی بەرز و بەتین بانگی کرد: هاوڕێیان!

ئەفسەرەکە هاواری کرد: ئیجازە بدەن! پێتان رادەگەیەنم کە رێگا نادەم وتار بخوێننەوە.

لاوەکە بە نەرمی وەڵامی دایەوە: تەنیا چەند وشەیەك: "هاوڕێیان"! با لەسەر گۆڕی مامۆستا و هاوڕێمان سوێند بخۆین کەوا هەرگیز ئامۆژگارییەکانی لەبیر نەکەین. سوێند بخۆین کە هەموومان لە تەواوی ژیاندا، بە بێ ماندووبوون، بۆ وێرانکردن و نەهێشتنی سەرچاوەی بەڵا و کوێرەوەری نیشتیمانمان و فەوتاندنی سەرەڕۆیی تێبکۆشین.

ئەفسەر هاواری کرد: بیگرن. بەڵام تەقینەوەی هەراوهوریا نەیهێشت دەنگی ببیسرێ.

-بمرێ سەرەڕۆیی. .. .. . دیکتاتۆری!. .. .

پاسەوانەکان بە ئانیشك دڕیان بە خەڵك دا و خۆیان گەیاندە لاوەکە کە لە هەموو لایەکەوە دەورەی درابوو و هاواری کرد:

بژی ئازادی!

دایك بۆ کەنارێك رادرا. لە کاتێکدا لە ترسان بە خاچێکەوە نووسابوو، لە چاوەڕوانی لێداند چاوی لەسەر یەك دانان. گێژەڵوکەی دەنگی ناڕێك کەڕی کردبوو. عەرز لە ژێر پێیاندا دەجووڵایەوە. هاژەی با و ترس هەناسەبڕکەیان وێخستبوو. دەنگی فیکەکێشانی پاسەوانان هەوای دەقەڵاشت. نەڕەی ئەفسەری پۆلیس لە هەوا گرمەی دەهات. ژنان وەك شێتان دەیانقیژاند. باتوومی پاسەوانان لە هەوا هەڵدەسووڕا. دەنگی هەنگاوی خەڵك

لەسەر زەوی وشك تەقەی دەهات. ئەم وەزعە ماوەیەکی زۆر درێژەی هەبوو. ڤلاسۆڤا ئیتر نەیدەتوانی چاوی لەسەر یەك دابنێ. لە رادەبەدەر دەترسا. تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، قیژاندی و دەستی کرد بە راکردن. لە نزیکی ئەو شوێنە لە تەنگاییەکدا، پاسەوانان لاوە بالآبەرزەکەیان گەمارۆ دابوو. لە بەرامبەر خەڵکەکەدا کە لە هەموو لایەکەوە دایان دەهاتنێ، دەستیان دەکردەوە. شیری رووت بە تروسکەی سپی و ساردەوە لە هەوا دەدرەوشان، لەسەر سەران بەرز دەبوونەوە و توند دەهاتنە خوارێ. گۆچان و باتووم دەردەکەوتن و بەرز دەبوونەوە. هاواری کۆمەڵێ هاوروژاو وەك گێژەڵوکە لێك دەهالآ. سەروچاوی پەشۆکاوی ئەو لاوە جاروبار دەردەکەوت. دەنگی بەتینی بەسەر لافاوی تووڕەییدا گرمەی دەهات:

-هاوڕێیان! بۆچی بەخۆرایی خۆتان فیدا دەکەن؟... ... .

خەڵك قسەکەیان سەلماند. داروچۆماخەکانیان فڕێ دا و پۆل پۆل بلاّو بوون. هێزێکی تێك نەشکاو پاڵی بە دایکەوە دەنا و بەرەوپێشی دەبرد. دایك چاوی بە نیکۆلای کەوت کە کلاّوەکەی کەوتبووە پشت سەری و خەڵکی تووڕە و هاوروژاوی بۆ دوواوە پاڵ پێوە دەنا و بە لۆمە و سەرکۆنەوە پێی دەگوتن: "شێت بوون! راوەستن، هێدی بنەوە!".

دایك دەستێکی نیکۆلای بە سووری هاتە بەرچاو. بۆ لای ئەو غاری دا و بانگی کرد: نیکۆلای تێپەڕە! بۆ کوێ دەچی؟ ئێستا تووشی لێدان دەبێ.

سۆفیا شانی دایکی گرت. دایك ئاوڕی داوە دیتی بە سەری رووت و قژی پەرش و بلاّوەوە باسکی کوڕێکی مێرمنداڵی گرتووە و ئەویش بە دەست سەروچاوی ئاوساوی پاك دەکاتەوە و بە لێوە لەرزۆکەکانی دەڵێ: "بەرم دەن. .. . هیچ نییە!".

سۆفیا گوتی: ئاگات لێ بێ، بیبەوە ماڵی خۆمان. .. . ها دەسرەت دەمێ سەروچاوی ببەستە. لە کاتێکدا دەستی لاوەکەی وەدەستی دایك دەدا، ئاخرین راسپاردەی گوت و رای کرد:

-خۆش بڕۆن، دەنا دەگیرێن. .. .. .

لە هەموو لاوە خۆپێشاندەران لە قەبرستان وەدەر دەکەوتن. پاسەوان بە نێو قەبراندا راویان دەنان. لە ئاتەگی پاڵتۆکانیان هەڵ دەنگوتن و جنێویان دەدان. شیرەکانیان هەڵدەسووڕاند. لاوەکە چاوێکی هەر لەوان بوو.

دایك بە ئەسپایی گوتی: با خێرا بڕۆین. .. . دەموچاوی پاك کردەوە. خوێنەکەی سڕییەوە و گوتی:

-ناڕەحەت مەبە. .. ئازاری نییە. .. . بە دەسکی شیرەکەی لە دەموچاوی دام. .. . بەڵام منیش دارێکی چاکم لێدا، وەقوڕەم خست!

به حالێكی هاوروژاو مسته خوێناوییه‌كه‌ی هه‌ڵێنا و به ده‌نگێكی گیراو گوتی:

-راومان بنێن، هه‌ر وا نابێ. كاتێكی زه‌حمه‌تكێشان راپه‌ڕن، ئێمه بێ چنگه‌پرچه ئێوه تێك ده‌هاڕین.

-خێرابه! دایك وه‌په‌له كه‌وت و به هه‌نگاوی خێراتر رووی كرده خانووچكه‌یه‌ك كه له گومبه‌زی گۆڕستانه‌كه‌دا ساز كرابوو. پێی وابوو دوو پاسه‌وان له پشتی دیواره‌كه له نێو مه‌زرا خۆیان مات كردووه و ده‌یانه‌وێ رێگایان پێ بگرن و لێیان بده‌ن. به‌ڵام كه به ئه‌سپایی ده‌رگای كرده‌وه، دیتی چۆل و هۆله و تۆزێك هاته‌وه سه‌رخۆ.

-راوه‌سته، ئێستا برینه‌كه‌ی سه‌روچاوت ده‌پێچم.

-نایه‌وێ، پێم شه‌رم نییه، بریندارم!

دایك خێرا برینه‌كه‌ی پێچا. كاتێك قامكه‌كانی هه‌ستیان به ته‌ڕاییه‌كی گه‌رم كرد، له ترسان مچوورکێكی به له‌شیدا هات. پاشان باسكی بریندار‌ه‌كه‌ی گرت و هاتنه ده‌ر و به مه‌زرایدا به دووای خۆیدا رایكێشا. لاوه‌كه به پێكه‌نینه‌وه گوتی: هاوڕێ بۆچی رامده‌كێشی؟ خۆم ده‌توانم باش بڕۆم. به‌ڵام دایك هه‌ستی ده‌كرد كه به لادا دێ و لاقی ده‌له‌رزان. به ده‌نگێك قسه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌كرد كه به‌ره‌و كزی ده‌چوو و بێ ئه‌وه‌ی چاوه‌ڕوانی وه‌ڵام بێ پرسیاری لێ ده‌كرد.

-ناوم "ئیڤان"ه ته‌نه‌كه سازم. .. . ئه‌ی تۆ كێی؟ له شانه‌ی یێگۆردا ئێمه سێ كه‌س بووین. .. . سێ ته‌نه‌كه‌ساز. له‌سه‌ریه‌ك یازده كه‌س بووین، زۆرمان خۆش ده‌ویست. دایك له شه‌قام عه‌ره‌بانه‌یه‌كی گرت، ئیڤانی سوار كرد و به سرته گوتی:

-ئیتر بێده‌نگ به، قسان مه‌كه.

بۆ ئه‌وه‌ی ته‌واو دڵنیا بێ، دیسان ده‌سره‌كه‌ی هاویشته سه‌ر زاری لاوه‌كه. بریندار ده‌ستی بۆ ده‌موچاوی برد، به‌ڵام نه‌یتوانی لێوه‌كانی وه‌ده‌رخا. ده‌ستی كه‌وتنه سه‌ر ئه‌ژنۆی. به‌و حاڵه‌شه‌وه له‌ژێر ده‌سره‌كه‌وه ده‌ستی كرد به ورته ورت:

-من ئه‌و لێدانه‌م له‌بیر ناچێته‌وه!. ... .. له پێش یێگۆردا قوتابییه‌ك به‌ناوی "تیتۆڤیچ" ئێمه‌ی به‌ڕێوه ده‌برد، ئابووری سیاسی فێر ده‌كردین. پاشان گرتیان.

دایك ئیڤانی له ئامێز گرت و سه‌ری به سینگی خۆیه‌وه نا. له ترسان وشك ببوو. به ترسه‌وه چاوی ده‌گێڕان و لای وابوو ئێستا له هه‌موو لایه‌كه‌وه پاسه‌وانی لێ په‌یدا ده‌بن و ئیڤانی ده‌كوژن.

ئاوڕی دایه‌وه و به زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كه‌وه پرسی:

-خواردوویه‌ته‌وه؟

دایك هەناسەیەكی هەڵكێشا و گوتی: بەڵێ زۆری خواردووەتەوە!

-كورتە.

_بەڵێ، پێڵاو دوورە. .. .. . . منیش چێشتكەرم.

-كارێكی دژوارە. .. . ... . وانییە؟

قامچییەكی لە ئەسپەكەی دا و دیسان رووی وەرگێڕا و بە دەنگێكی هێدی درێژەی پێدا:

-دەزانی ئێستا لە قەبرستان پێك هەڵبڕژان بوو. یەكێك لەو سیاسییانەیان دەناشت، لەوانەی دژی حكومەتن. .. .. . هاوڕێكانی تەرمەكەیان بەرێ دەكرد. .. .. . دەستیان كردبوو بە هاوار:

"بمرێ چینی دەسەڵاتدار، خەڵك دەڕوتێنێتەوە". پۆلیس پەلاماری دان. دەڵێن لێشیان كوژراوە، بەڵام پاسەوانانیش لێیان دراوە. .. .. .

عارەبانەچی بە ساردی سەری راوەشاند و بە دەنگێكی سەیر قسەكانی درێژە پێدان:

-دەست لە مردووانیش هەڵناگرن. .. . تەرمەكانیش وەخەبەر دێنن.. .. .

عارەبانەكە بەسەر بەردەكانی سەر شەقامدا خرمەی دەهات و دەڕۆیشت. سەری ئیڤان بە نەرمی لەسەر سینگی دایك دەخزی. عارەبانەچی ئاوڕێكی لێدانەوە:

-خەڵك هاوروژاوە. .. .. . لەسەر زەوی بێ نەزمی پەیدا بووە. .. .. . بەڵێ! دووێ شەو ژاندارمە هاتبوونە ماڵی درواسێمان و نازانم تا رۆژ لەوێ چییان دەكرد. كە رۆیشتن ئاسنگەرێكیان لەگەڵ خۆیان برد. دەڵێن شەوێك بە نهێنێ دەیبەن لە چەمدا دەیخنكێنن. .. .. . ئەو ئاسنگەرە پیاوێكی ژیر و بەهۆش بوو.

دایك پرسی: ناوی چ بوو؟

-ئاسنگەرەكە؟ ناوی "سائێل" بوو پێیان دەگوت " ییڤچینكۆ". هێشتا گەنجە. زۆر تێگەیشتوو بوو، شتی دەزانی. .. . وادیارە زانین و تێگەیشتن قەدەخەن. هێندێ جار دەهاتە نێزگەی عارەبانەچییەكان و دەیگوت:

-"ئێوە عارەبانەچییەكان ژیانێكی سەیرتان هەیە". راستە، ژیانمان لە ژیانی سەگ خراپترە, بەڵێ!

دایك گوتی: رایگرە!

عارەبانە راوەستا. ئیڤان هاتەوە سەرخۆ و لەسەرخۆ دەستی كرد بە نالین. عارەبانەچی گوتی:

-ئەم كوڕە زۆر نەخۆشە. .. .. . .

نیڤان بە لاکەلاك چووە ژووری حەوشە و لە کاتێکدا بە زەحمەت هەنگاوی هەڵدێنا، دەیگوت: شتێکی وانییە. .. دەتوانم بڕۆم. ... .

## (١٣)

سۆفیا پێش ئەوان گەیشتبۆوە ماڵێ. بە حاڵێکی پەرێشان و سیغار لەسەر لێوان بە پێشوازی دایکەوە هات. بریندارەکەی لەسەر قەرەوێڵەیەك درێژ کرد و گورج سەری پێچا. لەبەر دووکەڵی سیغار مژۆڵی لێك دەدان:

-نیڤان دانیلۆڤیچ هات. .. . . نیلۆڤنا تۆ ماندووی، ترساوی. .. .. . وانییە؟ بحەسێوە. نیکۆلای زووبە چایەك و پیاڵەیەك شەڕابی پۆرتۆ بۆ دایك بێنە.

دایك کە لە بەر ئەو ڕووداوانە شێوابوو، بە زەحمەت پشووی دەهاتە دەر و لە سینگیدا هەستی بە ژانێك دەکرد. بە ئەسپایی گوتی:

-ئێوە لە خەمی مندا مەبن. ... ..

هەموو لەشی پێداویستی بە لاواندنەوەیەکی هێدی و ئاگالێبوون هەبوو. نیکۆلای لە ژوورەکەی تر هاتەدەر. پەڕۆیەکی لە دەستی هاڵاندبوو. دوکتۆر نیڤان دانیلۆڤیچ بە قژی ئاڵۆزەوە بە دوایدا هات و بۆ لای نیڤان چوو، تەماشای کرد و گوتی:

-ئاو. .. .. . خێرا ئاوێکی زۆر. .. . لۆکە و پارچەی خاوێن بێنن. .. .. .

دایك چووە چێشتخانە، بەڵام نیکۆلای باسکی گرت و بردیە ژووری نانخواردن و بە مێهرەبانی گوتی:

-دوکتۆر لەگەڵ تۆی نییە، لەگەڵ سۆفیایەتی. تۆ زۆر پەشۆکاوی. وانییە خۆشەویستم؟

دایك بە قینێکەوە کە گەروی گرتبوو و نەیدەتوانی پێشی بگرێ، وەڵامی نیگای مێهرەبانی نیکۆلای دایەوە و گوتی:

-ئاخ، چەند ناحەز بوو. .. .. . بە شیر لە خەڵکیان دەدا. نیکۆلای سەری ڕاوەشاند و گوتی: منیش لەوێ بووم. پیاڵەیەك شەڕابی گەرمی بۆ تێکرد: زۆر باسی ئەوەمان کردووە. لەوبارەوە خۆت ناڕەحەت مەکە. پۆلیس بە پانایی شیر لێی دەدات لام وایە تەنیا یەکێك زۆر بریندا بوو. لە نزیك من کەوت. لەنێو کێشەم بردە دەرێ. ... ..

دەنگ و ڕووی نیکۆلای و ڕووناکی و گەرمایی ژوورەکە دایکیان هێنابۆوە سەرخۆ. بە سوپاسەوە چاوێکی لە خانەخوێکەی کرد و پرسی:

-له تۆشیان دا؟

-لام وایه خەتای خۆم بوو. بێ ئەوەی بەوێ دەستم وەشتێك کەوت و چەرمی لێبۆوە. ... .. . شەڕابەکەت بخۆوە. هەواکەی سارده و جلەکانیشت باش نین.

دەستی بۆ پیاڵەی شەڕاب درێژ کرد و دیتی خوێن لە نێو قامکاندا مەییوە. بە ئەسپایی باسکی هاویشە سەر ئەژنۆکانی. داوێنی تەڕ بوو. بە چاوی زەق و برۆی هەڵکشاوی لە بنەوە تەماشای قامکەکانی دەکرد. سەری دەسوورا. فیکرێك وەك چەکوش مێشکی دەکوتا:

-ئاوایە. .. .. . هەر ئەم بەزمەش رۆژێك چاوەڕوانی پاڤێلّ دەکا.

دوکتۆر هاتە ژوورەوە، قۆڵی هەڵماڵیبوو. لە وەڵامی پرسیاری نیکۆلای‌دا گوتی:

_برینی دەموچاوی هیچ نییە، بەڵام سەری شکاوە. ئەویش شتێکی وا نییە. بە خۆوەیە. .. . بەڵام خوێنی زۆر لەبەر رۆیشتووە. دەیبەینە نەخۆشخانە. .. .. .

نیکۆلای گوتی: بۆچی نەخۆشخانە؟ . .. . با هەر لێرە بێ.

-باشە . .. .. . ئەمرۆ سبەی قەی ناکا، بەڵام پاشان باشترە لە نەخۆشخانە بێ. ناتوانم بێم سەری بدەم. ئامادەکردنی راپۆرتی کارەساتی قەبرستان وەئەستۆ دەگری؟

-بەڵێ.

دایك بێدەنگ هەستا و بۆلای چێشتخانە چوو. نیکۆلای بە ترسەوە گوتی:

-بۆ کوێ دەچی؟ سۆفیا بە تەنیا کارەکان دەکا.

دایك چاوێکی لێکرد و بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە:

-هەموو لەشم خوێنە. .. .. .

کاتێك لە هۆدەکەی خۆی جلەکانی دەگۆڕین، دیسان بیری لە هێدی و هێمنی ئەوانە و لەو هێز و توانایە دەکردەوە کە لە بەرامبەر کارەساتاندا هەیانە. ئەو بیرکردنەوە هێنایەوە سەرخۆ و ترسی لە دڵی دەرهاویشت. کە هاتەوە ئەو ژوورەی برینداره‌کەی لێبوو، سۆفیا سەری بەسەر نیڤاندا بەردابۆوە، پێی دەگوت:

-هاوڕێ، ئەحمەقیت کردووە.

بە دەنگێکی باریك وەڵامی دایەوە: نێوەشم زەحمەتدا.

-باشترە قسە نەکەی. بێدەنگ بە.

دایك له پشت سۆفیا راوەستا و دەستی هاویشته سەرشانی و بە زەردەخەنەیەکەوە تەماشای رەنگی زەردهەڵگەڕاوی برینداره‌کەی کرد و بۆی گێڕایەوە کە چۆن ئیڤان لە نێو عارەبانەدا قسەی دەبزرکاند. ئیڤان کە لەرزوتای هاتبۆیە و چاوی سوور هەڵگەڕابوون، گوێی دەدایە. ددانی لێك دەدان و جاروبار بە شەرمەوە دەیگوت: ئاخ، چەند ئەحمەقم.

سۆفیا لێفەی پێدادا و گوتی: باشە، ئێمە بەجێت دێڵین، بحەسێوە!

هەردووکیان چوونە ژووری نان خواردن و لەوێ لەگەڵ دوکتۆر و نیکۆلای ماوەیەکی زۆر لەبارەی رووداوی رۆژ وتووێژیان کرد. وەك باسی کارەساتێکی دوور بکەن کە هێشتا روویننەداوە، بە دڵنیایی دەیانڕوانییە دوارۆژ و خۆیان بۆ کاری بەیانی ئامادە دەکرد. هەرچەندە بە رەنگ و روو هیلاك و ماندوو بوون، بەڵام بیر و هۆشیان گورج و لەسەرخۆ بوو. دوکتۆر بە توورەیی لەسەر کورسی دەجووڵایەوە و هەوڵی دەدا دەنگی بچووك بو باریکی زل بکا و دەیگوت:

-بەیاننامە. .. .. . بەیاننامە! ئیتر ئەمە بەس نییە؟ کرێکارە لاوەکان حەقیانە، دەبێ لە چوارچێوەیەکی بەرینتردا جموجۆڵ پێك بێنین. .. . دەڵێم کرێکاران حەقیانە!

نیکۆلای بە خەمناکی وەڵامی دایەوە:

-لە هەموو شوێنێك لەبەر نەبوونی کتێب هاواریانە. ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە چاپخانەیەکی باش دامەزرێنین. لیودمیلا هێزی لەبەردا نەماوە. ئەگەر چەند هاوکارێکی بۆ پەیدا نەکەین، بەم زووانە نەخۆش دەکەوێ.

سۆفیا گوتی: ڤێسۆڤشیکۆڤ چۆنە؟

-ناتوانێ لە شاردا بژی. لە چاپخانەی تازەدا کار دەکا، بەڵام هێشتا یەکێکمان کەم دەبێ.

دایك لەسەرخۆ پێشنیاری کرد: من بۆ ئەم کارە باشم؟

هەر سێك هەڤاڵ تۆزێك رامان. لەپڕ سۆفیا هاواری کرد: فیکرێکی باشە!

نیکۆلای بە دەنگێکی وشك گوتی: نا. .. .. . دایە. .. .. . ئەم کارە بۆ تۆ زۆر گرانە. دەبێ بچی لە دەرەوەی شار بژی. لەو حاڵەتەدا ناتوانی چاوت بە پاڤێل بکەوێ و بە گشتی. .. .. .

هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: ئەم مەسەلە بۆ پاڤێل بێ بەشییەکی گەورە نابێ و بۆ منیش هەروا. ئەو چاو پێکەوتنانە دڵم بریندار دەکەن. ناهێڵن باسی هیچ بکەین. کوڕەکەم لای وایە من نەفامێکم. .. .. . هەمیشە ئاگایان لێمانە. .. .. .

لە ڕووداوەکانی ئەم دواییە ماندوو ببوو، ئێستاکە مەسەلەی لەشار دوورکەوتنەوەی بۆ هاتبووە پێش، بەهەموو هێزێکەوە لەسەری سوور بوو.

نیکۆلای باسەکەی گۆڕی و لە دوکتۆری پرسی:

-بیر لە چی دەکەیەوە؟

-بیر لەوە دەکەمەوە ژمارەمان کەمە. پێویستە شێلگیرتر کار بکەین. دەبێ ئەندرێی و پاڤێل ڕازی بکەین رابکەن. هەردووکیان لەوە بەنرختن کە بێکار بن.

نیکۆلای نێوچاوانی تێك نا و بە دڕدۆنگی سەری لەقاند. چاوێکی لە دایك کرد. دایك زانی کە لە لای ئەو بە شەرمەوە باسی کوڕەکەی دەکەن.

وەدەرکەوت و کەمێك لەو کەسانە تووڕە بوو کە ئەوەندە بە تەنگ ئاواتەکانییەوە نین. راکشا و بە چاوی ئاوالّەوە، لە کاتێکدا سرتەسرت بۆ ئەو وەك لای لایە بوو، کەوتە ژێر باری نیگەرانی و پەشێویەوە. ئەو ڕۆژەی تێپەڕیبوو، لەلای ئەو پڕ لە نیشانەی هەڕەشە بوو. بەڵام ئەو چەشنە بیرکردنەوە بۆ ئەو دژوار بوو. ئەو شتانەی لە مێشکی خۆی دەرهاویشت و کەوتە بیر پاڤێل. دەیویست بە ئازادی بیبینێ، بەڵام هەر لەو کاتەشدا دەترسا. هەستی دەکرد کە هەموو شت لە دەوروبەری ئالۆزە و وەزع تا دێ شپرزەتر دەبێ و پێك هەڵپڕژانی توند ساز دەبن. سەبر و حەوسەڵەی خەڵك جێگای خۆی دەدا بە تووڕەیی و یاخیبوون. بە ئاشکرا تووڕەیی زیاتر دەبوو. قسەی توندوتیژ لە هەوا دەنگیان دەدایەوە. لە هەموو لاوە شنەبایەکی تازە، شنەبای هاندان، هەڵی کردبوو. لە بازاڕ، لە دووکانان، لە نێو پیشەساز و نۆکەراندا و لە هەموو شوێنێك، لە بارەی هەموو بەیاننامەیەکەوە قسە دەکرا. هەموو گرتنێك لەنێو خەڵکدا مەترسی ساز دەکرد و جاری وا هەبوو لەخۆوە دڵسۆزی خەڵکی دەجووڵاندەوە. لە هۆیەکانیان دەکۆڵینەوە. دایك زیاتر لە جاران دەیبیست کە خەڵك هێندێ قسەی ئەوتۆ دەکەن کە لە پێشدا ئەو لێیان دەترسا. وشەی "سۆسیالیست، سیاسەت، شۆڕش" یان بە گاڵتە دووپاتە دەکردەوە، بەڵام ئەو گاڵتەیە ئەوەی نەدەشاردەوە کە پێویستە فێریان بن. بە تووڕەیی قسەیان دەکرد، بەڵام ئەو تووڕەییە ترسیشی لەگەڵ بوو. ئەم وشانەیان بە بیرکردنەوە و بە ڕەنگی هیوا و هومێدەوە بە زماندا دەهات. هاوروژان و ئالۆزی بە کاوەخۆ و بە چەشنێکی هەراو، بە نێو ژیانی وەستاو و تاریکدا بڵاو دەبۆوە. بیری خەوتوو وەخەبەر دەهاتن، ئیتر لەبارەی ڕووداوی ڕۆژانەوە بە هێدی و هێمنی قسە نەدەکرا دایك بەم نوکتەیە لە هەڤاڵەکانی روونتر تێدەگەیشت، چونکە لە دیمەنی خەفەتباری ژیان پتر شارەزا بوو و لێی نزیکتر دەبوو. دەیزانی کە خەڵك تینووی شتێکن. شاد دەبوو. هەر لەو کاتەشدا دەترسا. شاد دەبوو چونکە تەواوی ئەو

کارانەی بە هی کوڕەکەی خۆی دەزانی. دەشترسا چونکە دەیزانی کە لە زیندان بێتەدەر، لە شوێنی هەرە بەترسدا سەرۆکایەتی هاوڕێیانی وەئەستۆ دەگرێ و لەوانەیە تێدا بچێ.
دایك زۆرجار هەستی بەوە دەکرد کە بیروباوەڕێکی مەزن، ئەوەی بۆ مرۆڤایەتی پێویستە، لە مێشکیدا شەپۆل دەدا و دەیزانی کە پێویستی بەوە هەیە کە لە بارەی حەقیقەتەوە قسە بکا. بەڵام قەت بەو ئاواتە نەدەگەیشت. بیرکردنەوەی ئاڵۆز هەراسان و کەڕ و لاڵی دەکرد. هێندێ جار دیمەنی کوڕەکەی وەك قەوارەی دێو مانەندی قارەمانی ئەفسانەیی دەهاتە بەرچاو تەواوی ئەو قسە راستانەی بیستبوونی، تەواوی هەست و بەزیی و ئەو شتە مەزن و پیرۆزانەی دەیناسین، لە کوڕەکەیدا کۆ دەکردنەوە. پاشان بە تاسە و حەزەوە تەماشای سیمای کوڕەکەی دەکرد و بە سەربەرزی و هیوا و هومێدەوە بە خۆی دەگوت: "وەزع زۆر باش دەبێ. .. . باش!".
خۆشەویستی دایکانەی گوڵی دەکرد و دڵی وەها دەگوشرا کە نزیك بوو خوێنی لێ بێ. بەڵام ئەو خۆشەویستییە دەبوو بە کۆسپی پەرەگرتنی ئەوینی مرۆڤایەتی و ئەو وێنەی دەسووتاند و ئیتر لە جیاتی ئەو هەستە گەورە، بێجگە لە فکرێکی خەفەتاوی و ترسەنۆك هیچی دیکە نەدەما و دەیگوت:
-"دەکەوێ. .. .. .. . هیلاك دەبێ. .. ."

## (١٤)

نیوەڕۆ لە ئیدارەی زیندان لە بەرامبەر پاڤێڵ دانیشتبوو. بە چاوێکی تەماوی و نیگەرانەوە تەماشای سەروچاوی مووداوی و ریشی هاتووی پاڤێڵی دەکرد. کاغەزەکەی توند لە نێو قامکان گرتبوو، لە دەرفەتێك دەگەڕا کە بتوانێ بیداتێ.
پاڤێڵ لەسەرخۆ گوتی: ئێمە هەموومان سلامەتین! تۆ چۆنی؟
-باشم. .. .. .. . یێگۆر ئیڤانۆڤیچ مرد!
پاڤێڵ بە ئەسپایی سەری بەردایەوە و لەسەرخۆ گوتی: بەڕاستی؟
دایك قسەکەی درێژە پێدا:
-کاتی ناشتنی پۆلیس هاتن. بوو بە شەڕ و لێدان. خەڵکیان گرت.
بەڕێوەبەری زیندان بە توندی وەدەنگ هات و نەڕاندی:

-باسی ئەم قسانە مەکەن. قەدەخەیە. خۆتان باش دەزانن قسەی سیاسی قەدەخەیە. دایك هەستا و وەك یەکێك کە لە سەر حەق بێ، وەك داوای لێبوردن بکا، گوتی:

-قسەی سیاسیمان نەدەکرد. باسی شەڕ و پێك هەڵپڕژان بوو.

بەڕاستی لێکیان دا، تەنانەت یەکێکیش سەری شکا.

-فەرقی نییە، تکایە باسی ئەم قسانە مەکەن. یانی ئەوەی پەیوەندی بە خۆتان و خاوخێزانتانەوە نەبێ، باسی مەکەن. بێدەنگ بن. کاتێك هەستی کرد روونکردنەوەکەی بەس نییە، دانیشتەوە و کاغەز و نووسراوەکانی کۆکردەوە و بە تووڕەیی گوتی: من بەرپرسم.

دایك تەماشایەکی کرد و نووسراوەکەی دا بە پاڤێلْ و هەناسەیەکی پڕ لە حەسانەوەی هەڵکێشا:

-بەڕاستی نازانم باسی چی بکەم.

پاڤێلْ زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی: منیش هەروا!

بەڕێوەبەری زیندان بە تووڕەیی گوتی: کەوابوو چاوپێکەوتنتان کەڵکی نییە. نازانن باسی چی بکەن و دێن ئێمە زەحمەت دەدەن.

دایك تاوێك بێدەنگ بوو. پاشان پرسی: کەی موحاکەمە دەکرێی؟

-ئەو رۆژانە دادخوا هات و گوتی: بەم زووانە.

قسەی ئاسایی دەکران. دایك دەیدیت کە پاڤێلْ بە خۆشەویستی تەماشای دەکا. نەگۆڕاوە. هەر ئاوا هێدی و لەسەرخۆیە. تەنیا ریشی زۆر هاتووە و پیر دیار دەدا. جومگەی دەستی سپیتر بووە. دایك ویستی باسی ڤێسۆڤشیکۆڤی بۆ بکا و نەختێك دڵخۆشی بکا، بێ ئەوەی دەنگی بگۆڕێ، هەر بەو شێوەیە کە قسەی ئاسایی دەکرد گوتی:

_ئاولێنەری تۆم دیت.

پاڤێلْ بە شێوەی پرسیار چاوی لە دایك بڕی. دایك بۆ ئەوەی دەموچاوی گرۆێی ڤێسۆڤشیکۆڤ نیشان بدا ـ بە سەری قامك روومەتی خۆی دەکوتا.

-حاڵی باشە. کوڕێکی بەهێز و بە وەریە. بەم زووانە دەست بەکار دەبێ. لە بیرتە هەمیشە کاری دژواری دەکرد. پاڤێلْ تێگەیشتبوو، سەری بۆ لەقاند و لە کاتێکدا بزەی شادی، چاوی گەش دەکردنەوە، وەڵامی داوە:

-بەڵێ لەبیرمە!

-باشە!. .. .. هەر ئەوەندە. .. .. .

دایك لە خۆی رازی بوو، شادی کوڕەکەی کاری تێکردبوو. کاتێك ویستی بڕوا، پاڤێلّ توند و گەرم دەستی دایکی گوشی:

-دایە سوپاس!

نەشەیەکی وەك سەرخۆشی سەری دایکی گرتبوو. دڵی کوڕەکەی لە نزیك دڵی خۆی دەدیت. نەیتوانی بە قسە وەڵامی بداتەوە. تەنیا بە بێدەنگی دەستی گوشی.

کە گەڕایەوە ماڵێ، ساشێنکا لەوێ بوو. ئەو کیژە فێرببوو ئەو رۆژانە دەهات کە دایك دەچووە بەندیخانە. قەت لە بارەی پاڤێلەوە هیچی لەدایك نەدەپرسی. ئەگەر خۆی باسی کوڕەکەی نەکردبایە، ساشێنکا تەنیا تەماشای دەکرد وهیچی نەدەگوت. بەڵام ئەو رۆژە بە نیگەرانییەوە پرسیاری لێکرد:

-باشە، چ دەکا؟

-حاڵی باشە.

-نامەکەت دایە؟

-بەڵێ.

-خوێندیەوە؟

-نا، چۆن دەیتوانی بیخوێنێتەوە!

ساشێنکا لەسەرخۆ گوتی:

-راستە لەبیرم نەبوو. با حەوتوویەکی دیکەش راوەستین. بیرورِای تۆ چییە؟ بلێی موافیق بێ؟ چاوی لە دایك کرد.

دایك لە وەڵامدا گوتی: نازانم. .. .. . لام وایە موافیق بێ. بۆ لە زیندان رانەکا؟ خۆ مەترسی تێدانییە.

ساشێنکا سەری لەقاند و بە دەنگێکی نەرم پرسی:

-نازانی چی بدەین بە نەخۆشەکە؟ برسییەتی.

-دەکرێ هەموو شتێکی بدەینێ. .. .. هەموو شت. .. . هەر ئێستا.

چووە چێشتخانە و ساشێنکاش بە کاوەخۆ وەدووای کەوت: دایك داهاتەوە تا قابڵەمە هەڵگرێ. ساشێنکا بە ئەسپایی گوتی:

-راوەستە.

کچەکە رەنگی پەڕیبوو. چاوی لە خەفەتان زەق ببوون. بە لێوی لەرزۆکەوە گوتی:

-دەمویست پرسیارت لیّ بکەم. .. .. . دەزانم نایەویّ رابکا. تۆ غیرەتی وەبەر بنیّ، بلّیّ لێرە بۆ نێمە پێویستە. .. . ناتوانین دەستی لیّ هەلّگرین. .. .. . دەترسم نەخۆش بکەویّ. زۆرم ترس هەیە. .. . دەزانی هێشتا رۆژی موحاکەمەی دیاری نەکراوە.
بە زەحمەت قسەی بۆ دەکرا. زۆری بۆ خۆی دەهێنا کە قسە بکا. تەماشای دایکی نەدەکرد. دەنگی وەك سیمێك کە بیکێشن و لەپڕ بپچڕیّ، یەکسان نەبوو. پێڵوی چاوانی داکەوتبوون، لیوی خۆی دەگەزین و قامکی دەشکاندنەوە.
دایك لەو پەشێوی و داگیرساوییە سەری سووڕمابوو، بەلاّم تێگەیشت. زۆر بە پەرۆشی و خەمناکی ساشێنکای لە ئامێزی گرت و لەسەرخۆ وەلاّمی داوە:
-کوڕی من تەنیا هەر بە قسەی خۆی دەکا. گویّ ناداتە قسەی کەس.
تاوێك لە ئامێزی یەکتردا مات بوون. پاشان ساشێنکا بەنەرمی لە ئامێزی دایك هاتە دەر و بە لەرزەوە گوتی:
-ئەمە بە جێی خۆی، بێنە خواردن بدەین بە بریندارەکە.
پاشان لە بن سەری نیڤان دانیشت و بە دەنگێکی دۆستانە پرسی:
-سەرت زۆر دێشیّ؟
-نا، ژانی زۆر نییە. تەنیا هەموو شت لە بەرچاوم لێڵە. بیّ تاقەتم.
لە شەرمان لێفەکەی تا چەنەگەی هەلّکێشا. هەر وەك تیشیك رۆژی لە چاوانی چەقیبیّ، مژۆڵی لێك دەدان. ساشێنکا کە هەستی کرد نیڤان شەرم دەکا لای ئەو نان بخوا، لە ژوورەکە وەدەرکەوت. نیڤان سەری هەلّبڕی و سیلەی چاوی دایە و بە مژۆلّ لێکدان گوتی:
-چەند جوانە!
نیڤان چاوەکانی گەورە و گەش و ددانی پڕ و ورد و دەنگی هێشتا گڕ بوو. دایك لێی پرسی:
-تەمەنت چەند ساڵە؟
-حەڤدە سالّ.
-دایك و بابت لە کوێن؟
-لە گوندی دەژین. .. .. . حەوت ساڵە لێرەم. کە لە مەدرەسە هاتمە دەر، ئیتر گوندم بەجیّ هێشت. باشە ئەدی هاوڕیّ تۆ ناوت چییە؟
کاتێك هاوڕێیان پێدەگوت، دایك پێی خۆش دەبوو و کاری تێدەکرد. بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

-ناوی منت بۆ چییە؟

لاوەکە پاش تاوێك بێدەنگی بە شەرمەوە ڕوونی کردەوە:

-بزانە، قوتابییەك لە شانەی ئێمە، یانی ئەو کەسەی کتێبی بۆ دەخوێندینەوە، زۆر باسی دایك پاڤێلۆ ڤلاسۆڤ، ڕێکخەری خۆپێشاندانی هەوەڵی مانگی ئەیار، ئەو ڤلاسۆڤە شۆڕشگێڕەی بۆ دەکردین.

دایك سەری دەلەقاند و گوێی بۆ ڕاگرتبوو. لاوەکە بە شانازیکردن درێژەی پێدا:

-ئەو هەوەڵین کەسێکە کە ئالآی ئێمەی بەرز کردەوە!

شانازی کردنی ئەو، کاری کردبووە سەر دایکیش.

-من لەوێ نەبوو. ئێمەش خەریك بووین لێرە خۆپێشاندان ساز کەین. سەرنەکەوتین. ژمارەمان کەم بوو. بەڵام ئەمساڵ وانابێ، دەیبینی!. .. .

لە بیری ڕووداوەکانی داهاتوودا دڵخۆش دەبوو. لە خۆشیان هەناسەی سوار ببوو. کەوچکەکەی ڕاوەشاند و گوتی:

-بەڕاستی باسی دایکی ڤلاسۆڤم دەکرد. پاش ئەوەی کوڕەکەیان گرت، ئەویش بوو بە ئەندامی حیزب. دەڵێن پیرەژنێکی سەرەنجراکێشە.

دایك پێکەنی. لە کاتێکدا پێی خۆش بوو، تۆزێکیش ناڕەحەت بوو. خەریك بوو بڵێ من دایکی ڤلاسۆڤم، بەڵام گێڕایەوە و بە خەفەت و گاڵتە بەخۆکردنەوە لە دڵی خۆیدا گوتی:

-ئای چەند پیرێکی خەرفاوم. .. .. .

بۆ لای کوڕەکە خوار بۆوە. لە پڕ بە داگیرساوی گوتی:

-نانەکەت بخۆ. .. . زوو چا ببەوە تا وەدووای کارەکانت بکەوی. دەرگا کرایەوە و سەرمایەکی شێداری پاییزی هاتە ژوور. سۆفیا بە خۆشحاڵی و بە کولمەی سوورەوە وەژوور کەوت:

-بەشەرەف جاسووسەکان وەك عاشقێکی وەدووای کچی دەوڵەمەندێك بکەوێ، ئاوا وەدووام دەکەون. دەبێ لێرە بڕۆم. باشە نیڤان چۆنی؟ باشی؟ پێلاگێیا! پاڤێل چی دەگوت؟ ساشێنکا لێرەیە؟

لەکاتێکدا سیغاری دادەگیرساند، بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێ پرسیاری دەکرد. بە سیلەی چاوانی دایك و نیڤانی هەڵدەنا. دایکیش تەماشای سۆفیای دەکرد و لە بنەوە زەردەخەنەی دەهاتێ و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

-ئێستا منیش دەبمە ئینسان. .. . ئینسانێکی باش!

دیسان سەری بە سەر نیڤاندا بەردایەوە و گوتی:

_کوڕی من زووتر چاك ببەوە!
ڕۆیشتە ژووری نانخواردن. لەوێ سۆفیا بە ساشێنکای دەگوت:
-هێشتا هیچ نەبووە، ئەو ژنە سێ سەد نووسخەی ئامادە کردووە. ئەوەندە کار دەکا خۆی دەکوژێ. .. .. . زۆر نازایە. .. .. . دەزانی ڕابواردن لە نێو ئەو جۆرە کەسانەدا و کارکردن لەگەڵیان و دۆستایەتیان بۆ من شانازییەکی گەورەیە. .. .. .
ساشێنکا لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە: بەڵێ.
کاتی ڕۆژئاوایە سۆفیا گوتی: دایە پێویستە تۆ سەفەرێکی دیکەش بکەی .
-بە خۆشییەوە. ئامادەم. دەبێ کەی بڕۆم؟
-سێ ڕۆژی تر. .... .. . باشە دەتوانی؟
-بەڵێ. .. .. .
نیکۆلای بە ئەسپایی ئامۆژگاری کرد:
-نابێ بە پێیان بچی. ئەسپەکانی پۆستە بە کرێ بگرە و بە ڕێگایەکی دیکەدا بڕۆ. بەو ڕێگایەی بە ناوچەی "نیکۆلسکی"دا تێدەپەڕێ.
بێدەنگ بوو. بە چەشنێك دەموچاوی تێك نابوو کە هیچ لێی نەدەدوەشایەوە. گنجێکی سەیر و ناحەزی لە رووومەتی دەبینرا.
دایك گوتی: ئەو ڕێگایە زۆر دوور دەکەوێتەوە. بێجگە لەمەش ئەسپ بە کرێگرتن زۆر گرانە.
نێکۆلای قسەکەی درێژە پێدا:
-بزانە. بەگشتی من دژی ئەو جۆرە سەفەرانەم. ئەو ناوچەیە شێواوە. خەڵکیان گرتووە. مامۆستایەکیشیان گرتووە. دەبێ ئاگات لە خۆت بێ. باشترە کەمێك ڕاوەستین.
دایك بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: حەی حەی! بەم حاڵەش دەڵێی کە لە زیندان شکەنجە نادەن؟
سۆفیا کە لەو کاتەدا پیانۆی لێدەدا، گوتی:
-بۆ ئێمە زۆر گرنگە کە بە بێ وچان بەیاننامە و چاپکراوەکان بلاو بکرێنەوە.
لەپڕ گوتی:
-دایە تۆ ناترسی کە بۆ ئەو ناوچەیە بچی؟
دایك تێکچوو و وەڵامی دایەوە:

-من قەت ترساوم؟ تەنانەت جاری هەوەڵێش نەترسام. .. . و ئێوە. ... .. .

بێ ئەوەی قسەکانی تەواو بکا سەری بەردایەوە. کاتێك لێیان دەپرسی کە داخوا دەترسێ، یان دەتوانێ فلان کار بکا، پێی هاسانە یان نا، هەستی دەکرد کە کارێکیان لێدەوێ، بەڵام دەیانەوێ لە خۆیانی دوور بخەنەوە و ئەو جۆرەی پێکەوە دەبوونەوە، لەگەڵ ئەو نابزوونەوە.

کاتێك رووداوی گرنگتر بەسەردا هاتن، لە سەرەتاوە لە خێرایی پەیدابوونی کارەسات بو خەم و خەفەتی زۆر، دەترسا. بەڵام زۆر زوو لەژێر تەئسیری ئەو بیروباوەڕەدا کە بە سەریدا زاڵ ببوو، دڵی تینوی کارکردن دەبوو. ئەمڕۆش ناوای لێهات. پرسیارەکەی سۆفیای زۆر پێ ناخۆش بوو. هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

-بەخۆڕایی ئێوە لە منتان پرسی دەترسی یان نا؟ ئێوە لە یەکتر ناپرسن لە چی بترسم؟

نیکۆڵای خێرا چاویلکەکەی هەڵگرت و لەولای دانا و چاوێکی لە خوشکی کرد. بێدەنگییەك کە ناڕەحەتی لێوە دیار بوو، دایکی هاوروژاند. بە شەرمەوە لە سەر کورسی هەستا خەریك بوو قسە بکا، بەڵام سۆفیا هێدی دەستی گرت و بە ئەسپایی تکای لێکرد:

-لێم ببوورە. جارێکی تر پرسیاری واناکەم.

دایك بەم بەڵێنەی سۆفیا پێکەنی. پاش چەند دەقیقە هەر سێك بە خۆشی، بەڵام بە نیگەرانییەوە، لە بارەی سەفەر بۆ گوندی قسەیان دەکرد.

## (١٥)

لەگەڵ تاریك و روونی بەیانی، دایك بە سواری عارەبانەیەك، بە رێگادا دەڕۆیشت کە بە بارانەی پاییز تەڕ و قوڕاوی ببوو. بایەکی شێداری دەهات و پڕیشکە قوڕی بەملاولادا دەدا. کابرای پۆستەچی لەسەر قەراخێکی عارەبانە دانیشتبوو، رووی لە دایك کردبوو و بە گنەگن سکاڵای دەکرد:

-بە براکەمم گوت وەرە با میراتەکەمان بەش بکەین. دەستمان کرد بە بەش کردن.

لەپڕ قامچییەکی لە ئەسپەکەی دەستی راستدا و توند تێیەوە خوڕی:

-حەیوانی بەدبەخت دەڕۆی یان نا؟

قەلەرەشەی قەڵەوی پاییز لە مەزرای رووتدا هەڵفڕیان بوو. با بە هاشە هاش بە پیریانەوە دەهات. تەنیشتیان دەبای کرد. بایەكی توند تووكی هەڵدەدانەوە و قنەقنی پێ دەكردن. پاشان لە بەرامبەر هێزی بادا، دایاندەنەواند و لە شەقەی باڵیان دەدا و هەڵدەفڕین.

پۆستەچی قسەكانی درێژە پێدان: ئاخرەكەی دەركەوت فێڵی لێكردم. .. . دیتم چار نییە.

ئەو قسانە بۆ دایك وەكو خەون وابوون، فیكرێكی تاریكیان دەخستە دڵی دایك و هێندێ رووداوی ساڵەكانی دوایی وەبیر دەهاتەوە. لەپێشدا لای وابوو كە دیار نییە ژیان لەكوێ پەیدا بووە، بەڵام ئێستا زۆر شت لەبەرچاوی خۆی و بە یارمەتی خۆی جێبەجێ دەبوون. هەستێكی بۆ دەهاتە پێش نەیدەزانی چییە. ئەو هەستە سەر لێشێواوی، خەم، خۆشی، دڵنیایی و بێ بڕوایی لەگەڵ بوو. هەموو شتێك لە دەوروبەری ئەو بە جووڵانەوەیەكی هێدی دەلەرزییەوە. هەوری بۆر و چڵكن بە ئارامی بە ئاسماندا دەگەڕان و وەپێش یەكتر دەكەوتن. لەم بەراوبەری رێگا دارە تەڕەكان كە لقی رووت و بێ گەڵایان دەبزووت، رایان دەكرد. مەزرا هەر درێژ دەبۆوە. تووشی تەپۆڵكان دەبوون و بەجێیان دەهێشتن. دەتگوت ئەو رۆژە ئاڵۆزە بە پێشوازی شتێكی دوور و پێویستەوە دەچێ.

دەنگی گنەگنی پۆستەچی، زرینگەی زەنگوڵەكان و هاژەی بایەكی شێدار، وەك چەمێكی بە گوڕ دەچوون كە بە هێزێكی یەكسان بە رۆخی مەزرایەكدا بێتە خوارێ.

عارەبانەچی لە جێگای خۆی دانیشتبوو و قسەی دەكرد:

-دەوڵەمەند لە بەهەشتیش جێگای تەنگە. كارەكە ئاوایە! براكەم دەستی كردووە بە لەچەری. لەگەڵ كاربەدەستانی دەوڵەت نێوانی خۆشە.

كە گەیشتنەجێ، ئەسپەكانی كردنەوە و بە ناهومێدی بە دایكی گوت:

-دەكرێ پێنج كەپێكم بدەیەی. ... ... .. ڤۆدكایەك بخۆمەوە. .. .. .

كاتێك دایك داخوازەكەی بەجێ گەیاند، دوو سكەی بچووكی لە دەستی دا هەڵخولاند و گوتی:

-بایی سێ كەپێك ڤۆدكا دەخۆمەوە و دوو كەپێكیش دەدەم بە نان. دوای نیوەڕۆ دایك گەیشتە گوندی نیكۆڵسكی. چووە میوانخانەیەك و داوای چای كرد. پاشان جانتا قورسەكەی لە بن كورسی دانا و لە نزیك پەنجەرە دانیشت و تەماشای مەیدانی بچووكی پێش پەنجەرەی دەكرد كە بە گژ و گیای پێ خوستكراو فەرش كرابوو. ئیدارەی دەوڵەتیش بە رەنگێكی بۆری خۆڵەمێشی و بانێكی كیسەڵییەوە دیار بوو. كابرایەكی سەر بێ تووكی دێهاتی بە ریشێكی درێژەوە لە باڵكۆنی خانەوەكە دانیشتبوو قەننەی دەكێشا. هەر وەك پەڵەی رەش تێ

دەپەڕین و بەسەر یەکدا کەڵەکەیان دەکرد. وڵات مات و بێدەنگ بوو. خەم و خەفەت هەموو شتێکی داگرتبوو. ژیان دەتگوت راوەستاوە و دیار نییە لە کوێ خۆی شاردووەتەوە.

لەپڕ قازاخێك بە چوارناڵ گەیشتە مەیدان و ئەسپەکەی لە پێش پلەکانی ئیدارە راگرت و قامچییەکەی هەڵسووڕاند و بەسەر کابرای ریش درێژدا نەڕاندی. دەنگی لە شووشەکانەوە دەهاتە ژوور، بەڵام دایك لە قسەکانی تێنەدەگەیشت.

کابرا هەستا و دەستی بۆ هەوا راداشت. قازاخ لە ئەسپەکەی دابەزی و ئەسپەکەی دا بە کابرا و خۆی لە پلەکانەکان سەرکەوت و لە ئیدارەدا ون بوو.

دیسان وڵات مات و بێدەنگ بۆوە. ئەسپی کابرا دووجار لەو عەرزە نەرمە سمکۆڵی کرد. کیژۆڵەیەکی چاو نەرم و رووممەت خڕ کە پرچی زەردی کەوتبوونە سەر شانان، لە دایك وەژوور کەوت. لێوی تێك نابوون و سینییەکی گەورەی پڕ لە قاپی لەسەر دەستی دانابوو.

دایك بە دەنگێکی دۆستانە پێی گوت: جوانکیلەکەم رۆژ باش!

-رۆژ باش!

کیژەکە لە کاتی کۆکردنەوەی پیاڵە و ئیستیکانەکاندا، لەپڕ بە حاڵێکی هەڵگیرساو گوتی:

-کابرایەکی رێگریان گرتووە وا دەیهێنن.

-ئەو رێگرە کێیە؟

-نازانم.

-چی کردووە؟

-نازانم، هەر ئەوەندەم بیستووە کە دەڵێن رێگرێکیان گرتووە. پاسەوانێك لە ئیدارەوە غاری دا بچێ بانگ بکا. هاواری کرد: "هێنایان".

دایك لە پێش پەنجەرەوە تەماشای دەکرد. دیتی دێهاتی دێن و وەنزیك دەکەون. هێندێکیان بە شێنەیی و هێندێکیش بە پەلە دەڕۆیشتن و لە رێگادا دووگمەی پاڵتۆکانیان دادەکردەوە. هەموویان لە پێش پلەکانی ئیدارە راوەستان و تەماشای لای چەپیان دەکرد. بەڵام هەموو مات بوون.

کچەکە چاوێکی لە کۆڵانێ کرد و دەرگای پێوەدا و دەرکەوت. دایك هەستا زۆر بە جوانی جانتاکەی لەژێر کورس دا شاردەوە و پاشان دەسماڵێکی بەسەردا دا و گورج لە ژوورەکەی هاتە دەر و خەیاڵی هەڵاتنی لە خۆی دوور خستەوە کە کوت و پڕ بۆی هاتبووە پێش.

که گەیشتە سەر پلەکانی میوانخانە، سەرمایەکی توندی وەسینگ و چاوان کەوت. هەناسەی گیرا و لاقی وەستان. لە نێوەڕاستی مەیدان چاوی بە ڕێبین کەوت کە بە دوو ژاندارم دەیهێنن و دەستیان لە پشتەوە بەستبوون. لە دەوروبەری دەرگای ئیدارە خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە و چاوەڕوانی دەکەن.

دایك سەرەگێژەی گرتبوو. بێ ئەوەی سەیری دەوروبەری خۆی بکا. چاوی لە ڕێبین وەرنەدەگێڕا. ڕێبین قسەی دەکرد. دایك گوێی لە دەنگی دەبوو، بەڵام لە قسەکانی تێنەدەگەیشت. پشوویەکی دا و هاتەوە سەرخۆ. وەرزێرێکی ریش پان چاوی تێبڕیبوو. دایك کۆکەیەکی هاتێ و دەستێکی بە ملی خۆیدا هێنا کە لە ترسان داکەوتبوو. بە زەحمەتی پرسی: چ باسە؟

کابرای وەرزێر ئاوڕی دایەوە و گوتی:

-خۆت تەماشا بکە. کابرایەیك تری لێ وەنزیك کەوت و لە پەنای راوەستا. تا دەهات خەڵك پتر دەبوو. پاسەوانەکان بێ دەنگ لە پێش خەڵك راوەستابوون. لەپڕ دەنگی ڕێبین بەرز لە هەوا دەنگی دایەوە: هەمووتان باسی ئەو نووسراوانەتان بیستووە کە لە بارەی ژیانی ئێمە وەرزێرانەوە نووسراون و باسی چۆنییەتی ژیانی ئێمە دەکەن. .. ... . باشە، منیان لەسەر ئەو نووسراوانە گرتووە. من ئەوانەم لە نێو خەڵکدا بڵاوکردووتەوە.

خەڵك لە دەوری ڕێبین کۆدەبوونەوە. دەنگی هێدی و یەکسان بوو. دایك تۆزێك هاتبووە سەرخۆ.

هەڤاڵی ئەوە وەرزێرە ریش زەرد و چاو شینە ئانیشکێکی تێ کوتا و پرسی:

-گوێت لێیە؟

کابرا بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە سەری هەڵێنا و دیسان تەماشایەکی دایکی کرد. کابرای دیکەش هەر وای کرد. ئەمەیان لەو گەنجتر بوو. دەموچاوێکی کزەڵۆکە و پەڵە پەڵە و ریشێکی رەش و کۆرپەی هەبوو. هەردووکیان تۆزێ: کشانەوە.

دایك لەبەر خۆیەوە گوتی: دەترسێن. پتر سەرەنجی دایە. لەسەر پلەکانەکانەوە دەموچاوی رەش و ئاوساوی ڕێبینی بە جوانی دەدیت. تەماشای چاوە گەشەکانی دەکرد. دەیویست ریبینیش ئەو ببینێ. لەسەر پەنجەی پێیان خۆی هەڵکێشا. خەڵك بە خەفەت و بێ بڕواییەوە، بێ ئەوەی دەنگیان لەبەر بێتە دەر، تەماشایان دەکرد. تەنیا لە ریزی پشتەوە دەنگی دەمە تەقەیەك دەهات.

ڕێبین بە دەنگێکی قایم و بەرز گوتی:

-وەرزێرینە! براکانم! بڕواتان بەو نووسراوانە هەبێ. من لەسەر ئەوانە بۆ لای مردن دەچم. لێیان داوم، شکەنجەیان کردووم. دەیانویست پێم ئاشکرا بکەن کە لە کێم وەرگرتوون. دیسان لێم دەدەن، بەڵام خۆ رادەگرم. چونکە ئەو نووسراوانە راستییان تێدایە. لای ئێمە دەبێ حەقیقەت لە گیان و لە نان خۆشەویستتر بێ.

یەکێك لە وەرزێرەکان پرسی:

-ئەم قسانە بۆچی دەکا؟

کابرای چاوشین لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:

-بۆ ئەو گرنگ نییە. ... .. پیاو دووجار نامرێ. ئێستا هیچ نەبووە حوکم دراوە.

خەڵك بێدەنگ بوون و بە خەمناکی لە بنەوە چاویان لێك دەکرد. وادیار بوو هەموویان لەبەر شتێکی گران و نهێنی هەراسانن.

لەپڕ قازاخەکە لەسەر پلەکانی شیدارە دەرکەوت. .. .. . بە دەنگێکی مەستانە و بە لاکە لاك قوڕاندی:

-ئەم خەڵکە بۆ کۆبووەتەوە؟ .. .. .. . ئەوە کێیە وا قسان دەکا؟

غاری دا مەیدان و قژی رێبینی گرت و رایوەشاند و گوڕاندی:

-ئەوە تۆی قسان دەکەی؟ ئەوە تۆی دایك سەگ؟

خەڵك هەر زمەی دەهات. بۆڵە بۆڵ دەست پێکرا. خەمێکی توند بەسەر دایکدا هات. سەری بەردایەوە. لە دوو وەرزێرەکان یەکیان هەناسەی هەڵکێشا. دەنگی رێبین سەر لە نوێ بەرز بۆوە:

-باشە. .. .. ئەی خەڵکی بە شەرەف چاو لێبکەن!

-بێدەنگ بە . .. . قازاخ مستێکی لە بنی گوێی سرەواند. رێبین لاترەیەکی برد و پاشان شانەکانی هەڵتەکاند:

-دەستی پیاو دەبەستن و بە کەیفی خۆیان ئازاری دەدەن!

-پاسەوان بیبەن! ئەم خەڵکەش بڵاوەی بکا.

هەر وەك سەگێکی لە پێش کەلاکێك بەسترابێتەوە، لە پێش رێبین خۆی هەڵداویشت و بە مست لەسەر وسینگی و سکی رێبینی دەدا.

لەنێو کۆمەڵدا یەکێك هاواری کرد: لێی مەدە!

-یەکی دیکەش: بۆ لێی دەدەی؟

وەرزێرە چاوشینەکە سەری بادا و بە هەڤاڵەکەی گوت: با بڕۆین.

لە کاتێکدادایك بە چاوی خۆشەویستی تەماشای دەکردن، بە کاوەخۆی بە مەیداندا تێپەڕین.

دایك بە نارامی هەناسەیەکی هەڵکێشا. قازاخ دیسان چووە سەر پلەکانەکان و بە توورەیی دەستی کرد بە نەڕاندن و دەست راوەشاندن:

-دەڵێم بیهێننە ئێرە!

دەنگێك بە توندی وەڵامی دایەوە: نا. .. . "دایك زانی ئەوە دەنگی وەرزێرە چاوشینەکەیە" نابێ بێڵین. .. . . . ئەگەر بیبەنە وێ تا دەمرێ لێی دەدەن. .. .. ئەو دەم ئێمە تاوانبار دەکەن. لەوانەیە بڵێن ئێوە کوشتووتانە و بە سەر ئێمەیدا بێنن. نابێ بێڵین. .. .. رێبین هاواری کرد:

-وەرزێرینە! نابینن ژیانتان چۆنە؟ نابینن رووتتان دەکەنەوە، فریوتان دەدەن، خوێنتان دەمژن، هەموو بارێك لەسەر شانی ئێوەیە. ئێوە هێزی بنچینەی کۆمەڵن. .. ... بەڵام چ مافێکتان هەیە؟ تەنیا مافی ئەوە نەبێ لە برسان بمرن.

خەڵکەکە لەپڕ دەستی کرد بە هاوار، لە کاتێکدا قسەی یەکتریان دەقۆستەوە دەیانگوت:

-راست دەکا، ئەو پیاوە راست دەکا.

سەر پۆلیسی گوندی لە کوێیە؟. .. . بانگی کەن.

قازاخەکە بە دووایدا چووە.. .. .

-یاڵڵا. .. . با بچین. .. .. . سەرخۆشە. .. .

-کۆکردنەوەی کاربەدەستانی دەوڵەتی کاری ئێمە نییە.

خەڵك پتر خرۆشا.. .. .

-قسان بکە! . .. .. ناهێڵین لێت بدەن. .. .

-چت کردووە. ... . لەسەر چی وات لێدەکەن؟

-دەستانی بکەنەوە. .. . . .

-نا .. .. نا. ... . براکانم!

-بۆچی نا... گرنگ نییە!

-بەر لەوەی کارێکی نابەجێ بکەن، بیر بکەنەوە!

رێبین بەسەر زەنا زەنای خەڵکدا دەنگی زاڵ بوو و گوتی:

-دەستم ژان دەکەن. براکانم! . .. .. راناکەم. ناتوانم لەبەر حەقیقەت رابکەم. چونکە حەقیقەت لە وجودی مندا هەیە.

چەند کەس لە کۆمەڵەکە جیابوونەوە و لە کاتێکدا سەریان دەلەقاند وەدوور کەوتن. هێندێك پێدەکەنین. . ..
بەڵام تا دەهات خەڵك پتر دەهاورژا و لە هەموو لایەکەوە بە پەلە جلیان دەکردە بەر و دەهاتن لە دەورەی رێبین کۆدەبوونەوە. گیراوەکە وەك مزگەوتی نێو لێڕەوار لەنێو خەڵك راوەستابوو، باسکی بەسەر سەریدا بەرز کردبوونەوە و هاواری دەکرد:

-سوپاستان دەکەم، سوپاس ئەی خەڵکی بەشەرەف. ئێمە دەبێ دەستی یەکتر بگرین. ئەگەر یارمەتی یەکتر نەدەین، کێ یارمەتیمان دەدا؟

دیسان دەستە خوێناوییەکەی بەرز کردەوە و گوتی:

-خوێنی دەستم ببینن، لە پێناوی حەقیقەتدا رژاوە.

دایك لە پلەکانەکان هاتە خوارێ، بەڵام ئیتر رێبینی لێ دیار نەبوو. سەر لەنوێ چەند پلەکان سەر کەوتەوە. ئاگرێك لە سینگیدا دایسا و شتێکی شادیهێنەری لە دڵیدا دەجووڵایەوە. .. .

-وەرزێرینە! ئەو نووسراوە بچووکانە بدۆزنەوە، بیانخوێننەوە، بڕوا بە قسەی پیاوەکانی دەوڵەت مەکەن کەدەڵێن ئەوانەی هەڵگری حەقیقەتن بێ دین و یاخین. ... . حەقیقەت بە بێدەنگی بەسەر زەویدا دەگەڕێ و لەنێو سینگی کۆمەڵانی خەڵکدا پەنا و پەسیو دەدۆزێتەوە. بۆ کاربەدەستان لە ئاگر و ئاسن خراپترە. حەقیقەت باشترین دۆستی ئێوەیە. بەڵام دوژمنی سەری کاربەدەستانە. هەر بۆیەش خۆی دەشارێتەوە.

لەنێو خەڵکدا هەرا پەیدا بوو:

-برایان گوێ بدەنێ!

-ئاخ فەقیرە حیسابی تەواوە!

-کێ تۆی پێوە کردووە؟

یەکێك لە پاسەوانەکان هاواری کرد:

-قەشە!

دوو وەرزێر جنێویان دا.

دەنگێك هاواری کرد:

-هاوڕێیان، تەماشا کەن!

سەرپۆلیسی گوندی دیار بوو دەهات. کابرایەکی باڵابەرز و بەخۆوە بوو. دەموچاوێکی خڕی بوو، کڵاوەکەی هاتبووە سەر گوێی. لا سمێڵێکی قیت و یەکیشی شۆڕ ببۆوە. ئەو حاڵەتە سەر و رووی کابرای بێگیان و دزێو و

ئەحمەقانە نیشان دەدا. شیرێکی بە دەستی چەپەوە بوو، باسکی راستی رادەوەشاند. دەنگی شەقاوانی دەبیسرا. خەڵك پێشیان چۆل دەکرد. حاڵەتێکی شەکەتی و خەفەتباری بەسەر خەڵکدا دەباری. هەراوهوریا نشتەوە، هەر دەتگوت بە عەرزی دا چووەتە خوار. دایك هەستی کرد کە پێستی نێوچاوانی دەلەرزی. گڕێکی گەرمی بە چاواندا دەهات. ویستی دیسان بچێتەوە نێو خەڵك. داهاتەوە و لە چاوەڕوانییەکی پڕ لە خەفەتدا وشك بوو.

سەرپۆلیس لە پێش رێبین راوەستا و تەماشەیەکی کرد و پرسی:

-چ باسە؟ ئەوە بۆ دەستی نەبەستراون؟ بۆچی؟ دەستانی ببەستن.

دەنگی باریك و بەرز، بەڵام بێ رەنگ بوو.

پاسەوانێك گوتی:

دەستی بەسترابوون، بەڵام میللەت کردیانەوە.

چی؟. ... .. میللەت؟ . .. .. . میللەتی چی؟

سەرپۆلیس تەماشایەکی خەڵکەکەی کرد کە لە دەورەی کۆببوونەوە. هەر بەو دەنگە باریك و بێ رەنگەوە درێژەی پێدا:

-میللەت کێیە؟

نوکی شیرەکەی بۆ سینگی وەرزێرە چاو شینەکە راداشت و گوتی:

چووماکۆڤ تۆ میللەتی؟ کێی دیکەش؟ میشین تۆش؟

ریشی یەکێ تریشی گرت:

-ناجسنینە بڵاوەی بکەن. .. .. . دەنا پێتان نیشان دەدەم. .. .. .

لەو دەنگ و قیافەدا نە گۆڕانێك دیار بوو نە هەڕەشەیەك. زۆر بە نەرمی و بە پۆزێکی یەکسان و بە دڵنیایی لە خەڵکی دەدا. کە وەنزیك دەکەوت خەڵك دەکشانەوە و سەریان بەردەدایەوە و روویان وەردەگێڕا.

دەنگی پاسەوانەکانی دا:

-باشە، بۆ راوەستاون، بۆ نایبەستن؟

پاش هێندێ جنێوی پیس دیسان تەماشای رێبینی کرد و بە سەریدا گوڕاند:

-لەگەڵ تۆمە، دەستانت لە پشتەو گرە!

رێبین گوتی: نامەوێ دەستانم ببەستن. ... .. من راناکەم. .. پارێزگاری خۆشم ناکەم، دەست بەستنم فایدەی چییە؟

سەرپۆلیس بۆ لای رێبین چوو و پرسی:

-چی؟

رێبین دەنگی هەڵێنا و گوتی:

-ئەی دڕندەینە! ئێوە زۆرتان لە خەڵکد داوە. بەم زووانە رۆژێکی خوێناوی بۆ ئێوەش دێتە پێش.

سەرپۆلیس لە پێشی راوەستا و سمێڵی بادا و تەماشایەکی کرد و پاشان هەنگاوێك کشایەوە و لەپڕ نەڕاندی:

-ئاخ باوك سەگ. .. .. ئەم قسانە چین؟

پاشان بە هەموو هێزی مستێکی لە روومەتی دا.

رێبین لێی چووە پێش و هاواری کرد:

-حەقیقەت بە مست ناکوژرێ, بێجگە لەوە تۆ حەقت نییە لێم بدەی.

سەرپۆلیس قسەکەی وەك قوڕەی سەگ درێژکردەوە و گوتی:

-من حەقم نییە؟

دیسان دەستی هەڵێنا کە لێی بدا. رێبین خۆی لەبەر لادا و هێندەی نەمابوو سەرپۆلیس وەعەرزی بکەوێ. لەنێو خەڵکەکەدا یەکێك توند چڵمی هەڵ لوشی. دەنگی رێبین بە رق هەستاوی دووپاتە بووەوە:

سەرپۆلیس تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، خەڵك بێدەنگ و تووڕە وەك ئاڵقە دەوریان دابوو. هاواری کرد:

-نیکیتا! هۆ، نیکیتا!

وەرزێرێکی خولە پاڵتۆیەکی کورتی لەبەردا بوو لە خەڵك جیابۆوە. سەری بەردابۆوە و چاوی لە عەرزی بڕیبوو.

سەرپۆلیس سەری بادا و بەکاوەخۆ گوتی:

-نیکیتا زللەیەکی توندی لێ بدە!

کابرا هەنگاوێ: چووە پێش و بەرەوڕووی رێبین راوەستا و سەری هەڵێنا. رێبین لە نزیکەوە بەو قسە راست و توندوتیژانە بوومبارانی کرد:

-ئەی خەڵکی بەشەرەف، تەماشا کەن. بزانن ئەم ملهوڕە چۆن ئێوە بە دەستی خۆتان دەخنکێنێ. تەماشا کەن و بیر بکەنەوە. .. .

کابرا بە نەرمی دەستی بەرز کردەوە و بە ئەسپایی زللەیەکی لە رێبین دا. سەرپۆلیس بۆڵەیەکی لێهات:

-ناجسن! گوتم وای لێبدە؟!

یەکێك لەنێو خەڵکدا هاواری کرد:

-نیکیتا خوات لەبیر نەچێتەوە!

سەرپۆلیس پاڵێکی بە کابرایەوە نا و گوتی:

-دەڵێم لێی بدە!

کابرا هەنگاوێك کشاوە بە خەمناکی سەری بەردایەوە و لە وەڵامدا گوتی:

-نا، لێی نادەم!

-چۆن؟

سەرپۆلیس سوورهەڵگەڕا. سمکۆڵی لە عەرزی دەکرد و بە جنێودان بۆ لای ڕێبین چوو. دەنگی لێدان هەستا، ڕێبین بەلادا هات. باسکی ڕاوەشاند. سەرپۆلیس پاڵێکی پێوەنا و بە عەرزی دادا. بە پێلاقان وەرگەڕا سەرو سینگی. خەڵك بە هاوارێکی دوژمنانەوە ڕوویان لە سەرپۆلیس کرد. بەڵام ئەو بۆ لایەکی تر دەرپەڕی و شیری هەڵکێشا:

-ئاخ! ئاوا یاخی دەبن؟ .. .. .. ئاوا؟ ... .. . .

دەنگی دەلەرزی، پاشان دەستی بە بڵمەبڵم کرد. دیار بوو هێزیشی کەم بووە. سەری بردەوە نێو شانانی و چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و کشایەوە. لە کاتێکدا ئاوڕی لە پاش خۆی دەدایەوە، بە دەنگێکی نیگەرانەوە هاواری کرد:

-باشە هەڵیگرن. ... .. من دەڕۆم. .. . بەڵام پاشان؟ هەمووتان بزانن ئەمە تاوانباری سیاسییە، دژی قەیسەر خەبات دەکا، ئاژاوە دەنێتەوە، ئێوەش لە سەری دەکەنەوە. دەزانن ئێوە یاخی بوون؟ ... .. . ها؟ . ... . . . .

دایك بە ڕاماوی، بێ جووڵانەوە، بێ فکر و بێ حاڵ، هەر وەك مۆتەکە سواری کۆڵی بوبێ، لەژێر باری ترس و بەزییدا دەتلایەوە. هاواری تووڕەیی خەڵك وەك وزەی مێش هەنگوین لە گوێیدا دەزرینگایەوە. دەنگی لەرزۆکی سەرپۆلیس و زەنا زەنا، وەك گێژەڵۆکە لە دووری سەری دەهاڵا.

-ئەگەر تاوانبارە دەبێ موحاکەمە بکرێ!

-بەڵام نابی لێی بدەن!

-حەقتان نییە لێی بدەن!

-داخوا ئەم کارە ڕەوایە؟ بەم حاڵە هەموو کەس دەست دەکا بە لێدانی خەڵك. . . . ئەو دەم وەزع چۆن دەبێ؟

-نای لەو ملهوڕە و ئازاردەرانە!

خەڵك بە دوو دەستە دابەش دەبوون. هێندێك دەورەی سەرپۆلیسیان دەدا و هاواریان دەکرد و هانیان دەدا. هێندێکی تر کە ژمارەیان کەمتر بوو، بە دەنگیکی هێدی و خەفەتبارانەوە قسەیان دەکرد. چەند کەس هەڵیان نەستاندەوە. پاسەوانەکان خۆیان ئامادە دەکرد دەستانی ببەستن.

دەنگیان دان: دێوینە راوەستن!

رێبین قوڕی دەموچاوی سڕیەوە و چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، چاوی بەدایك کەوت. دایك بێ ئەوەی خۆی بییەوێ، خۆی بڵند کرد و باسکی هەڵێنان. رێبین رووی وەرگێڕا، بەڵام پاش تاوێك دیسان چاوی تێبڕی. دایك وای هاتە بەرچاو کە رێبین خۆی بڵند دەکا و سەر هەڵدێنێ و رووومەتە خوێناوییەکانی دەلەرزن. .. .. .

-"منی ناسی. .. .. .رەنگە منی ناسیبێ".

لە خۆشیان و لە داخان لەرزی و بەسەر ئیشارەی بۆ کرد. بەڵام زوو تێگەیشت کە ئەو وەرزێرە چاوشینەی لای رێبین، تەماشای دەکا. ئەو چاولێکردنە ترسی وەبەر دایکی نا:

-چ دەکەم؟ .. .... . لەوانەیە منیش بگرن. .. .. .

وەرزێرەکە بە سرتە چەند قسەیەکی لەگەڵ رێبین کرد و سەری لەقاند و بە دەنگێکی ئاشکرا و ئازایانە گوتی:

-گرنگ نییە . .. .. من لەم دنیایەدا تەنیا نیم. هەرگیز ناتوانن تەواوی حەقیقەت حەپس بکەن. رێگام بکەوێتە هەر شوێنێك، لە فکری مندا دەبن. ئاوایە، گرنگ نییە هێلانەم لێ رووخاوە. خۆ لەوێ نە دۆستی لێ بوو نە هاوڕێ.

دایك لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەو قسانە بۆ من دەکا.

-کۆمەڵ دەتوانێ بۆ حەقیقەت هێلانەی تر دروست بکا. رۆژێك دادێ کە هەڵۆ بە ئازادی بفڕن. کۆمەڵیش خۆی ئازاد دەکا.

ژنێك سەتڵە ئاوێکی هێنا سەروچاوی بەندییەکەی شوشتەوە. دەنگی ناسك و خەفەتاوی ئەو ژنە لەگەڵ قسەکانی رێبین تێکەڵ دەبوو و نەیدەهێشت دایك لە پسەکانی حاڵی بێ. هێندێك لە وەرزێرەکان کە سەرپۆلیس وەپێشیان کەوتبوو، وەرێ کەوتن. یەکێك فەرمانی دا:

-عارەبانەیەك ئامادە بکەن؛ ئەو بەندییە بەرێتە شار. کێ ئامادەی دەکا؟

پاشان سەرپۆلیس بە دەنگێکی گۆڕاو نەڕاندی:

-من دەتوانم لە تۆ بدەم، بەڵام ئەحمەق تۆ ناتوانی حەقت نییە!

رێبین وەڵامی داوە: مەگەر تۆ کێی؟ . . .. خوای؟

چەند هاوارێکی گیراو وەڵامەکەیان بێ شوێن کرد:

-مامە گیان دەمە تەقە مەکە! .. ... .. سەرۆکە.

-تۆ خوا ئێوە عاجز مەبن!

-بێدەنگ بە کابرا!

ئێستا بۆ شارت دەبەن!

-لەوێ قانون پتر لەبەرچاو دەگیرێ!. ... .. .

هاواری خەڵك باری سازان و پاڕانەوەی بە خۆیەوە دەگرت و وەك هەراو بۆڵە و زیقەیەك تێکەڵ دەبوو کە هیچ ئاوازەیەکی هومێدی تێدا بەدی نەدەکرا.

پاسەوانان باسکی ڕێبینیان گرت و لە پلەکانی ئیدارە وەسەریان خست و لەگەڵی چوونە ژوورێ. وەرزێرەکان وردە وردە بڵاوەیان کرد.

دایك دیتی کابرای چاوشین بۆ لای دێت و لە بنەوە چاوی لێدەکا. چۆکی لەرزین. هەستی تەنیای و خەفەت دڵی دەگوشی و دەهات بڕشێتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: نابێ بڕۆم . .. .. . . نا. .. .. . نابێ.

پاڵی بە دیوارەوە دا و ڕاوەستا.

سەرپۆلیس بە پۆزێکەوە لەسەر پلەکانان ڕاوەستابوو. بە دەنگێکی نەرم، بەڵام بە شێوەی لۆمە و سەرکۆنە قسەی دەکرد:

-ئەحمەقینە، باو سەگینە. .. . بە هیچ شتێك عاقڵ نابن و دەست لەو کارانە هەڵناگرن. دەستی لە سیاسەتی دەوڵەت وەردەدەن. بێ مێشکینە. حەق وابوو سوپاستان کربام. حەق وابوو کڕنۆشتان بۆ بردبام. ئەگەر ویستبام دەمتوانی هەمووتان یەك جێ بۆ زیندان و حەبسی قورس بنێرم.

بیست کەس بە سەری ڕووتەوە گوێیان بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو. شەو دادەهات. هەموو دادەکشان. کابرای چاوشین لە دایك وەنزیك کەوت و بە هەناسە هەڵکێشان گوتی:

-داستانێکی سەیرە!

دایك لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە: بەڵێ!

دۆستانە چاوێکی لێکرد و لێی پرسی:

-کاری تۆ چییە؟

-ئەو ژنانەی تۆڕ دەچنن لێیان دەکڕم. .. .. پارچەش دەکڕم.

کابرا بە ئەسپایی دەستێکی بە ریشیدا هێنا و پاشان چاوێکی لە گوندی کرد و بە دەنگێکی خەمناکەوە گوتی:

-ئەو شتانە لێرە وەگیر ناکەون. .. .

دایك سەر تا پێ تەماشای کرد و چاوەڕوانی دەرفەتێك بوو کە بچێتەوە میوانخانە. کابرا سەروچاوێکی جوان و عاقڵانەی هەبوو. چاوەکانی خەفەتبار دیار بوون. کەڵەگەت و چوارشانە بوو. بلوزێکی یەخە ناواڵە و کراسێکی چیتی خاوێن و پانتۆڵێکی ئەستووری سووری لەبەردا بوو. پێڵاوێکی پووشی لە پێدا بوو.

دایك بێ ئەوەی بزانێ لەبەرچی، هەناسەیەکی هەڵکێشا. لەپڕ لە ژێر تەنسیری هەستێکدا کە پێشی بیرکردنەوەی لێ گرتبوو، بە شێوەیەك کە خۆشی پێی سەیر بوو پرسی:

-دەکرێ شەو میوانی تۆ بم؟

لەگەڵ ئەو قسانە هەموو لەشی لەرزی و خێرا فکرێکی تیژی بە مێشکیدا هات:

-دەبە هۆی فەوتانی نیکۆلای . .. .. پاڤێل نابینمەوە. ماوەیەکی زۆر لێم دەدەن. کابرا بە کاوەخۆی لە کاتێکدا چاوی لە عەرزی بڕیبوو، یەخەی بلوزەکەی لەسەر سینگی ڕێکوپێك دەکرد، وەڵامی داوە:

-شەو میوانی من بی؟ بەڵێ قەیدی چییە؟ تەنیا ئەوەندەیە من ماڵێکی وام نییە.

دایکی گوتی: ناسك و نازدار نیم!

کابرا تەماشایەکی کرد و گوتی: باشە!

لەو کاتەدا شۆقێکی سارد لە چاوەکانیدا دەتروسکا. ڕەنگی بزرکابوو.

دایك هێدی گوتی:

-باشە ئێستا لەگەڵ تۆ دێم. .. .. . . تۆ جانتاکەم هەڵدەگری. .. .. .

-باشە.

شانی هەڵتەکاندن و یەخەی بلوزەکەی دیسان هاویشتە سەر یەك و لەژێر لێوانەوە گوتی:

-ئەوەتا عارەبانەکە دەڕوا.

ڕێبین لەسەر پلەکانی ئیدارە وەدەرکەوت. دیسان دەستەکانیان بەستبوونەوە. دەموچاوی بە پەڕۆیەکی بۆر پێچرابوو. دەنگی لە سەرمای ڕۆژئاوادا بەرز بۆوە:

-خواحافیز ئەی خەڵکی بەشەرەف. وەدووای حەقیقەت کەون. بیپارێزن. بڕوا بە قسەی ئەو کەسانە بکەن کە پەیامی باشتان بۆ دێنن. .. .. . لە پێناوی پارێزگاری حەقیقەتدا چی لە تواناتان دایە درێخی مەکەن. .. .. .

سەرپۆلیس هاواری کرد:

-سەگە بێدەنگ بە. پاسەوان ئەسپەکان دەنگ دە!
-چیتان هەیە خەمی بخۆن؟ ئەوە ژیان نییە ئێوە هەتانە.
کابرا تەماشایەکی کرد و گوتی: باشە!
عارەبانە وەڕێ کەوت. ڕێبین لە نێوان دوو پاسەوان دانیشتبوو. دیسان هاواری کرد:
-بۆ دەبێ لە برسان بمرن؟ تێبکۆشن بۆ وەدەستهێنانی ئازادی.
هەم نانتان دەداتێ و هەم حەقیقەت. خواحافیز ئەی خەڵکی باش. ... ...
دەنگی تەگەری عارەبانە و سمی ئەسپەکان و جنێوی سەرپۆلیس لەگەڵ دەنگی ڕێبین تێکەڵ دەبوون، نەیاندەهێشت دەنگی ببیسرێ.
دایك گەڕایەوە میوانخانە و لەنزیك سەماوەر لە پەنا مێزێك دانیشت. پاروە نانێکی هەڵگرت و تەماشای کرد و بە ئەسپایی دایناوە. برسی نەبوو. لە ناخی دەروونییەوە هەستی بە ناڕەحەتییەك دەکرد کە دڵی ڕێك دەگوشی و سەری دەسووڕاند.
لەبەر خۆیەوە بە خەمناکی دەیگوت:
-منی بە چاو ئەنگاوتووە .. .. . . منی بە چاو ئەنگاوتووە. هەستی پێکردووە... ..
فکری هەورازتر نەدەچوو. تووشی هیلاکی و خەفەتباری و هەستێکی نالەبار دەبوو. بێدەنگییەکی شەرمن کە لە پشت پەنجەرەوە خۆی مات کردبوو، جێگای هەرا و هوریای گرتبۆوە و دەری دەخست کە خەڵکی گوندی ترساون و گێژ بوون. ئەو بێدەنگییەش هەستی تەنیایی دایکی تیژتر دەکرد و گیانی بە تارماییەکی ڕەش و بۆر دادەپۆشی... . کیژەکە وەژوورکەوت و هەر بەسەرپێوە گوتی:
-هێلکە و ڕۆنێکت بۆ بێنم؟
-پێی ناوێ.، نیشتیام نییە. .. .. . ئەو هەرا و هوریایە ترساندوومی. کیژەکە چووە نزیك مێزەکە و بە ئەسپایی بەڵام بە تووڕەیی گوتی:
-سەرپۆلیس چەتد توند لێی دا. .. .. . زۆری لێ نزیك بووم. .. .. هەمووم دیت. هەموو ددانی شکاندبوون. کە تفی فڕێ دەدا هەر خوێن بوو. خوێنێکی ڕەش. چاوی دیار نەبوون. قازاخەکە لێرەیە. تەواو سەرخۆشە و هەر دەشخواتەوە. .. . دەڵێ ئەوانە دەستەیەك بوون ئەو سەرۆکیان بوو. سێ کەسیان لێگرتوون. یەکیان ڕای کردووە. مامۆستایەکیش گیراوە، لەگەڵ ئەوان بووە. بڕوایان بە خوا نییە. خەڵك هان دەدەن تا کلیساکان تاڵان

بکەن. .. .. . کاریان نەمەیە. .. .. هێندێك لە وەرزێرەکان سکیان بەو ریشدارە دەسووتا. .. . هێندێکی تر دەیانگوت: دەبێ بیکوژن. ... . ئاخ دێهاتی ئاوا خراپیش لای ئێمە هەن.

دایك بە وردی گوێی دابووە قسەکانی. بە هیوا بوو بەو جۆرە نیگەرانی خۆی لەناو بەرێ و خەم و خەفەتی چاوەڕوانی بدا بە با. کچەکەش دڵی بەوە خۆش بوو کە یەکێك گوێی بۆ راگرتووە، خۆش خۆش قسەی دەکرد:

-باوکم دەڵێ ئەوە هەمووی ئەنجامی قاتی و قوڕییە. دوو ساڵە زەوی بەروبووی نییە. خەڵك هەمووی هەژار و نەدارە. هەر لەبەر ئەمەشە ئەو وەرزێرانە ئاوا دەبینرێن. موسیبەتە. لەنێو کۆڕ و کۆمەڵاندا هاوار دەکەن و بەشەڕ دێن. لەم دواییەدا کاتێك هەمو سامانی "ڤاسیوکۆڤ"یان بە تاوانی باج نەدان فرۆشت، دەڵێن زللەیەکی لە کوێخای ئاوەدانی دا و گوتی: "ئەوە پاشماوەی باجی من".

لە پشت دەرگا هەستی پێیان هات. دایك دەستی بە مێزەکەوە گرت و هەستا. وەرزێرە چاوشینەکە وەژوور کەوت و بێ ئەوەی کڵاوەکەی هەڵگرێ پرسی:

-جانتاکەت لە کوێیە؟

بە هەناسە دەستی دایە و گوتی:

-خاڵییە. .. . ماریا لەگەڵ ئەو میوانە تا ماڵی ئێمە وەرە.

بێ ئەوەی چاو لە هیچ کەس بکا وەدەرکەوت.

کچەکە پرسی: شەوێ لە گوندی دەبی؟

-بەڵێ. لە تۆڕی چنراو دەگەڕێم. تۆڕ دەکڕم.

-لێرە وەگیرت ناکەوێ. لە "تینکۆڤ" و لە "دارینۆ" دەچنن نەك لێرە.

بەیانی دەچم بۆ وێ.

پاشان پارەی چایەکەی دا و سێ کەپیکیشی دا بە کچەکە. کچەکەش زۆری پێ خۆش بوو. لە کۆڵانێ کە دەنگی پێیانیان لەسەر عەرزی شێدار دەهات، ماریا گوتی:

-ئەگەر بخوازی، زوو دەچمە "دارینۆ" بە ژنەکانیدەڵێم تۆڕەکانیان بێنن بۆ ئێرە.

ئەوان خۆیان دێن و ئیتر پێویست ناکا تۆ بچی. دووازدە کیلۆمەتر رێگایە. .. .. .

دایك هەروا بە دەم رۆیشتنەوە وەڵامی داوە:

-نا . .. ... خۆشەویستەکەم، فایدەی نییە!

هەوای سارد دایکی هێنابۆوە سەرخۆ، بڕیارێکی ناڕوون و ساخ نەبۆوەی بە خەیاڵیدا هات کە دەبوو بە هۆی شادی و هێزی وەبەر دەنا. بۆ ئەوەی خێرا دەری ببڕێ. لە خۆی دەپرسی:
-چ بکەم؟ . .. .. ڕاست و ڕەوان بە ئاشکرا دەست پێ بکەم.
هەوا تەواو تاریك ببوو و زۆر سارد بوو. پەنجەرەی ماڵەکان بە شەبەقێکی سوور و مات دەدرەوشان. پاتاڵ لەو شەوە تاریکەدا بە تەمبەڵی بۆڕەیان دەهات. جاروبار هەرایەکی کەم دەبیسرا. خەفەتێکی بەسام گوندەکەی دادەگرت.
کچەکە گوتی:
-ئێرەیە. ماڵێکی خراپت هەڵبژاردووە. ئەم وەرزێرە زۆر فەقیرە.
وەك کوێران لە دەرگا دەگەڕا تا دەرگای دیتەوە. دەرگای کردەوە و بانگی کرد:
-تاتیانا! میوانەکەت ئەوەتا!
پاشان ڕای کرد. لە تاریکیدا دەنگی دەهات:
-خواحافیز.
دایك لەبەر دەرگا ڕاوەستا دەستی بە پشتی چاوانییەوە گرت و لە بنەوە تەماشای کرد. خانوویەکی تەنگ و بچووك، بەڵام ئەوەندە پاك و خاوێن بوو، جێبەجێ سەرەنجی ڕاکێشا. ژنێك هاتەدەر، سڵاوی کرد و ڕۆیشتە ژووری. چرایەك لە قوژبنێك لەسەر مێز دانرابوو. خانەخوێ لە پەنا مێزەکە دانیشتبوو و تەماشای دایکی دەکرد. پاش تاوێك گوتی:
-وەرە ژووری! تاتیانا خێرا بچۆ بانگی "پیوتر" بکە.
ژنەکە بێ ئەوە چاو لە دایك بکا بە گورجی وەدەرکەوت. دایك بەرەورووی کابرا لەسەر کورسییەك دانیشت و چاوێکی لەملاولا کرد جانتایەکەی دیار نەبوو. بێدەنگییەکی گران بەسەر خانووەکەدا هاتبوو. تەنیا هەستی پتەپتی چرایەك دەهات. دەموچاوی پەشۆکاوی خانەخوێ دەلەریەوە.
-باشە. .. .. . زوویە. .. .. قسە بکە. .. .
دایك لەپڕ بە دەنگێکی توند بێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، پرسی:
-جانتاکەم لە کوێیە؟
کابرا شانی هەڵتەکاندن و بە بیرکردنەوە وەڵامی دایەوە:
-جانتاکەت ون نابێ.

دایك بە دەنگێکی کز گوتی:

-بە ئانقەست لای کچەکە گوتم خاڵییە. .. .. . ئەمە راست نییە. شتی زۆر قورسی تێدایە.

دایك پرسی: باشە . .. .. . دەی، چی؟

کابرا هەستا و لێی وەنزیك کەوت و بە ئەسپایی پرسی:

-تۆ ئەو پیاوەت دەناسی؟

دایك لەرزی. بەڵام لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

لای وابوو ئەو وەڵامە کورتە هەموو شتێکی بۆ روون دەکاتەوە. کابرا پێکەنی و گوتی:

-دیتم نیشارەت بۆ کرد. ئەویش وەڵامی دایەوە. بە سرتە پێم گوت ئەو ژنەی لەسەر پلەکانی میوانخانەکە راوەستاوە دەیناسی؟

دایك خێرا پرسی: ئەو چی گوت؟

-ئەو گوتی: "ژمارەمان زۆرە". بەڵێ. .. .. . بەڵێ گوتی: "ژمارەمان زۆرە".

چاوێکی پڕ مانای لە میوانەکەی کرد و دیسان بە زەردەخەنەیەکەوە درێژەی پێدا:

-ئەو پیاوە هێزێکی مەزنە. .. .. . ئازایە. .. .. هەرچی بییەوێ دەیڵێ. لێی دەدەن، جنێوی پێ دەدەن. .. .. بەڵام دەست هەڵناگرێ.

دەنگی نیوە دڵنیا و گنجی نێوچاوانی و گەشەی چاوی، پتر بوون بەهۆی هێدی بوونەوەی دڵی دایك. ترس و پەشێوی و هیلاکی رۆیشت و لە جیاتی ئەوە بیری لە حاڵی رێبین دەکردەوە. بە قینێکی کوت وپڕ کە نەیتوانی پێشی بگرێ، هاواری کرد:

-رێگرینە. .. .. . دڕندەینە!

کابرا بە خەمناکی لێی دوور کەوت و سەری بادا:

-بەڵێ، دەوڵەت دوژمنی بەترسی بۆ خۆی ساز کردوون.

دیسان گەڕایەوە کن دایك و بە ئەسپایی گوتی:

-من پێم وایە جانتاکەت رۆژنامەی تێدان. .. .... . راستە؟

دایك فرمێسکی سڕینەوە و بە ساکاری وەڵامی داوە:

-بەڵێ، وایە، بۆ ویم هێنابوون.

کابرا برۆی تێکنان و دەستی بە ریشیدا هێنا و چاوی لە قوژبنێك برین و بێدەنگ بوو.

-ئەو بۆ ئێمەشی دەهێنا. کتێبیشی دەداینێ. ئەو پیاوە دەناسین. .. .. . دەیتبوومان! کابرا بێدەنگ بوو، بیری کردەوە و پاشان پرسی:

-باشە، ئێستا تۆ ئەوانە و جانتاکەت چ لێدەکەی؟

دایك چاوێکی لێکرد و بە شێوەیەکی هاندەرانە گوتی:

-بۆ تۆیان بەجێ دێلم. ... .. .

کابرا پێی سەیر نەبوو. بەرهەڵستیشی نەکرد. تەنیا گوتی:

-بۆ ئێمە؟

پاشان تەماشایەکی دەرەوەی کرد و گوێی هەڵخست و لەبەر خۆیەوە گوتی:

-ئەوە دێن!

-کێ؟

-بێگومان ناشناکانی ئێمەن.

ژنێك هاتە ژوور و وەرزێرێکی بە دواوە بوو. کابرا کڵاوەکەی هاویشتە قوژبنێك و لە خانەخوێ وەژوورکەوت و پرسی:

-دەی باشە؟

ئەوی تر بە نیشانەی "نەرێ" سەری لەقاند. ژنەکە گوتی:

-ستێپان! میوانەکەمان بە رێگادا هاتووە، رەنگە برسی بێ.

دایك لە وەڵامدا گوتی:

-نا گیانەکەم، سوپاس. .. .. .

وەرزێرەکەی تر رووی کردە دایك و بە دەنگێکی توند دەستی پێکرد:

-ئیجازە بدە خۆم بناسێنم. ناوم "پیوتر ییگۆرۆڤ ریابینین"ە پێم دەڵێن "شیلۆ". لە کارەکانی ئێوە کەمێك سەر دەردەکەم. خوێندەوارم. بە رواڵەت ئەحمەق نیم.

ئەو دەستەی دایك بۆی درێژکردبوو گوشی و بە ستێپیانی گوت:

-باشە. تەماشاکە ستێپیان! ژنی ئاغا ژنێکی باشە. بەڵام بەو حاڵەش دەڵێ ئەوانە هەموویان هیچ و پوچن. قوتابی و بەرەڵڵان، بە هاوروژاندنی خەڵك کەیف دەکەن. بەڵام ئێمە ئەمرۆ هەردووکمان دیتمان کە پیاوێکی نازایان گرتووە. ئێستاش دەبینی کە ئەم ژنە گەنج نییە و وادیارە خانمش نییە، بەڵام دەستی لە کاردا هەیە.

-پێت ناخۆش نەبێ! ناوت چییە؟

توند و ڕەوان و یەك پشوو قسەی دەکرد. چەناگەی وەك پیاوی تادار دەلەرزی. چاوی بڕیبوونە ڕوخساری نیلۆڤنا. بە جلێکی شڕ و قژی ئاڵۆزەوە دەتگوت لە شەڕی گەڕاوەتەوە و دوژمنی شکاندووە و لە شایان سەرخۆشە. دایك چاوێکی دۆستانەی لێکرد و وەڵامی دایەوە. جارێکی دیکەش بە گەرمی دەستی دایکی گوشی و دەستی کرد بە پێکەنینێکی وشك و نەرم:

-ستێپان دەزانی کارێکی پیرۆزە. .. .. کارێکی زۆر جوانە. .. .. پێم گوتی کۆمەلانی خەڵك خۆیان دەستیان بەکار کردووە. ئەم خانمە ڕاستی نالێ، چونکە زیانی بۆ ئەو هەیە. بەڵام کۆمەڵی خەڵك دەیەوێ بە ئاشکرا وەری کەوێ. بێ ئەوەی لە خەمی قازانج و زەرەردا بێ. دەزانی؟ کۆمەڵ ژیانی خراپە. لە هەموو لایەکەوە زیانی پێدەگا. نازانێ ڕوو لە کام لا بکا. چونکە لە هەموو لاوە لێی لە هەڵلا دەدەن: "ڕاوەستە".

ستێپان سەری لەقاند و گوتی: دەزانم. هەر لەو کاتەشدا لێی زیاد کرد:

لە خەمی جانتاکەی دایە. .. .. .

-لەخەمیدا مەبە دایە گیان، هەموو شت ڕێکوپێکە. جانتاکەت لە ماڵی منە. ئێستا کە ستێپان باسی تۆی بۆ دەکردم گوتی تۆش دەستت لە کاردا هەیە. ئەو پیاوەش دەناسی. پێم گوت: "ئاگات لێ بێ، نابێ زار بلاو بین. مەسەلەکە زۆر گرنگە". تۆش دایە . .. .. .. . جێبەجێ هەستت کرد کە ئێمە لەگەڵ ئێوەین. مرۆڤی باش زۆر زوو دەناسرێ. هەر دیارە. چونکە لە بازاڕ ژمارەیان زۆر نییە. ئاخ. .. .. . نا ... . . . . .جانتاکەت لە ماڵی منە.

لە پەنای دانیشت و بە چاولێکردنێکی تکاکارانەوە درێژەی پێدا:

-ئەگەر دەتەوێ خاڵی بکەی یارمەتیت دەدەم. .. . پێویستمان بە کتێب هەیە.

ستێپان گوتی: دەیەوێ هەموو بدا بە ئێمە.

-فیکرێکی زۆر باشە دایە. ئێمە دەزانین چییان لێبکەین.

لەپڕ هەستا و دەستی کرد بە پێکەنین. پاشان بە هەنگاوی گەورە لە ژووریدا دەستی کرد بە هاتوچۆ و بە کەیفخۆشی قسەکانی درێژە پێدا:

-هەرچەندە زۆریش سادەیە، بەڵام دەتوانین بڵێین مەسەلەیەکی سەیرە. لە جێگایەك شکاوە، بەڵام لە شوێنێکی تر تۆڵەی کراوەتەوە. .. .. . خراپ نییە. .. ... . ئاوایە. ئەو ڕۆژنامەیە زۆر باشە و تەئسیری هەیە. چاو و گوێی خەڵك دەکاتەوە. خاوەن ملکان خۆشیان ناوێ. ... .. حەوت کیلۆمەتر لێرە دوور لای ژنێکی خاوەن ملك

کار دەکەم، دارتاشم. دەبێ بڵێم کە ژنێکی باشە. کتێبمان دەداتێ، بەڵام هێندێ جار ئەحمەقانەن. دەیانخوێنینەوە و خوێندەوراییان پێ باش دەبێ. بە گشتی لێی مەمنونم. .. .. بەڵام کاتێك ئەم رۆژنامانەم پێشان دا، تووڕە بوو و گوتی: پیۆتر دەست لەوانە هەڵگرە. منداڵی نەفام ئەوانە ساز دەکەن و تەنیا دەبێتە هۆی چارەڕەشیتان. .. . وەك بەندیخانە و دوورخستنەوە بۆ سیبریا. ... .. . ئەگەر خوێندنەوەی ئەو رۆژنامانە درێژە پێ بدەی، لەوانەیە تووشی ئەو کارەساتە بی.

دیسان بێدەنگ بوو. بیری کردەوە و وەدووای قسەکانی خۆی کەوت:

-بەراستی دایە ئەو پیاوە خزمی ئێوە بوو؟

دایك لە وەڵامدا گوتی: نا.

پیۆتر دەستی بە پێکەنین کرد. دیار نەبوو بە چی شادە و پێدەکەنێ. دایك وای زانی کە بە بێگانە زانینی رێبین زووڵمە. گوتی:

-خزم نییە، بەڵام لەمێژە دەیناسم. وەك برای خۆم رێزی لێدەگرم.

ئەو زاراوەی لێی دەگەڕا نەیدەدۆزییەوە. زۆر بەوە ناڕەحەت بوو. نەیتوانی پێشی کۆڵە گروی خۆی بگرێ. بێدەنگییەکی خەماوی ژوورەکەی داگرت. پیۆتر سەری بەسەر شانیدا خوارکردبۆوە، دەتگوت گوێی داوەتە شتێك. ستێپان ئانیشکی وەسەر مێزەکەدا بوو. ژنەکەی پاڵ وەسۆیە دابوو، کەوتبووە بەر نیسێیە.دایك هەستی دەکرد کە چاوی تێبڕیوە. جاروبار چاوێکی لە تاتیانا دەکرد کە روومەتێکی خڕ و سەوزە و لووتێکی قەڵەمی و چەنەگەیەکی جوان چاوێکی کاڵی هەبوو.

پیۆتر درێژەی بە قسەکانی دا:

-کەوابوو ناسیاوتە. .. . زۆر بە جەرگە، زۆر نرخ بۆ خۆی دادەنێ. .. .. . دەبێ هەر واش بێ. .. .. . بۆ خۆی مرۆڤێکە. .. ... . . وا نییە تاتیانا؟ . .. .. . تۆ دەڵێی چی؟

تاتیانا قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

-ژنی هەیە؟

لێوە باریکەکانی و زارە چکۆڵەکەی خڕ بوونەوە.

دایك بە خەمباری وەڵامی دایەوە:

-ژنەکەی مردووە!

تاتیانا بە دەنگێکی هێدی گوتی:

-هەر بۆیەش ئەوەندە ئازایە. پیاوی خاوەن ژن و ماڵ واناکا، دەترسیٚ!. ... ..

پیۆتر گوتی:

-ئەی چ لە من دەکەی، ژنیشم هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا. .. ... .

تاتیانا بیٚ ئەوەی تەماشای بکا، لیّوی بادان و گوتی:

-بەسیەتی. چ دەکەی؟ زۆر قسان دەکەی و جارجاریش کتیّب دەخویّنییەوە. هەر بەوەندەی کە لەگەڵ ستیّپان لە کەلیّن و قوژبنان سرت و خورت دەکەن، خەڵك بەختەوەر نابیٚ. پیۆتر تیّك چوو و لەسەرخۆ گوتی:

-زۆر کەس گویٚ دەداتە قسەی من . .. . . باش نییە وا قسەی دەکەی . ... .. من وەك هەویّن وام. ... .. .

ستیّپیان بیٚ ئەوەی هیچ بڵیٚ چاویّکی لە ژنەکەی کرد. تاتیانا پرسی:

-وەرزیّر بۆچی ژن دیّنیٚ؟ دەڵیّن چونکە پیّویستی بە کریّکار هەیە. ... . بۆ چ کاریّك؟

ستیّپیان بە دەنگیّکی گنەوە گوتی:

-بۆ چما ئەو کارەی هەتە بەس نییە؟

-ئەو کارە کەڵکی چییە؟ لەسەر ئەوەشەوە ئینسان رۆژ بە رۆژ لە هەژاریدا دەژی. ... منداڵت دەبن . .... . . دەرفەتی ئەوەت نامیّنیٚ پیّیان رابگەی. .. .. . ئەویش لەبەر کاریّك کە تەنانەت نانیشی لیٚ پەیدا نابیٚ.

لە دایك وەنزیك کەوت و لە پەنای دانیشت، بیٚ ئەوەی قسەکانی نیشانەی خەم و سکاڵایان لیّوە دیار بیٚ، دریّژەی پیّدا:

-دوو منداڵم هەبوو. یەکیان سەماوەر سووتاندی. .. .. . تەمەنی دوو ساڵ بوو. ئەوەی دیکەش لەبەر کاری پیۆتر بە مردوویی لە دایك بوو. ئەمەش بۆ من بوو بە بەختەوەری؟ دەڵیّم وەرزیّر خراپ دەکەن ژن دیّنن. .. ... . دەست و باڵی خۆیان دەبەستن. ئەگەر ئازاد بن وەك ئەو پیاوەی دەیناسی بە ئاشکرا لە پیّناوی راستیدا خەبات دەکەن. وایە، حەقم نییە؟

دایك گوتی:

-بۆچی گیانەکەم؟ ئەگەر وانەبیٚ مرۆڤ ناتوانیٚ بەسەر ژیاندا زاڵ بیٚ.

-تۆمیّردت هەیە؟

-میّردم مردووە. تاقە کوڕیّکم هەیە. .. .. .

-لە کویّیە، پیّکەوە دەژین؟

-گیراوە، لە زیندانە!

هەستی کرد کە شانازییەکی هێدی لەگەڵ خەمێك کە هەمیشە بە سەریدا دەهات، لە دڵدا پێکەوە تێکەڵ دەبن.

-جاری دووهەمە دەگیرێ. چونکە راستی ناسیوە و تۆوی راستی بە ئاشکرا لە گیانی خۆیدا چاندووە. گەنجە، جوانە. ..... . ژیرە. .. .. ئەو بوو کە کەوتە بیری ئامادەکردنی رۆژنامە. ئەو بوو بە هۆی ئەوە کە رێبین بۆ بڵاوکردنەوەی دەست بەکار بێ. هەر چەند رێبین بە تەمەن دوو هێندەی ئەویش گەورەترە. بەم زووانە بە تاوانی ئەو کارانە کوڕەکەم موحاکەمە دەکەن. پاشان کە ناردیانە سیبریا، رادەکا و دەگەڕێتەوە تا سەرلەنوێ دەست بەکار بکاتەوە. ئەوانە زۆرن. ژمارەیان تا دێ زیاد دەکا و هەموو شتیان بە یەکەوە تا ژێر سێدارە لە پێناوی راستیدا خەبات دەکەن.

بە جارێك پێشی بەرەڵلا کرد. بەڵام بێ ئەوەی ناوی کەس بێنێ، باسی ئەو کارانەی کرد کە بە نهێنی بۆ ئازادی کۆمەڵانی خەڵك دەکرێن، لە توێی باسکردنی ئەو مەسەلەدا کە دڵی پێ دەحەسایەوە، تەواوی هێزی خۆی و تەواوی ئەو عەشقەی کە لەبەر کارەساتی جۆربەجۆری ژیان وا دەرەنگ سەری هەڵدابوو، لە قسەکانیدا دەگونجاند. دەنگی یەکسان بوو. وشەی بە هاسانی دەدۆزینەوە و وەك مرواری رەنگاوڕەنگ دەیهۆنینەوە. لەبەر ئەوەی قسەکانی جێگای خۆیان دۆزیبۆوە، وەرزێرەکان مات ببوون و بە رێزەوە تەماشایان دەکرد. دەنگی هەناسەی ئەو ژنەی دەبیست کە لە پەنای دانیشتبوو. سەرەنجی گوێگرەکانی بڕوای دایك بە قسە و بەڵێنەکان بەهێز دەکرد.

-تەواوی ئەو کەسانەی لەبەر زووڵم و زۆر وەزاڵە هاتوون، تەواوی کۆمەڵانی خەڵك، دەبێ بە پێشوازی ئەو کەسانەوە بچن کە لە بەندیخانە، یان لەژێر داردا، لە پێناوی ئەواندا بە هیلاك دەچن. ئەوانە هیچ مەبەستی شەخسییان نییە. بۆ خەڵکی روون دەکەنەوە کە رێگای بەختەوەرییان کامەیە. بە ئاشکرا دەڵێن ئەو رێگایە دژوارە. هیچ کەس بە زۆر بۆ لای خۆیان راناکێشن. بەڵام هەر کەس لەگەڵیان کەوت، ناتوانێ لێیان جیا بێتەوە، چونکە دەزانێ حەقیانە و ئەوە رێگایەکی باشە و رێگایەکی تر نییە.

دایك لەوەی کە بە ئاوات دەگەیشت کەیفی دەکرد. دەیدیت کە ئێستا خۆی لەبارەی راستییەوە قسە بۆ خەڵك دەکا:

-کۆمەڵ دەتوانێ لەگەڵ ئەو دۆستانە بێ ترس بە ڕێگادا بڕوا. تا ئەو کاتەی خەڵك گیانێکی یەکگرتوو پێك نەهێنێ و یەك دەنگ هاوار نەکا: "خۆم خاوەن دەسەڵاتم و خۆم یاسا دادەنێم، یاسایەکی ئەوتۆ کە بۆ هەموو کەس وەك یەك بێ" ئەوانە دەست هەڵناگرن.

ئاخرەکەی دایك ماندوو بوو، بێدەنگ دانیشت. بە تەواوی دڵنیا بوو کە قسەکانی بە خۆڕایی ناچن و شوێنەواریان دەمێنێ. .. .. . وەرزێرەکان جۆرێکیان چاو لێ دەکرد، دەتگوت هێشتا هەر گوێیان لە قسەکانییەتی. پیۆتر دەستی بە سینگیەوە نابوون. پێڵوی چاوی ڕێك هێنابوون. زردەخەنەیەکی لەسەر لێوان دیاربوو. ستێپان ئانیشکی وەسەر مێزەکە دابوو، ملی هەڵکێشابوو، بۆ پێشەوە خوار بۆوە، سێبەرێکی کەوتبووە سەر ڕوومەتی و حاڵەتێکی پوختەتری پێدابوو. تاتیانا لە پەنا دایك ئانیشکی وەسەر ئەژنۆی دابوو تەماشای پێڵاوەکانی دەکرد.

پیۆتر لەبەرخۆیەوە گوتی:

-ئاخ! هەر وایە!

سەری ڕاوەشاند و بە پارێز لەسەر کەروێتێك دانیشت. ستێپیان بەکاوەخۆ سەری هەڵێنا و چاوێکی لە ژنەکەی کرد و هەر وەك بییەوێ شتێك لە ئامێز بگرێ باسکی ڕاکێشان. بە دەنگێکی پڕ لە بیرکردنەوە دەستی پێکرد:

-ئەگەر مرۆڤ بییەوێ دەست بەو کارە بکا، دەبێ بەڕاستی بە هەموو تواناوە خەریك بێ. .. .

پیۆتر بە شەرمەوە هاتە نێو قسەکەی و گوتی:

-بەڵێ. .. .. . بێ ئەوەی بۆ دوواوە ئاوڕ بداتەوە.

ستێپان درێژەی پێدا:

-کار باش جێبەجێ بووە!

پیۆتر لێی زیاد کرد:

-لەسەرنسەری جیهاندا. .. .. .

## (١٨)

دایك پاڵی وەدیوار دابوو و سەری وەرگێڕابوو. گوێی بۆ بیروڕای ئەو دوو پیاوە ڕاگرتبوو. تاتیانا هەستا، تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و دیسان دانیشتەوە. کاتێك تەماشای ئەو دوو پیاوەی دەکرد، چاوە کاڵەکانی دەدرەوشان. لەپڕ ڕووی لە دایك کرد و گوتی.

-وادیارە کوێرەوەریت زۆر دیوە.

دایك وەڵامی دایەوە: بەڵێ!

-باش قسەی دەکەی. قسەکانت چاك لە دڵیدا جێ دەگرن. .. . . کاتێك پیاو گوێ دەداتە قسەکانت، بەخۆی دەڵێ: "خوایە، خۆزگە پیاو توانیبای ئەگەر بۆ جارێکیش بێ، ئەو کەسانە لە ژیانی خۆشدا ببینێ". ژیانی ئێمە چۆنە؟ وەك مەڕ و ماڵات. خوێندەوارم. کتێب دەخوێنمەوە. زۆریش بیر دەکەمەوە. جاری وا هەیە شەو لەبەر بیرکردنەوە خەوم لێ ناکەوێ. بەڵام ئەنجامی چییە؟ ئەگەر بیر نەکەمەوە بە خۆڕایی لە عەزاب دام. .. .. ئەگەر بیریش بکەمەوە هەروا. .. .. . کەوابوو هەموو شت بەخۆڕایی دەڕوا.. .. .

وەرزێران کار دەکەن و بۆ پارۆ نانێك پشتیان دەچەمێ. قەتیش هیچیان نییە. لەو وەزعە نارەحەت دەبن. نارەق دەخۆنەوە و لێك دەدەن. دیسان دەست بە کار دەکەونەوە. .. .. ئەنجام دەبێتە چی؟ . .... ... . هیچ. .. ..

تاتیانا بە دەنگێکی هێدی و ڕەوان و بە چاوی تەوس و پلارەوە قسەی دەکرد. هێندێ جار وەك بییەوێ وشەکانی بە بەنەوە بکا رادەوستا. پیاوەکان بێدەنگ بوون. با وە شووشەکان دەکەوت و جارجار نەرم بە دووکەڵکێشی سۆبەدا دەهاتە ژوور. سەگێك دەیلوراند. تنۆکەی باران دەنك دەنك وەپەنجەرە دەکەوتن. شۆقی چراکە دەلەرزی و کز دەبوو, لەپڕ دەگەشایەوە.

-قسەکانی تۆم گوێ لێبوون، ئەمەیە، خەڵك بۆچی دەژی؟ ئەوە زۆر سەیرە. گوێ بۆ قسەکانت رادەگرم و دەبینم. بەڵێ من ئەمە دەزانم، بەڵام تا ئێستا قەت شتی ناوام نەبیستووە، ئەو فیکرەش بۆ من نەهاتبووە پێش .. .. . نا. ... ..

ستێپان بە دەنگێکی نەرم و خەمبار قسەکانی پێ بڕی:

-دەبێ نانی بخۆین و چراکە بکوژێنینەوە، خەڵك وەشك دەکەوێ. چرای چۆماکۆڤەکان تا درەنگ دایسا! بۆ ئێمە گرنگە نییە، بەڵام رەنگە بۆ میوانەکان باش نەبێ.

ژنەکە هەستا و لە دەوری ئاگردانەکە دەستی بەکار کرد.

پیۆتر بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

-بەڵێ، ئێستا دەبێ ئاگادار بین! پاش ئەوەی سەرلەنوێ رۆژنامەکە بڵاوکرایەوە. .. ..

ستێپان گوتی:

-لەبەر خۆم ناڵێم. ... .. ئەگەر بشمگرن بەڵایەکی گەورە نییە. ژیانی وەرزێرێك ئەوەندە نرخی نییە. .. .. .

ژنەکەی چووە لای مێزەکە و بانگی کرد:

-وەرە. ... .. .

هەستا چوو بۆ لای و تەماشای کرد کە چۆن میزەکەی رازاندووەتەوە. بە گاڵتە گوتی:

-بە شانازی براکانمان . ... .. دەستەیەکی پێنج کەسی. .. .. بۆ ئەو دەمەی ببینە سەد کەس.

-دایك سکی پێ سووتا. .. .. پتری خۆش دەویست. پاش قسەکانی هەستی بە بارسووکییەك دەکرد و دەیدیت کە گرانایی خەفەتی رۆژی سووك بووە. لە خۆی رازی بوو. خێروخۆشی بۆ هەمووان بە ئاوات دەخواست.

دایك گوتی:

-نابێ ئەم قسانە بکەی. پیاو نابێ لە رووی لێکدانەوەی ئەو کەسانەوە نرخی خۆی دیاری بکا کە بە خوێنی ئەو تینوون. خۆتان دەبێ نرخی خۆتان بزانن. نەك لەبەر دووژمنان، بەڵکو لەبەر دۆستەکانتان.

وەرزێر بە ئەسپایی وەدەنگ هات:

-کام دۆستەکانمان؟

-من پێت دەڵێم کە گەل دۆستی هەیە.

-بەڵێ، هەیەتی، بەڵام نەك لێرە.

-باشە. ... .. خۆتان دەبێ لێرە دۆست پەیدا بکەن.

-بەڵێ. .. . دەبێ وابکەین.

تاتیانا بانگی کردن:

-وەرنە سەر میز!

لەسەر نانخواردن پیۆتر وای نیشان دا کە لە قسەکانی دایك نارەحەت بووە. دیسان دەستی کرد بە قسان:

-دایە دەزانی بەیانی زوو تۆ دەبێ وەرێ کەوی. تا کەس تۆ لێرە نەبینێ. پێوستە بچییە گوندی دراوسێمان و لەوێ عارەبانە بگری. .. .

ستێپان گوتی:

-بۆچی؟ خۆم دەیبەمەوە!

-نا، ئەگەر شتێك رووبدا لێی دەپرسن شەو لە ماڵی تۆ بووە یان نا؟ بڵێ! "لە کوێ بووە؟". من بانگم کردبوو!. .. .. "ها تۆ؟ باشە کەوابوو بچۆ بۆ زیندان!". تێگەیشتی؟ بۆ زیندان پەلەت لە چییە؟ هەر شتە بە نۆرەی خۆی. .. .. . بەڵام ئەگەر بڵێی شەو لە ماڵی تۆ نووستووە و ئەسپی بە کرێ گرتووە و رۆیشتووە، ناتوانن هیچت پێ بڵێن. کەس بەرپرسی رێبواران نییە. .. .. . ئەو هەموو هاتوچۆی گوندی دەکەن.. .. .

تاتیانا بە تانەوە گوتی:

-پیۆتر فێر بووی چۆن بترسی؟

لە ئەژنۆی خۆی دا و وەڵامی دایەوە:

-دەبی هەموو شت بزانی. دەبێ ترسان و نەترسان شارەزا بێ. لە بیرتە سەرۆکی دەفتەری دادپرسی بۆ ئەو رۆژنامەیە چەندی "باگانۆ"ی ئەزیەت کرد؟ باگانۆڤ پارەشی بدەیەی قەت دەست لە کتێب نادا. بەڵێ! ... .. . دایە بڕوا بکە هەموو کەس لە گوندیدا دەزانێ کە من لە فێڵەزانیدا دانامێنم. کەس لە من باشتر نازانێ کتێب و نووسراوە لە گوندیدا بڵاو بکاتەوە. ... .. . هەر چەندەی تۆ بتەوێ! خەڵکی نێرە خوێندەواریان کەمە و ترسەنۆکن. راستە. .. .. . لەگەڵ ئەمەش ژیان ئەوەندە دژوار بوو کە پیاو ناچارە چاو بکاتەوە و لەخۆی بپرسێ کە چی روودەدا؟ کتێب بە هاسانی وەڵام دەداتەوە: "ئەوەی روودەدا هەر ئەوەیە: بیر بکەوە و بڕوانە". زۆر وا هەیە پیاوی نەخوێندەوار باشتر لە خوێندەوار تێدەگا. بە تایبەتی ئەگەر خوێندەوارەکە تێر و پڕ بێ. ئەو وڵاتە باش دەناسم. زۆر شت دەبینم. پیاو دەتوانێ بژی، بەڵام ئەگەر نەیەوێ هەر لە سەرەتاوە بچێتە ژێر دار، ژیری و چالاکی پێویستە. ... ... . کاربەدەستانی دەوڵەتیش هەست بەوە دەکەن کە وەزع گۆڕاوە و وەرزێر بە ساردی لەگەڵیان دەبزووێتەوە. زەردەخەنەی نایەتە سەر لێوان و مێهرەبانی نییە .. .. .. . بە گشتی دەیەوێ واز لە کاربەدەستان بێنێ. لەم دواییەدا لە گوندی "سمۆڵیاکۆڤ" نزیك ئێرە هاتبوون باج وەربگرن, وەرزیران تاویان دا چۆماخ. .. .. . سەرپۆلیس هاواری کرد: "ئاخ سەرسەرینە . ... .. لە قەیسەر یاخی دەبن!". وەرزێرێك بەناوی "سپیڤاکین" وەڵامی دایەوە: "برۆ ون بە. نە خۆت بێ و نە قەیسەرت". ئەو قەیسەرە کێیە کە کراسیشتان لەبەر دادەنێ؟ دایە وەزع بەم جۆرەیە. دیارە سپیڤاکین گیرا و زیندانی کرا، بەڵام قسەکانی هەر مانەوە منداڵە وردەکەش دووپاتەیان دەکەنەوە. قسەکانی زیندوون و هاوار دەکەن!

نانی نەدەخوارد، هەر قسەی دەکرد. چاوە مەکراوییەکانی دەدرەوشان. زۆر شتی بچووکی لە بارەی ژیانی دێهاتییەکانەوە بۆ دایك باس دەکرد. هەر وەك کیسەیەك لە دراوی مس خاڵی بکا.

ستێپان دووجار پێی گوت:

-نانەکەت بخۆ!

پیۆتر پاروە نانێكێ و کەچکێکی هەڵدەگرت و پاشان وەك چوڕەیەك کە بخوێنێ، دەستی پێ دەکردەوە. ئاخرەکەی پاش شێوخواردن لە پڕ راست بووەوە و گوتی:

-کاتی چوونەوە هاتەوە.

لە دایك چووە پێش و دەستی گوشی:

-دایە گیان خواحافیز! لەوانەیە قەت یەکتر نەبینینەوە. پێویستە بڵێم کە ئاشنایەتی لەگەڵ تۆ و بیستنی قسەکانت بۆ من زۆر خۆش بوو. بێجگە لە کتێب جانتاکەت چی دیکەی تێدایە؟

-شاڵێکی خوری تێدایە.

-زۆر باشە. شاڵێکی خوری. ستێپان گوێت لێیە؟ ئێستا ئەم پیاوە جانتاکەت دێنێ. ستێپان با برۆین. خواحافیز. .. .. بەخۆشی دانیشن!

کە ئەوان وەدەرکەوتن، تاتیانا جێگای بۆ دایك راخست. لە چەکمەجە هێندێ جلی هێنانەدەر و لەسەر قەرەوێڵەکەی دانان.

دایك گوتی:

-کوڕێکی زرینگە!

تاتیانا چاوێکی لێکرد و وەڵامی دایەوە:

-قسە دەکا و قسە دەکا، بەڵام هەر لە نزیکەوە دەبیسرێ.

دایك پرسی:

-مێردەکەی تۆ چۆنە؟

-پیاوێکی باشە. ئارەق خۆر نییە. تەواو پێکەوە رێککەوتووین. تەنیا کەمێك بێ زیبکە. قەدی راست کردەوە و پاش تاوێك بێدەنگی قسەکانی درێژە پێدان:

-ئێستا دەبێ چ بکەین؟ دەبێ خەڵك بهاوروژێنن؟

-ئاشکرایە! هەموو کەس لە فیکری ئەوەدایە. بەڵام هەر کەس بۆ خۆی بە جیا. پێویستە بە دەنگی بەرز لەو بارەوە قسە بکرێ. دەبێ لە هەوەڵەوە یەکێك هەبێ بڕیار بدا.

لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشت و پرسی:

-دەڵێین تەنانەت ژنی گەنج و دەوڵەمەندیش دەستیان لەو کارەدا هەیە. دەچن بۆ کرێکاران شت دەخوێننەوە. ئەو خانمانە ناترسێن، لەو کارە ناپرینگێنەوە.

پاش ئەوەی بە وردی گوێی دایە وەڵامی دایك، هەناسەیەکی لە ناخەوە هەڵکیشا و چاوی لەسەر یەك دانان و سەری لەقاند و درێژەی پێدا:

-جارێك لە كتێبدا خوێندمەوە كە ژیان مانای نییە. .. .. . جێبەجێ لەو مەبەستە تێگەیشتم. من دەزانم ئەو ژیانە چییە! ریزە قیكرێك هەیە، بەڵام لێك گرێ نەدراون و وەك مەڕی بێ شوان بە دەوری یەكدا دەگەڕێن, كەس نییە كۆیان بكاتەوە. ئینسان نازانێ چ بكا. ئەو ژیانەیە كە مانای نییە. پێم خۆش بوو لەبەر ئەو ژیانە رابكەم، تەنانەت ئاوڕیش نەدەمەوە. ئینسان چەند تێبگا ئەوەندەش بەدبەختە. .. .. .

دایك لە گەشایی چاوە شینەكان و روومەتی ئەو ژنەدا ئەو دەردەی دەدیت و لە قسەكانیشیدا دەیبیست. ویستی دڵخۆشی بداتەوە. .. .. . .

-بەڵام خۆشەویستم دەزانی دەبێ چ بكەی؟

تاتیانا بە نەرمی قسەكەی پێ بڕی:

-دەبێ بزانین چ بكەین. ... .. . جێگاكەت سازە، راكشێ.

بە بیركردنەوە بۆلای سۆبە چوو. .. .. . دایك بێ ئەوەی خۆی بگۆڕێ راكشا. لە هیلاكییان ئێسكەكانی ژانیان دەكرد. بە ئەسپایی ناڵاندی. تاتیانا چرای كوژاندەوە. كە تاریك بوو دیسان تاتیانا بە دەنگێكی نەرم و یەكسان لە ژووری دەستی پێكرد:

-نوێژان ناكەی؟ منیش لام وایە ئەوانە هەموو بۆ ترساندنی ئێمە ساز كراون. چونكە نەفامین. .. .. .

دایك لە جێگادا بزووت. تاریكاییەكی بێ بن لە پەنجەرەوە تەماشای دەكرد. خشەخش و دەنگە دەنگێكی نهێنی لە دەوروبەری دەخزین. بە دەنگێكی ترساوانەوە گوتی:

-لەبارەی خواوە قسەم نییە. .. .. بەڵام بڕوام بە عیسا هەیە. بڕوا بە قسەكانی دەكەم: "هاوڕەگەزی خۆت وەك خۆت خۆش بوێ. ... ."

بەڵێ بڕوام بەوە هەیە.

لەپڕ بە پەشۆكاوی گوتی:

-ئەگەر خوا هەیە بۆچی ئاگای لە ئێمە نییە؟ بۆچی بە قودرەتی خۆی ئێمە ناپارێزێ؟ بۆچی رێگا دەدا كە خەڵك بە دوو چینی جیاواز دابەش بكرێن؟ بۆچی رێگای ئازار و كوێرەوەری مرۆڤ و دیلی و ژێردەستی و خراپە و دڕندەیی دەدا؟

تاتیانا بێدەنگ بوو. دایك لە تاریكاییدا تارمایی لەشی تاتیانای دەدیت. ئەو ژنە گەنجە نەدەبزووت. دایك زۆر خەمبار بوو، چاوی لەسەر یەك دانان. لەپڕ دەنگێكی سارد و باریك هات:

-هەرگیز لەسەر مردنی منداڵەكانم نە خوا و نە مرۆڤ نابەخشم. ... .. قەت!

دایك هەستاوە سەر جێگا. لە دەرد و ژانی ئەو ژنە سەری سوورِ ما.

بە نەرمی گوتی:

-هێشتا گەنجی. .. . دیسان منداڵتان دەبێ!

پاش تاوێك بێدەنگی ژنەکە گوتی:

-نا! دوکتۆر گوتوویە تازە قەت منداڵت نابێ.

مشکێك بەوێدا رای کرد. تەقەیەکی وشك بێدەنگییەکەی شکاند. دیسان خشەخش و دەنگی باران، هەروەك بە قامکی لەرزۆك لە شتێك بدرێ، لەسەربانی بیسرا. تنۆکەی باران بە خەمناکی وەعەرزی دەکەوتن و شەوی درێژی پاییز بە رەوتی باران یەك ئاهەنگ دەبوو. .. .

دایك چاوی دەبیرەخەو راچووبوون. هەستی پێی یەکێك لە دەرەوە هات. دەرگا بە ئەسپایی کرایەوە و یەکێك لەسەرخۆ گوتی:

-تاتیانا خەوتووی؟

-نا. .. .. .

-ئەو نووستووە؟

_بەڵێ، لام وایە. .. .. .

رووناکییەك پەیدا بوو، لەرزی و لە تاریکیدا نوقم بوو. کابرا هاتە لای جێگای دایك و پاڵتۆیەکی بەسەر لاقاندا درابوو راستی کرد. ئەو دڵسۆزییە کاری کردە سەر دایك. دیسان چاوی لەسەر یەك دانان و بزەیەکی هاتێ. ستێپان بە بێدەنگی جێگاوبانی خۆی هەڵگرت و چووە کەلەگی.

دایك زۆر لەسەر هەست لە بێدەنگییەکی تەمبەڵانەی خەوهێنەردا گوێی هەڵخسبوو، خۆی مات کردبوو لە تاریکیدا سەروچاوی خوێناوی رێبینی دەهاتە بەرچاو. سرت و خورتێکی کورتی لە کەلەگی بەر گوێ کەوت.

-دەزانی پیاوی چۆن لەو کارەدان. پیاوی کۆنەساڵی وا کە هەزار خەم و خەفەتیان هەبووە و زەحمەتیان کێشاوە. نۆرەی ئەوەیە بحەسێنەوە، بەڵام بزانە چ دەکەن. بەڵام تۆ ستێپان. .. .. . گەنجی، بەهۆشی . .. .. . ئاخ!

وەرزێر بە دەنگێکی گیراو وەڵامی دایەوە:

-پیاو ناتوانێ بێ فکرکردنەوە بێتە نێو ئەو کارە. .. . . کەمێك راوەستە. . . . . ئەو هەوایە دەزانم.

دەنگەدەنگ بڕایەوە. .. .. . کابرا دیسان وەدەنگ هاتەوە:

-ڕێگا ئەوەیە. .. . دەبێ لە پێشدا بە جیا و بە تایبەتی لەگەڵ وەرزێران قسەی بکەی، بۆ نموونە لەگەڵ "ماکۆڤ"، "ئالێشا". خوێندەوارن، نازان، لە حکومەت بێزارن. هەروەها "شۆرین سێرگێی" وەرزێرێکی ژیرە. "کنیازیف" پیاوێکی ڕاست و نازایە. بۆ دەست پێکردن جارێ بەسە. .. ... .. پاشان کە بووین بە دەستەیەکی بچووك دەزانین چ دەکەین! دەبێ بزانین لە کوێ دەتوانین ئەم ژنە بدۆزینەوە. دەبێ لەو کەسانە وەنزیك کەوین کە ئەو باسی دەکردن. .. .. تەورەکەم هەڵدەگرم و دەچمە شار. .. .. تۆش بە خەڵك بڵێ کە چووەتە شار دارشکێنی بکا و پارەیەك پەیدا بکا. .. . دەبێ ئاگامان لە خۆمان بێ. حەقیقەتی کە دەڵێ: پیاو دەبێ قەدر و نرخی خۆی بزانێ. کاتێك کاری وا هاتە پێش، ئەگەر پیاو بییەوێ دەست بەوە بکا، دەبێ قەدری خۆی بزانێ. بزانە ئەم وەرزێرە، ئەم ڕێبینە، سەر بۆ خواش نەوی ناکا تا دەگا بە سەرپۆلیسێك. خۆڕاگری نیشان دەدا، هەر وەك تا ئەژنۆیان لە عەرزا گێرابێ. ئەدی نیکیتا؟ شەرمی کرد. ... بەڕاستی موعجیزەیە. .. .ئاخ ئەگەر گەل هاودەنگ بێ و دەست بەکار بێ، دنیا بە دووای خۆیدا ڕادەکێشێ. .. ..

-لەپێش چاوی ئێوە لە پیاوێك دەدەن و ئێوەش دەست لەسەر سینگ ڕادەوەستن!

-ڕاوەستە!دەبێ شوکری خوا بکەی کە خۆمان لێمان نەدا. چونکە هێندێ جار بە وەرزێران لە گیراوەکان دەدەن. ئەوانیش بە قسەیان دەکەن. ڕەنگە بە دڵ بەزەییان پێدابێ، بەڵام ناچارن دەیکەن، لە ترسی وەی ئەوەك خۆیان ئازار بدەن. غیرەتی ئەوەیان نییە دەست لە کاری ناحەز بگێڕنەوە. دەبێ کارێکی وا بکەین کە ژمارە زۆر بێ و جا پێکەوە شۆڕش بکەین!

ماوەیەکی زۆر قسەی کرد. هێندێ جار ئەوەندە بە سەبر قسەی دەکرد کە دایك تێنەدەگەیشت. هێندێ جاریش دەنگی هەڵدێنا. ئەو دەم ژنەکە دەیگوت:

-سەبر! وەخەبەری دێنی.

دایك خەوی لێکەوت. خەو هەر وەك پەڵە هەورێکی خەمهێنەر خۆی بەسەردا کێشا و لەگەڵ خۆی برد. کاتێك تاریك و ڕوونی بەیانی بە چاوی خەواڵوودوە تەماشای پەنجەرەی دەکرد و بێدەنگییەکی سارد بە خەواڵوویی بەسەر گوندیدا مەلەی دەکرد و زەنگی کلیساکان تازە دەنگی دەدایەوە، تاتیانا دایکی وەخەبەر هێنا.

-سەماوەر سازە، چای بخۆینەوە. تا لە عارەبانەدا سەرمات نەبێ. ... .. ستێپان هەر وەك کارێکی زۆری هەبێ، ڕیشە قرژەکەی لێك و لوس دەکرد و پرسی:

-لە شار چۆن دەتوانم دایك بدۆزمەوە؟

دایك وا هاتە بەرچاو كە سەروچاوی ئەو وەرزێرە لە دووێ شەوێوە خۆشەویستتر بووە. لە كاتی چاخواردنەوەدا بە خۆشحالی گوتی:

-ئەم پێشهاتە چەند سەیرە!

تاتیانا پرسی: پێشهاتی چی؟

-ئەم یەكتر ناسینە. .. . زۆر سادەیە. .... . .

دایك بە بیركردنەوە و بە دڵنیایی گوتی:

-لەو كارەدا هەموو شت زۆر سادەیە.

ژن و مێرد بە زمانێكی خۆش و دڵێكی پاك و بە بەخێرهێنانێكی گەرمەوە بەرێیان كرد. كە سواری عارەبانە بوو بیری كردەوە كە ئەو وەرزێرە زۆر بە وریایی وەك مشكی كوێر، بێ هەڵلا و بگر بەردەوام كار دەكا. دەنگی ناڕەزایی ژنەكەی لە بن گوێی هەر دێت و چاوە شینەكانی بە گەشاییەكی وشك و داخ دەدرەوشێن. هەتا ماوە داخ و خەفەتی دایكێك كە بۆ منداڵەكانی دەگرێ، هەر دەمێنێ.

دایك جارێكی تر كەوتە فكری رێبین و سەروچاوە خوێناوی و چاوە گەشەكانی و قسە بەتینەكانی هێنایەوە بیر. دڵی گیرا و هەستێكی تاڵی بێدەسەڵاتی لەبەرامبەر ئەو دڕندانەدا بەسەردا هات. تا گەشتەوە شار، تەلاتەتی رێبینی بە ریشی رەش و كراسی دڕاو و دەستی لە پشتەوە بەستراو و قژی ئاڵۆز و دەموچاوی بەقین داگیرساوەوە، هەر لەبەر چاوی بوو. هەروەها بیری لەوە دەكردەوە كە خەڵكێكی زۆر لە گوندی بە نهێنی چاوەڕوانی حەقیقەت دەكەن و هەزاران كەس بێدەنگ، بێ ئەوەی لە تەواوی ژیاندا چاوەڕوانی پاداش بن، كار دەكەن.

لەو كاتەدا كە بیری لە سەفەری سەركەوتووی خۆی دەكردەوە، لە دڵدا هەستی بە خۆشییەك دەكرد و هەوڵی دەدا كە نیتر ستێپان و ژنەكەی لەبیر بەرێتەوە. لە دوورەوە بورجەكانی كلیسا و خانووەكانی شاری چاو پێكەوت. هەستێكی خۆش تینێكی وەبەر دڵی هێنایەوە و هێدی كردەوە.

## (١٩)

نیكۆلای بە قژی ئاڵۆز و كتێبێك بە دەستەوە، دەرگای لە دایك كردەوە، لە خۆشییان گەشكە بوو، هاواری كرد:

-هەر وا زوو. .. .. زۆر باش بوو. .... . . زۆرم پێخۆشە. .... .... .

مۆزڵی لەبن چاویلکەکەدا وێك دەکەوتن. یارمەتی دا پاڵتۆکەی داکەنێ و بە خۆشەویستییەوە تەماشای کرد و گوتی:
-دوێنێ شەو هاتبوون ئێرە بگەڕێن. هۆی ئەوەم لەخۆم دەپرسی، ترسام، نەکا پێش هاتێك بۆ تۆ روویدابێ. ...
. بەڵام لەگەڵ خۆیان نەبردم. خەیاڵم ئاسوودە بوو. ئەگەر تۆیان گرتبا دەستیان لە من هەڵنەدەگرت.
بردییە ژووری نانخواردن و بە هەناسەسواری درێژەی پێدا:
هەرچۆنێك بێ منیان لە ئیدارە وەدەرنا. ... .. . لەو بارەوە خەم ناخۆم. هەراسان ببووم ئەوەندەی ژمارەی ئەو وەرزێرانە رابگرم کە هیچیان نەماوە جووتی پێ بکەن. کاری تر هەیە کە دەبێ بیکەم.
ژوورەکەی هەر دەتگوت دەستێکی بەهێز لە تووڕەبوونێکی ئەحمەقانەدا دیوارەکانی راوەشاندووە تا هەموو شت تێکوپێك بدا. وێنەکان کەوتبوونە خوارێ، کاغەزەکانی دیواری لێکرابوونەوە و دڕدڕ کرابوون. لە جێگایەك تەختەیەکیان لە گۆڕاییی ژوورەکە هەڵکەندبوو. خۆڵەمێشی پێش سۆبە بلاو کرابۆوە. لە پەنا سەماوەری کوژاوەوە، لەسەر مێز قاپی پیس و ژامبوون و پەنیر لەسەر کوتە کاغەزێك و پاروە نان و کتێب و خەڵوز دەبینران. دایك بزەیەکی هاتێ و نیکۆلای بەخۆدا شکایەوە:
-ئەم پەرش و بلاوییە کاری منە. بەڵام دایە گیان گرنگ نییە. لام وایە دێنەوە، جا بۆیە هیچ شتێکم رێکوپێك نەکردۆتەوە. باشە، سەفەرەکەت خۆش بوو؟
ئەم پرسیارە بە گرانی وە سنیگی دایك کەوت. دیسان دیمەنی رێبینی هاتەوە بەرچاو. خۆی لەوە بە تاوانبار زانی کە جێبەجێ باسی نەکردبوو. چووە لای نێکۆلای و دەستی بە گێرانەوە کرد. هەر لەو کاتەشدا دەیویست هێدی و لەسەرخۆ بێ و هیچ شتێك لەبیر خۆی نەباتەوە.
-گرتیان!. .. .. .
نیکۆلای راچەنی.
-بەڵێ.... .. . .
-چۆن؟
دایك بە دەست راوەشاندن بێدەنگی کرد. هەر وەك لە بەرامبەر دادپرسی بێ و لە ئازاردانی ئەو پیاوە سکاڵا بکا، دەستی بە قسان کرد.
نیکۆلای پاڵی وە کورسی دابوو. رەنگی پەڕیبوو. لێوی خۆی دەگەستن و گوێی بۆ راداشتبوو. چاویلکەی لەسەر مێزی دانا و دەستێکی بە روومەتی خۆیدا هێنا، دەتگوت هەودای جاڵجاڵۆکە لە دەموچاوی دەکاتەوە. گنجی

دەموچاوی قوڵتر بوون و ئێسکی روومەتی سەیر دەرپەڕین. کونە لوتی کەوتنە لەرزین. یەکەم جار بوو کە دایك نیکۆلای ئاوا ببینێ. ئەو وەزعە تۆزێکی ترساند.

پاش ئەوەی دایك بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، نیکۆلای بێدەنگ هەستا و دەستی لە گیرفانی نان و لە ژووورێدا دەستی کرد بە هاتوچۆ. ددانی رێك دەگوشین و لەژێر لێوانەوە دەیگوت:

-دەبێ پیاوێکی لێوەشاوە بێ. ئازایەکی سەیر. ... .. . لە زیندان ئازاری دەدەن. ئەو کەسانەی وەك ئەوەن لە زینداندا چارەڕەشن... . . . . .

پاشان لە بەرامبەر دایك راوەستا و دەستی پتر لە گیرفانی راکردن. بە خۆڕایی هەوڵی دەدا کە پێشی هەڵچوونی خۆی بگرێ کە کاری لە دایکیش کردبوو. چاوی وەك نووکی چەقۆ باریك ببوونەوە. دیسان دەستی کرد بە هاتوچۆ و بە دەنگێکی سارد و تووڕە پاشماوەی قسەکانی درێژە پێدان:

-بڕوانە ئەو بێ شەرمییە! تاقمێك مرۆڤی نەفام، بۆ راگرتنی دەسەڵاتی شوومیان بەسەر گەلدا، لە هەموو کەس دەدەن، دەخنکێنن و زووڵم لە هەموو کەس دەکەن. .. .. . . دڕندەیی زیاتر دەبێ. بێ بەزەیی دەبێتە قانوونی ژیان. بیر بکەوە! هێندێك کەس لێ دەدەن و ملهوڕانە دەبزوونەوە، چونکە دڵنیان سزا نادرێن. چونکە نەخۆشی شکەنجەدانی خەڵکیان گرتووە. نەخۆشی گڵاوی ئەو کۆیلانەیان گرتووە کە رێگا دراون بە هەموو هێزیانەوە غەریزەی کۆیلەتی و دابی چەپەڵی خۆیان ئاشکرا بکەن. هێندێکی تر ژارخواردووی تۆڵەن. هێندێکیش لەژێر زەبری لێداندا خەرفاون و کەڕولاڵ بوون. .. . خەڵك خراپ دەکەن.

راوەستا و هەر دوو دەستی گرتن و بە دەنگێکی هێدی درێژەی پێدا:

-پیاو بێ ئەوەی بییەوێ، لەو ژیانە دڕندانەیەدا گێژ دەبێ.

پاشان هاتەوە سەرخۆ. چاوی دەدرەوشان. بە هێمنی تەماشای دایکی دەکرد کە چاوی بە فرمێسکان تەڕ ببوون.

-نابێ کاتمان بە خۆڕایی بڕوا. .... . . . جانتاکەت لە کوێیە؟

-لە چێشتخانەیە.

جاسووسان دەورەی ماڵیان داوە، ناتوانین ئەو هەموو رۆژنامەیە بە دزی لە ماڵی بەرینە دەر. نازانم لە کوێیان بشارمەوە. .. . لەوانەی ئەمشەو ژاندارمەکان بێنەوە. پێم خۆش نییە تۆ بگرن. هەرچەندە حەیفیشە، بەڵام ئێستا هەموویان دەسووتێنم.

دایك پرسی: چی؟

-هەمووی ئەوانەی لە جانتادان. .. ..

دایك تێگەیشت و هەر چەند خەفەتیشی زۆر بوو، بەڵام ئەو سەربەرزییەی لە سەرکەوتنی خۆیدا هەستی پێدەکرد، بزەیەکی خستبووە سەر لێوانی. وردە وردە وەجۆش هات و گوتی:

-جانتاکەم هیچی تێدا نییە، تەنانەت پەڕە کاغەزێکیش.

پاشماوەی سەر گوزەشتەکەی بۆ گێڕایەوە. نیکۆڵای لە پێشدا بە نیگەرانی و پاشان بە سەرسووڕمانەوە گوێی بۆ قسەکانی راگرت. ئاخرەکەی قسەکانی پێ بڕی و گوتی:

-شتێکی سەیرە، شانسێکی سەیرت هەیە!

لە کاتێکدا بە جارێك شەرم دایگرتبوو، خرۆشا و دەستی دایکی گوشی و گوتی:

-بەم هەموو بڕوایەی بە گەلت هەیە من دڵخۆش دەکەی. .. . . تۆم لە دایکی خۆم خۆشتر دەوێ. . . .

دایك بە پرسیارەوە زەردەخەنەیەکی هاتێ و لە بنەوە چاوێکی لێکرد و دەیویست بزانێ نیکۆڵای لەبەرچی وا شاد و لەسەر حاڵە.

نیکۆڵای دەستی لەسەری خست و بە بزەیەکی دڵخۆشکەرەوە گوتی:

-هەموو شت سەیرە. .. . دەزانی. .. . . ئەو رۆژانە من بە چەشنێکی سەیر شاد بووم. هەموو وەختی خۆم لەگەڵ کرێکاران رابواردووە. شتم بۆ خوێندنەوە. . . . . . وتووێژمان کردووە. . ... . لێیان وردبوومەوە. هەستێکی پاکم لە دڵمدا کۆکردووەتەوە. چەندە ئینسانی باشن. هێندەی رووناکی رۆژەکانی مانگی ئەیار! مەبەستم کرێکارە گەنجەکانە. بەهێز و بەهەستن. تینووی تێگەیشتنی هەموو شتێکن. پیاو ئەوانە دەبینێ بەخۆی دەڵێ کە رووسیا دەبێتە دیموکراسی هەرە پرشنگداری سەر زەوی.

هەر وەك بییەوێ سوێند بخوا. باسکی هەڵێنا و پاش تاوێ بێدەنگی لەسەر قسەکانی رۆیشت:

-لەبیرتە لە ئیدارەیەك کارم دەکرد. لە نێو ژمارە و کاغەزدا ترشابووم. ساڵێك ئەو جۆرە ژیانە بۆ فەوتانم بەس بوو. چونکە پێشتر راهاتبووم لەنێو خەڵکدا بژیم. کاتێك لە خەڵك جیا دەبمەوە ناڕەحەت دەبم. .. . . بە هەموو تواناوە بۆ لای خەڵك دەگەڕێمەوە. ئەوجار دەتوانم سەرلەنوێ بە ئازادی بژیم. دەتوانم دیسان کرێکاران ببینم و ئەوەی دەیزانم فێریان بکەم. دەزانی! من لە نزیك لانکی فیکری تازە لە دایك بووم، لە پێش سیمای هێزێکی داهێنەر کە خەریکە پەیدا دەبێ، دەمێنمەوە. بە چەشنێکی سەر سووڕهێنەر سادە و جوانە و زۆر سەیر هاندەرە. مرۆڤ گەنج دەبێتەوە، خۆڕاگر دەبێ، خاوێن دەبێتەوە، ژیانێکی تەواو رادەبوێرێ.

لە خۆشییان دەستی کرد بە پێکەنین و دایکیش لە شادی ئەودا بەشدار بوو و گوتی:

تۆ پیاوێکی لەرادەبەدەر باشی. هێزێکی مەزن و لەسەرخۆت هەیە. ئەو هێزە بە توانایەکی زۆرەوە دڵان بۆ لای تۆ رادەکێشیێ. زۆر لەگەڵ خەڵك دەدوێ و زۆر باش خەڵك دەناسی.

-ژیانی ئێوە دەبینم و تێدەگەم، خۆشەویستم.

-مرۆڤ تۆی خۆش دەوێ. .. .. خۆشەویستی مرۆڤێك ئەوەندە خۆشە، ئەوەندە خۆشە. .. خۆزگە زانیبات!

دایك بە گەرمی دەستی بەسەر دەستی نیکۆلایدا هێنا و لەژێر لێوانەوە گوتی:

-ئەوە ئێوەن کە لەنێو مردوواندا زیندەوەر زیندوو دەکەنەوە. خۆشەویستم، بیر دەکەمەوە دەبینم کە زۆرمان کار لە پێشە و زۆریشی سەبر دەوێ! پێم خۆشە دڵسارد نەبی. گوێ بدەیە، پاشماوەی باسی ئەو ژنە وەرزێرەت بۆ بگێڕمەوە.

نیکۆلای لە پەنای دانیشت و لە کاتێکدا رووی شادی خۆی وەرگێڕابوو، دەستی بە مووەکانی خۆیدا دەهێنا. بەڵام خێرا رووی کردە دایك و بە تامەزرۆیی گوێی بۆ باسەکە راگرت:

-زۆر سەیرە. .. . شانست هێناوە، زۆر وێدەچوو کە بگیرێی. . ... وادیارە وەرزێریش وە جموجۆڵ کەوتون. ئەمەش سەیر نییە! لێرەوە ئەو ژنە دەبینم، هەست بە دڵی پڕ لە قینی دەکەم . ... . . . حەقتە کە دەڵێی دەردی ئەو قەت هێدی نابێ. هێندێ کەسی ئەوتۆمان پێویستە کە هەر خەریکی لادێ بن. لە هەموو جێیەك لە پیاومان کەمن. . . . . ژیان هەزاران باسکی پێ دەوێ.

دایك لەسەرخۆ گوتی:

-پێویستە پاڤێڵ ئازاد بێ. . . . . ئەندرێیش!

نیکۆلای چاوێکی لێکرد و سەری بەردایەوە:

-دایە بزانە. ... . . هەرچەند پێت ناخۆش دەبێ، بەڵام راستت پێ بڵێم، پاڤێڵ زۆر باش دەناسم. گومانم لەوەدا نییە کە راناکا. دەیەوێ موحاکەمە بکرێ، دەیەوێ خۆی بە سەربەرزی نیشان بدا. لەو بەشە چاو ناپۆشێ و فایدەی نییە. لە سیبریا دەگەڕێتەوە. . ...

دایك لەسەرخۆ هەناسەیەکی هەڵکێشا:

-چار نییە؟ لەمن باشتر دەزانێ کە دەبێ چ بڕیارێك بدا. ... ..

نیکۆلای لەبن چاویلکەوە چاوێکی لە دایك کرد و درێژەی بە قسەکانی دا:

-خۆزگە ئەو وەرزێرەی باسی دەکەی زوو هاتبایە. بە تایبەتی دەبێ وتارێکی کورت لەبارەی رێبینەوە بنووسرێ و لە دێهات بڵاو بکرێتەوە. ... . چونکە بە ئاشکرا هەنگاوی ناوە، زیانێکی پێ ناگەیەنێ و نووسینی ئەو

وتارەش بۆ کاری ئێمە زۆر بە کەڵکە. من ئەمڕۆ دەینووسم، بەیانیش لیودمیلا چاپی دەکا. .. . بەڵام چۆن بیگەیەنینە گوندی؟
-من دەیانبەم.
نیکۆلای دەنگی هەڵێنا:
-نابێ . . . .. سوپاس. پێت وانییە کە ڤێسۆڤشیکۆڤ بتوانێ ئەو کارە بکا؟
-دەبێ لەگەڵی باس بکرێ.
-خەریك بە . . . . . . پێشی بڵێ کە دەبێ چۆن بجووڵێتەوە.
-باشە، ئەدی من چ دەکەم؟
-خەمێ مەخۆ!
دەستی کرد بە نووسین. دایك لەگەڵ کۆکردنەوەی شتومەکی سەر مێزەکە چاویشی لەو دەکرد و قەڵەمەکەی دەدیت کە بە دەستییەوە دەلەرزێ و زنجیرەی درێژی وشەکانی دەخستە سەر کاغەز. هێندێ جار نیکۆلای پشت ملی دەلەرزی و سەری هەڵدێنا و چاوی لەسەر یەك دادەنان. دایك هەستی بە وەجۆش هاتنێکی تەواو دەکرد. لە بن لێوانەوە گوتی:
-سزایان بدە. چاو لەو پیاوکوژانە مەکە!
-ئەوەتا، ئامادەیە. ئەم کاغەزە لە باخەڵتدا بشارەوە. ... . . . بەڵام بزانە ئەگەر ژاندارم تووشت بن دەتپشکنن.
لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:
-با چەخە بن!
ئێواری دوکتۆر ئیڤان دانیلۆڤیچ هات. نیکۆلای لێی پرسی:
-کاربەدەستانی دەوڵەتی بۆچی وا لەپڕ هاورووژاو و شێواون. دۆینێ شەو هەموو جێگایەك گەڕان. . .. . ئەخۆشەکە لە کوێیە؟
-دۆینێ رۆیشت. ئەمڕۆ شەمۆیە. نەیدەتوانی لە کۆبوونەوەدا بەشدار نەبی. ... . دەزانی؟ دوکتۆر وەڵامی دایەوە.
-پیاو کە سەری قەڵشابێتەوە، چوونی بۆ کۆبوونەوە ئەحمەقییە.
-هەوڵم دا ئەمەی تێبگەیەنم، بەڵام بێ سوود بوو.

دایك گوتی: دەیویست لەكن هاوڕێیانی خۆی هەڵكێشێ و پێیان نیشان بدا كە هێشتا هیچ نەبووە لەو ڕێگایەدا خوێنی خۆی ڕشتووە. . ... ..

دوكتۆر چاوێكی لێكرد و ددانی ڕێك گوشین و گوتی:

-ئاخ. ... . . ئێوە چەند خوێنخۆرن!

-باشە، گیانەكەم تۆ ئیتر لێرە كارت نەماوە. دەتوانی بڕۆی. ئێمە چاوەڕوانی خەڵكین. دایە ئەو كاغەزانەی بدەیە. . . . . .

دوكتۆر گوتی: دیسان؟

-وەرە ئەوەتا، بیانگەیەنە چاپخانە!

-بەچاوان. ... . . هەر ئێستا.

-بەڵێ. .... . . جاسووسێك لە پێش ماڵەكەمانە.

-دیتوومە. لە پێش ماڵی منیش هەیە. .. ... باشە، خواحافیز. .. . ژنی بێ بەزەیی! خواحافیز. ... . . دەزانن هاوڕێیان! ئەو پێكهەڵپڕژانەی لە قەبرستان ڕوویدا، مەسەلەیەكی زۆر باش بوو. لە نێوشار لە هەموو شوێنێك باسی دەكرێ و لەسەر زمانانە. كاری لە خەڵكدا كردووە. وایان لێ دەكا كە بیر بكەنەوە. ... . . وتاری تۆ لەم بارەوە، زۆر باش بوو لە كاتی خۆیدا بڵاوكرایەوە. من هەمیشە گوتوومە پێك هەڵپڕژانێكی باش لە ڕێككەوتنێكی خراپ باشترە.. .. .. ..

-باشە. ... . . بڕۆ. ... . ...

-بۆچی پیاوەتیت نییە. دایە، دەست بێنە. ئەو كوڕە كارێكی ئەحمەقانەی كرد!. ... . دەزانی ماڵەكەی لە كوێیە؟

نیكۆلای ناونیشانی كوڕەكەی دایە.

-دەبێ سبەینێ بچمە ماڵەكەی. .. . كوڕێكی باشە. . .... . وانییە؟

-بەڵێ. ... . زۆر دڵپاكە و ژیر و ئازایە. .. . . .

لەكاتی وەدەركەوتندا دوكتۆر گوتی: نابێ لێی خافڵ بن. .. . . منداڵێكی ئەحمەق نییە. هەر دەبێ لەو كوڕانە ڕووناكبیری پرۆلتاریا پێ بگا. وەختێك ئێمە گەیشتینە ئەو قۆناخە كە بەڕاستی ناتەبایی چینایەتی نامێنێ، ئەوانە جێگامان دەگرنەوە. ... .

-هاوڕێ تۆ زۆر بە قسە بووی.

-بە کەیفم بۆیە ئەوەندە قسە دەکەم. ... . .

-کەوابوو چاوەڕوانی زیندان دەکەی؟ لەویّ بحەسێیتەوە.

-سوپاس . ... . ماندوو نیم.

دایك گوێی دەدا قسەکانیان و بەوە شاد بوو کە بۆ بریندارەکە دڵسۆزی دەکەن. کە دوکتۆر ڕۆیشت نیکۆڵای و دایك لەسەر مێز دانیشتن و چاوەڕوانی میوانەکانی شەویّ بوون. نیکۆڵای ماوەیەکی زۆر بە دەنگی نەرم باسی ئەو هاوڕێیانەی خۆی بۆ کرد کە دوورخرانەوە و ئەوانەی رایان کردووە و بە ناوی خواستەمەنی کاری خۆیان درێژە پێدەدەن. دەنگی نەرمی نیکۆڵای لە دیوارە رووت و قووتەکانی ئەو ژوورەدا دەنگی دەدایەوە, دەتگوت بڕوا بە چیرۆکی قارەمانەتی ئەو کەسانە ناکەن کە هێزی خۆیان فیدای نوێکردنەوەی مرۆڤ کردووە. سێبەرێکی نیوە گەرم بەسەر خەیاڵیدا وەك گیان لەبەرێکی مەزن و هێزێکی پیاوانە و لەبن نەهاتوو خۆیان دەنواند. ئەو گیان لەبەرە بە شێنەیی بەڵام بیّ وچان لەسەر زەوی بە ڕێگادا دەڕوا و بۆگەنی کۆنی درۆ لە ڕەگ و ریشە دەردێنیّ و حەقیقەتی سادە و رووناکی ژیان بۆ خەڵك دەردەخا. یانی ئەو حەقیقەتەی بەڵێنی رزگاری لە تەماع و قین و درۆ —ئەو سیّ دێوەزمەی دنیایان هێناوەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان- بە هەموو خەڵك دەدا.

ئەو خەیاڵە کاری کردبووە سەر دڵی دایك. پێشتر لە بەرامبەر وێنەی پیرۆزدا چۆکی دادەدا و شوکرانەی لەسەر ئەو ڕۆژانەی ژیانی دەبژارد کە کەمتر کوێرەوەرییان تێدا بووە. ئەو تەنسیرە لە دڵی دایکدا وەك ئەو هەستە دەچوو کە لە کاتی دووعادا بەسەریدا دەهات. ئێستا ئیتر رابوردووی خۆی لەبیر کردبوو. ئەو هەستەی لە رابردوودا بۆی پەیدا ببوو، ئێستا هەراوتر و و گەشتر و شادیهێنتر ببوو. ئەو هەستە قوڵتر دەچووە ناخی دەرونییەوە و ڕۆژ بەرۆژ پرشنگدارتر دەبوو.

نیکۆڵای قسەکانی بڕی و بە دەنگ گوتی:

-ئیتر ژاندارمەکان نایەن.

دایك تەماشایەکی کرد و پاش کەمێك بێدەنگی گوتی:

-مردووشۆر بیانبا!

دیارە! . ... . . دایە ڕەنگە زۆر ماندوو بی، دەبیّ بچی بنووی. بەڵام بە هێزی، خۆت لەبەر ئەم هەموو خەم و خەفەت و کوێرەوەرییە رادەگری. تەنیا سەرت زۆر سپی بووە. بچۆ بحەسێوە. ... . . بچۆ.

دەستی یەکتریان گوشی و لێك جیابوونەوە.

# (٢٠)

دایك زوو خەوی لێكەوت. بەیانی لە دەنگی دەرگای چێشتخانە وەخەبەر هات. توند لە دەرگایان دا. هێشتا هەوا تاریك بوو. دایك خێرا جلی لەبەر كرد و بۆ لای چێشتخانە چوو و لە پشت دەرگا پرسی:

-كێیە؟

دەنگێكی نەناسراوە وەڵامی دایەوە:

-منم!

-تۆ كێی؟

دەنگەكە بە ئەسپایی و بە پاڕانەوە گوتی:

-بیكەوە!

دایك دەرگای كردەوە، نیگنات هاتە ژوور و بە خۆشییەوە هاواری كرد:

-ئاخ، بە هەڵە نەچووم! گەیشتمە جێگایەكی باش. . . .

تا پشتێندی بە قوڕەوە ببوو. ڕەنگی بزركابوو، چاوی دەقوڵەوە چووبوون. قژی پەرێشان و ئاڵۆز لە بن كڵاوی هاتبوونە دەر. دەرگای پێوەدا و بە سرتە گوتی:

لەلای ئێمە كارەسات قەوماوە.

-دەزانم.

سەری سووڕما و مژۆڵی لێكدان و پرسی:

-لە كوێ دەزانی؟ كێ خەبەری پێداون؟

-ئەو دوو هاوڕێیەی تر چییان لێهات؟ ئەوانیش گیراون؟

-ئەودەم لەوێ نەبوون، چووبوونە كۆمیسیۆنی سەربازگیری. پێنج كەس لەگەڵ ڕێبین گیراون.

چڵمی هەڵلوشی و بە زەردەخەنەیەوە گوتی:

-بەڵام من نەگیراوم. . . . بێ گومان بەدووامدا دەگەڕێن. قەیدی نییە با بگەڕێن. قەت ناچمەوە وێ. لەوێ ئێستاش شەش كوڕ و كچێك كار دەكەن، دەكرێ هیوات پێیان بێ.

دایك پرسی: چۆن توانیت دەرباز بی؟

ئیگنات لەسەر کورسی دانیشت و تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و گوتی:

-من؟ شەویٚ ژاندارمەکان راست هاتنە کارخانە. دەقیقەیەك پێشتر مێشەوان بە غار هات لە پەنجەرەیدا و گوتی:"کورِینە رابکەن، بۆ ئێوە دێن"!

ئیگنات دەستی کرد بە پێکەنین، بە داوێنی بلوزەکەی دەموچاوی سرِییەوە و درێژەی پێدا:

-مام رێبین هەر وا زوو ناپەشۆکیٚ. ئەویٚ شەویٚ نیشانی دا. جێبەجیٚ بە منی گوت: "راکە بۆ شار، وەبیرت دیٚ ئەو دوو ژنەی هاتبوونە ئێرە". خێرا شتێکی نووسی و گوتی: "وەرە برِۆ، خواحافیز" و پالێکی پێوەنام. .. . . لە خانوو وەدەرکەوتم و لە پشت داران خۆم شاردەوە. گوێم لە دەنگی پێی ژاندارمان بوو. ٚزۆر بوون. لە هەموو لاوە دادەوەرین. کارخانەیان گەمارۆدا. .. . . لە نێو پۆلە دارێکدا بووم، بە پێشمدا تێپەرِن. پاشان راست بوومەوە و وەرِیٚ کەوتم. رۆژێك و دوو شەو بیٚ راوەستان بە رێدا هاتووم. تا حەوتوویەك ماندووم، لاقم شکاون!

دیار بوو لە خۆی رازییە. زەردەخەنەیەك چاوە زەردەکانی روون دەکردەوە. لێوە ئەستوورەکانی دەلەرزین. دایك سەماوەری هەلگرت و گوتی:

-ئێستا چات بۆ دێنم. تا چا دەگاتیٚ خۆت بشۆ، دێیەوە سەرخۆ.

-دەمەویٚ نامەکەی بدەم بە تۆ.

بە زەحمەت لاقی هەلێنا و بە ناخوئۆف هاویشتیە سەر مێز و دەستی کرد بە کردنەوەی بەلەکە پێچ کە لە لاقانی هالاندبوو. نیکۆلای هاتە ژوور. ئیگنات پەشۆکا و لاقی لەسەر عەرزی دانایەوە. خەریك بوو هەستیٚ، بەلام بەلادا هات و کەوتە عەرزی. دەستی بە مێزەکە گرت:

-ناخ! چەند هیلاکم!

نیکۆلای دۆستانە سەری بۆ ئەوی کرد و گوتی:

رۆژباش هاورِیٚ. راوەستە ئێستا یاریدەت دەدەم.

لە پێش ئیگنات چۆکی دادا و دەستی کرد بە کردنەوەی بەلەك پێچی قورِاوی و پیس.

دایك گوتی:

-دەبیٚ لاقەکانی بە یۆد داشۆین، زۆر باشە.

نیکۆلای گوتی:

-راستە.

نیگنات زۆر بە شەرمدا چوو، چلمی هەڵلوشی. ئاخری نیکۆلای نووسراوەکەی دیتەوە تەماشای کرد و دای بە دایك:

-ئەوەتا بۆ تۆی نووسیوە!

-بیخوێنەوە!

نیکۆلای نامەی نوشتاوە و قوڕاوی لە چاوان وەنزیك خست و دەستی کرد بە خوێندنەوە: "دایە! تکا دەکەم دەست لەکار هەڵ مەگرە. بە خانم بڵێ لە بیری نەچێ، هەمیشە لە بارەی کارەکانی ئێمە پتر بنووسێ. خواحافیز. "ڕێبین"".

دایك بە خەمناکی گوتی:

-چەند پیاوێکی باش بوو. گەرویان گرتووە، بەڵام هەر لە خەمی خەڵك دایە.

نیکۆلای کە نووسراوەکەی بە دەستەوە بوو، باسکی بەردانەوە و بە ئەسپایی گوتی:

-زۆر سەیرە!

نیگنات قامکە چلکنەکانی پێی دەبزاوت و تەماشای دەکرد. دایك ڕوومەتی فرمێسکاوی خۆی شاردەوە و بە تەشتە ئاوێکەوە هاتە لای. لە عەرزی دانیشت و دەستی بۆ لاقی نیگنات درێژ کرد.

-چ دەکەی؟ ..... فایدەی نییە. ......

-زووکە لاقت بێنە!. .....

نیکۆلای گوتی:

-دەچم یۆد دێنم.

نیگنات لاقەکانی لەژێر مێز ڕاگرتبوو و لەژێر لێوانەوە دەیگوت:

-نابێ.

دایك بێ ئەوەی گوێ بداتێ، دەستی کرد بە کردنەوەی بەلەك پێچی لاقەکەی تری. دەموچاوی خڕی نیگنات لەسەر سوورمان درێژ ببوو. دایك دەستی کرد بە شوشتنی و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

-دەزانی ڕێبینیان دارکاری کرد.

نیگنات بەسەرسوورمانەوە هاواری کرد:

-بەڕاست!

بەڵێ، لە پێشدا زۆریان لێدابوو. کە گەیاندیانە نێکۆلسکی، سەرپۆلیس لێیدا. سەروچاوی خوێناوی بوو.

نیگنات برۆی تێکنان و شانی هەڵتەکاندن:

-ناخ، ناوا پێکەوە تەون و بەستیان هەیە. چەند لە شەیتان دەترسم ئەوەندەش لەوان دەترسم. .. .. وەرزێرەکان لێیان نەدا؟

-تەنیا کابرایەك بە قسەی سەرپۆلیس . .... .. ئەوانی دیکە هەڵوێستیان باش بوو، تەنانەت دژی لێدانیشی بوون.

-بەڵێ وەرزێرەکان کەم کەم تێدەگەن کە کێ لە کوێ رادەوەستێ و بۆچی؟

-لەوێش وەرزێری تێگەیشتوو هەن.

-لە کوێ نین؟ لە هەمو شوێنێك هەن. بەلام دۆزینەوەیان زەحمەتە.

نیکۆلای بوتڵە یۆدێکی هێنا. خەڵوزی لە سەماوەرەکە هاویشت و بێدەنگ وەدەرکەوت. نیگنات پاش ئەوەی چاوێکی لە دایك کرد پرسی:

-ئەمە گەورەترە؟

-لە تێکۆشانی گەلدا گەورەترێك نییە، هەموویان هاورێن.

نیگنات بە زەردەخەنەیەکی سەرسوورمانەوە گوتی:

-زۆر سەیرە.

-چی سەیرە؟

-هەموو شت. .... . لە جێیەك لە پیاوی هەڵدەدەن، لە شوێنێکی تر لاقی دەشۆن. لانی نێوەنجیشی هەیە؟

دەرگای ژوورەکە کرایەوە و نیکۆلای وەلامی دایەوە:

-نێونجی ئەوانەن کە دەستی خوێناوی ئەو کەسانە دەلێسنەوە کە لە خەڵك دەدەن. ..... .ئەوانە نێونجین. .. .

نیگنات بە رێزەوە تەماشای کرد و پاش تاوێك ماتبوون گوتی:

-ئەمە راستە.

نیکۆلای گوتی:

-نیلۆڤنا ماندوو بووی، با من بیانشۆم.

نیگنات لە شەرمان لاقی کێشایەوە، دایك هەستا و گوتی:

-تەواو بوو. .. . . . . ئێستا دەتوانی هەستی.

نیگنات هەستا و هەر جارە لەسەر لاقێکی راوەستا. لە کاتێکدا بە زەحمەت خۆی رادەگرت گوتی:

-نازانم چۆن سوپاسی تەواو بکەم. .... .

هەر سێکیان چوونە ژووری نان بخۆن. ئیگنات بە دەنگێکی نەرم گوتی:

-من رۆژنامەکانم بلاو کردنەوە. زۆرم پێخۆشە بە رێگادا برۆم. رێبین گوتی: "برۆ ئەوانە بەرە. ئەگەر بتگرن لە کەسی دیکە وەشك ناکەون. ". .

نیکۆلای پرسی:

-زۆر کەسی واهەن بخوێننەوە؟

-ئەوانەی خوێندەوارن هەموو دەخوێننەوە. .... .

نیکۆلای تۆزێك راما و گوتی:

-چۆن بکەین کەم ئەم بەیاننامە لە بارەی گیرانی رێبین زوو بگاتە دێهات؟

-ئیگنات گوێی قوت کردن و گوتی:

-هەر ئەمرۆ دەیانگەیەنم. هێشتا هیچ نەبووە. بەیاننامەکان ئامادەن؟

-بەڵێ، ئامادەن.

ئیگنات لە کاتێکدا چاوی دەدرەوشان و دەستی رێك دەخستن، گوتی:

-بمدەنێ، دەیانبەم. دەزانم بۆ کوێیان بەرم، چییان لێبکەم. بمدەنێ.

دایك بێ ئەوەی تەماشای بکا، پێکەنی:

-بەڵام تۆ ماندووی، دەترسێی. ئێستا دەتگوت قەت ناچمەوە گوندی.

ئیگنات لێوی بزاوتن و موە قرژەکانی بە دەستی داماڵین و بە نەرمی گوتی:

-هیلاکم. .. . . . باشە، دەحەسێمەوە، بەڵام راستە دەترسێم. خۆتان دەڵێن ئەوەندە لە پیاوی دەدەن کە خوێنی لەبەر دەڕوا. هیچ کەس نایەوێ ئەقوستان بێ. ... . جێبەجێی دەکەم، بە شەو دەچم. هەر چۆنێك بێ رێگا دەدۆزمەوە. بمدەنێ هەر ئەمشەو وەڕێ دەکەوم.

برۆی تێك نان و تاوێکی ماتبوو. ... .

-دەچمە نێو لێڕەوار، لەوێ خۆم دەشارمەوە. پاشان خەبەر بۆ هاورێیان دەنێرم و پێیان دەڵێم کە: "بێن و بەشی خۆیان هەڵگرن". ئەوە باشترین رێگایە. ئەگەر خۆم بەیاننامەکان بلاو بکەمەوە و بمگرن، رۆژنامەکان لە کیس دەچن، . ... . . ئەوەندە کەمن کە دەبێ زۆرمان ئاگا لێیان بێ.

دایك دیسان پرسی:

-ئەدی ترس چ لێدەکەی؟

نیگنات دەستی بە قژە ئاڵۆزەکانیدا هێنا و لەسەرخۆ گوتی:

-ترس لە جێگای خۆی و کار لە جێگای خۆی. ئێوە بە چی پێدەکەنن؟ بزانن ئێوەش! دایك لە خۆشییان مچوورکی پێدا هات و گوتی:

ناخ تۆ رۆڵەکەم. .. ... تۆ.

نیگنات بە شەرمەوە زەردەخەنەیەکی هاتێ:

-بەڵێ بووم بە منداڵیش.

نیکۆلای کە بە چاوێکی دۆستانە تەماشای دەکرد، وەدەنگ هات:

تۆ نابێ بچییە ئەوێ. نیگنات بە ناڕەحەتی پرسی:

-کەوابوو بچمە کوێ؟

-یەکی دیکە لەگەڵ تۆ دێ. تۆ دەبێ بە وردی پێی بڵێی کە چ بکا. باشە؟

نیگنات پاش تاوێ: رامان وەڵامی دایەوە:

-باشە.

-ئێمە پێناسێکی باشت بۆ پەیدا دەکەین و دەتکەین بە جەنگەڵوان.

-ئەگەر وەرزێرێك هات دار ببڕێ، یان لە جێگای قەدەخە راو بکا، دەبێ چ بکەم؟ بیگرم؟ ئەو کارە بە من ناکرێ.

دایك و نیکۆلای دەستیان کرد بە پێکەنین. نیگنات دیسان تووڕە و ناڕەحەت بوو. نیکۆلای گوتی:

-مەترسە. شتی وا روونادا. .. .. . بڕوا بکە!

نیگنات گوتی:

-پێم خۆشە بچمە کارخانە. دەڵێن کوڕی بەهۆش و باشی لێن.

دایك لەسەر مێز هەستا و بە بیرکردنەوە چاوێکی لە پەنجەرە کرد و گوتی:

-ئاخ. .. .. . ژیان. پیاو رۆژێ پێنج جار پێدەکەنێ و پێنج جار خەمناك دەبێ. نیگنات قسەکانت تەواو بوون، بچوو بنوو. .. . .

-بەڵێ، نامەوێ بنووم.

-بڕۆ بخەوە.

-دیاره زۆر توندی دەگری. باشە دەچم. سوپاس بۆ شەکر و چایەکەتان. ... . بۆ میهرەبانیتان.

لەسەر قەرەویلەی دایک راکشا و سەری خوراند و لەژێر لێوانەوە گوتی:

-ئێستا هەموو شت لە ماڵەکەتان بۆنی قەتران دەگرێ. بەخۆڕایی. ... خراپتان کرد! رووداوم دەکەن! خەوم نایە. .. . ئێوە چەند ئینسانێکی باشن. .. ... تازە هیچم بەسەر نایە. ... پیاو وادەزانێ سەد کیلۆمەتر لەدێ دوورە. ... چەند بە باشی باسی نێونجییەکانی کرد. .... . شەیتانینە!. ... . .

لەپڕ خرپەی هات و لە کاتێکدا برۆی هەڵکشابوون و دەمی لێک کردبوونەوە، خەوی لێکەوت.

## (٢١)

شەو درەنگانێک لە ژوورێکی بچووکی ژێر عەرزدا، لەبەرامبەر ڤیسۆڤشیکۆڤ لەسەر کورسی دانیشتبوو، برۆی تێک نابوون و بە ئەسپایی پێی دەگوت:

-چوار جار لە پەنجەرەی نێوەڕاستی. . . . .

نیکۆلای بە نیگەرانییەوە دووپاتەی کردەوە:

-چوارجار؟

-لەپێشدا سێ جار. ... . دەزانی؟

بە قامکی لە مێزەکەی دا و بژاردی: یەک. .. . . دوو . . . . . سێ. . . . پاشان تاوێک راوەستە و جارێکی دیکەش.

-تێگەیشتم.

-وەرزێرێکی سوورکارە دەرگات لێ دەکاتەوە، لێت دەپرسێ: "بۆ دایکە؟" لە وەڵامدا بڵێ:"لە لایەن خاوەن ملکەوەیە". هەر ئەوەندە، ئیتر خۆی دەزانێ.

سەریان پێکەوە نابوو، هەردووکیان باڵابەرز و بەخۆوە بوون. دەنگیان سەبر کردبۆوە و قسەیان دەکرد. دایک لە نزیک مێزەکە راوەستابوو، گوێی دەدا قسەکانیان. ئەو نیشانە نهێنی و پرسیار و وەڵام و قەرار و مەدارە دایکیان وەپێکەنین دەخست. لە دڵی خۆی گوتی: "ئەوانە هێشتا منداڵن".

چرایەك بە دیوارەوە دایسا. سەتڵەیەكی تێكشكاو لەوێ تروسكەی دەدا. ناسنەواڵە و وردە تەنەكە لەسەر عەرزی كەوتبوون. بۆنی چەورایی و ژەنگ و شێداری ژوورەكەی پڕ كردبوو.

نیگنات پاڵتۆیەكی ماهوتی ئەستووری لەبەردابوو، زۆری خۆشدەویشت. دایك دەیدیت كە بە حەزەوە دەستی بە قۆڵاندا دێنێ. بە زەحمەت ملە ئەستوورەكەی وەردەگێڕا تا باشتر خۆی ببینێ. فكرێك بە دڵی دایكدا هات: "منداڵینە. ... . . منداڵە خۆشەویستەكانم".

نیگنات هەستا و گوتی:

-هەر ئەمەیە، لەبیرت بێ، لە پێشدا لە ماڵی مراتۆڤی باوە گەورە بپرسە.

ڤێسۆڤشیكۆڤ گوتی: لە بیرمە. بەڵام وادیار بوو كە نیگنات بڕوای پێ ناكا. جارێكی دیكەش هەموو ناوونیشان و قسە و قەرارەكانی بۆ دووپاتە كردەوە لە دواییدا دەستی بۆ لای درێژ كرد:

-جارێ هەر ئەوەندە . خواحافیز، لە زمانی منەوە سڵاویان پێ بگەیەنە. پێیان بڵێ "نیگنات زیندووە و سڵامەتە". دەیانبینی، ئەوان ئینسانی باشن.

بە خۆشی دەستی بە پاڵتۆیەكەیدا هێنا و لە دایكی پرسی:

-دەتوانم بڕۆم؟

-رێگا دەدۆزییەوە؟

-شكی تێدا نییە. ... .. .هاوڕێیان خواحافیز!

بە شانی بڵند و كڵاوی تازەوە و دەست لە گیرفاندا، سینگی وەپێش دا و رۆیشتە دەر. لەسەر نێوچاوان و لاجانگانی، موی كورتی لول خواردووی منداڵانە بە رەنگێكی روون دەلەرزینەوە.

ڤێسۆڤشیكۆڤ لە دایك چووە پێش و گوتی:

-ئاخرەكەی منیش كارم پەیدا كرد. ماندوو دەبووم، بە خۆمم دەگوت: بۆچی لە زیندان هاتمە دەرێ. دەبێ هەر خۆم بشارمەوە، لە كاتێكدا لە زینداندا شت فێر دەبووم. پاڤێڵ مێشكی پڕ دەكردین. چەندە بەتام بوو. ئەندرێیش چاو و گوێی دەكردینەوە. باشە، دایە لە بارەی راكردنیان چ بڕیارێكتان داوە؟ جێبەجێی دەكەن؟

-دووسبەی دەزانم.... . . .

هەناسەیەكی هەڵكێشا و دووپاتەی كردەوە:

-دووسبەی.

ڤێسۆڤشێنكۆڤ دەستی هاویشتە سەرشانی و گوتی:

-بە رابەرەکان بڵێ، زۆر هاسانە. .. . . . .بە قسەت دەکەن. خۆشت تەماشا کە. ئەمە دیواری زیندانە، لە نزیك چرایەکە. لە بەرامبەر وێدا زەوییەکی بەیار هەیە. قەبرستان کەوتووەتە دەستی چەپی و لای راستەش. شەقام و نێو شارە. یەکێك لەوانەی چراکان هەڵدەکا، بە رۆژ دەچێ پەیژەیەك بە دیوارەوە دەنێ و دەچێتە سەری و چرایەکان پاك دەکاتەوە. ئالقەی پەیژەکە لە دیواری دەکاتە قولاپ. ئەو پەیژە بەنە لە حەوشە هەڵاوسراوە و ئامادەیە. لە زیندان ئاگایان لە سەعات هەیە. داوا لە گیراوە غەیری سیاسییەکان دەکەن کە هەراوهوریا بکەن، یان بۆ خۆیان دەیکەنە هەرا. لەو کاتەدا ئەو کەسانەی دیاری کراون، بە پەیژەدا سەردەکەون و تەواو. بە هێدی و هێمنی روو لە شار دەکەن. لەبەر ئەوەی پاسەوانەکانیش لە پێشان قەبرستان و پاشان زەوییە بەیارەکە دەگەڕێن، نایاندۆزنەوە.

لەوکاتەدا کە نەخشەکەی دەکێشا، لای وابوو زۆر هاسان و روون و ژیرانەیە. پۆزی لێدەدا. کاتێك دایك ڤێسۆڤشیکۆڤی ناسیبوو، لاوێکی تەمبەڵ و نەزان بوو. ئێستاکە دەیدیت ئەوەندە چالاك و سەربزێوە، پێی سەیر بوو چاوە تەنگەکانی ڤێسۆڤشیکۆڤ لە پێشدا بە بێ باوەڕی تەماشای هەموو شتێکیان دەکرد. ئێستا دەتگوت ئەو چاوانە گۆڕاون و سەرلەنوێ دایانڕشتوونەوە و هەموو شت بە روونی دەبینن.

بیری لێ بکەوە. ئەو کارە بە رۆژ دەکرێ. .. . . بەڵێ بەرۆژ. کێ بە خەیاڵیدا دێ کە زیندانیەك بتوانێ بە رۆژی رووناك لەبەرچاوی ئەو هەموو خەڵکە رابکا؟

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

-ئەی ئەگەر تەقەیان لێ بکەن چۆن دەبێ؟

-کێ؟ ئەوێ سەربازی لێ نییە. پاسەوانەکانیش بزمار بە دەمانچەکانیاندا دەکوتن. ... .. .

-ئەوانە هەموو زۆر سادەن!

-دەبینی، چۆن پێت دەڵێم هەر وایە. لەم بارەوە لەگەڵ ئەوانی تریش قسە بکە. من لە پێشدا هەموو شتێکم ئامادە کردووە. پەیژە، تەناف، چەتاڵ. ... . . .. لەگەڵ ئیجازە دارەکەیش قسەم کردووە. ئەو کابرایە چراکان هەڵدەکا. . . . . .

لە پشت دەرگاوە یەکێك دەجووڵایەوە و دەکۆکی. دەنگی دوو ئاسن کە وێك دەکەوتن، لەهەوا دەزرینگایەوە.

-ئەوەتا . ... ... . هەوە.

دەرگا کرایەوە، کابرایەك وانێکی ئاسنی حەمامی بە دەستەوە بوو، وەدەرکەوت.

-شەیتان وەرە ژووری!

سەرێکی خڕ و ریشێکی ماش وبرنجی، بێ کڵاو و چاو هەڵمساو هاتە ژوور.
ڤێسۆڤشیکۆڤ یاریدەی دا وانەکە بێنێتە ژوور. پاشان کابرایەکی زەبەلاحی پشت کوڕ، لێوە بێ مووەکانی لێك کردەوە و کۆکی و تفێکی فڕێ دا و هەر بەو دەنگە ناقۆڵایە گوتی:
-شەوباش!
ڤێسۆڤشیکۆڤ گوتی:
-باشە، پرسیاری لێ بکە!
-پرسیاری چی لێبکەم؟
-لەبارەی راکردن!
پیرەمێرد بە قامکە رەشەکانی سمێڵی پاك کردەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا.
-دەزانی، یاکۆڤ ڤاسیلۆڤیچ! ئەمە بڕوا ناکا کە جێبەجێکردنی ئەو کارە چەند هاسانە.
کابرا بە هێمنی وەڵامی دایەوە:
-ناخ! باوەڕ ناکا؟ باوەڕ ناکا یانی نایەوێ. بەڵام چونکە ئێمە پێمان خۆشە ئەو کارە بکرێ، لامان وایە زۆر هاسانە.
داهاتەوە، دیسان کۆکە گرتی. پاشان تاوێك لە ژووریێ مایەوە و چڵمی هەڵلوشی و سینگی خۆی داماڵی و بە چاوێکی زەق تەماشای دایکی کرد. دایك گوتی:
-من ناتوانم لەو بارەوە بڕیار بدەم.
ڤێسۆڤشیکۆڤ گوتی:
لەگەڵ ئەوانی تر قسە بکە. پێیان بڵێ هەموو شت ئامادەیە. ناخ. .. .. خۆزگە دەمتوانی ئەوان ببینم، دەمزانی چۆن رازییان دەکەم.
-دەبێ پاڤێڵ وهەڤاڵەکانی بڕیار بدەن.
پیرەمێرد دانیشت و پرسی:
-ئەو پاڤێلە کێیە؟
-کوڕی منە.
-ڤلاسۆڤ.
سەری لەقاند و کیسە توتنی هێنادەر سەبیلەیەکی تێ کرد و گوتی:

-ئەم ناوەم بیستووە. .. .. . برازاکەم دەیناسیّ. .. . . . برازای منیش گیراوە. ناوی "بێڤچێنکۆ"یە. ئێوە دەیناسین؟ من ناوم "گۆبوون"ە. بەو زووانە هەموانمان دەگرن. ئەوەدەم ئێمەی پیر دەحەسێینەوە. ژاندارم بەڵێنی پێدام کە برازاکەم بنێریّ بۆ سیبریا.

دەستی کرد بە سەبیلەکێشان و لە کاتێکدا جاروبار تفی فڕیّ دەدا، ڕووی کردە لاوەکە و گوتی:

-ئاخ! ئەمە نایەویّ؟ خۆی دەزانیّ. پیاو دەسەڵاتی بە دەست خۆیەتی. .. . . . ئەگەر ماندوو بوو دابنیشیّ و ئەگەر لە دانیشتن بێزار بوو بە ڕێگادا بڕوا. ئەگەر ڕووتیان کردەوە بێدەنگ بیّ و ئەگەر لێیاندا سەبر و حەوسەلەی هەبیّ. ئەگەر کوشتیان بکەویّ. .. . . بەڵام من برازاکەم دێنمە دەریّ. . . . . .

قسەکانی کابرا دایکیان ناڕەحەت کرد و بە وشەکانی پیرەمێرد هان درا.

دایك لەژێر باران و بای سارددا بە کۆڵانێدا دەڕۆیشت و بیری لە نیکۆلای دەکردەوە: "بزانە چی لێهاتووە. .. . . چەند گۆڕاوە!". لە کاتێکدا لەبارەی "گۆبوون"دوە بیری دەکردەوە، بە خەیاڵدا دەچوو:

-"وادیارە لەو ژیانە تازەدا من بە تەنیا نیم".

پاش ئەم بیرکردنەوە وێنەی کوڕەکەی لە دڵیدا نەخشی بەست:

-"خۆزگە ئەو رازی بوویایە".

## (٢٢)

پاش حەوتوویەك، کاتێك لە دەفتەری زیندان خواحافیزی لە پاڤێل دەکرد، هەستی کرد کە کاغەزێکی چکۆڵەی لولدراوی لە دەستی دایە. لەرزی و ئاوڕێکی بە پرسیار و پاڕانەوە وەسەر دا. پاڤێل وەڵامی نەدایەوە. هەر وەك جاران زەردەخەنەیەکی مەند و ئارامی لە چاواندا بوو. دایك شارەزای ئەو زەردەخەنە و پێکەنینە بوو. هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

-خواحافیز!

پاڤێل کە دڵسۆزییەکی لە دەموچاویدا بەدی دەکرا، جارێکی دیکەش دەستی بۆ درێژ کرد و گوتی:

-"دایە بەخێرچی"!

دەستی کوڕەکەی گرت و چاوەڕوان بوو. پاڤێل قسەکەی درێژە پێدا:

-ناڕەحەت و پەرێشان مەبە.

ئەم قسانە و گنجی نێوچاوانی، ئەم وەڵامەیان دەدایەوە کە دایك چاوەڕوانی بوو. سەری بەردایەوە و لەژێر لێوانەوە گوتی:
-چ بووە؟ بۆچی وا دەڵێی؟
بێ ئەوەی تەماشای بکا، خێرا وەدەرکەوت تا فرمێسکەکانی هەستی دەروونی ئاشکرا نەکەن. لە ڕێگادا هەستی کرد کە ئەو دەستەی کاغەزی کوڕەکەی تێدابوو ژان دەکا. گرانایی لەسەر باسکییە و هەر وەك زەبرێکی لە شانی درابێ وایە. کە گەیشتەوە ماڵێ کاغەزەکەی دا بە نیکۆلای. لەو کاتەدا کە نیکۆلای کاغەزەکەی دەرکردەوە، تۆزێك هومێدی هاتەبەر. بەڵام نیکۆلای پێی گوت:
-دەمزانی، بزانە چی نووسیوە: "هاوڕێیان من ڕاناکەم. ناتوانم. .. .. . . ئێمە هیچمان ئامادەی ڕاکردن نین. بڕوا بە خۆبوونمان لە کیس دەچێ. باشترە لە فکری ئەو وەرزێرەدا بن کە تازە گیراوە. پێویستی بە یارمەتی ئێوە هەیە. لێرە زۆری ئازار دەدەن. هەموو ڕۆژێ لەگەڵ پۆلیس دەستەوەیەخەیە. تا ئیستا بیست و چوار سەعات لە زیندانی تاریکدا بووە. بێ پسانەوە ئازار دەدرێ. هەموو تکای بۆ دەکەین. دڵخۆشی دایکم بدەنەوە ئەم مەسەلەی بۆ باس بکەن، لە هەموو شت تێدەگا. پاڤێل".
نیکۆلای ڕووی وەرگێڕا و دەسرەی لە گیرفانی دەرهێنا و پاش ئەوەی دەستی بە لووتییەوە گرت: لەژێر لێوانەوە گوتی:
-سەرمام بووە. .. .. .
بە بیانووی چاویلکە لە چاوکردن، چاوەکانی بە دەستی شاردنەوە و لە ژوورێدا دەستی کرد بە هاتوچۆ:
-دەزانی ئەگەر قبوڵیشی کردبایە سەر نەدەکەوتین!
دایك لە کاتێکدا خەمێکی تاریك دڵی ڕێك دەگوشی گوتی:
-گرنگ نییە، با موحاکەمەی بکەن!
-هاوڕێیەك لە پێتێربورگەوە نامەی بۆ نووسیوم. .... . ..
-لەوانەیە لە سیبریاشەوە رابکا، وانییە؟
-دیارە. .. . .. هاوڕێیەکە دەنووسێ کە بەو زووانە موحاکەمە دەست پێدەکرێ. هەر لە ئێستاوە بڕیاری دادگا دیارە. هەمووان دووردەخەنەوە. دەبینی. ئەو بێ شەرەفە ناجسنانە دادپەروەرییان کردووەتە گاڵتەوگەپ، تێ دەگەی؟ هەر لە پێشەوە، بەر لە دادگا، لە پێتێربورگ سزا دیاری کراوە.
دایك بە لێبڕاوی گوتی:

-نیكۆلای نیڤانۆڤیچ تۆ لەو قسانە گەڕێ. ڕوونكردنەوە و دڵخۆشی دانەوەی من كەڵكی نییە. پاڤێل هەرگیز كاری خراپ ناكا، كارێكی وا ناكا خۆی و هەڤاڵەكانی خەمبار بن. منی خۆش دەوێ. دەبینی ئەو لە فیكری مندا بووە. .. .. . چی نووسیوە: "دڵخۆشی بدەنەوە". ها.. . . .

دڵەكوتەی گرتبو. .. . لەبەر پەرێشانی سەری دەسووڕا. نیكۆلای بە دەنگێكی زۆر ڕەوان گوتی:

-كوڕێكی زۆر باشت هەیە. خۆشم دەوێ و زۆر ڕێزی لێ دەگرم.

دایك پێشنیاری كرد:

-چۆنە لەبارەی ڕێبینەوە قسە بكەین؟ دەبویست هەر جێبەجێ دەست بەكار بێ. وەڕێ كەوێ. ئەوەندە بە ڕێگادا بڕوا تا لە هیلاكییان دەكەوێ. پاشان لە خۆشی ئەوەی كە ڕۆژ هەتا ئێوارێ كاری كردووە، بخەوێ.

نیكۆلای كە هەروا لە ژوورێدا دەهات و دەچوو، گوتی:

-بەڵێ، بەڕاستی! دەبێ چ بكەین؟ دەبێ ساشێنكا. .. . .

-بەم زووانە ئەو دێ. هەمیشە كە دەزانی لە زیندان گەڕامەوە دێ.

نیكۆلای سەری بەردایەوە و لە پەنا دایك دانیشت. لێوی خۆی دەگەزین و یاری بە ریشی خۆی دەكرد:

-حەیف خوشكم لێرە نییە. ئەگەر ئەو لێرە بایە هەڵاتنی ڕێبینی جێبەجێ دەكرد. دایك گوتی:

-خۆزگە تا پاڤێل لەوێیە ئەو كارەمان بۆ كرابا. چەندەی پێ خۆش دەبوو!

بێدەنگ بوو. لەپڕ بە دەنگێكی نەرم و لەسەرخۆ دەستی پێكرد:

-نازانم كە دەتوانێ بۆچی ڕاناكا؟

لە دەرگایان دا. نیكۆلای هەستا و لەگەڵ دایك چاویان لێك كرد. نیكۆلای لەسەرخۆ گوتی:

-ساشێنكایە.

-چۆنی پێ بڵێم؟

-بەڵێ. .. .. . زەحمەتە.

دیسان لە دەرگا درایەوە، بەڵام هێدیتر. وادیار بوو ئەو كەسەش كە لە پشت دەرگا بوو، لە دوودڵێدا بوو. نیكۆلای و دایك پێكەوە چوون دەرگا بكەنەوە. بەڵام كە گەیشتنە دەركی چێشتخانە نیكۆلای گەڕایەوە گوتی:

-باشترە تۆ دەرگا بكەیەوە.

كە دایك دەرگای كردەوە، كچەكە بە شێنەیی پرسی:

-نایەوێ ڕابكا؟

بەڵێ. .. . . نایەوێ.

-دەمزانی.. . . . ..

ڕەنگی بزڕکا. نیوەی دووگمەکانی چاکەتەکەی ترازاندن. خەریك بوو دایکەنێ، بەڵام نەیتوانی. پاشان دیسان قسەکانی درێژە پێدان:

-با و بارانە. هەوای چەند ناخۆشە. .. . ساخ و سلامەتە؟

-بەڵێ. . ... .

ساشێنکا چاوی لە دەستەکانی خۆی کرد و بە نەرمی گوتی:

-وەك هەمیشە رازی و سلامەتە؟

دایك بێ ئەوەی چاوی لێبکا گوتی:

-بۆ ئێمەی نووسیوە کە کارێکی وا بکەین ڕێبین رابکا.

-بەڕاستیتە؟ دەبێ ئەو کارە جێبەجێ بکەین!

نیکۆلای هاتەوە ژوور و گوتی:

-منیش لەسەر ئەو باوەڕەم. . . . .ڕۆژباش ساشێنکا!

کچەکە دەستی بۆ درێژ کرد و گوتی:

-قەیدی چییە؟ هەموو لایان وایە نەخشەکە نەخشەیەکی عاقڵانەیە. . ... وانییە؟ دەزانم هەموو لەسەر ئەم باوەڕەن.

-بەڵام کێ بەجێگەیاندنی وەئەستۆی خۆی دەگرێ؟ هەموو کاریان هەیە.

کچەکە هەستا و گوتی:

-من دەرفەتی ئەوەم هەیە. ... . . . .

-قەیدی نییە، بەڵام هاوکاری دیکەشیت دەوێن.

-باشە، دەبینمەوە. هەر ئێستا وەدووای ئەو کارە دەکەوم. .. .

دایك پێشنیاری کرد:

-چۆنە تاوێك بحەسێیەوە؟

کچەکە پێکەنی و دەنگی نەرم کردەوە و گوتی:

-لە خەمی مندا مەبە. .. . .. ماندوو نیم.

دایك و نیكۆلای لە پەنجەرەوە وەنزیك كەوتن. چاویان لێبوو. لە حەوشە وەدەركەوت و لەپشت دەرگای ئاسن بزر بوو. نیكۆلای فیكەیەكی سەبری كێشا و پاشان دەستی دا قەڵەم و لەسەر مێز دانیشت.

دایك بە ئەسپایی و بە بیركردنەوە گوتی:

-خەریكی ئەو كارە دەبێ و دەبێتە هۆی حەسانەوەی.

-دیارە!

پاشان رووی لە دایك كرد و بە روویەكی خۆش و زەردەخەنەیەكەوە لێی پرسی:

-نیلۆڤنا، ئەمە كۆنە بەرماوی خۆتە. .. . تۆ قەت بۆ پیاوێكی خۆشت ویستووە و حەزت لێكردووە، ئاخت هەڵنەكێشاوە؟

-ئاخ! —هاواری كرد و دەستی راوەشاند- ئاخ هەڵكێشانی چی! تەنیا لەوە دەترسام بە زۆر بە مێردم بدەن.

-هیچ كەست خۆش نەویستووە؟

-تاوێك بیری كردەوە و گوتی:

-لەبیرم نییە. رەنگە كەسێكم خۆش ویستبێ، بەڵام لە بیرم نییە. چۆن كەسم خۆش نەویستووە؟

تەماشایەكی نیكۆلای كرد و بە سادەیی و ئارامی و بە خەفەتەوە گوتی:

-مێردەكەم لە رادەبەدەر لێیداوم. هەرچی لە پێش ئەودا بووە هەموویم لەبیر چووەتەوە.

نیكۆلای رووی بۆ لای مێزەكە وەرگێڕا و دایكیش تاوێك وەدەركەوت. كە گەڕایەوە نیكۆلای بە نیگایەكی خۆشەویستانە و بە وشەی نەرم و دڵلاوێنەوە دەستی كرد بە گێڕانەوەی بەسەرهات و حەزلێكردنی خۆی:

-دەزانی منیش وەك ساشێنكا رابوردوویەكم هەبوو. .. . كچێكم خۆش دەویست كە زۆر دڵگیر بوو، وەك ئەستێرەی رێنوێنی من بوو. راستییەكەی ئێستاش هەر خۆشم دەوی. هەمیشە و هێندەی پێشوو. بە گیان و بە دڵ و بە هەستی حەق ناسیەوە. .. .

دایك دەیدیت كە چاوەكانی نیكۆلای لە گڕێكی گەرمدا دەدرەوشێ. سەری هاویشتبووە سەر باسكی و دەیڕوانییە شوێنێكی دوور. دەتگوت تەواوی لەشی كز و باریك بەڵام پتەوی بۆ پێشەوە دەكشێ، هەر وەك گوڵەبەرۆژە كە سەر بۆ لای رۆژ خوار دەكاتەوە.

-كەوابوو بیخوازە.

-ئاخ، پێنج ساڵە شووی كردووە.

-بۆچی زووتر نەتهێنا، مەگەر خۆشت نەدەویست؟ نیكۆلای پاش تاوێك بیركردنەوە وەڵامی دایەوە:

-پێم وایە ئەویش خۆشی دەویستم. گومانم لەوەدا نییە. کاتێك من ئازاد بووم ئەو گیرابوو. وەزعی ئێمەش وەك ساشێنکا و پاڤێلٚ بوو. لە دوواییدا بۆ دە ساڵ ناردیانە سیبیریا. .. .. چەند دوورییەکی داخدار. .. . . خەریك بوو وەدووای بکەوم. .. . . بەڵام هەر دووکمان شەرمان دەکرد. .. . . . من مامەوە. لەوێ لەگەڵ هاورێیەکی خۆم کە کورێکی زۆر باش بوو، بوون بە ئاشنا و پێکەوە رایان کرد و ئێستا لە دەرەوە دەژین. ..

نیکۆڵای چاویلکەکەی دەرهێنا و لەبەر رووناکی، چاوی لە شووشەکانی کرد و خاوێنی کردنەوە. دایك سەری لەقاند و بە خۆشەویستی گوتی:

-ئاخ. .. . . گیانەکەم.

سکی پێ دەسووتا و هەر لەو کاتەشدا هەستێك ناچاری دەکرد کە زەردەخەنەیەکی دایکانەی بێتە سەر لێوان. نیکۆڵای حاڵەتی خۆی گۆڕی و قەڵەمەکەی کە بە هەوای قسەکان دەیبزاوت هەڵیگرت و گوتی:

-ژیانی خێزان داری هێزی شۆڕشگێڕی پیاو کەم دەکاتەوە. بەڵێ هەمیشە کەمی دەکاتەوە. پیاو منداڵی پەیدا دەبێ. پتر پێویستی بە پارە دەبێ و بۆ پەیداکردنی نان دەبێ کار بکا. ... . شۆڕشگێڕی راستەقینە بە بێ ماندووبوون دەبێ کار بکا و بۆ ئەو کارەش دەرفەت پێویستە ئەگەر لەبەر ماندوویی یان دڵداری وەدووا بکەوین، دەبێ بڵێین خەیانەتمان بە قازانجی گەل کردووە. ... .

هەر چەند رەنگی بزرکابوو، بەڵام دەنگی قەوی بوو، هێزێکی پتەو لە چاوانیدا دەدرەوشا. دیسان بە توندی لە دەرگایان دا. نیکۆڵای بێدەنگ بوو. لیودمیلا بوو، روومەتی لە سەرمان سوورهەڵگەڕابوون. لە کاتێکدا گالۆشەکانی دەردەهێنان، بە تووڕەیی گوتی:

-رۆژی موحاکەمە دیاری کراوە. حەوتوویەکی تر.

نیکۆڵای لە ژوورەکەیەوە بانگی کرد:

-مسۆگەرە؟

دایك بە بێ ئەوەی بزانێ لە خۆشییان یان لە ترسان، پەشۆکا و رایکردە لای ئەو. لیودمیلا بە دەنگێکی نەرم و بە تەوس و گاڵتە درێژەی پێدا:

-بەڵێ. راستە. دادپرس تازە ئیددیعا نامەی رێکخستووە. لە دادگا بە ئاشکرا دەڵێن لە پێشەوە حوکمیان دراوە. ئەمە یانی چی؟ چما دەوڵەت لەوە دەترسێ کە هەوڵ دەدا کاربەدەستەکانی بە نەرمی لەگەڵ خەڵك بجزوونەوە؟ وادیارە سەرەڕای ئەوەی کە دەوڵەت هەوڵ دەدا کاربەدەستانی خراپ بکا، دیسان لە چەپەڵی ئەوان دڵنیا نییە.

لیودمیلا لەسەر کەرویت دانیشت و روومەتە قوپاوەکانی داماڵین و لە کاتێکدا دەنگی پتر تووڕە دەبوو، تەوس و تانەی لە چاوان دەباری. نیکۆلای گوتی:

-بە خۆڕایی خۆت ماندوو مەکە، دەنگت بە گوێی دەوڵەت راناگا. ئاڵقەی دەوری چاوی لیودمیلا رەشتر دەبوو. سێبەرێکی تووڕەیی دەکەوتە سەر دەموچاوی و لە کاتێکدا لێوەکانی دەگەست، درێژەی پێدا:

-من دژی دەوڵەتم، ئەگەر بمکوژێ حەقیقەتی، دوژمنم. بەڵام بۆچی بۆ پارێزگاری خۆی خەڵك خراپ دەکا؟ بۆچی وام لێدەکا گاڵتەیان پیّ بکەم؟ بۆچی بە سەگ سیفەتی خۆی گیانی من ژاراوی دەکا؟. . . . .

نیکۆلای مژۆڵی لێك نزیك کردنەوە و سەری راوەشاند و لە پشت چاویلکەوە چاوێکی لێکرد. ئەو ژنە گەنجە قسەکانی درێژە پێدان، دەتگوت ئە کەسانەی لێیان بێزار و تووڕەیە لەلای دانیشتوون. دایك گوێی بۆ قسەکان هەڵخستبوو، بەڵام هیچ لێیان تێنەدەگەیشت. وەك مەکینە هەر ئەم وشانەی دووپاتە دەکردەوە:

-دادگا . . .... حەوتوویەکی تر. .. . دادگا. .. . .

دایك نەیدەتوانی ئەوەی لە دادگادا روودەدا و داخوا حاکمەکان چۆن لەگەڵ پاڤێڵ دەبزوونەوە، بێنێتە بەرچاوی خۆی. بەڵام هەستی بە نزیکبوونەوەی رووداوێکی خەفەتهێنەر دەکرد کە دڕندەیی و بێبەزەیی و نائینسانی لێوە دیار بوو.

## (٢٣)

دایك دوو رۆژی تەواو لە تەمی خەفەت و پەرێشانی و لە چاوەڕوانییەکی پڕ لە پەژارەدا، بێدەنگ رایبوارد. روژی سێیەم ساشێنکا هات و بە نیکۆلای گوت:

-هەموو شت ئامادەیە. ... . . ئەمڕۆ سەعات یەك.

نیکۆلای بە سەرسوورمانەوە گوتی:

-هەروا زوو. ... . ئامادەیە؟

-بەڵێ، گیروگرفتی زۆر نەبوو. تەنیا ئەوەندە بەس بوو دەستە جلێك و جێگای شاردنەوەی بۆ رێبین پەیدا بکەم. ئەوەی تر هەموو "گۆبوون" وەئەستۆی خۆی گرتووە. رێبین تەنیا دەبێ گەڕەکێك بە پێیان بڕوا. ڤێسۆڤشیکۆڤ لە شەقام دەچێتە پێشی و پاڵتۆیەك و کڵاوێکی دەداتێ و پێی دەڵێ بچێتە کوێ. من چاوەڕوانی رێبین دەبم و لەگەڵ خۆمی دەبەم.

-خراپ نییە. ئەو "گۆبوون"ە کێیە؟

-تۆ دەیناسی. لە ماڵی ئەو شتی بۆ قوفڵ سازەکان خوێندووەتەوە.

-ئەها، وەبیرم هاتەوە. .. . . پیرەمێردێکی سەیرە. ... ..

ساشێنکا کە بە بیرکردنەوە لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. گوتی:

-لە سەربازە کۆنەکانە. وەستای شیروانییانە. ئاگادارییەکی زۆری نییە. لە راست ملهوڕ و زۆرداراندا قینێکی توندی لە دڵ دایە. کەمێك فەیلەسووفانەیە.

دایك بێدەنگ گوێی بۆ قسەکانی راگرتبوو. وردەوردە فکریکی لێڵ و ساخ نەبوونەوەی لەمێشکیدا پێك هات:

-گۆبوون دەیەوێ "یێڤچینکۆ"ی برازای، یانی ئەو ئاسنگەرەی کە حەزت لە خاوێنی و قیت و قۆزییەکەی دەکرد —لەبیرتە؟- دەرباز بکا.

نیکۆلای سەری لەقاند. ساشێنکا گوتی:

-هەموو شت لەوپەڕی باشیدا جێبەجێ کراوە. تەنیا من لە سەرکەوتنیدا گومانم هەیە. زیندانییەکان هەموویان لە سەعاتێکدا دەخولێنەوە. کە پەیژەکەیان چاو پێ بکەوێ، زۆریان دەیانەوێ رابکەن.

چاوی لەسەر یەك دانان و بێدەنگ بوو. دایك لێی وەنزیك کەوت.

-دەبنە هۆی زەحمەتی یەکتر.

هەر سێکیان لە نزیك پەنجەرە راوەستابوون. دایك کەوتبووە پشت نیکۆلا و ساشێنکا وتووێژی خێرای ئەوان هەستێکی تاریکی لە دایکدا پەیدا کرد و لەپڕ گوتی:

-.. .. . . . دەچم.

ساشێنکا پرسی:

-بۆچی؟

نیکۆلای ئامۆژگاری کرد:

-نا گیانەکەم، نابێ بچی.. . . . . نەوەك تووشی رووداوێك بی.

دایك تەماشای کردن و بە نەرمی، بەڵام بە لێبڕاوی دووپاتەی کردەوە:

-بۆچی؟ . . . .. دەچم.

نیکۆلای و کچەکە چاوێکیان لە یەکتر کرد و ساشێنکا شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:

-دیارە. . . .. . .

پاشان رووی لەدایك كرد و خوار بووەوە بۆ لای دەنگێكی سادە و دۆستانە گوتی:

-لەگەڵ ئەمەش، پێت رادەگەیەنم بە خۆرایی هیواداری.

دایك بە دەستی لەرزۆك ساشێنكای بۆ لای خۆی راكێشا و گوتی:

-گیانەكەم . .. . . منیش لەگەڵ خۆت بەرە. .. . . . نابە هۆی زەحمەت . . .... دەبێ بزانم. . . . . ... لام وانیە راكردن بكرێ!

كچەكە بە نیكۆلای گوت:

-باشە، با بێ.

نیكۆلای سەری بەردایەوە و گوتی:

-ئەمە بە دەست تۆیە.

-بەلام دایە ئێمە لەوێ ناتوانین پێكەوە بین. تۆ بچۆ نێو باخ و مەزرا، لەوێوە دیوارەكانی زیندان دیارن. دەنا لەوانەیە لێت بپرسن كە لەوێ چ دەكەی؟

دایك بە دڵنیایی دەنگی هەڵێنا:

-هەرچۆنێك بێ وەلامێك دەدۆزمەوە.

ساشێنكا گوتی:

-لە بیرت نەچێ، پاسەوانەكانی زیندان تۆ دەناسن. ئەگەر لەوێ بتبینن. ...

دایك گوتی:

-من نابینن!

بێ ئەوەی خۆی بزانێ، لەپڕ هومێدێك كە هەمیشە لە دڵیدا هەبوو، هەڵگیرسا و جۆشاندی. لە كاتێكدا خۆی دەگۆڕی، بیری دەكردەوە:

-رەنگە. ... ... ئەویش.. .. .. .

بە پەلە خۆی گۆڕی.

پاش سەعاتێك دایك لە زەوییەكانی نزیك زیندان بوو. بایەكی توند لە داوێنانی رۆدەهات و وەعەرزی سەهۆلاوی دەكەوت، لە كاتێكدا كۆنە كەپری نێو باغێكی رادەژاند، توند لە دیواری زیندانی دەدا، خۆی لە حەوشە روو دەكرد و هەرا و هوریای ئەوێی لەگەڵ خۆی دەبرد و بەرەو ئاسمان تێهەڵدەبوو. چەند پەڵە هەور لە هاتوچۆدا بوون و هێندێ جاریش قوولایی شینی ئاسمانی دەردەكەوت.

شار کەوتبووە پشت سەری دایك و پێشیشی قەبرستان بوو. زیندان لە لای راستە و لە بیست مەتری دایك بوو. لە کن قەبروستانەکە دوو سەرباز ئەسپیان دەگێڕان و فیکەیان لێدەدا و پێدەکەنین. دایك چووە لای سەربازەکان و گوتی:

-رۆڵەکان، بزنێکتان نەدیوە؟ نەهاتووە ئێرە؟

یەکیان وەڵامی دایەوە:

-نا. .. . . . . نەماندیوە.

دایك بە شێنەیی وەدوورکەوت. لەوان تێپەڕی و لە کاتێکدا لە بنەوە تەماشای دەکردن، بۆ لای قەبرستان دەچوو. لەپەڕ هەستی کرد لاقی گران دەبن و دەچەمن، وەك بە عەرزەوە بەسترابن. لە سیلەیەکی زیندان چرا هەڵکەرێك کە پشتی لەژێر پەیژەیەکی بچووکدا خوار ببۆوە، دەرکەوت. دایك مژۆڵی لێك دان و چاوێکی لە سەربازەکان کرد هەر لە جێگای خۆیان بوون و ئەسپەکان بە دەوریاندا دەگەڕان. پاشان دیتی کابرا پەیژەیەکەی بە دیواردوە ناوە و بە کاوەخۆ لێی وەسەر دەکەوێ. ... . . بە دەستی ئیشارەیەکی کرد و بە پەلە هاتە خوارێ و بزر بوو. دڵی دایك توند لێی دەدا. دەقیقە زۆر بە لەسەرخۆ تێدەپەڕین. پەیژەکە لە نێو قوڕ و لەتکە خشتدا بە زەحمەت دەبینرا. لە پڕ سەری رەشی رێبین لەسەر دیواری وەدەرکەوت. پاشان هەموو لەشی وەدیار کەوت. بە لایەکدا بای دایەوەو خۆی خزاندە خوار. سەری دووهەم کە کڵاوی خوری لەسەربوو، دەرپەڕی و خۆی گەیاندە عەرزی و لە سیلەی خانووەکەدا ونبوو. رێبین خۆی راست کردەوە، تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و سەری راوەشاند. .. . . . دایك لاقی لە عەرزیی دەدان و لەبەرخۆیەوە دەیگوت:

-هەڵێ. ..... . .. هەڵێ.. . . . . . .

گوێی دەزرینگانەوە. .. . . . هەرا و هوریایەکی گوێ لێبوو. سەری سێیەم بە قژی بۆرەوە لەسەر دیواری وەدەرکەوت. دایك لەوێ حەپەسابوو و بە هەردوو دەست سینگی خۆی دەگرت و تەماشای دەکرد. سەرێکی بۆر و دەموچاوی بێ توك لە هەوا سەرمەقولاتی دەدا، پاشان لە پشتی دیوار ون بوو. هەراوهوریا توندتر دەبوو. بایەکی توند دەنگە دەنگ و فیکە و هەراوهوریای بە هەوادا بڵاوەدەکردنەوە. رێبین بە بن دیواردا دەڕۆیشت. پاشان بە زەوییەکدا تێپەڕی کە زیندانی لە خانووەکانی شار جیا دەکردەوە. دایك لای وابوو زۆر سەبر دەڕوا و سەری زۆر هەڵدێنێ. بێگومان ئەو کەسانەی تووشی دەبوون لەوانەبوو دووایە بیناسنەوە. دایك لەبەرخۆیەوە دەیگوت:

-خێراتر . ..... . . خێراتر... . .

لە حەوشەی زیندان تەقەیەك هات. خرمەی شووشە شكاوێك بەرز بۆوە. سەربازەكە بە هەموو تواناوە پێی لە عەرزی بەند كردبوو، ئەسپەكەی بۆ لای خۆی رادەكێشا. سەربازەكەی تر دەستی بۆ زاری خۆی بردبوو، دیار نەبوو بەرەو زیندان هاواری چ دەكا. پاشان سەری وەردەگێڕا و گوێی هەڵدەخست. دایك بە لەشێكی تێك گوشراو دەیڕوانی. چاوەكانی كە هەموو شتێكیان دەدیت، بڕوایان بە هیچ شتێك نەدەكرد. ئەو راكردنەی ئەو لای وابوو زۆر دژوار و بەترسە، خێراتر و هاسانتر سەری گرتبوو. ئیتر رێبین لە كۆڵان نەدەبینرا. تەنیا كابرایەكی كەڵەگەت كە پاڵتۆیەكی درێژی لەبەردابوو، لەگەڵ كچۆڵەیەك بەوێدا رادەبورن. سێ پاسەوان لە دەورەی زیندان وەدیار كەوتن. باسكیان بۆ پێشەوە راداشتبوو و غاریان دەدا. یەكێك لە سەربازەكان رایكردە پێشان، ئەوی دیكە لەگەڵ ئەسپەكەی دەڕۆیشت و خەریك بوو خۆی باوێتە سەر. ئەسپەكە ركێفی نەدەدا و هەڵدەبەزی. دایك وای هاتە بەرچاو كە هەموو شت لە دەوروبەری لە هاتوچۆدایە. زیرەی ئاژیر بە دەنگێكی ناهومێدانە هەوای دەقەڵاشت. دایك هەستی بە مەترسی كرد، دەلەرزی. لە كاتێكداچاوی هەر لە پاسەوانەكان بوو، بە بن دیواری قەبرستاندا پاڵاوتی. پاسەوانەكان بۆ لای دیكەی زیندان غاریان دا و وەك سەربازەكان بزر بوون. دایك دیتی جێگری زیندانیش كە باشی دەناسی، هەر بە شوێنی واندا دەڕوا. دووگمەكانی كرابوونەوە. .. . لەپڕ پاسەوانەكان دەركەوتن، خەڵك وەكۆ بوو.

با گێژی دەخوارد و هەر وەك كەیفخۆش بێ، دەستی رادەوەشاند و هێندێك دەنگە دەنگی تێكەڵ بە گوێی دایكدا دەدا:

-هێشتا لەوێیە!

-پەیژە؟ -ئەوە چتانە، خوا بتانگرێ!

دیسان فیكەفیك دەستی پێكردەوە. دایك ئەو هەراوهوریایەی پێخۆش بوو. هەنگاوی توند كردن و لەبەرخۆیەوە دەیگوت:

-كەوابوو دەكرا. .. . . ئەگەر ویستبای دەیتوانی!

لەپڕ لەبن دیوار تووشی دوو پاسەوان بوو. یەكیان بانگی كرد:

-راوەستە! كابرایەكی ریشدارت نەدی؟ ... . .. كەس بێرەدا رای نەكرد؟

دایك دەستی بۆ لای چۆلی راداشت و لەسەرخۆ گوتی:

-بەڵێ، بەولایەدا هەڵات.

پاسەوان هاواری كرد:

-بیگۆرۆڤ راکە! . .. ... فیقە لیّ بدە! ... . لەمێژە؟

-هەروا تاوێکە.

دایك بۆ ماڵیّ گەڕایەوە. داخی شتێکی دەخوارد. تاڵی و تووڕەییەکی لەدڵیدا هەبوو. کە گەیشتەوە نێو شار، عارەبانەیەکی راگرت. لە عارەبانەدا لاوێکی سمێڵ خورمایی و رەنگ پەڕیو هیلاکی دیت. ئەویش تەماشای دایکی دەکرد. خوار دانیشتبوو. هەر دەتگوت شانی راستەی لە هی چەپەی بەرزترە.

نیکۆلای بە خۆشییەوە بە پێشوازی دایکەوە هات:

-ساخ و سلامەتی! . . . . . باشە. .. . . چۆن بوو؟

-کار تەواوە. ... . . . .

هەر وەك هەوڵ بدا هەموو شتێکی وەبیر بێتەوە، باسی راکردنی وەك چیرۆکی ئەفسانەیی گێڕایەوە.

نیکۆلای دەستی رێکخستن و گوتی:

-دەزانی شانسمان هەیە!. . ... زۆر لە تۆ دەترسام. ... ... ناتوانی فکریشی لێبکەیەوە!.... لە موحاکەمە مەترسیّ . .. .. هەتا زووتر بکریّ، پاڤێلّ زووتر رزگار دەبیّ، بڕوا بکە. لەوانەیە کاتێکی بۆ سیبیریای بەڕیّ دەکەن بتوانیّ رابکا.

پاشان دەستی کرد بە باسی دادگا. دایك کە هەستی دەکرد نیکۆلای ترسی لە شتێك هەیە و تێدەکۆشیّ دڵنیای بکا، گوێی بۆ قسەکانی شل کردبوو. دایك گوتی:

-پێت وایە من لەگەڵ موحاکمەکان قسە دەکەم و نامەیان بۆ دەنووسم؟

نیکۆلای هەستا و دەستی راوەشاند و بە نیگەرانییەوە گوتی:

-ئەوە دەڵێی چی؟ من قەت فکرێکی ئاوام نەکردووەتەوە.

-راستە دەترسێم! ترسم هەیە و نازانم لە چی. .. . .. .

دایك بە بێدەنگی لە ژوورەکەی دەڕوانی.

-هێندیّ جار وام بە خەیاڵدا دیّ کە گاڵتە بە پاڤێلّ دەکەن. سووکایەتی پیّ دەکەن. پێی دەڵێن: "تۆ هۆی . .. . .. . دێهاتی. ... . . . کوڕی وەرزێر . ... . .چت لەخۆت کردووە؟".

پاڤێلّ بە دەمارە. ... .. وەڵامیان دەداتەوە. ... . ئەندرێی گاڵتەیان پێدەکا. ئەو لاوانەی ئێمە ئەوەندە خوێنگەرم و پیاون. ... . . ئەودەم بە خۆم دەڵێم: "ئەگەر شتێك رووبدا. ... ئەگەر یەکێك لەوان حەوسەلەی

ئەمێنێ. ... . ئەوانی تر پشتیوانی لێ دەكەن. ... . ئەوەدەم لەوانەیە حوكمیان بدەن، بە جۆرێك ئیتر هەرگیز نەیانبینینەوە.
نیكۆلای بە پەرێشانی دەستی بە ریشیدا دەهێنا و مات ببوو. دایك بە دەنگێكی هێدی درێژەی پێدا:
-ناتوانم ئەو فكرانە لەسەرم دەركەم. موحاكەمەیەكی بەترسە. لە هەموو شت دەكۆڵنەوە. لە حەقیقەت دەگەرێن. بەراستی بەترسە! سزادانەكە ترسی نییە. ... . بەڵام موحاكەمە. .... . لێكۆڵینەوەی حەقیقەت بە ترسە. نازانم چۆنی بڵێم.
هەستی دەكرد كە نیكۆلای بە ترسی ئەو نازانێ و تێی ناگا، بۆیە لە روونكردنەوەكەیدا دادەما... . . .

## (٢٤)

ئەو سێ رۆژەی بۆ موحاكەمە مابوون، ترسیان لە دڵی دایكدا زیاد دەكرد. كە رۆژی موحاكەمە داهات، ئەو بارە گرانەی پشتی چەماندبوو لەگەڵ خۆی بردییە دادگا.
لە كۆڵانێ دراوسێكانی پێشووی گەرەكی بەسەر كردەوە، لە وەڵامی سڵاویاندا بە بێدەنگی سەری دانەواند و بەپەلە بە نێو خەڵكێكی خەمناكدا رێگای خۆی كردەوە. لە رێگا و لە تەلاری دادگاشدا تووشی كەسوكاری گیراوان بوو. بە دەنگی گیراو قسەیان دەكرد. باسی هێندێ شتیان دەكرد كە دایك لێیان تێنەدەگەیشت. هەستێكی دڵتەزێن لە زەنا زەنای خەڵكەكە پەیدا دەبوو، كاری دەكردە سەر دایك و پتر دڵی رێك دەگوشی.
سیزۆڤ لە پەنا خۆی جێگای بۆ كردەوە و گوتی:
-دانیشە.
دایك بە قسەی كرد، گنجی كراسەكەی راست كردەوە و چاوێكی لە دەوروبەری خۆی كرد. هێندێك شریتی سەوز و سوور و دەزووی زەرد و باریكی بەرچاو كەوت كە دەتروسكان. ئەو ژنەی لە پەنای دانیشتبوو بە ئەسپایی گوتی:
-كورەكەی تۆ كورەكەی منیشی بەدبەخت كرد!
سیزۆڤ بە پەرێشانی قسەكەی پێ بری و گوتی:
-"ناتالیا" بێدەنگ بە.

دایك چاوێکی لە ژنەکە کرد و ناسی. دایکی سامۆیلۆڤ بوو. کەمێك لەولاتر مێردەکەی بە سەرێکی تاس و روومەتێکی جوان و ریشێکی سوورەوە دانیشتبوو، پشتی چاوانی گنجی کەوتبۆیە، چاوی لە پێش خۆی بڕیبوون و ریشی دەلەرزی.

رووناکییەك لە پەنجەرە بەرزەکانی تالارەوە دەهاتە ژوور. کڵوە بەفر وەشووشەی پەنجەرەکان دەکەوتن. لەنێوان دوو پەنجەرەدا وێنەیەکی گەورەی قەیسەر لە چوارچێوەیەکی زێڕدا دەبینرا. لە بەرامبەر وێنەیەکی مێزێك بە ماهووتی سەوز داپۆشرابوو کە تەواوی درێژایی تالاری داگرتبوو. لە لای راستە، لە پشت پەرژینێکی ئاسن، دوو تەختەدار دانرابوون و لە لای چەپەش دوو ریز کورسی سوور جێ کرابوونەوە. بەردەستەکان بە یەخەی سەوز و دووگمەی زێڕ کفتەوە، بە شێنەیی دەهاتن و دەچوون. لەو هەوا گوماناوییەدا سرت و خورت لە گوێیاندا دەزرینگایەوە و بۆنی دەرمانێك دەهات و دیار نەبوو لە چ لایەکەوە دێ. ئەو رەنگ و زریقە و بریقەیە چاویان لەبەر هەڵنەدەهات. پیاو هەستی دەکرد کە لە گێژاوی ترسێکی ئالۆزدا نوقم بووە.

لەپڕ یەکێك بە دەنگی بەرز دەستی بە قسە کرد. هەموو هەستان. دایك لەرزی، بەڵام هەستا و خۆی بە باسکی سیزۆڤەوە راگرت.

لە سیلەی لای چەپ، دەرگایەکی گەورە کرابۆوە. پیرەمێردێکی کورتەباڵای چاویلکە لە چاو کە هەر بەلادا دەهات، وەژوورکەوت. لەسەر دەموچاوی بچووکی هێندێ موی کورتی بناگوێی دەلەرینەوە. سمێڵی تاشیبوون و لێوی سەرەوەی بۆ نێو زاری هاتبۆوە. ئێسکە دەرپەڕیوەکانی روومەتی و چەنەگەی پالّیان وەیەخەی بلّندی ئۆنیفۆرمەکەی دابوو. دەتگوت لە ژێر ئەو ئێسکانەوە ملی نییە. لاوێکی کەڵەگەت کە روومەتی خشت و سووری وەك چینی دەچوون، پیرەمێردی رادەگرت. سێ ئەفسەر بە زریقە و بریقەوە، سێ کەسیش بە جلی ئاساییەوە بە دووایاندا دەهاتن. ماوەیەکی زۆر لە دەورەی مێزەکە پێکەوە راوێژیان کرد و پاشان دانیشتن. دوای ئەوەی هەمووان جێگای خۆیان گرت، یەکێك لەوان کە روومەتێکی بێ موی هەبوو و دووگمەی چاکەتەکەی کرابوونەوە، لە کاتێکدا لێوە ئەستوورەکانی بە زەحمەت دەبزاوتن، بە سارد و سڕی لەگەڵ پیرەمێرد دەستی بە قسان کرد. لەو سەری مێزە گەورەکە کابرایەکی باڵابەرزی سەر بێ تووك، کاغەزی پەڕ پەڕ دەکردن.

پیرەمێرد خۆی بۆ پێشەوە خوار کردەوە و دەستی بە قسە کرد. وشەی هەوەڵی بە ئاشکرا دەربڕی، بەڵام وشەکانی تر بەسەر لێوە باریك و بۆرەکانیدا هەڵدەخلیسکان.

-رادەگەیەنم! ... . .

سیزۆڤ کەمێك دایکی راچڵەکاند و لە کاتێکدا هەڵدەستا گوتی:

-تەماشاکە.

لە پشتی پەرژینە ئاسنەکە دەرگایەک کرایەوە و سەربازێک بە شیری رووتەوە هاتە ژوور. پاشان پاڤێل و ئەندرێی و فیدیا مازین و برایانی گوسێڤ و سامۆیلۆڤ و پێنج لاوی دیکە کە دایک نەیدەناسین، وەژوور کەوتن. پاڤێل زەردەخەنەیەکی بەسەر لێوانەوە بوو. ئەندرێ بەسەر بزرواندن سلاوی لەدایک کرد. زەردەخەنەکانیان، دەموچاویان، فیز و پۆزی زیندوویان، سام و بێدەنگی تالاریان شکاند و گەشاندیانەوە. تروسکەی چلکنی جلە زێڕ کفتەکان کەمتر بوو. شنە بایەکی دلنیایی و بۆ خارێك لە هێزی زیندوو گەیشتە دلی دایك و لە پەشۆکاوی و سەرگەردانی هاتە دەر. لەسەر کەروێتەکانی پشت سەری دایك کە کۆمەلێ تا ئەوەدەم چاوەڕوان بوو، بە دەنگی نەرم و هێدی وەلامی سلاوی گیراوەکان درایەوە.

دایك گوێی لێبوو کە سیزۆڤ لەژێر لێوانەوە دەلێ:

-ناترسێن!

دایکی سامۆیلۆڤ لەلای راستە دەستی بە ناخ هەلکێشان کرد. یەکێك بە توندی هاواری کرد:

-بێدەنگ!

پیرەمێرد گوتی:

-پێتان رادەگەیەنم!

ئەندرێ و پاڤێل لە پەنا یەك دانیشتبوون. مازین و سامۆیلۆڤ و برایانی گوسێڤیش هەموویان لە پێشەوە لەسەر کەروێتێك دانیشتبوون. ئەندرێ ریشی تاشیبوو، سمێلی هاتبوون و نوکی سمێلانی شۆڕ ببۆوە و سەری خڕی وەك سەری پشیلە دەچوو. قیافەیەکی جیددی هەبوو. دوو خەتی پڕەنگ سێبەریان هاویشتبووە سەر لێوی سەرەوەی مازین و سەروچاوی قەلەو ببوو. سامۆیلۆڤ وەك جاران قژی بادرابوون. سیزۆڤ سەری بەردایەوە و ناخێکی هەلکێشا و گوتی:

-فێدیا! فێدیا!

دایك هاسانتر هەناسەی هەلدەکێشا و گوێی دەدا پرسیارەکانی پیرەمێرد کە بە بێ تەماشاکردن لە گیراوەکانی دەپرسی. دایك وەلامەکانی کورت و ئارامی کورەکەی دەبیست. وای دەهاتە بەرچاو کە سەرۆکی دادگا و حاکمەکان نابێ ناجسن و بێڕەحم بن. بە وردی تەماشای سەروچاویانی دەکرد و هەولی دەدا تێیان بگا. هەستی دەکرد کە هومێدێکی تازەی لە دلێدا پەیدا بووە. ئەو کابرای کە دەتگوت رووبەندێکی چینی بە سەروچاواندا دراوە، بەلگەیەکی دەخوێندەوە. دەنگی ئەو کابرایە تالاری پڕکردبوو لە خەم و خەفەت. چوار دادیار بە سرتە و

به نهێنی لەگەڵ گیراوەکان قسەیان دەکرد. دیمەن و ڕواڵەتی هەموویان هێز و توانای نیشان دەدا و باڵندەیەکی ڕەشی گەورەی وەبیر پیاو دەهێنایەوە.

لەلای ڕاستەی کابرای پیر، حاکمێکی ورگ زل و چاو داقوپاو کورسی پڕ کردبوو. لە لای چەپەش کابرایەکی کووڕی سمێڵ سووری ڕەنگ پەڕیو دانیشتبوو. بە ماندوویی سەری وەکورسی دەکرد و چاوی وێك دەهێنان و بیری دەکردەوە. دادپرسیش بێ‌واز و ماندوو دەهاتە بەرچاو. لە پشت سەری حاکمەکان چەند کەسێکی تر دانیشتبوون. کابرایەکی باڵابەرزی بە شان و باهۆ بەسەر و شێوەیەکی ژیرانە دەستی بە ڕوومەتید دەهێنا. نوێنەری نەجیبزادان بە قژێکی شینکی و ریشێکی درێژەوە چاوی دەگێڕان. سەرۆکی شاریش کە دیار بوو بە ورگە زلەکەیەوە ناڕەحەتە، هەوڵی دەدا بە داوێنی بلووزەکەی دایپۆشێ، بەڵام داوێنەکە هەر هەڵدەکشایەوە.

پاڤێلێ بە دەنگێکی بەرز و بەتین گوتی:

لێرەدا نە تاوانبار هەیە، نە دادپرس و حاکم. لێرەدا تەنیا سەرکەوتوو و دیل دەبینرێن.

ماتی و بێدەنگی پەیدا بوو. ماوەی چەند سانییە دایك تەنیا گوێی لە جیڕەی قەڵەم و لێدانی دڵی خۆی بوو. سەرۆکی دادگاش وادیار بوو گوێ دەداتە شتێك و چاوەڕوانە. هاوکارەکانی خۆیان بزاوت. پاشان سەرۆکی دادگا گوتی:

-بەڵێ! ئەندرێی ناخودکا ئیعتراف بکە!.... . . .

یەکێك لە ژێر لێوانەوە گوتی: هەستە! .... . هەستن!. .. . . .

ئەندرێی بەکاوەخۆ هەستا و لە کاتێکدا سمێڵی بادەدان، لە بنەوە چاوی لە پیرەمێرد دەکرد. پاشان شانی هەڵتەکاندن و بە دەنگێك کە وەك گۆرانی دەچوو گوتی:

-ئیعتراف بە چی بکەم؟ نە کەسم کوشتووە و نە دزیم کردووە، تەنیا ئەو شێوە ژیانەم قبووڵ نییە کە خەڵك هان دەدا یەکتر ڕووت بکەنەوە و بکوژن.

پیرەمێرد بە لێبڕاوی گوتی:

-یان بڵێ "بەڵێ" یان بڵێ "نا".

دایك هەستی دەکرد کە لە پشت سەری، پەرێشانی و هاورووژانێك لە گۆڕێ دایە. ئەوانەی لە دەوروبەری بوون پێکەوە سرت و خورتیان بوو، دەجووڵانەوە، دەتگوت دەیانەوێ خۆیان لەو تۆڕە جاڵجاڵۆکەیە ڕزگار بکەن کە قسەکانی کابرای دەموچاو چینی لە دەوروبەریانی تەنیبوو.

سیزۆڤ لە بنەوە بە دایکی دەگوت:

-گوێت لێیه چۆن وەڵام دەدەنەوە؟

-بەڵێ گوێم لێیه.

-فێدیا مازین وەڵام بدەوە!

فێدیا هەستا و بە راشکاوی گوتی:

-ئامادە نیم.

سەروچاوی داگیرسابوون. چاوی دەدرەوشان.

سیزۆڤ ئاخێکی هەڵکێشا. دایك چاوی لێك کردنەوە.

-من دادیارم نەویستووە. ئامادە نیم هیچ بڵێم. ... . ئەم دادگایەش بە قانونی نازانم. ... . ئێوە کێن؟ . . . ... مەگەر میللەت ئەو مافەی داوە بە ئێوە کە ئێمە موحاکەمە بکەن؟ نا، میللەت ئەو مافەی نەداوە بە ئێوە. من ئێوە ناناسم.

دانیشت و سەروچاوی داگیرساوی لە پشت شانی ئەندرێیدا شاردەوە.

حاکمە قەڵەوەکە سەری بۆ لای سەرۆك خوار کردەوە و سرتەیەکی لەگەڵ کرد. ئەو حاکمە رەنگی بزرگابوو خێسەیەکی لە گیراوەکان کرد و شتێکی لە کاغەزی بەردەمی نووسی. سەرۆکی دێ سەری لەقاند و بەکاوەخۆ لاقی بزاوتن. نوێنەری ئەجیبزادان قسەیەکی لەگەڵ دادپرس کرد. سەرۆکی شار گوێی هەڵخستبوو، لە کاتێکدا لووتی دەسری، بزەیەکی لەسەر لێوان بوو.

سەرۆکی دادگا بە دەنگێکی گیراو دیسان دەستی بە قسان کرد. چوار دادیار بە وردی گوێیان دەدایە. گیراوەکان پێکەوە سرت و خورتیان بوو. فێدیا مازین لە کاتێکدا بە نارەحەتی بزەی دەهاتێ، خۆی دەشاردەوە. سیزۆڤ بە سرتە بە دایکی گوت:

-دیتت؟ . .... . ئەو بێ غیرەتە لە هەمووان باشتر قسەی کرد!

دایك بێ ئەوەی تێبگا زەردەیەکی هاتێ. ... . تەواوی ئەو رووداوە لە بەرچاوی دایك سەرەتای بێزارییەکی بەترس بوو کە ئەگەر رووی دابا دەیتوانی دانیشتووەکان بە ترسێکی سارد تێك برووخێنێ. بەڵام قسە هێدی و نارامەکانی پاڤێل و ئەندرێی ئەوەندە نازایانە و بەتین بوون، دەتگوت لە ماڵێکی بچووکی قەراخ شار قسە دەکەن نەك لە دادگا لە بەردەمی حاکمەکاندا.

قسە قارەمانانەکانی فێدیا مازین دایکیان شاد دەکرد. هەستی غیرەت و گەشانەوە لە تالاری دادگا پەیدا دەبوو. لە جوجوڵی ئەوانی پشتەوە دایك تێگەیشت کە تەنیا هەر ئەو هەست بەو شتە ناکا.

کابرای پیر پرسی:

-بیروڕای تۆ چییه؟

داپرسی سەر بێتووك دەستی بە مێزەکەی گرت و هەستایەوە. خێرا دەستی بە قسە کرد و هێندێك ژمارەی گوتن. هیچ شتێکی بەترس لە دەنگیدا نەبوو. لەگەڵ ئەوەش دایك وایزانی خەنجەریان لە دڵی داوە. هەستێکی دوژمنانەی لە دڵیدا پەیدا ببوو. لای وابوو ئەو هەستە وردە وردە وەك شتێکی نەدیتراو و نەگیراو پەرە دەگرێ. تەماشای حاکمەکانی دەکرد، بەڵام لە قسەکانیان تێنەدەگەیشت. بە پێچەوانەی چاوەنواڕی ئەو، لە پاڤێڵ و لە فێدیا تووڕە نەدەبوون و قسەی سووکیان پێ نەدەگوتن. دەیدیت ئەو پرسیارانەی لێیان دەکەن بە گرنگیان نازانن، دەتگوت حاکمەکان بە پێچەوانەی ویستی خۆیان پرسیاریان لێ دەکردن. بە بێ وازی گوێیان بۆ وەڵامەکان رادەگرت. هیچ شتێك بۆ ئەوان جێگای سەرنج نەبوو. هەموو شتێکیکان لە پێشەوە دەزانی.

ژاندارمێك لەبەرامبەریان راوەستابوو بە دەنگێکی هێدی قسەی دەکرد: "هەموویان پاڤێڵ ڤلاسۆڤیان بە هاندەری سەرەکی دانا". حاکمە قەڵەوەکە پرسی:

-ئەدی ئەندریی ناخۆدکا؟

-ئەویش!

یەکێك لە دادیارەکان هەستا و گوتی:

-ئیجازە هەیە؟

پیرەمێرد لە یەکیانی پرسی:

-رەخنەت نییە؟

دایك وای دەهاتە بەرچاو کە حاکمەکان هەموو نەخۆشن. لە رەنگ و رواڵەت و قسەکردنیان نەخۆشی دیار بوو. وادیار بوو لە هەموو شت بێزارن لە ئەفسەرەکان، لە ژاندارمەکان، لە دادیارەکان، لە دانیشتنی بەتۆبزی، لە پرسیار و لێکۆڵینەوە، لە گوێ راگرتن و لە هەموو شتێك. ..... دایك زۆر کەم تێکەڵاوی لەگەڵ گەورە پیاوان هەبوو. چەند ساڵ بوو ئەو جۆرە کەسانەی هەر نەدیتبوو.

ئەفسەرە زەردەڵەکە کە دایك باشی دەناسی، هەستابوو بە دەنگ لەبارەی ئەندریی و پاڤێڵەوە قسەی دەکرد. لە کاتی قسەکردنیدا دایك لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "ناپیاو.. .. . . تۆ سەرت لە هیچ دەرناچێ".

نیتر دایك بێ ئەوەی بترسێ، تەماشای خەڵکەکەی دەکرد. بەزەیی پێدا نەدەهاتن. نەیدەویست لە ئاست ئەوان هەستی بەزەیی هەبێ، بەڵکو هەموویان سەرسامی و خۆشەویستییەکیان تێدا پێك دەهێنا کە بە نەرمی دڵی دەگوشی. سەری سوورمابوو. شادییەکی ئاشکرا و خۆشەویستی و ئارامی دایگرتبوو.

گەنج و بەهێز لە نزیك دیوار دانیشتبوون و خۆیان لە وتووێژی دادپرس و دادیارەکان نەدەگەیاند. جاری وابوو یەکێك لەوان بزەیەکی دەهاتێ و چەند قسەیەکی لەگەڵ هاوڕێکانی دەکرد. ئەندرێی و پاڤێلێ هەمیشە بە سەبر لەگەڵ یەکێك لە دادیارەکان قسەیان دەکرد. دایك شەوی پێشوو ئەو دادیارەی لە ماڵێ دیتبوو، نیکۆلایش بە "هاوڕێ"ی ناو بردبوو. مازین لە هەموان پتر بەتین و تاو و بە گەرمی گوێی بۆ قسەکانیان رادەگرت. سامۆیلۆڤ لەگەڵ گوسێڤ سرتەی دەکرد.دایك دەیڕوانی، لێکی دەدایەوە، بیری دەکردەوە, بێئەوەی هێشتا هەست بەو دوژمنایەتییە بکا کە تووشی دەهات. دایك دەیدیت کە ئیڤان هەموو جارێ بە ئەسپایی لەهاوڕێکانی دەکوتێ، پێدەکەنێ، دەموچاوی سوورهەڵدەگەڕێن و گوێی هەڵدەمسێن و سەری دەلەقێنێ. یەك دووجار نیخەی لێهات، پاشان چەند دەقیقەیەك خۆی پۆز کرد، هەوڵی دەدا خۆی پیاوانەتر نیشان بدا. بەهەر جۆر ئاکارێکی دەم رووتانەی هەبوو، دەیویست سەرکەوتوویی خۆی نیشان بدا.

سیزۆڤ سەبر ئانیشکێکی تێکوتا. دایك ئاوڕی وێدایەوە. سیزۆڤ لەو دەمیدا شادیش بوو و کەمێکیش نیگەران بوو، بە سرتە گوتی:

-ها بزانە، ئەو لاوانە چەندە بڕوایان بە خۆیان هەیە، چەند بەهێز و دڵگەرم بوون.

لە تالاری دادگا شاهیدەکان بە دەنگێکی لەرزۆك قسەیان دەکرد. حاکمەکان بە ساردی پرسیاریان دەکرد. حاکمە قەڵەوەکە باوێشکی دەهاتێ و دەستە ئاوساوەکەی بە پێش زارییەوە دەگرت. هاوکارە سمێڵ سوورەکەشی پتر رەنگی پەڕیبوو. جارجار باسکی هەڵدێنا و بە پەنجەکانی توند نێوچاوانی دەگوشی و بێئەوەی شتێك ببینێ تەماشای بن میچی دەکرد. دادپرس جاروبار شتێکی دەنووسی و لەگەڵ نوێنەری نەجیبزادان سرت و خورتێکی دەکرد. سەرۆکی شار لاقی هاویشتبوونە سەر یەك و بە پەنجە سوکێك لە بەلەکی خۆی دەدا و بە مەندی چاوی لە قامکانی بڕیبوو. سەرۆکی دێ خۆی بە پێشدا خوار کردبوو، سکی کەوتبووە سەر ئەژنۆیانی و هەردوو دەستی وەبەردابوون و سەری دەلەقاند. ئەو لەگەڵ کابرایەکی پیر کە لە نێو کورسیدا ون ببوو و وەك فڕفڕەی با لێبڕاو لە جێی خۆی نەدەبزووت، تەنیا کەسێك بوون کەوا دیار بوو گوێیان لە زەنا زەنای دانیشتووان راگرتبوو. ئەم وەزعە ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا و دیسان خەفەتێك خەڵکەکەی داگرتەوە.

پیرەمێرد گوتی:

-رادەگەیەنم. ... . .

دەنگی کز کرد و پاشماوەی قسەکانی لەژێر لێوانەوە گوت و هەستا.

دەنگی کۆکە، ناخ هەلکێشان، تەپەی پێیان و زەنا زەنا، تالاری پڕ کرد. گیراوەکانیان هێنا، زەردەخەنەیەکیان لەسەر لێوان بوو و لە بەرامبەر کەسوکاریاندا سەریان دانەواند. نیڤان گوسێڤ دیار نەبوو بە کێ دەڵێ، هاواری کرد:

-هاورێ نەکەی بترسی! .. . . .

دایك و سیزۆڤ هەستان و چوونە دالآنێ، کرێکارە پیرە بە دڵسۆزی لە دایکی پرسی:

-پێت خۆشە چایەك بخۆیەوە؟ جارێ سەعات و نیوێکی ماوە.

-نا، سوپاس، ناخۆمەوە.

-کەوابوو منیش ناچم. ... . . ئای لەو کوڕانە، ها؟ واقسان دەکەن و دادەنیشن دەڵێی هەر ئەوان پیاوی دوارۆژن و خەلکی تر هیچ. فێدیاشت دیت، ها؟ ... . .

باوکی سامۆیلۆڤ کلآوەکەی بە دەستەوە گرتبوو، هاتە لایان و بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

-گریگۆری من؟ دادیاری نەویستووە و وەلآمیش ناداتەوە، بۆخۆی ئەو فیکرەی دۆزیوەتەوە. پێلاگێیا! کوڕەکەی تۆ پێی وایە دەبێ دادیار بگرن، بەلآم کوڕی من دەلێ نامەوێ. چوار کەسی دیکەش لەگەلێ کەوتوون.

ژنەکەی لە پەنای دانیشتبوو. بە دەسرە لووتی پاك دەکردەوە و مژۆلی لێك دەدان. سامۆیلۆڤ دەستی بە چەناگەی گرتبوو، چاوی لە مەزرایە دەکرد و دەیگوت:

-ناخر ئەمە زۆر سەیرە! تەماشای ئەو شەیتانانە دەکەی وادەزانی بە خۆڕایی ئەو کارەیان کردووە و ژیانی خۆیان تێك داوە، جاری واشە پیاو دەلێ رەنگە حەقیان بێ. پیاو دەزانێ کە رۆژ بە رۆژلە کارخانە ژمارەیان زۆرتر دەبێ. هێندێ جار دەیانگرن، بەلآم قەت هەموویان ناگیرێن. وەك ماسی نێو چەم وان، هەموویان پێکەوە ناگیرێن. دیسان پیاو لەخۆی دەپرسێ: "لەوانەیە ئەوانە رێگای راستییان گرتبێ؟".

سیزۆڤ گوتی:

-تێگەیشتنی ئەو مەسەلەیە دژوارە.

سامۆیلۆڤ گوتی:

-بەلێ. .. . . راستە.

ژنەکەی پاش ئەوەی چلمی هەلگلوشی هاتە نێو قسەکان:

-ئەو حاکمە مەلعونانە هەموویان سلاّمەتن. .. .. . .

بزەیەکی هاتیّ و دریّژەی پیّدا:

-پیّلاّگییا دلّت نەیەشیّ کە گوتم هەموو خەتای کوڕەکەی تۆیە. راستیت دەویّ مەعلوم نییە کیّ لە هەمووان تاوانبارترە. ... . . بیستووتە کە جاسووس و ژاندارم چ راپۆرتیّکیان لە کوڕەکەی ئیّمە داوە؟

بیّ ئەوەی خۆی بزانیّ، دیار بوو بە کوڕەکەی دەنازیّ و شانازی پیّوە دەکا. دایك ئاگای لەو هەستە هەبوو، بزەیەکی دۆستانەی کرد و لەسەرخۆ گوتی:

-دلّی لاوان هەمیشە لە دلّی پیران لە راستی نزیکترە.

خەلّك لە دالاّنیّ دەگەڕان، لیّك کۆدەبوونەوە و بە دلگەرمی و لەسەرخۆ قسەیان دەکرد. هیچ کەس خۆی دوور نەدەخستەوە. لە سەروچاوی هەمووان دیار بوو کە پیّویستیان بە قسەکردن و پرسیار و وەلاّمدانەوە هەیە. لەو نیّو دالاّنە تەنگە و لە نیّوان دوو لادیواری سپیدا، خەلّك پۆل پۆل دەهاتن و دەچوون. هەر وەك بایەکی توند هەلّیگرتبن و بیانەویّ خۆیان بە شتیّکی قایمەوە بگرنەوە.

برا گەورەکەی "بوکین" وەك دیّویّکی زل بە گرژی و گورجی دەهات و دەچوو و دەیگوت:

-سەرۆکی شار لیّرە چ دەکا؟ بە هیچ جۆر نیّرە جیّگای ئەو نییە.

باوکی کە پیرە پیاویّکی ریوەلّە بوو، بە ترسەوە تەماشای ئەملاولای کرد و گوتی:

-رۆلّە کۆنستانتین بیّدەنگ بە!

-نا، دەمەویّ قسە بکەم.. . . . دەلّیّم ئەو کابرایە، پارەکە بەردەستەکەی لەسەر ژنەکەی خۆی کوشت. ... . بلّیّن بزانم ئەوە چۆن حاکمیّکە؟ بیّوەژنی بەردەستەکەی ئیّستا لەگەلّ ئەو حاکمە دەژی.... . . . ئیّوە چۆنی تیّدەگەن؟ بیّجگە لەوە، هەموو کەس دەزانیّ ئەو کابرایە دزە. ... . . .

سامۆیلۆڤ گوتی:

-ئاخ. .. .. . خوایە . . . . . رۆلّە کۆستانتین!

-راست دەکەی . . . . . ئەو کابرایە حاکمیّکی راست نییە. ... . .

بوکین کە گوێی لەو قسانە بوو، لە کاتیّکدا پۆلیّکی خەلّك بە دوواوە بوو، گەرم داهات و سوورهەلّگەڕا و دەستی بە قسان کرد:

-ئەگەر مەسەلەی تاوانی دزی لە گوڕیّدا بیّ، دەبیّ دەستەی دادگەران پیّرابگا، یانی خەلکی ئاسایی وەك بۆرژوا و وەرزیّران. بەلاّم ئەوانەی دژی حکومەتن؟ ... . . دەولّەت موحاکەمەیان دەکا. وانییە؟

-ئای ...... . سەیرە، بۆ چما ئەوانە دژی دەوڵەتن؟ ئای! ئەوە دەڵێی چی؟

-نا .. . . . راوەستە! فێدیا مازین حەقیەتی! ئەگەر تۆ سووکایەتی بە من بکەی، منیش زللەیەکت لێدەم و پاشان تۆ خۆت موحاکەمە بکەی، دیارە کێ تاوانبار دەبێ. بەڵام لە راستیدا کێ سووکایەتی کردووە؟ تۆ . .. . . . یان من؟

پاسەوانێکی قەپۆزبەرانی پیر کە سینگی بە نیشان و میداڵ داپۆشرابوو، پاڵی بە خەڵکەوە نا و بە قامك هەڕەشەی لە بوکین کرد و گوتی:

-هۆی . . . . . . . هەرا هەرایە مەکە. ... .. پێت وایە ئێرە مەیخانەیە؟

-ئیجازە بدە پیاو! گوێ بدەیە. ... . . ئەگەر من لە تۆ بدەم و تۆش لە من بدەی، پاشان من تۆ موحاکەمە بکەم. ..... . . چۆن بیر دەکەیەوە؟

پاسەوان بە تووڕەیی گوتی:

-ئێستا وەدەرت دەنێم!

-بۆ کوێ! ..... . . لە بەرچی؟

-بۆ کۆڵانێ. ... ... لەبەر ئەوەی هەراهەرایە دەکەی. ... . . .

بوکین تەماشایەکی دەوروبەری کرد و لەسەرخۆ گوتی:

-بۆ ئەوانە هەر ئەوە گرنگە کە پیاو بێدەنگ بێ.

کابرای پیر بە تووڕەیی گوتی:

-تا ئێستا نەتدەزانی؟

بوکین دەنگی کز کرد و گوتی:

-کەوابوو بۆچی خەڵك ناتوانێ بێتە کۆبوونەوەی دادگا و تەنیا کەسوکاری گیراوەکان دەتوانن؟ . . . . ....

.ئەگەر بە دادگەری موحاکەمەیان دەکەن، با لەبەرچاوی خەڵك بیکەن، ئیدی بۆچی دەترسێن؟

.سامۆیلۆڤ بەهێزتر دووپاتەی کردەوە:

-راستە، ئەم دادگایە ویژدانی پیاو رازی ناکا. ..... . .

دایك حەزی دەکرد ئەوەی لەبارەی نابەرامبەری دادگاوە لە نیکۆلای بیستبوو بیگێڕێتەوە. بەڵام قسەکان باش تێنەگەیشتبوو و هێندێکی لەبیر چووبوونەوە. بۆ ئەوەی وەبیر خۆیان بێنێتەوە لە خەڵك جیابۆوە. دیتی لاوێکی سمێڵ بۆر کە دەستی ناوەتە گیرفانی پانتۆڵی و شانی چەپەی لە شانەکەی تری نەویترە، بە وردی تەماشای دەکا.

به ئاشنا هاته بەرچاوی، بەڵام لاوەکه رووی وەرگێڕا و دایکیش که بیری له قسەکان دەکردەوە، لەبیری چووەوە.

پاش تاوێك گوێی له ورته ورتێك بوو:

-ئەوەی ئەو لای؟ لای چەپ؟

یەکێك بەرزتر و خۆشحاڵتر وەڵامی داوە:

-بەڵێ!

دایك تەماشای دەوروبەری خۆی کرد. .. . . . . ئەو لاوەی شانی به قەد یەك نەبوون له پەنای راوەستابوو، لەگەڵ یەکی تەنیشتی که لاوێکی بەشان و باهو و ردێن رەش بوو و پاڵتۆیەگی کورتی لەبەردابوو و چەکمەیەکی درێژی له پێدا بوو، قسەی دەکرد.

دایك تێکرا بوو، بەڵام هەر لەو کاتەدا ویستی لەبارەی بیروباوەڕی کوڕەکەیەوە قسه بکا. دەیویست ئەو رەخنانه ببیسێ که لەوانەیه له قسەکانی بگیرێن و لەڕووی قسەی ئەو کەسانەی له دەوروبەری بوون بڕیاری دادگا هەڵسەنگێنێ.

به پارێزەوە به سیزۆڤی گوت:

-باشە، ناوا موحاکەمەیان دەکەن؟ لەم وەزعە تێناگەم. .. .. . حاکمەکان دەیانەوێ بزانن کام له گیراوەکان چی کردووە، بەڵام ناپرسن بۆچی وای کردووە.. . . . . .چما ئەوە راستە؟ پاشان ئەوانە هەموویان پیرن. دەبێ گەنج ئەو لاوانە موحاکەمە بکەن.

سیزۆڤ گوتی:

-بەڵێ سەر دەرکردن لەو کاره بۆ ئێمە دژوارە. ... . زۆریش دژوارە.

به بیرکردنەوە سەری لەقاند. پاسەوان دەرگای تالاری کردەوە و بانگی کرد:

-کەسوکاری گیراوەکان بێنە ژوورێ. ..... . . پسولەکانتان نیشان بدەن. ،

دەنگێکی کزەڵۆك گوتی: پسوله.. . . .. دەڵێی بۆ سیرك دەچین. ...... ..

هاندانێکی گشتی و رق و قینێکی نەدیتراو هەست پێدەکرا. تەماشاچییەکان پتر روویان کرابۆوە. هەر هەرایان دەکرد و لەگەڵ پاسەوانەکان دەمه دەمیان بوو.

## (٢٥)

سیزۆڤ بە بۆڵە بۆڵ لەسەر کەروێتێك دانیشت. دایك پرسی:

-چیتە؟

-هیچ . . . . میللەت تێنەگەیشتووە.

زەنگێك لێدرا. ... . . .یەکێك بە توندی رایگەیاند:

-حاکمەکان دێن!

سەرلەنوێ وەك جاری پێشوو هەموویان هەستان. حاکمەکان هاتن هەر وەك خۆیان دانیشتن. .. .. . گیراوەکانیان هێنا نێو تالار. سیزۆڤ دەستی کرد بە ورتە ورت:

-باش سەرەنج بدەنێ، ئێستا دادپرس قسە دەکا.

دایك سەری هەڵێنا، بۆ پێشەوە خواربۆوە و چاوەڕوانی شتێکی نائاسایی بوو. دادپرس کە راوەستابوو، ڕووی لە حاکمەکان بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی راستی لە هەوا راوەشاند و دەستی بە قسان کرد. دایك لە قسەکانی هەوڵی تێنەدەگەیشت. دەنگی زل بوو، هێندێ جار توند دەبوو، دووایە نرم دەبۆوە. وشەکانی لەبەر یەك دەکشانەوە، باڵیان دەگرت و وەك پۆلە مێشوولەیەکی رەش لەسەر کلۆ شەکرێك، دەسووڕان. دایك لەو قسانەدا نە هەڕەشەی دەدیت و نە شتێکی نائاسایی. وەك بەفر سارد و وەك خۆڵەمێش بۆر، دانار دانار دەبوون و تالاریان پڕ دەکرد لە خەم و خەفەت و موی لەشی پیاویان گرژ دەکرد. بێگومان پاڤێڵ و هاوڕێکانی گوێیان لەو قسە درێژە و کەم مانایانە نەدەبوو کە لێی نەدەترسان و بە ئارامی وتووێژی خۆیان درێژە پێدەدا. جاروبار بزەیان دەهاتێ وهێندێ جار گرژ دەبوون تا زەردەخەنەی خۆیان بشانەوە.

سیزۆڤ بە ئەسپایی گوتی:

-درۆ دەکا!

دایك هێشتا لەسەری ساخ نەببۆوە تا بڵێ راستە یان درۆیە. گوێی بۆ قسەکانی دادپرس شل کردبوو، دەیزانی کە بێئەوەی راستە و راست هێرش بەرێتە سەر یەکێك، هەمووان بە تاوانبار دادنێ. کاتێك ناوی پاڤێڵی دەهێنا، باسی فێدەیاشی دەکرد، پاشان بوکینیشی لەگەڵ دەخستن. دەتگوت هەموو تاوانبار کراوەکان لە کیسەیەك دەنێ و رێکیان دەگوشێ. نێوەرۆکی قسەکانی هەستی دایکیان دانەدەمرکاند، نە کەیفخۆشیان دەکرد و نە نیگەران. هەروا چاوەڕوانی شتێکی نائاسایی بوو. لە نێو قسە و دەنگ و دەموچاو و باسك راوەشاندنی

داپرسدا بۆ ئەو شتە دەگەڕا. هەستی دەکرد کە ئەو شتە نائاسایی و نەبینراو و نەبیسراوە لەوێیە. سەرلەنوێ دڵی تەنگ دەبوو.

تەماشای حاکمەکانی دەکرد. بە ئاشکرا دیار بوو قسەکانی داپرس ماندووی کردوون. سەروچاوی زەرد و گرژ و سیسیان وەك تەرمی بێ گیان سارد و بێتین بوو. ئەو سەروچاوانە کە هێندێکیان هەڵمساو و هێندێك لەڕ و لاواز بوون، لە خەفەتێکدا کە تالاری داگرتبوو پتریش لێڵ و بێڕەنگ ببوون. سەرۆکی دادگا نەدەبزووت. لە بەرامبەر ئەو بێوازی و سارد و سڕییەدا دایك لەخۆی دەپرسی:

-بەراستی ئەوەیە دادگا و موحاکەمە؟

لەپڕ ئیددیعانامەی داپرس بە جۆرێکی چاوەڕوان نەکراو تەواو بوو. داپرس بە دەست ڕێکخستن لە بەرامبەر حاکمەکاندا سەری دانەواند و لە جێگای خۆی دانیشتەوە. نوێنەری نەجیبزادان چاوی گێڕان و بە سەر ئیشارەیەکی بۆ کرد، سەرۆکی شار دەستی بۆ درێژکرد و سەرۆکی دێش بزەیەکی هاتێ و تەماشایەکی ورگی خۆی کرد.

کابرای پیرە کاغەزێکی بۆ لای چاوی خۆی برد و گوتی:

-دادیاری "فیدۆسیێف" و "مارکۆڤ" و "زاگارۆڤ" نۆرەی قسەیەتی!

ئەو دادیارەی دایك لە ماڵی نیکۆلای دیتبووی، هەستا, دەم وچاوێکی گەورە و ڕواڵەتێکی بێئازاری هەبوو، چاوە چکۆڵەکانی دەدرەوشان، بە کارەخۆ و بە دەنگێکی ئاشکرا و ڕەوان دەستی بە قسە کرد. بەڵام دایك نەیتوانی گوێی لە قسەکانی بێ. سیزۆڤ بەسرتە پێی گوت:

دەزانی دەڵێ چی؟ دەڵێ ئەوانە منداڵ و نەفام و شەڕانی بوون. مەبەستی فێدیایە!

دایك کەوتە ژێر باری ناهومێدییەکی توند و وەڵامی نەدایەوە. ئازاری زیاد دەبوو، گیان ڕێك دەگوشرا. ئێستا تێدەگەیشت کە بۆچی چاوەڕوانی عەدالەت بوو و بۆچی پێی وابوو وتووێژێکی پیاوانە و توند لە نێوان حەقیقەتی کوڕەکەی و حەقیقەتی دادگادا دەبینێ. لای وابوو حاکمەکان بە درێژی و بە وردی لەبارەی تەواوی ژیانی پاڤێلەوە پرسیار دەکەن. بە چاوێکی ئاواڵە تەماشای هەموو قسە و کردارەکانی ڕۆژانەی پاڤێل دەکەن و پاش ئەوەی ڕاستی و دروستی ئەوەیان بۆ دەرکەوت، بە دەنگێکی بەرز دەڵێن:

-"ئەو پیاوە لەسەر حەقە".

بەڵام هیچی وا نەبوو. وادیار بوو کە تاوانبارکراوەکان و حاکمەکان سەد فرسەنگ لێك دوورن و ئاگایان لە یەکتر نییە. دایك لە چاوەڕوانیدا ماندوو بوو. ئیتر گوێی نەدەدا قسەکان، گۆڕابوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

-"ئاوا موحاکەمە دەکەن؟ .... .. ... موحاکەمە!. . .. ".

سیزۆڤ بە سەر لەقاندن قسەکەی سەلماند ولەبن لێوانەوە گوتی:

-باش بوو.

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

-وادیارە ئەو حاکمانە مردوون!

-سەرلەنوێ زیندوو دەبنەوە!

دایك کە چاوی لێکردن، بەراستی سێبەرێکی نیگەرانی لەسەر دەموچاویان بەدی دەکرد. دادیارێکی تر قسەی کرد. ئەو کابرایە پیاوێکی کورتە باڵا بوو، سەروچاوێکی درێژ و رەنگێکی بزرکاوی هەبوو. حاکمەکان قسەکەیان پێبڕی. لەپڕ دادپرس هەستا و بە دەنگێکی توند باسی سووڕەت مەجلیسی کرد و لەگەڵ کابرای پیرە دەستی بە قسەکرد. دادیار بە رێزەوە سەری دانەواند و گوێی بۆ قسەکانیان شل کرد، پاشان لەسەر قسەی خۆی رۆیشت. سیزۆڤ ئامۆژگاری دەکرد:

-راست و رەوان قسە بکە، بێ توێکڵ! بزانە کاکڵی مەبەست لە کوێ دایە!. ... ...

هاوروژان لەنێو تالاردا زیاد دەبوو. قینێکی شەڕکەرانە سەری هەڵدەدا. دادیار لە هەموو لاوە هێرشی دەکردە سەر حاکمەکان و بە قسەی گەرم و سووڕەوەبوو پێستی بە ساڵدا چووی ئەوانی داخ دەکرد. وا دەهاتە بەرچاو کە حاکمەکان لێك نزیك دەبنەوە، هەڵدەمسێن و دەپووچێنەوە، تا بە هەموو لەشی داڕزاوی خۆیانەوە پێشگیری لە تەوس و پلارەکان بکەن.

ئەو جار پاڤێڵ هەستا. لەپڕ تالار مات و بێدەنگ بوو. دایك تەواو خۆی بۆ پێشەوە خوارکردەوە. پاڤێڵ بە هێدی و ئارامی دەستی پێکرد:

-لەبەر ئەوەی من ئەندامی حیزبێکم، بێجگە لە دادگای حیزبەکەم هیچ دادگایەك بە رەسمی ناناسم. بۆ بەرگری لە خۆم قسە ناکەم، بەڵکو بۆ پێخۆشبوونی ئەو هاوڕێیانە قسە دەکەم کە دادیاریان نەگرتووە. تێدەکۆشم ئەو شتانەتان بۆ روون بکەمەوە کە تێیان نەگەیشتوون. دادپرس چوونی ئێمەی بۆ ژێر ئاڵای سۆسیال دیموکرات بە یاخیبوون دژی کاربەدەستە بەرزەکانی دەوڵەت زانیە و لەبارەی ئێمەوە، وەك یاخییەکانی دژی "قەیسەر" قسەی کردووە. پێویستە بڵێم کە بە بڕوای ئێمە قەیسەر تەواوی ئەو زنجیرە نییە کە وڵاتی ئێمەی بەستووەتەوە، بەڵکو تەنیا هەوەڵین ئاڵقەیەتی کە دەبێ میللەتی لێ رزگار بکەین.

بێدەنگی لەبەرامبەر ئەو دەنگە بەتینەدا قوڵتر دەبوو. وادەهاتە بەرچاو کە تالارەکە گوشادتر دەبێ و پاڤێلا لە گوێگرەکانی وەدوور دەکەوێ. بەرزتر و گەشتر ببوو. دایك هەستی بە سەرما دەکرد.

حاکمەکان بە گرانی و بە نیگەرانییەوە خۆیان بزاوت. نوێنەری نەجیبزادەکان لەگەڵ حاکمە گێلەکە ورتە ورتێکی کرد، کابراش سەری راوەشاند و رووی لە کابرا پیرە چکۆڵەکە کرد کە لەو لایەوە قسەی لەگەڵ دەکرد. سەرۆکی دادگا کە لە کورسیەکەیدا خۆی دەبزوات، شتێکی بە پاڤێل گوت، بەڵام دەنگەکەی لەنێو رەوەندی بەرین و رێکی قسەکانی ئەو لاوەدا پووچانەوە.

-ئێمە سۆسیالیستین. ئەمە مانای وایە دوژمنی خاوەن ملکایەتی تایبەتین کە بووەتە هۆی ناکۆکی خەڵك. ئەوان لە دژی یەکتر چەکدار دەکا، ناکۆکی و ناتەبایی لە ئاشتی نەهاتوو پێك دێنێ و بۆ شاردنەوە و پینەکردنی ئەو ناتەباییەش درۆیان دەکا. خەڵك فێری درۆ و دووڕوویی و دوژمنایەتی دەکا. ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین کۆمەڵێکی واکە مرۆڤ تەنیا بە ئامرازی دەوڵەمەندبوون دەزانێ، کۆمەڵێکی نائینسانییە. .. . . ئەو کۆمەڵە دوژمنی ئێمەیە. ئێمە ناتوانین رەوشتی چەپەڵ و بێبەزەیی و سەگ رەوشتانەی ئەو کۆمەڵە سەبارەت بە بەرهەڵستانی قبوڵ بکەین. ئێمە دەمانەوێ دژی هەر شێوە رەفتارێك کە تەنیا لەڕووی سوود و تەماع خەڵك لێك جیادەکاتەوە، دژی هەموو شێوەیەکی کۆیلەتی بەدەنی و مەعنەوی مرۆڤ کە ئەو کۆمەڵە بەکاری دێنێ، خەبات بکەین و خەبات دەکەین. ئێمەی کرێکار، ئەو کەسانەین کە لە مەکینە زلەکانەوە بیگرە تا دەگاتە بوکەشووشەی منداڵان، هەموو شت بەکاری ئێمە دروست دەکرێ. ئێمە لەو حەقەش بێبەشین کە بۆ گەیشتن بە ئامانجی ئینسانی خۆمان خەبات بکەین. هەموو کەس پێی رەوایە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی ئێمە بکاتە داردەست. ئێمە دەمانەوێ ئەوەندەمان ئازادی هەبێ بتوانین بەرە بەرە دەسەڵات بگرینە دەست، یان دەسەڵات بکەوێتە دەستی گەل، کار بۆ هەموو کەس هەبێ. ئێوە دەزانن کە ئێمە یاخی نین.

پاڤێل زەردەخەنەیەکی هاتێ و لەسەرخۆ دەستێکی بە قژەکانیدا هێنا. چاوی بە گەشاییەکی پتر دەدرەوشان.

سەرۆکی دادگا بە دەنگێکی توند گوتی:

-تکا دەکەم باسی مەسەلەکە بکە!

بە تەواوی سینگی خۆی بۆ لای پاڤێلا وەرگێڕابوو تەماشای دەکرد. دایك وای هاتەبەرچاو کە چاوە سیسەکانی ئەو کابرایە پڕ لە تەماع و ناجسنی و چەپەڵین. حاکمەکان هەموو چاویان لە پاڤێلا بڕیبوو، دەتگوت چاویان بەوییەوە نووساوە و خۆیان پێوە هەڵاوەسیوە، تا خوێنی بمژن و گیان وەبەر لەشی رزیوی خۆیان بێننەوە. پاڤێلا بە لێبڕاوی پەنجەی بۆ درێژکردن و بە دەنگێکی ئاشکرا گوتی:

-ئێمە شۆڕشگێڕین و تا ئەو دەمەی هێندێك زوڵم لە هێندێکان دەکەن هەر شۆڕشگێڕ دەبین. ئێمە دژی دەستەیەك خەبات دەکەین کە ئێوەی بۆ پارێزگاری لە قازانجی خۆی دیاری کردووە. تا ئەو ڕۆژەی ئێمە سەرنەکەوین، ئاشتی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا سەر ناگرێ. ئێمە سەردەکەوین، سەرکەوتن بۆ ئێمەی زۆرلێکراو دەبێ. نوێنەرانی ئێوە ئەوەندە بەهێز نین کە خۆتان فکر دەکەنەوە. ئەو دارایی و سامانەی کۆیان کردووەتەوە و بە فیداکردنی میلیۆنها ئینسانی چارەڕەش دەیپارێزن ئەو هێزەی ئەوانی بەسەر ئێمەدا زاڵ کردووە، ڕەوتێکی بەرهەڵست لە نێوان ئەواندا پێك دێنێ و لە باری لەش و گیانەوە گەندەڵیان دەکا. گیانتان هەمشەی لەژێر بارێکی گران دایە. لە ڕاستیدا ئێوە کە فەرمانڕەوای ئێمەن، لە ئێمە کۆیلەترن. ئێوە ڕۆحتان کۆیلە و ژێردەستە، بەڵام ئێمە لەشمان. ئێوە ناتوانن خۆتان لەو کۆیلەتی و پڕوپووچە ڕزگار بکەن کە گیانتان دەکوژێ، بەڵام هیچ شتێك ناتوانی ببێتە کۆسپی ئازادی ژیانی ئێمە. ویژدانی ئێمە هەمیشە دەگەشێتەوە و پەرە دەستێنێ، هەمیشە گەشەدارتر دەبێ و باشترین کەسانێك کە دەروونیان پاکە، تەنانەت باشترین کەسانێك لە کۆمەڵی ئێوەدا، بۆلای خۆی ڕادەکێشێ. بە چاوی خۆتان تەماشا بکەن، هەر ئێستا ئیتر کەسێکیتان نییە کە بتوانێ بە بیروباوەڕ بۆ پاراستنی دەسەڵاتی ئێوە تێبکۆشێ. ئێوە ئیتر هەموو وەرەقێکتان لە عەرزی داوە. هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆتان بەدەستەوە نەماوە کە بتوانێ ئێوە لە هێرشی دادپەروەری مێژوو بپارێزێ. لە مەیدانی بیروڕادا ناتوانن ئیتر هیچی تازە بخولقێنن. ئێوە لەباری مەعنەوییەوە بەرهەمێکتان نییە. بیروباوەڕی ئێمە ڕۆژبەرۆژ پەرە دەگرێ، دەچێتە نێو کۆمەڵانی خەڵك و ئەوان بە خەبات، بۆ ئازادی، بۆ خەباتی شێلگیر و لە ئاشتی نەهاتوو ڕێك دەخا. بێجگە لە زۆرداری و دڕندەیی، ناتوانن بە هیچ شتێکی تر پێشی ئەو جووڵانەوە بگرن. بیروهۆشی مەزنی کرێکاری تەواوی کرێکارانی جیهان لەسەر یەك بیروباوەڕ کۆدەکاتەوە. ئێوە ناتوانن بە هیچ جۆر پێشی ئەو ڕەوتە بگرن کە ژیان تازە دەکاتەوە. ئەو دەستانەی ئەمڕۆ ئێمە دەخنکێنن، هەر بەو زووانە، برایانە، دەستی ئێمە دەگوشن. هێزی ئێوە هێزێکی میکانیکییە کە بە کۆکردنەوەی زێڕ و زیو پێکهاتووە. ئەو هێزە ئێوە لە دەستە و کۆمەڵی ئەوتۆدا کۆدەکاتەوە کە یەکتر دەخۆنەوە. بەڵام هێزی ئێمە هێزێکی زیندووی هاوپەیوەندییە کە هەموو ژێردەستەکان دەکا بە یەك. ئەوەی ئێوە دەیکەن هەمووی تاوانبارانەیە، چونکە تەنیا لە فیکری ئەوەدان کە مرۆڤ بکەن بە کۆیلە. بەڵام تێکۆشانی ئێمە دنیا لە شەڕی دێوەزمەی درۆ و تەماع و قینی ئێوە ڕزگار دەکا. کرێکاران و وەرزێرانی ئێمە ڕزگار دەبن و دنیایەکی ئازاد و یەکسان و لەبن نەهاتوو پێك دێنن. ئەمە هەر دێتە دی!

پاڤێلاً تاوێك بێدەنگ بوو، پاشان بە هێزێکی پتر دووپاتەی کردەوە:

-ئەمە هەر دێتە دی!

حاکمەکان زۆر بە سەیری هەر سرت و خورتیان بوو، بێئەوەی چاو لە پاڤێلآ وەرگێڕن. دایك لەبەرخۆیەوە دەیگوت:

-ئەوانە بەو چاولێکردنە قەد وباڵای کوڕەکەم کە ئێرەیی بە ساخی و توانا و گورج و گۆڵییەکەی دەبەن، پیس دەکەن.

گیراوەکان بە وردی گوێیان بۆ قسەی هاوڕێکەیان راگرتبوو. ڕەنگیان پەڕیبوو، بەڵام تیشکی شادی لە چاوانیاندا دەتروسکا. دایك قسەکانی پاڤێلی هەڵدەمژی و لە مێشکیدا تۆمار دەبوون.

پیرەمێردی کورتەباڵآ چەند جار قسەکانی پاڤێلی بڕی. دیار نەبوو چی دەگوت. تەنانەت جارێك زەردەخەنەیەکی خەمبارانەشی هاتە سەر لێوان. پاڤێلێ بە بێدەنگی گوێی بۆ قسەکانی رادەگرت و بە دەنگێکی ئارام قسەکانی درێژە پێدان و سەرەنجی هەمووانی رادەکێشا. دوواییەکەی سەرۆکی دادگا دەستی بۆ پاڤێلێ راگرت و بە توندی چەند قسەیەکی کرد. ئەویش بە شێوەی گاڵتە پێکردن وەڵامی دایەوە:

-ئەتیجە دەگرم. مەبەستم ئەوە نەبوو سووکایەتی بە تۆ بکەم. بە پێچەوانەوە، چونکە تۆیان بە زۆر هێناوەتە ئەم شانۆکارییە کە ناوتان ناوە دادگا، لەبارەی تۆوە هەست بە هاودەردی دەکەم. هەر چۆنێك بێ ئێوە ئینسانن. ئێمە لە دیتنی ئەوە کە خەڵك هێندە پەست و نزم بن و ببنە خزمەتکاری ملهوڕ و زۆرداران و نرخی مرۆڤایەتی خۆیان بخەنە ژێر پێ، با دژی بیروباوەڕی ئێمەش بن، ناڕەحەت دەبین.

پاڤێلێ، ئیتر بێئەوەی تەماشای حاکمەکان بکا دانیشت. دایك هەناسەی خۆی راگرت تا بە وردی تەماشای ئەو کەشانە بکا کە چارەنووسی کوڕەکەیان بە دەست بوو.

ئەندرێی کە لە خۆشییان گەش ببۆوە، بە گەرمی دەستی پاڤێلی گوشی. سامۆیلۆڤ و مازین روویان بۆ لای وەرگێڕا. پاڤێلێ لە شادمانی هاوڕێکانی تۆزێك پەشۆکا. تەماشای ئەو کەروێتەی کرد کە دایك لەسەری دانیشتبوو، بەسەر ئیشارەی بۆ کرد، وەك لێی بپرسێ:

-رازی؟

دایك بە هەناسەیەکی قوڵ و بە رووخۆشی وەڵامی دایەوە. لە کاتێکدا گڕێکی گەرمی ئەوین وخۆشەویستی دایگرتبوو، دەلەرزی. سیزۆڤ لەژێر لێوانەوە گوتی:

-ئەوەتا. ... . .. ئێستا موحاکەمە دەست پێدەکری، چاکیان ڕێکخستەوە، ها. .. . .. . دایك لە خۆشی وەی کوڕەکەی وا ئازایانە قسەی کردووە و قسەکانی تەواو کردووە، بێئەوەی وەڵامی بداتەوە سەری لەقاند. پرسیارێك وەك چەکوش مێشکی دەکوتا:

"ڕۆڵەکانم، ئێستا چتان بەسەر دێ؟".

## (٢٦)

ئەوەی کوڕەکەی گوتی بۆ دایك شتێکی تازە نەبوو، شارەزای بیروباوەڕی بوو، بەڵام یەکەم جار بوو کە لە دادگادا ئەو قسانە دەکران. هێمنایەتی پاڤێل سەرنجی دایکی ڕاکێشابو. قسەکانی پاڤێل لەگەڵ بڕوایەکی بەتین بە سەرکەوتن و بە حەقانییەتی کوڕەکەی، وەك ئەستێرەیەك لە دەورانیدا دەدرەوشان و لە دڵیدا تێکەڵ دەبوون. پێی وابوو ئێستا حاکمەکان لەگەڵ پاڤێلا دەست بە وتووێژ دەکەن، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەندرێ ڕاست بۆوە. کەمێك خۆی بزاوت و لە بنەوە چاوێکی لە حاکمەکان کرد و دەستی کرد بە قسان:

-دادیارە بەڕێزەکان!

حاکمە نەخۆشەکە بە دەنگێکی تووڕە و توند گوڕاندی:

-دادگا لەبەرامبەر تۆیە، نەك دادیارەکان.

دایك لە ڕواڵەتی ئەندرێی را دەیزانی کە دەیەوێ گاڵتە بکا. سمێڵی دەلەرزین و چاوەکانی وەك چاوی پشیلە وریایی و شادییان لێ دیار بوو کە دایك شارەزای بوو. دەستە درێژەکانی توند بە سەریدا هێنا و هەناسەیەکی هەڵکێشا. سەری ڕاوەشاند و پرسی:

-چۆن شتی وا دەبێ؟ پێم وابوو مەسەلەکە وا نییە، یانی ئێوە حاکم نین، تەنیا دادیارن. .. . .

کابرا بە وشکی ڕایگەیاند:

-تکا دەکەم باسی ئەسڵی مەسەلە بکە.

-ئەسڵی مەسەل؟ باشە. کەوابوو دەمەوێ بڕوا بکەم کە ئێوە بەراستی حاکمن، یانی سەربەخۆ و جوامێرن. ...

.

-دادگا پێویستی بە بیروباوەڕی تۆ نییە.. . . .

-چۆن؟ پێویستی بەو ڕێزگرتنە نییە؟ ها. . . . بەو حاڵەش لەسەر قسەکەم دەڕۆم. ئێوە جۆرە کەسێکن کە فەرقی دۆست و دوژمن ناکەن، ئازاد و سەربەخۆن. بەوجۆرە ئێستا دوولا لەبەرمبەر ئێوەدان، یەکیان سکالایەتی کە تالان کراوە و لێی دراوە، ئەوەی دیکەیان وەڵام دەداتەوە کە مافی لێدان و تالانکردنی هەیە، چونکە تفەنگی بە دەستەوەیە. . . . .

کابرای پیر دەنگی هەڵێنا و بە دەستی لەرزۆکەوە پرسی:

لەبارەی ئەسڵی مەسەلەکەوە قسەت هەیە بیکەی؟

دایك بە دیتنی ئەو وەزعە کەیفخۆش بوو، بەڵام شێوەی ڕەفتاری ئەندرێی بە دڵ نەبوو، چونکە لەگەڵ قسەکانی پاڤێل ڕێك نەدەکەوت. دایك دەیویست باسێکی شێلگیر و بەپێز دەست پێبکرێ.

ئەندرێی تەماشای کابرا پیرەی کرد و بێئەوەی وەڵامی بداتەوە گوتی:

-باسی مەسەلەکە؟ قسە لە چی بکەم؟ ئەوەی پێویست بوو بیزانن هاوڕێم گوتی، ئەوەی دیکەش ئەگەر وەختی هات خەڵکی تر دەیڵێن. . ... .

کابرای پیرە تۆزێك لە جێگای خۆی بلند بوو و گوتی:

-مافی قسەکردنت لێ وەردەگرمەوە. .. . . . نۆرەی گریگۆری سامۆیلۆڤە.

ئەندرێی لێوەکانی توند پێکەوە گوشی و بە تەمبەڵی خۆی هاویشتە سەر کەروێتەکە. لە تەنیشت ئەو سامۆیلۆڤ لە کاتێکدا ئاڵقەی قژەکانی دەبزاوت هەستا سەرپێ. ... .

-دادپرس گوتی ئێمە وەحشی و دوژمنی پێشکەوتنین.

-بێجگە لەو شتەی پەیوەندی بە کارەکەتانەوە هەیە باسی هیچ شتێك نەکەی!

-هەروا دەکەم. هیچ شتێکی ئەوتۆ نییە کە پەیوەندی بە خەڵکی بەشەرفەوە نەبێ. تکا دەکەم قسەکانم مەبڕن.

من لە ئێوە دەپرسم: زانیاریتان لە چ رادەیەك دایە؟

پیرەمێرد ددانی دەچیڕەوە بردن و گوتی:

ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووینە ئێرە لەگەڵ ئێوە دەمەتەقە بکەین. با بۆ سەر مەسەلەکە بگەڕێینەوە.

وادیار بوو گاڵتەی ئەندرێی حاکمەکانی نارەحەت کردووە. لەسەر چاوەکانیاندا دیاربوو. وتەی پاڤێل پەشێوی کردبوون، بەڵام شێوەی بەهێز و پێزی قسەکانی، پێشی رقی گرتبوون و ڕێزی ئەوانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. ئەندرێی ئەو خۆڕاگرییەی ئەوانی لەناو بردبوو و بە هاسانی ئەو شتەی لە بنەوە بوو هێنابوویە ڕوو. دەستیان کردبوو بە سرت و خورت و خێرا خێرا قیافەی خۆیان دەگۆڕی.

-ئێوە جاسووس پەروەردە دەکەن، ژنان و کچان سووك دەکەن، خەڵك دێننە ریزی دز و پیاوکوژان، بە ناردق دەرماندای دەکەم و لە زیندانندا دەیرزێنن. شەرە نێودەوڵەتییەکان، درۆ، سەرسەریەتی، خەرفاندنی میللەت و ئەوانە شارستانیەتی ئێوەن. بەڵێ، ئێمە دوژمنی ئەو شارەستانییەتەین.

کابرای پیرە چەناگەی بزاوت و هاواری کرد:

-تکا دەکەم. ... . .

سامۆیلۆڤ بە جارێك داگیرسابوو، توندتر لە کابرا هاوری کرد:

-بەڵام ئێمە شارستانییەتێکی دیکە، ئەو شارستانییەتەمان خۆش دەوێ کە ئێوە داهێنەرەکانیتان زیندانی کردووە و مێشکیانتان بەستووە.

-مافی قسەکردنت لێ دەستێنمەوە.. . . . نۆرەی فێدیا مازینە!

لاوی کورتەباڵا لەپڕ وەك درێشە لە کون بێتە دەر، هەستا و بە دەنگێکی پچڕپچڕ گوتی:

-من ... . . من سوێند دەخۆم، دەزانم حوکمم دەدەن.

پشووی سوار بوو و رەنگی پەڕی. ئیتر لە سەروچاویدا بێجگە لە چاوەکانی هیچی تر نەدەبینرا. دەستی درێژ کرد و درێژەی پێدا:

-قەولی شەرەفتان پێدەدەم! بۆ هەر شوێنێکم بنێرن، رادەکەم، دێمەوە، هەمیشە بۆ ئەو مەرامە کار دەکەم. .. . . بۆ ئازادی وڵات. لە تەواوی ژیانمدا! قەولی شەرەف دەدەم. ... . . لافاوی هاندەران تەواوی خەڵکەکەی بزواندبوو و بە هەراهەرایەکی سەیر دەجووڵانەوە. ژنێك دەگریا، یەکێك دەکۆکی و هەناسەی نەدەهات. ژاندارمەکان بە سەرسامییەکی منداڵانە تەماشای گیراوەکانیان دەکرد. بە قینەوە چاویان لە خەڵك دەکرد. حاکمەکان وەجموجوڵ کەوتبوون. کابرای پیرە هاواری کرد:

-نۆرەی ئیڤان گوسێڤە.

-من قسە ناکەم!

-نۆرەی ڤاسیلی گۆسێڤە.

-من نامەوێ قسە بکەم.

-نۆرەی فیۆدۆر بوکینە!

ئەو کابرایە کە قژێکی بۆری هەبوو، بە تەمبەڵی هەستا و لە کاتێکدا سەری رادەوشاند بە کاوەخۆ گوتی:

-دەبوو شەرم بکەن. من هەرچەندە نەزانێکم، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە دادپەروەری چییە.

دەستی خستە سەر سەری و بێدەنگ بوو. چاوی تۆزێك وێك هێنان، وەك تەماشای شتێکی دوور بکا.

کابرای پیرە بە سەرسووڕمانێکی رق هەستاوانە، لە کاتێکدا پاڵی وەکورسیدا بوو، گوڕاندی:

-ئەوە دەڵێی چی؟

-ئاخ. . . . . . . ئێوە؟. . . . . .

بوکین بە گرژ و مۆنی خۆی خستە سەر کەروێتەکەو. لە قسە بێماناکەیدا شتێکی گرنگ و مەزن و هەر لەوکاتەشدا سەرکۆنەیەکی داخاوی و ساکار هەبوو. کاری کردە سەر هەموو خەڵکەکە، تەنانەت حاکمەکانیش گوێیان قوت کردەوە، وەك بیانەوێ دەنگدانەوەیەك وەربگرن کە لە قسەکانی روونتر بێ. تەماشاچییەکان هەموو مات بوون. بێجگە لە دەنگی گریانێکی کەم هیچ نەدەبیسرا. پاشان دادپرس شانی هەڵتەکاندن و بزەیەکی هاتێ. نوێنەری نەجیبزادەکان کۆکی. دیسان لە تالاردا بوو بە سرت و خورت. دایك سەری لە سیزۆڤ وەنزیك خست و گوتی:

-حاکمەکانیش قسە دەکەن؟

-نا، تەواو بوو، ئێستا دەبێ حوکم بدەن.

-پاشان ئیتر چی؟

-بەڵێ. . . .

دایك بڕوای بە قسەی سیزۆڤ نەکرد. دایکی سامۆیلۆڤ بە پەرێشانی لەسەر کەروێتەکە دەجوولا، شان و ئانیشکی وە ئیلۆڤنا دەکەوتن. لەسەرخۆ لە مێردەکەی پرسی:

-زۆر سەیرە، چۆن شتی وا دەبێ؟

-ئەوە بە چاوی خۆت دەبینی!

-چ بەسەر کوڕەکەمان دێنن؟

-بێدەنگ بە . . ... . وازم لێ بێنە. ... . . .

پیاو هەستی دەکرد کە لە نێو تەماشاچییەکاندا شتێك تێکدراوە، شکاوە، گۆڕاوە. بە سەرسووڕمانەوە مژۆڵیان لێکدەدان. دەتگوت لەبەرچاویان گڕێکی ئاگر دایسێ. ئەو کلۆکۆ بەرزەی لەنێو تالاردا پێکهاتبوو، بێئەوەی هەستی پێبکەن، پەلەیان دەکرد کە بە شێوەی هەڵچوونێکی ئاشکرا و سووك و رەوان و بێنرخ، پارچە پارچە بکەن. برا گەورەی بوکین وەدەنگ هات و گوتی:

-ببوورن! . . . . بۆچی ناهێڵن قسە بکەن؟ دادپرس هەر چەندی ویستی قسەی کرد.

لە نزیك كەروێتەكە پاسەوانێك دەستی راوەشاند و لەژێر لێوانەوە گوتی:

-بێدەنگ بە!... ... . بێدەنگ.

باوكی سامۆیلۆڤ بۆ پشتەوە خوار بۆوە و لە پشت ژنەكەیەوە بە دەنگێكی لاڵەپەتی گوتی: وای دانێن كە تاوانباران، دەبێ رێگایان بدرێ قسەكانیان بكەن. دژی كێ بوون؟.... دژی هەمووان؟ دەمەوێ بزانم.. .. . . منیش حەز لەو مەسەلەیە دەكەم... . . راستی لە كوێیە؟ پێم خۆشە تێبگەم. دەبێ رێگا بدرێ قسەكانیان بكەن. . . . . . پاسەوانێك بە قامك هەڕەشەی لێكرد و نەڕاندی:

بێدەنگ!

سیزۆڤ بە پەرێشانی سەری راوەشاند. دایك چاوی لە حاكمەكان وەرنەدەگێڕا. پەریشانی لە زیدەیی ئەوانی دەدەیت. پێكەوە قسەیان دەكرد، بەڵام تێیان نەدەگەیشت دەڵێن چی. زەنا زەنای سارد و دەنگی سفت و لوسیان وەسەروچاوی دایك دەكەوت، كوڵمەیان دەلەرزاند و تامێكی ناخۆشیان لە زاریدا پەیدا دەكرد. وای دەهاتە بەرچاو كە حاكمەكان باسی كوڕەكەی و هاوڕێكانی، باسی ئەو پەیكەرە رووت و بێهێزانە دەكەن. دەتگوت ئەو پەیكەرانە، ئێرەییەكی ناپیاوانە و تەماعێكی توندی ئینسانی نەخۆش و رزیو، لە دڵی حاكمەكاندا دەجووڵێنن. لێویان لێك دەدان و داخی ئەوەیان دەخوارد كە هێزی شان و باهویان وەك وان نییە بتوانێ كار بكا و سامان كۆبكاتەوە و تام لە ژیان بكا. ئێستا ئەو پەیكەرانە لەكار و تێكۆشانی رۆژانە دووردەخرێنەوە و وەلا دەنران. ئیتر دەست بەسەرداگرتنیان و كەڵك وەرگرتن لە هێزی ئەوان دەرەتانی نەبوو.

فەوتاندنیشیان لە تواناداا نەمابوو. هەر بۆیەش ئەو لاوانە دوژمنایەتییەكی بەقین و توندیان لە حاكمە پیرەكاندا پێكهێنابوو، وەك دوژمنایەتی دڕندەیەكی لاواز كە نێچیرێكی تەڕ و تازە ببینێ و نەتوانێ بیخوا.

دایك هەر چەندی پتر تەماشای حاكمەكانی دەكرد، ئەو فكرەشی لە مێشكیدا بەهێزتر دەبوو. وای دەهاتە بەرچاو كە حاكمەكان تەماع و قینی خۆیان كە وەك تەماع و قینی ئەو برسییانە دەچێ كە جاران توانیویانە زۆر بخۆن، ناشارنەوە. پێلاگێیا وەك دایكێك كە كوڕەكەی هەمیشە و سەرەڕای هەموو شتێك، لە گیانی خۆی خۆشتر دەوێ، سەری لەو نیگا كزانە سووڕمابوو كە دەبارینە سەر دەموچاوی پاڤێل و وەسینگ و شانی دەكەوتن و خۆیان لە پێستی سووتاوی دەخزاند، دەتگوت بە دووای ماكەی ژیاندا دەگەڕێن و دەیانەوێ خوێنی وشكهەڵاتووی رەگ و لەشی بێهێزی ئەو كەسانەی نیوە مردوون گەرم دابێنن. وای دەهاتە بەرچاو كە كوڕەكەی هەست بەو رێخشانە شێدارە دەكا و مچووڕكی پێدا دێ و چاو لە دایكی دەكا.

پاڤێلٚ چاوە ماندووەکانی بە نەرمی و خۆشەویستی لە دایك دەبڕی هێندێ جار بزەیەکی دەهاتێ و سەری رادەوەشاند. ئەو بزەیە کە دڵی دایکی دەلاواندەوە دەیگوت:

-بەو زووانە ئازاد دەبم.

لەپڕ حاکمەکان هەموو هەستان. دایك لە خۆوە سەیری بزووتنەوەی ئەوانی کرد. سیزۆڤ گوتی:

-دەڕۆن!

دایك پرسی:

بۆ حوکم دانیان؟

-بەڵێ.

دایك لەپڕ هۆشی پەشۆکا و شەکەتییەکی زۆر هەموو لەشی داگرت. نێوچاوانی ئارەقەی کرد. هەستێکی ناهومێدی و بێدەسەلاتی بەسەردا هات و بوو بە هەستی سووکایەتی سەبارەت بە حاکمەکان و شێوەی موحاکمەیان. سەری وەژان کەوت. دەستی بە نێوچاوانیدا هێنا و تەماشای دەورووبەری خۆی کرد. خزم و کەسوکاری گیراوەکان لە پەرژینی ئاسن نزیك دەبوونەوە. دەنگە دەنگ تالاری پڕ کردبوو. دایکیش بۆ لای پاڤێلٚ چوو. پاش ئەوەی دەستی گوشی، لە خەمان و لە خۆشییان دەستی کرد بە گریان. پاڤێلٚ دڵخۆشی دایەوە. ئەندرێی پێدەکەنی و گاڵتەی دەکرد. ژنەکان هەموویان دەگریان. ئەو گریانەش لە پەرۆشیان نەبوو، بەڵکو خوویان پێگرتبوو. هەستیان بە ژانی زەبرێکی ئەوتۆ نەدەکرد کە کوت وپڕ وەسەری کەسێك دەکەوێ و گێژی دەکا، هەستیان بە خەمی جیابوونەوە لە رۆڵەکانیان دەکرد، بەڵام ئەو ژان و خەفەتە لەنێو هەستێکدا دەتوایەوە کە بەرهەمی ئەو رۆژە بوو. دایك و باب بە جۆرێك دەیانڕوانییە منداڵەکانیان کە لە نیگایاندا هەستی بە منداڵ زانینی رۆڵەکانیان و بە زیاترزانینی خۆیان، لەگەڵ جۆرە رێزگرتنێك کە لە منداڵەکانیان، بە سەیری تێکەڵ دەبوو. ئەو پیرانە لە کاتێکدا بە خەمناکی لە خۆیان دەپرسی: چۆن لەمەودووا ژیان بەسەر دەبن؟ هەر لەو کاتەشدا بە سەرنجەوە تەماشای ئەوبەرەی تازەپێگەیشتوویان دەکرد کە ئازایانە باسی پێکهێنانی ژیانێکی باشتر دێننە گۆڕێ. شارەزا نەبوون کە هەستی خۆیان دەرببڕن و بەو کارە رانەهاتبوون. قسە بە زۆری لە زاروزمانان دەردەپەڕین، بەڵام بێجگە لە شتی ئاسایی وەك جلوبەرگ و کراس و دەرپێ، باسی هیچی تر نەدەکرا. ئامۆژگاری گیراوەکانیان دەکرد کە بەخۆڕایی کاربەدەستان تووڕە نەکەن.

سامۆیلۆڤ بە کوڕەکەی گوت:

-هەموو کەس بێزار دەبێ، هەم ئێمە و هەم خەڵکی تریش!

براکەی بوکین دەستی رادەوشاند و غیرەتی وەبەر برا چکۆڵەکەی دەنا:
-ئەوەیە دادپەروەرییەکەیان و هیچی تر.. . .. ..
برا چکۆڵەکەی وەڵامی دایەوە:
-ئاگات لە سێرووەکە بێ! .. . ... زۆرم خۆش دەوێ!
-کە گەڕایەوە دەبینی هەر زیندووە!. .... . .
سیزۆڤ دەستی برازاکەی گرتبوو بە ئەسپایی دەیگوت:
-باشە فیۆدۆر، یانی رۆیشتی!. .... . .
فیۆدۆر داهاتەوە و بە زەردەخەنەیەکی شەیتانانە شتێکی بە گوێیدا چرپاند. سەربازێکیش لە پەنایان بوو پێکەنی، بەڵام جێبەجێ خۆی کۆکردەوە و بۆڵەبۆڵێکی کرد.
دایکیش وەك ئەوانی تر باسی کراس و دەرپێ و ساخ و سلامەتی دەکرد، لە کاتێکدا لەبارەی پاڤێل و ساشێنکا و خۆیەوە، پرسیاری زۆری لە دڵی خۆیدا گەڵاڵە کردبوون. لە ژێر ئەو قسانەدا هەستی ئەوینێکی لەبن نەهاتوو لە ئاست پاڤێل و ئاواتی ئەوەی پاڤێل لێی رازی بێ، پەرەی دەگرت. دایك کە حاکمەکانی دەهێنا بەرچاو، چاوەڕوانی ئەو شتە نائاساییەی نەدەما و بێجگە لە مچوورکێکی ناخۆش هیچی دیکەی هەست پێنەدەکرد.
هەستی دەکرد کە خۆشییەکی گەورە و رووناکی لە دڵیدا پەیدا دەبێ، بەڵام لەو خۆشییە تێنەدەگەیشت و لەبەری پەرێشان بوو. دیتی کە ئەندرێی یەك بە یەك لەگەڵ هەموان قسان دەکا. کاتێك هەستی پێکرد کە ئەندرێی لە پاڤێلا پتر پێداویستی بە قسەی خۆش و دڵنەوایی هەیە، گوتی:
-ئەو دادگایەم خۆش ناوێ!
ئەندرێی گوتی:
-بۆچی دایە گیان؟ کۆنەناشە، بەڵام بێکار نییە. ... . . . .
دایك گوتی:
-شتێکی وانییە . ..... . . . پیاو سەری لێ دەرناکا. لە حەقیقەت ناکۆڵنەوە.
ئەندرێی گوتی:
-ئای! چاوەڕوانی شتێکی ئاوا بووی؟ پێت وابوو لێرە بە دووای حەقیقەت دەگەڕێن؟
دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

-پێم وابوو كه دەبێ شتێكی سەرنجراكێش بێ، زیاتر لەوەی له كلیسا دەكرێ. پێم وابوو پاڕانەوه له دەرگای حەقیقەت لێرە دەكرێ. ... .

پاڤێلاّ لەسەرخۆ گوتی:

-دایه، ئێمه دەزانین له كوێ له حەقیقەت دەپاڕێنەوە.

ئەندرێی گوتی:

-دایه گیان تۆش دەزانی!

دەستەی دادگا!

هەموو كەس جێگای خۆی گرتەوە.

سەرۆكی دادگا دەستێكی هاویشته سەر مێزەكەی، كاغەزێكی لەپێش دەموچاوی خۆی راگرت و به دەنگێكی كزەلۆكی وەك وزەوز دەستی به خوێندنەوە كرد.

-"دادگا. .. .. . پاش راوێژكردن... . "

سیزۆڤ گوتی:

-بڕیاری حوكم دانه!

هەموو كەس مات و بێدەنگ بوو، هەستابوونه سەرپێ و چاویان له كابرا پیرە بڕیبوو. ئەو كابرایه لەبەر لەڕ و لاوازی وەك دارێك دەچوو كه دەستێكی نهێنیّ رایگرتبێ. حاكمەكان راوەستابوون. سەرۆكی دێ سەری به لایەكدا خوار كردبۆوە و تەماشای بن میچی دەكرد. سەرۆكی شار دەستی به سینگیەوە بوو. نوێنەری نەجیبزادان دەستی له ریشی خۆی وەردەدا. حاكمه نەخۆشەكه لەگەلّ هاوكارە ورگ زلەكەی و دادپرس، تەماشای تاوانبارەكانیان دەكرد. له پشت حاكمەكان و لەسەر سەریانەوە، قەیسەر به ئونیفۆرمی سوورەوە خۆی دەنواند. دەعبایەك بەسەر رووومەتی سپیدا دەخزی و هەودایەكی جالّجالۆكەی دەلەرییەوە.

-"....... . به دوورخستنەوە بۆ سیبریا حوكم دراون. .. . . . "

سیزۆڤ هەناسەیەكی هێدی بوونەوەی هەلّكێشا و گوتی:

-دوورخستنەوە! ئاخرەكەی تەواو بوو، سوپاس بۆ خوا! باسی "كاری دژوار" دەكرا. زۆریش جێگای ترس نییه دایه . . .. . . شتێك نییه. ..... . .

دایك لەسەرخۆ گوتی:

-دەمزانی.

-هەرچۆنێك بێ! ئێستا روونە! هەموو کەس ئەوان دەناسێ.
رووی بۆ لای مەحکومەکان وەرگێڕا و بە دەنگی بەرز هاواری کرد:
-فێدیا خواحافیز!. . ..... . هەمووتان. ..... . . . خواتان لەگەڵ.
دایك بێدەنگ بوو، بە نیشارەی سەر خواحافیزی لە پاڤێلاّ و لە هەمووان کرد. خەریك بوو بگری، بەڵام شەرمی کرد.

## (٢٧)

کە لە دادگا هاتە دەر زۆری پێ سەیر بوو کە هێشتا هیچ نەبووە، شەو بەسەر شاردا هاتووە و چرای شەقامان هەڵکراون و ئەستێرە لە ئاسمان دەدرەوشێن. لە دەوروبەری کۆشکی دادپرسی خەڵك پۆل پۆل کۆدەبوونەوە.
لەو هەوا ساردەدا کە بەفر لە ژێر پێیان هەر سێرەی دەهات، کابرایەك کە کلاوێکی شینکی لەسەر بوو، لە سێزۆڤ وەنزیك کەوت و خێرا لێی پرسی:
-حوکمی چییان دان؟
-دوورخستنەوە.
-هەموویان؟
-بەڵێ هەموویان.
-سوپاس. . .....
پاشان وەدەرکەوت.
سێزۆڤ بە دایکی گوت:
-بزانە! خەڵك دەیانەوێ مەسەلەکە بزانن. .... . . .
لەپڕ دە کوڕ و کچ دەورەیان دان، بوو بە هەرا. خەڵکی دیکەش لێیان کۆبوونەوە. سێزۆڤ و دایك راوەستان.
خەڵك دەیانەویست بزانن بڕیاری دادگا چی بووە؟ گیراوەکان لە دادگا چۆن بوون، کێ و لە چ بارێکەوە قسەی کردووە. لە تەواوی ئەو پرسیارانەدا، وەك یەك راستی و دڵسۆزی دەبینرا. یەکێك هاواری کرد:
-ئەوە دایکی پاڤێلاّ ڤلاسۆڤە!
لەپڕ هەموو بێدەنگ بوون.
-ئیجازە بدە دەستت بگوشم!

یەکێك زۆر بە گەرمی دەستی دایکی گوشی. لەبەر دڵگەرمی دەستی دەلەرزی. قسەکەی درێژە پێدا:

-کوڕی تۆ بۆ هەمووان سەرمەشقی غیرەت و ئازایەتییە.

دەنگێکی لەرزۆك هاواری کرد:

-بژی کرێکاری رووس!

-پایەدار بێ شۆڕش!

بمرێ دیکتاتۆری و سەرەڕۆیی!

هەراوهوریایەکە تا دەهات توندتر و زیاتر دەبوو. خەڵك لە هەموو لاوە لە سیزۆڤ و نیلۆڤنا کۆدەبوونەوە. دەنگی فیکە کێشانی پاسەوانان هەوای قەڵاشتەوە، بەڵام نەیتوانی بەسەر دەنگە دەنگی خەڵکدا زاڵ بێ. کابرایەکی پیر پێدەکەنی. ئەوانە هەموو وەك خەونێکی شیرین دەهاتنە بەرچاوی دایك. بزەی دەهاتێ، دەستی رێك دەگوشین، سڵاوی دەکرد، فرمێسکی شادی بەسەر کوڵماندا دەڕژان، لەبەر ماندوویی لاقی دەچەمین، بەڵام دڵی کە پڕ لە خۆشییەکی سەرکەوتووانە بوو، وەك ئاوێنەیەکی ساف رەنگی هەستی دەروونی دەدایەوە. هەر لە پەنا دایك دەنگێکی رەوان بە تووڕەیی هاواری کرد:

-هاوڕێیان! برایان! ئەو دێوەی میللەتی رووس هەڵدەلوشێ، ئەمڕۆ دیسان ئیشتیای خۆی دامرکاند. .... . .

سیزۆڤ گوتی:

-دایك با بڕۆین!

لەو دەمیدا ساشێنکا گەیشتەجێ. باسکی دایکی گرت و بردییە قەراخ شەقام و گوتی:

-با بڕۆین، لەوانەیە پۆلیس بۆ لێدانی ئێمە پەلاماری ئەو خەڵکە بدا، یان هێندێکیان بگرن. باشە، بۆ سیبریا دووری دەخەنەوە؟

-بەڵێ... . .. . بۆ سیبریا. .. . . .

-باشە ئەی ئەو چی کرد؟ قسەی کرد؟ دیارە دەزانم. لە هەمووان ساکارتر و بەهێزترە. ... .راستە رووخۆش و حەساسە. .. . . بەڵام لەڕووی هەڵنایە هەستی خۆی دەربڕێ. هەر وەك حەقیقەت راست و خۆڕاگرە، مەزنە، لە وجودی ئەودا هەموو شتێك هەیە. . . . .. هەموو شت. ... . . بەڵام لە زۆر بارەوە تین بۆ خۆی دێنێ. ئەمە باش دەزانم.

ئەم قسانە کە پڕ لە ئەوین و خۆشەویستی بوون و بە ورتە ورت دەگوتران، دایکیان هێنایە سەرخۆ و هێزی بەرەو کزبوونیان وەجۆش خست. دایك کچەکەی بۆ لای خۆی راکێشا و بە دەنگێکی نەرم و پڕ لە خۆشەویستی پرسی:

-کەی دەچییە لای؟

کچەکە بە دڵنیایی تەماشای پێش خۆی کرد و وەڵامی دایەوە:

-هەر کاتێك کەسێك بدۆزمەوە کاری من وەئەستۆی خۆی بگرێ، چونکە بەو زووانە نۆرەی موحاکەمەی منیش دێ. .... . ... منیش بۆ سیبریا دەنێرن. ئەودەم دەڵێم دەمەوێ بمنێرن بۆ ئەو شوێنەی ئەویان بۆ بردووە.. .... .
.

لە پشت سەری ئەوانەوە سیزۆڤ وەدەنگ هات:

-سلاوی منی پێبگەیەنە! ناوم سیزۆڤە. دەمناسێ. .... . مامی فیۆدۆرم.

ساشێنکا راوەستا. رووی تێکرد و دەستی بۆ درێژ کرد:

-فیۆدۆر دەناسم، منیش ناوم ساشێنکایە.

فامیلتان چییە؟

ساشێنکا چاوێکی لێکرد و گوتی:

-فامیلم نییە. ... ... بێباوکم.

-مردووە؟

بە دڵ گەرمییەك وەڵامی دایەوە:

-نا ... ... . زیندووە. .. ... . . خاوەن ملکە، کاربەدەستە، وەرزێران تالآن دەکا.... لێیان دەدا.

-ئاوا. .. ..

پاش تاوێك بێدەنگی، لە کاتێکدا لە بنەوە چاوی لێدەکرد، قسەکەی درێژە پێدا:

-باشە من بێرەدا دەڕۆم. .. . . دایە خواحافیز! ... . . .هەر کاتێك ویستت وەرە چای بخۆینەوە. .. ... مادام، بە هیوای یەکتر دیتنەوە. ... . .. لە بارەی باوکتەوە زۆر توندی! دیارە ئەو مەسەلەی پەیوەندی بە خۆیتەوە هەیە.

ساشێنکا دەنگی هەڵێنا:

-ئەگەر کوڕەکەت ئینسانێکی بێنرخ بایە، زیانی بۆ خەڵك هەبایە، ئەو قسەت پێدەگوت؟

پیرەمێرد پاش تاویك رامان وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ پێم دەگوت.

-کەوابوو لە لای تۆ حەقیقەت لە کوڕەکەت خۆشەویسترە. باشە. لای منیش لە باوکم خۆشەویسترە.

سیزۆڤ بزەیەکی هاتێ، سەری راوەشاند و گوتی:

-ئەگەر وەڵامی هەموو شتێك وا بدەیەوە، دیارە زرینگی! ... ... . پیر زوو تێدەشکێن، شارەزای چۆن پەلامار بدەی! .. . . . .. بە هیوای دیدار. . .... . .ئەوپەڕی بەختەوەریت بۆ بە ئاوات دەخوازم. .. .. . بەڵام لەگەڵ خەڵك تۆزێك رووخۆش بە. ... . . .ها. .... . . خوا ئاگادارتان بێ. دایە خواحافیز! . . . . ... ئەگەر پاڤێڵت دیت، پێی بڵێ گوێم لە وتارەکەی بوو. ...... . لە هەمووی تێنەگەیشتم. ... . .. تەنانەت جاری وا هەبوو دەشترسام. . . . . بەڵام هەرچی گوتی راستە!

کڵاوەکەی تۆزێك هەڵێنا و بێئەوەی پەلە بکا لە کۆڵانێدا ون بوو. ساشێنکا بە زەردەخەنەیەکەوە چاوی لێکرد و گوتی:

-دەبێ پیاوێکی باش بێ.

دایك وای دەهاتە بەرچاو کە ئەو کچە لە جاران خۆشەویسترە. کە گەیشتنە ماڵێ لەسەر کەروێتێك دانیشتن. دایك دیسان باسی نەخشەی ساشێنکای کرد. کچەکە بە برۆی هەڵکشاو کە نیشانەی بیرکردنەوە بوو، لە چاوی گەورەی خەیاڵاوی، تەماشای شوێنێکی دووری دەکرد. لەسەروچاوی رەنگ پەڕیویدا بیرکردنەوەیەکی هێدی هەست پێدەکرا.

-پاشان، کە منداڵتان بوو، منیش بۆ بەخێوکردنی دێمە لای ئێوە. ژیانمان لێرە خراپتر نابێ. پاڤێڵ زۆر وریایە، کارێك دەدۆزێتەوە.

ساشێنکا لە کاتێکدا چاوی لە دایك بڕیبوو پرسی:

-ناتەوێ هەر ئێستا بچی و لەگەڵی بکەوی؟

دایك هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

-فایدەی چییە؟ ئەگەر بییەوێ رابکا، دەست و پێی دەبەستم. بێجگە لەوەش، ئیجازە نادا.

ساشێنکا لەژێر لێوانەوە گوتی:

-بەڵێ هەر وایە. .. . .

دایك بۆ پۆزێکەو گوتی:

-بێجگە لەوەش کارم هەیە.

-بەڵێ راستە. .... . .. ئەوەش زۆر باشە.

ساشێنکا ئەمەی گوت و لەپڕ خۆی بزاوت، هەر دەتگوت لەژێر بارێکی گران رزگار بووە. پاشان بە ئەسپایی گوتی:

-لە سیبریا نامێنێتەوە، رادەکا. .... . . مسۆگەرە. .... . ..

-باشە کەوابوو تۆ چت بەسەر دێ؟ ئەگەر منداڵت ببێ چی لێ دێ؟

-نازانم. .... .. با بزانم. نابێ لە خەمی مندا بێ، هەرچی بۆ خۆی بیەوێ با وابکا. من تەنیا هاورێی ئەوم. دەزانم جیابونەوەی بۆ من زۆر دژوارە، بەڵام دەتوانم پیوی هەموو شتێك لە خۆم هەڵسووم.. ..... . بە هیچ جۆر نابم بە هۆی زەحمەتی ئەو، نا!. .. .. .

دایك هەستی کرد کە ساشێنکا ئەوەی دەیلێ دەتوانێ بەجێی بگەیەنێ. بە دڵسۆزییەکی گەرمەوە کچەکەی لە ئامێز گرت و گوتی:

-گیانەکەم. .... .. کوێرەوەرییەکی زۆرت لە پێشە!

ساشێنکا بزەیەکی نەرمی هاتێ و خۆی بە دایکەوە نووساند و رووەمەتی سوور هەڵگەڕان.

-ئەوە مەسەلەیەکی دووروودرێژە. .... . . پێت وانەبێ کە فیداکاری بۆ من زەحمەتە. .... . من دەزانم چ دەکەم. . . .. . دەزانم دەبێ هیوام بە چی هەبێ. ئەگەر ئەو لەگەڵ من بەختەوەر بێ، منیش لەگەڵ ئەو بەختەوەر دەبم. ئاوات و ئەرکی من ئەوەیە کە توانای ئەو زیاتر بکەم، هەر خۆشەوییەکی لەدەستم بێ بۆی ئامادە بکەم، بەختەوەرییەکی زۆر. زۆرم خۆش دەوێ. ئەویش منی خۆش دەوێ، دەزانم. هەستی خۆمان بە یەکتر نیشان دەدەین. هەر چەندی بتوانین سەرمایەی مەعنەوی یەکتر زیاد دەکەین. ئەگەر پێویستیش بێ، وەك دۆستی دڵسۆز لێك جیادەبینەوە.

دایك زەردەخەنەیکی هاتێ و لەسەرخۆ گوتی:

-منیش دێمە لای ئێوە. .... . رەنگە منیش دوور خەنەوە.

ئەو دوو ژنە بێ‌ئەوەی قسە بکەن، لە ئامێزی یەکتردا بیریان لە کەسێك دەکردەوە کە هەردووکیان خۆشیان دەویست. بێ‌دەنگی و پەژارە و خۆشەویستییەکی گەرم هەر دووکی داگرتبوون. . . .

نیکۆلای زۆر بە ماندوویی گەیشتەوە. لە کاتێکدا خۆی دەگۆڕی بە پەلە گوتی:

-بەر لەوەی دەرفەتمان لە کیس بچێ بڕۆن. ئەمرۆ لە بەیانییەوە بە ئاشکرا دوو جاسووس بە دووای منەوەن. بۆنی گرتنی لێدێ. ... ... هەر لە ئێستاوە هەست پێدەکەم. دەبێ لە شوێنێك شتێکی خراپ قەومابێ. ... . بەڕاستی، ئەوەتا وتارەکەی پاڤێڵ.... .. .. بڕیار دراوە کە چاپ بکرێ. . ... . بیدەن بە لیودمیلا و تکای لێبکەن کە زۆر بەپەلە چاپی بکا. دایە، پاڤێڵ زۆر باشی قسە کردووە. ساشێنکا لەو جاسووسانە وریابە! ڕاوەستن، ئەو بەستانەش لەگەڵ خۆتان بەرن. ... ... بیدەن بە دوکتۆر.

لە کاتی قسەکردندا دەستە سارەدەکانی توند ڕێك دەگوشی. پاشان هاتە نزیك مێزەکە، چەکمەجی کێشایەوە و بە پەلە هێندێك سەنەد و بەڵگەی دەرهێنان و ئەودیو و ئەودیوی کردن و هێندێکی دڕاندن و هێندێکیشی لەسەر یەك دانان. تەواو نیگەران و پەرێشان بوو. قژەکانی ئاڵۆز بوون.

-ئەوەندە ماوە نییە کە تەماشای هەمووان بکەم. هەر ئەوانەم جیاکردنەوە، دیسان بزانە چەند زۆرن! شتێکی سەیرە. دایە، لام وایە باشترە تۆ لێرە نەخەوی، تۆ دەڵێی چی؟ بەشداربوون لەو گاڵتەبازارەدا تا ڕادەیەك ناخۆشە. لەوانەیە ژاندارم بتگرن. پێویستە بۆ بڵاوکردنەوەی وتاری پاڤێڵ بچییە دێهات.

دایك گوتی:

-سەیرە. من بۆ چی دەگرن؟ لەوانەیە تۆ بە هەڵەچووبی و هەر نەیەن. نیکۆلای دەستی ڕاوەشاند و بە دڵنیایی گوتی:

-من بۆنی شتێکی ئاوا دەکەم. .. . . . بێجگە لەوەش، تۆ دەتوانی یارمەتی لیودمیلا بدەی. تا درەنگ نەبووە ئێوە بڕۆن.

دایك بەوە شاد بوو کە لە چاپکردنی وتاری کوڕەکەیدا بەشداری دەکا، گوتی:

-ئەگەر وایە دەڕۆم. بەڵام وەنەبێ لە ترسان بڕۆم. .. ... . ئێستا نیتر لە هیچ شتێك ناترسم. سوپاس بۆ خوا، ئێستا ئێتر دەزانم. .. . . .

نیکۆلای بێئەوەی تەماشای بکا بانگی کرد:

-هەر خۆش بی. .. . . . ئاخ. پێم بڵێ جلەکانی ژێرەوە و جانتاکەم لە کوێن؟ هەموو شتێکت خستووەتە ژێر دەستی وەستایانەی خۆت. من ناتوانم شتی تایبەتی خۆشم بدۆزمەوە. ئێستا خۆم ئامادە دەکەم، ژاندارمەکان تووشی سەرسووڕمانێکی ناخۆش دەبن.

ساشێنکا کاغەزە نوشتاوەکانی لە سۆبەدا سووتاندن و پاشان هەوڵی دا خۆڵەمێشەکەیان لەگەڵ خۆڵەمێشی ئاوردوو تێکەڵ بکا.

نیکۆلای دەستی ساشێنکای گوشی و گوتی:

-برۆن! لە بیرت نەچێ، کتێبم بۆ بنێری. ئەگەر شتێکی تازە و سەرنجراکێش بلاو بۆوە. .... . به هیوای دیدار! هاورێی خۆشەویست ئاگات لە خۆت بێ، بە تایبەتی. . .. ساشێنکا پرسی:

-پێت وایە زۆر لە زینداندا بمێنییەوە؟

-هیچ دیار نییە. بێگومان ماوەیەکی زۆر. .. .. . تاوانی جۆربەجۆریان بۆ من هەلبەستووە. دایە تۆش لەگەل ساشێنکا بچۆ. .... . .. چونکە وەدوواکەوتنی دووکەس دژوارە.

-باشە دەچم خۆم دەگۆڕم. .. .. .

تەماشایەکی نیکۆلای کرد، بێجگە لە نیگەرانییەکی کەم کە نیگای نەرم و مێهرەبانی دادەپۆشی، هیچ نیشانەی پەشێوی لێ بەدی نەدەکرا. ئاگای لە هەموو کەس بوو. رووخۆش و کارپوخت، هێدی و نارام، چ بە ئاشکرا و چ بە نهێنی هەر ئەو ژیانی رەمزاوی جارانی هەبوو. دایك بە ئەوینێکی بە پارێزەوە خۆشی دەویست، وەك ئەو ئەوینە هێندە بڕوای بە خۆی نەبێ. ئێستا بەزەیی پێدادەهات، بەلام پێشی هەستی خۆی گرت، چونکە دەیزانی ئەگەر نیکۆلای هەست بەو بەزەیی پێداهاتنە بکا، دەشێوێ و هەر وەك عادەتی خۆیەتی تۆزێکیش سەر و شێوەی سەیر دەبێ. دایك نەیدەویست نیکۆلای بەو حالە ببینێ. جێبەجێ کە خۆی گۆڕی هاتەوە ژووری. نیکۆلای دەستی ساشێنکای گوشی و گوتی:

-زۆر باشە. دلنیام کە هەم بۆ ئەو باشە و هەم بۆ تۆ. بەختەوەری تاقە کەسێك ئەگەر کەم بێ زیانی نییە. .. . . . بەلام دەزانی، نابێ زۆر بێ، تا بێنرخ نەبێ. .. . . . دایە گیان ئامادەی؟

چاویلکەکەی راست کرد و هاتە لای:

-باشە، بە هیوای دیدار. .. . . . تا سێ. .... . چوار. ... یان شەش مانگی تر. وای دابنێین شەش مانگ. .... .. . ئەو ماوەیە زۆرە، لە شەش مانگدا دەکرێ پیاو زۆر کار بکا! تکا دەکەم ئاگاتان لە خۆ بێ! باشە، با یەکتر ماچ کەین. .... .

لە کاتێکدا باسکە ئەستوورەکانی لە ملی دایك دەهالاند، چاوی لە چاوانی کرد و بە پێکەنینەوە گوتی:

-پێم وایە عاشقی تۆم. .... . هەر ماچت دەکەم.

دایك بێئەوەی هیچ بلێ نێوچاوان و روومەتی ماچ کرد. دەستی دەلەرزین و بۆ ئەوەی نیکۆلای هەستی پێ نەکا، بەری دانەوە.

-دەڕۆن؟ بەخێر چن، ئاگاتان لەخۆ بێ، وریا بن. ... . .. سبەینێ بەیانی منداڵێکی بنێرن. یەکێك لە ماڵی لیودمیلایە، با بێ بزانێ وەزع چۆنە. .. . . باشە! هاوڕێیان، بە هیوای یەکتر دیتنەوە. ... . هەموو شت ڕێکوپێکە. ... . هەموو شت!

ساشێنکا لە کۆڵانێ گوتی:

-ئەگەر پێویست بێ هەروا بە هاسانی بۆ مردنیش دەچێ. ... . . هەر ئاوا کە پەلەی دەکرد، وەك ئێستا. ... . .کاتێك مردن ڕووی تێبکا، نیکۆلای چاویلکەکەی ڕاست دەکا و دەڵێ: "هەی هەی!" و دەمرێ. ... .

دایك بە منگە منگ گوتی:

-زۆرم خۆش دەوێ. ... . .

-سەرم لێ سووڕماوە. .. .. . . بەڵام خۆشەویستی لە بارەی ئەو. ... .. نا! هەستی ڕێز و حورمەتم بۆی هەیە. ... . .. هەر چەندە مێهرەبان و دڵنەرمە، بەڵام بە ڕادەی پێویست مرۆڤانەتی نییە. ... .. پێم وایە وەدووامان دەکەون، با لێك جیا بینەوە. ئەگەر پێت وابوو وەدووات کەوتوون مەچۆ ماڵی لیودمیلا.

دایك گوتی:

-دەزانم!

ساشێنکا دووپاتەی کردەوە:

-مەچۆ ماڵی لیودمیلا. کەوابوو وەرە ماڵی من. بە هیوای دیدار.

خێرا ڕووی وەرگێڕا و گەڕایەوە. دایك بانگی کرد:

-بە هیوای دیدار.

## (٢٨)

پاش چەند دەقیقەیەك دایك لە ژووره چکۆڵەکەی لیودمیلا لە نزیك سۆبە دانیشتبوو خۆی گەرم دەکردەوە. لیودمیلا کراسێکی ڕەشی لەبەردابوو، بەکاوەخۆ لەو ژووره چکۆڵەدا دەهات و دەچوو. بە خشەخشی داوێنەکەی و دەنگی فەرماندەرانی ژوورەکەی پڕ دەکرد. دار لە نێو سۆبەدا قرچەقرچیان دەهات و ئاگر هەر نێڵەی بوو، هەوای ژوورەکەی ڕادەکێشا و گرفەی دەهات، دەنگی ڕەوانی ژنەکە لە ژوورێدا دەنگی دەدایەوە:

-خەڵك ئەحمەقییان لە ناجسنییان زۆر زیاترە، تەنیا هەر ئەو شتانە دەبینن کە لێیان نزیکن و دەستیان دەیانگاتێ. بەڵام هەرچی نزیکە خوێڕیانەیە و هەرچی دوورە بە نرخە. بەڕاستی ئەگەر ژیان هاسانتر بایە و خەڵك بەهۆشتر بان، بە قازانجی هەمووان دەبوو. ... . . . . بەڵام بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، جارێ دەبێ واز لە ژیانی هێدی بێنن.

لەپڕ چوو لە پێش دایك راوەستا و سەبرتر وەك بیەوێ داوای لێبوردن بکا، قسەکانی درێژە پێدا:

-من کەمتر خەڵك دەبینم. ... .. . ئەگەر کەسێك دێتە ماڵم، دەست پێدەکەم. ... . . گاڵتەیە، وانییە؟

-بۆچی؟

دایك دەیویست بزانێ لیودمیلا بڵاوکراوەکان لە کوێ چاپ دەکا. ... ... بەڵام لە دەوروبەری خۆی هیچ شتێکی وای نەدەدیت. لە ژوورەکەیدا کە سێ پەنجەرەی بەرەو حەوشە دەکرانەوە، کەرویتێکی فەنەر و کتێبخانەیەك و مێزێك و چەند کورسی و قەرەوێلەیەکیش کە بە دیوارەوە بوو، دەبینران. لە قوژبنێك و لە سیلەیەك سۆبە و هێندێك وێنەش بە دیوارەوە بوون. هەموو شت لەو ژوورەدا پاك و خاوێن بوو. بە تایبەتی وێنەی خاوەن ماڵەکە وەك تەرکە دنیایان دەچوو. پیاو لەو ژوورەدا هەستی بە شتێکی رەمزاوی و نهێنی دەکرد. دایك تەماشای دەرگاکانی کرد. بە دەرگایەکدا هاتبووە ژوورێ کە بۆ دالانێ دەکرایەوە. لە نزیك سۆبە دەرگایەکی تری بەرز و درێژ دەبینرا. کە هەستی کرد لیودمیلا بە وردی تەماشای دەکا، بە گورجی گوتی:

-بۆ کارێك هاتووم!

-دەزانم بۆ هیچ شتێکی تر کەس نایەتە ماڵی من.

دایك وای هەست پێکرد کە خاوەن ماڵەکە دەنگی دەلەرزێ، بزەیەکی بەسەر لێوە ناسکەکانییەوە دیار بوو، گلێنەی چاوی لە پشت چاویلکەکانی دەدرەوشا. دایك چاوی لێکرد و وتارەکەی پاڤێلی بۆ راگرت.

-ئەوەتا، تکایان لێ دەکردی کە بە زوویی چاپی بکەی. ... ...

دەستی کرد بە باسی ئەو پێش دەستیە کە نیکۆلای پێش گیرانی خۆی رەچاوی کردبوو. لیودمیلا بێئەوەی هیچ بڵێ، وتارەکەی وەرگرت و خستییە بەر پشتێنی و لەسەر کورسی دانیشت. گڕی ئاگرەکە لە شووشەی چاویلکەکانیدا تروسکەی دەکرد. زەردەخەنەیەکی گەرم لەسەر روومەتی دیار بوو، گوتی:

-ئەگەر ژاندارم بێنە ماڵی من، تەقەیان لێ دەکەم. لە بەرامبەر زۆرداراندا حەقمە دیفاع لە خۆم بکەم. خۆم بپارێزم. چونکە خەڵکی تر بۆ خەبات بانگ دەکەم. دەبێ ئەو کارە بکەم.

شەبەقی ئاگر لەسەر دەموچاوی لاچوو، دیسان هاتەوە سەر حالی سروشتی و بە فیکردا چوو. دایك بە هەستێکی خۆشەویستی لە دلی خۆیدا گوتی:"دەبێ ژیانێکی دژواری هەبێ".

لیودمیلا لە پێشدا بە نابەدلی دەستی کرد بە خوێندنەوەی وتاری پاڤێل، پاشان پتر سەری بەسەر کاغەزەکاندا خوار کردەوە، پەڕەکانی دەخوێندنەوە خێرا لەولای دادەنان. کە لە خوێندنەوەی بیۆوە، هەستا و لە دایك وەنزیك کەوت و گوتی:

-زۆر باشە. ... . . . روونە. .. .. . . . شتێکە خۆشم دەوێ.

تاوێك بیری کردەوە و گوتی:

-نەمدەویست باسی کوڕەکەت لەگەلێ بکەم، قەت نەمدیوە. وتووێژی خەمبارانەم پێخۆش نییە. دەزانم پیاو کە خزمێکی دوور دەخرێتەوە چ وەزعێکی هەیە. ... . بەلێ بزانم، ئەگەر ئینسان کوڕێکی ئاوای هەبێ باشە؟

-بەلێ زۆر باشە.

-باشە، بەلام ترسیشی هەیە.

دایك بزەیەکی هاتە سەر لێوان و گوتی:

-ئێستا ئیتر نا!

لیودمیلا دەستێکی بە قژەکانی خۆیدا هێنا و رووی لە پەنجەرە کرد. سێبەرێکی گەرم و سووکی کەوتبووە سەر کولمان.

ئێستا چاپی دەکەم. .. . . .. تۆ یارمەتیم دەکەی؟

-چۆن نایکەم!.... . ..

-ئێستا زوو پیتەکان ریك دەخەم. .. ... بچەوە ئەمڕۆ بۆ تۆ زۆر دژوار و داخدار بووە.

لەسەر قەرەوێلە راکشێ، من ناخەوم. لەوانەیە شەوێ وەخەبەرت بێنم کە یاریدەم بدەی. بەر لەوەی خەوت لێبکەوێ چراکەی بکوژێنەوە.

دوو لقەداری لە سۆبەکە هاویشت و بە دەرگایەکی تەنگادا کە لە کن بوخارییەکە ساز کرابوو، وەدەرکەوت و دەرگاکەی لەسەر خۆی پێوەدا. دایك چاوێکی لێکرد و لە کاتێکدا جلەکانی دادەکەند بیری لە خانەخوێکەی دەکردەوە:

-"فەقیرە. .. . . .. .زەحمەت دەکێشی".

لەبەر هیلاکیان سەری سوورِا، بەڵام مێشك و دڵی هێدی و نارام بوو. هەموو شت لەبەر چاوی بە تیشکێکی نەرم و دڵاوێن رووناك دەبوو. دایك ماوەیەك بوو شارەزای ئەو جۆرە دڵ دامرکانە ببوو کە بە دووای هەڵچوون و دڵپەشێویدا روودەدا. پێشتر تووشی پەرێشانی دەبوو، بەڵام ئێستا ئەو نارامییە گیانی گوشاد دەکرد و بە هەستێکی مەزن بەرین و بەهێزی دەکرد. چراکەی کوژاندەوە. لە نێو جێگای سارد و سرِدا راکشا. لە ژێر لێفەدا خۆی خرِ کردەوە و زوو خەوی لێکەوت. کاتێك چاوی هەڵبرِین، تیشکی رۆژ و سەرمای زستان ژوورەکەیان پرِکردبوو. لیودمیلا لەسەر قەرەوێڵەیەکی فەنەر راکشابو، کتێبێك بە دەستەوە، بە چاوێکی دۆستانە تەماشای دایکی دەکرد.

دایك بەخۆدا شکایەوە و بانگی کرد:

-ناخ، خوایە، چەند زۆر نوستووم. زۆر درەنگە؟

-رۆژباش. نزیك سەعات دەیە. هەستە قاوەڵتی بخۆین. .. .

-بۆچی وەخەبەرت نەهێناوم؟

-خەریك بووم، بەڵام تۆ لە خەوەکەت دا زەردەخەنەیەکی ئەوەندە دۆستانەت لەسەر لێوان بوو. ... . .

هەستا و لە قەرەوێڵەکە وەنزیك کەوت و خۆی بەسەر دایکدا خوار کردەوە. دایك لە چاوە ماتەکانی خانەخوێکەیدا نزیکی و پاکی و دۆستایەتی دەدیت.

-نەمویست هەڵتبستێنم. بێگومان خەونی خۆشت دەدیت. .. . . .

-نا، خەونم نەدی. .. . .

-گرنگ نییە، بەڵام زەردەخەنەکەتم زۆر پێ جوان بوو. ئەوەندە نارام و دڵگیر بوو.

لیودمیلا نەرم لەسەرخۆ دەستی کرد بە پێکەنین. ... ...

-بیرم لە تۆ و لە ژیانت دەکردەوە. چونکە دژوارە. .. ...

دایك کەوتە بیرکردنەوە. لە کاتێکدا برۆی دەبزاوتن، بە گومانەوە گوتی:

-لەو بارەوە هیچ نازانم. هێندێ جار دێتە پێش و خێرا بەدووای یەکترا دێن.

لافاوێکی پەرێشانی کە باش شارەزای بوو، دڵی داگرت و پرِی کرد لە وێنە و بیر و خەیاڵ. لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشت و پەلەی کرد کە پەیکەری فکرەکانی بە کراسی قسە داپۆشێ:

-ئەوانە هەموو بۆ لای ئامانجێك دەچن وەك ئاگر کە لە شوێنێك بەردەبێ، گرِەکەی هەمیشە رووی لە سەرێیە، لە جێگایەك رۆژنەیەك بۆ خۆی دەکاتەوە. لە جێگایەکی تر توندتر و رووناکتر دەدرەوشێ. ... .. ئەوەندە شتی

خەفەتاوی هەن هەر باسیان ناکرێ. فەقیرن خەڵك لە ئازار دان، ئەزیەتیان دەدەن، جاسووسانیان وەدووا دەخەن، بە بێبەزەیی لێیان دەدەن. ئەودەم ئەوانیش خۆیان دەشارنەوە. وەك تەرکە دنیایان دەژین، لە بەشێکی زۆری خێر و خۆشی بێبەشن، ئەوەش زۆر دژوارە.

لیودمیلا خێرا سەری هەڵێنا و بە وردی چاوی لە دایك کرد و بە دەنگێکی هێدی گوتی:

-لەبارەی خۆتەوە هیچ ناڵێی؟

دایك لە کاتێکدا جلی لەبەر دەکرد گوتی:

-لەبارەی خۆم؟ پیاو کاتێك یەکێکی خۆش دەوێ، کاتێك یەکێکی تریش لە لای خۆشەویستە، کاتێك لە خەمی هەمووان دایە، کاتێك بەزەیی بە هەمووواندا دێ، چۆن دەتوانێ خۆی ببوێرێ. تەواوی ئەوانە لە دڵی مرۆڤدا بە یەك دەگەن و وێك دەکەون. لە حاڵێکی ئاوادا پیاو چۆن دەتوانێ خۆی هەڵاوێرێ؟ . ..... . بۆ کوێ بچێ؟

نیوەی جلەکانی لەبەر کردبوو، تاوێکی کەوتە بیرکردنەوە. لەپڕ وای هاتە خەیاڵ کە ئیتر ئەو نیلۆڤنایەی جاران نییە کە ئەوەندە لە بارەی کوڕەکەیەوە پەرێشان بوو و لە خەمی دابوو، بۆی لە مەترسیدا بوو و بیری لە پاراستنی دەکردەوە. ئیتر ئەو ژنە نییە و لێی دوور کەوتووەتەوە. دەڵێی ئەوانەی هەموو بە ئاگر سووتاندووە. ئەو خەیاڵەی گیانی دایکی خاوێن و سووك کردبوو. دڵی بەهێزێکی تازە نوێ کردبۆوە. گوێی بۆ دەروونی خۆی رادەگرت و بە ئاوات بوو بزانێ لە ناخی دەروونیدا چ رادەبرێ. لەوەش دەترسا کە نەوەك سەرلەنوێ نیگەرانی و پەرێشانی کۆنی لە دڵیدا زیندوو بێتەوە.

لیودمیلا لێی وەنزیك کەوت و بە خۆشی لێی پرسی:

-بیر لە چی دەکەیەوە؟

-هیچ نازانم.

هەردووکیان بێدەنگ بوون و بزەیەکیان هاتێ. پاشان لیودمیلا وەدەرکەوت و گوتی:

-سەماوەرەکەم چی بەسەر هات؟

دایك تەماشایەکی پەنجەرەی کرد، لە دەرەوە رۆژێکی سارد دیار بوو. دڵی دایك رووناك و گەرم بوو. دەیویست بە خۆشی، بە هەستی حەقناسییەوە، بە دوور و درێژی باسی هەموو شتێك بکا.ئارەزووی دوعا و پاڕانەوە کە دەمێك بوو لە بیری کردبوو، بەسەریدا هات. سەرورووی پاڤێلی هێنا بەرچاوی خۆی، دەنگێکی کز لە مێشکیدا زرینگایەوە: "ئەوە دایکی پاڤێل ڤلاسۆڤە". چاوی گەش و پڕ لە خۆشەویستی ساشێنکا لە پێش چاوی دەدرەوشانەوە. قەلافەتی رەشی رێبینی هاتە بەرچاو. روومەتی سەوز و مەندی پاڤێلا بزەی هاتێ.

نیکۆلای بە شەرمەوە مژۆلی لێك دەدان. لەپڕ هەناسەیەکی قوولٚ وسووك هەموو ئەوانەی تێك دان. هەستێکی ئارام وەکو هەورێکی روون و رەنگاورەنگ بەسەر دڵیدا هات.

لیودمیلاٚ وەژوورکەوت و گوتی:

-نیکۆلای راستی دەکرد. ... . . گرتوویانە. هەر وەك خۆی گوتبووی کوڕەکەم نارد. هاتەوە، دەڵێ پاسەوان لە حەوشە خۆیان شاردۆتەوە، یەکیش لە پشت دەرگایە. جاسووسان دەورەی ماڵەکەیان داوە. کوڕەکە دەیانناسێ. ... .

دایك سەری راوەشاند و بە سادەیی گوتی:

-ئاخ. ... .. . . نیکۆلای . ... . . فەقیرە! .. ... ..

لیودمیلاٚ بە دەنگێکی گیراو و هێدی درێژەی پێدا:

-لەم دوواییەدا زۆری قسە بۆ کرێکارانی شار دەکرد، سووتابوو. کاتی ئەوە هاتبوو خۆی بشارێتەوە. هاوڕێکانی پێیان دەگوت بڕوا، بەلاٚم بە قسەی نەدەکردن. من لەو بڕوایەدام لەو جۆرە کارانەدا نابێ ئامۆژگاری خەڵك بکەی، بەڵکو دەبێ ناچاریان بکەی... . . .

کوڕێکی مێرمنداڵ، مو رەش و دەموچاو سوور و سپی، چاوکاڵ و قەپۆزبەران دەرگای کردەوە و بە دەنگێکی گشتی گوتی:

-سەماوەرەکەم بێنم؟

-بەڵێ "سێریۆژە" بێزەحمەت! ئەوە بەردەستی منە. ... . . . تۆ نەتدیتبوو؟

-نا.

-هێندێ جار دەمناردە ماڵی نیکۆلای.

دایك وای هاتە بەرچاو کە لیودمیلاٚ رواڵەتی گۆڕاوە، ساکارترە و هۆشی کەمتر لە جێگای دیکەیە. جوولاٚنەوەی نەرمی و قەد و بالاٚی رێك و لەباری، جوانی و هێزێکی تەواویان لێ دیار بوو. کەمێك لێبڕاو بوو و دەموچاوی بزڕکابوو. ئالقەی چاوەکانی بە شەو گەورەتر ببوون و تێکۆشانێکی بەردەوام لە جوولاٚنەوەیدا هەست پێدەکرا.

کوڕەکە سەماوەرەکەی هێنا.

-سێرژ! ئەمە دایکی پاڤێل ڤلاٚسۆڤە، ئەو کرێکارەی دوێنێ حوکمیان دا.

کوڕەکە داهاتەوە، دەستی دایکی گوشی و بۆ دەرێ چوو. نانی هێنا و لەسەر مێز دانیشت. لیودمیلاٚ کە چای تێدەکرد. داوای لە دایك کرد کە تا نەزانێ پۆلیس خۆی لە کێ مات کردووە، نەچێتە ماڵێ.

-ڕەنگە خۆیان لە تۆ مات کردبێ. ... . . بێگومان پرسیارت لێدەکەن.

-گرنگ نییە، ئەگەر بشمگرن بەڵایەکی گەورە نییە. تەنیا دەمویست وتاری پاڤێلآ پێشتر بڵاوکرابایەوە. ... . .

-پیتەکانی ڕێك خراون. سبەینێ بۆ شار و دەوروبەری نووسخەی تەواومان بە دەستەوە دەبێ، هەروەها بۆ شارۆچکەکانیش. ناتاشا دەناسی؟

-چۆن نایناسم؟

-باشە، ئەو دەبێ ئەو نووسخانە بەرێ. ... . .

کوڕەکە ڕۆژنامەیەکی دەخوێندەوە، وای دەنواند کە گوێی لە قسەی ئەوان نییە، بەڵام جاروبار چاوێکی لە دایك دەکرد. دایك کە سەیری ئەو چاولێکردنە ژیرانەی دەکرد، دڵگەرمییەکی خۆشی بۆ پەیدا دەبوو.

لیودمیلا دیسان باسی نیکۆلای کرد، بێئەوەی بۆ گیرانەکەی بگرێ و بناڵێ. شێوەی قسەکانی بۆ دایك تەواو ئاسایی بوو. ڕۆژەکە لە هەموو جارێك خێراتر تێدەپەڕی. تا لە قاوەڵتی بوونەوە. نزیك نیوەڕۆ بوو.

بە توند لە دەرگا درا. کوڕەکە هەستا و چاوێکی بە پرسیاری لە خانەخوێ کرد.

-سێریۆژە بڕۆ بیکەوە. دەبێ کێ بێ؟

لیودمیلا بە پۆزێکەوە، هێدی دەستی لە گیرفانی نا و بە دایکی گوت:

-ئەگەر ژاندارم بن لەو قوژبنە راوەستە. ... . سێریۆژە تۆش.. . . . . .

کوڕەکە لەسەرخۆ گوتی: "دەزانم" و ون بوو.

دایك بزەی هاتێ. ئەو ئامادەکارییە کاری تێکرد و هەستی بە پێشهاتێکی نالەبار نەکرد.

دوکتۆر وەژوورکەوت و بە پەلە گوتی:

-نیکۆلای گیراوە . . . . ... نای دایە، ئەوە تۆ لێرەی؟ کە بردیان لە ماڵێ نەبووی؟

-نا. منی بۆ ئێرە ناردبوو. ... .

-ها، پێم وانییە زۆر بۆ تۆ باش بێ. دوێنێ شەو لاوان پێنج سەد نووسخەیان لە وتاری پاڤێل بە چاپی ژڵاتین ئامادە کردووە. ئەو کارە زۆر باش کراوە، پوخت و خاوێنە و دەخوێندرێتەوە. دەیانەوێ ئەمشەو لە شاریدا بڵاوی بکەنەوە. من پێم وایە بۆ نێو شار نووسخەی چاپی باشترە. نووسخەی ژڵاتین دەبێ بۆ شوێنی تر بنێرین.

دایك خێرا گوتی:

-ئەو نوسخانە بدەن بە من بۆ ناتاشایان دەبەم.

زۆری پێخۆش بوو کە هەتا زووتر وتاری پاڤێل بڵاو بێتەوە و تەواوی زەوی بە قسەی کوڕەکەی داپۆشرێ. بە چاوی گەش و بە شێوەی پاڕانەوە تەماشای دوکتۆری دەکرد. دوکتۆر گوتی:

-نازانم ئەگەر ئێستا ئەو کارە بکەین عاقلانەیە یان نا.

تەماشای سەعاتی کرد، سەعات یازدە و چل و سێ دەقیقە بوو. .... . ...

-قەتار سەعاتی دوو و پێنج دەقیقە دەڕوا. تۆ شەو دەگەیە جێ، بەڵام ئەوەندەی پێویستە درەنگ نابێ. پاشان کاری سەرەکی ئەوە نییە.

لیودمیلا دووپاتەی کردەوە:

-بەڵێ ئەوە نییە!

دایک لێی چووە پێش و گوتی:

-ئەدی چییە؟ مەبەستت ئەوەیە کارەکە باش ئەنجام بدرێ. من دەزانم چ دەکەم. لیودمیلاچاوی لە دایک بڕی و نێوچاوانی خۆی سڕیەوە و گوتی:

-مەترسی تێدایە.

دایک گوتی: مەترسی چی؟

دکتۆر بە دەنگێکی بەپەلە و نارێك گوتی:

-چونەکە تۆ سەعاتێك پێش گیرانی نیکۆلای لە ماڵێ وەدەرکەوتووی، پاشان چوویەتە کارخانە کە لەوێ تۆ زۆر باش دەناسن. دوای چوونی تۆ بۆ کارخانە بڵاوکراوەی شۆڕشگێڕانە لە کارخانەدا بڵاو بوونەتەوە. ئەوانە هەموو وەك ئاڵقەی تەنافێك دەکەونە گەردنت.

دایک هەڵگیرسا و گوتی:

-ئاگایان لە من نابێ. ئەگەر لە گەڕانەوەدا بمگرن و لێم بپرسن لە کوێ بوو، دەزانم وەڵام بدەمەوە. لە کارخانەوە ڕاست دەچمە دەرەوەی شار، لەوێ پیاوێك دەناسم ناوی "سیزۆڤ"ە. دەڵێم پاش موحاکەمە لەبەر خەم و خەفەتان چوومەتە ماڵی سیزۆڤ. ئەویش هاودەردی منە، برازای لەگەڵ پاڤێل حوکم دراوە. .. .... .. دەڵێم ئەو ماوەیە لای ئەو بووم. .. .. ئەویش پشتگیری لە قسەکانم دەکا. .. . . دەبینن!. . . .

لەبەر ئەوەی هەستی دەکرد ئاواتەکەی دێتە دی، پتر هەوڵی دەدا کە ڕازیان بکا و بە هێزێکی پترەوە قسەی دەکرد. ئەوانیش ڕازی بوون.

دوکتۆر بە نابەدڵی گوتی:

-چار چییە؟ بچۆ!

لیودمیلا بێدەنگ لە ژوورێدا دەهات و دەچوو، گرژ ببوو، ڕوومەتی تێك قووپابوون. وادەهاتە بەرچاو کە ڕەگی ملی هەستاون و سەری گرانتر بووە. ڕازیبوونی بە ناچاری دوکتۆر دایکی تووشی هەناسە هەڵکێشان کرد. بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

-هەمووتان چاوەدێری من دەکەن، بەڵام وریای خۆتان نابن.

دوکتۆر گوتی:

-ئەمە ڕاست نییە، چاوەدێری خۆشمان دەکەین. دەبێ ئاگامان لە خۆشمان هەبێ. ئەوانەی بە خۆڕایی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە، هەر چەندی سەرکۆنەیان بکەین کەمە. . . بەوجۆرە بڵاوکراوەکانت بۆ دێننە ئێزگەی شەمەندەفەر.

بۆی ڕوون کردەوە کە دەبێ چ بکا. پاشان بە وردی سەیری کرد و گوتی:

سەرکەوتنی تۆم دەوێ. ئێستا ڕازی، وانییە؟

دوکتۆر بە ناڕەزایی وەدەرکەوت. کاتێك دەرگا پێوەدرا، لیودمیلا هاتە کن دایك و گوتی:

-تۆ ژنێکی نازداری. لە فکرەکەت تێدەگەم. . . .

باسکی دایك گرت و هەردووکیان لە ژوورێدا دەستیان کرد بە هاتوچۆ.

-منیش کوڕێکم هەیە ئێستا دووازدە ساڵە، بەڵام لەگەڵ باوکی دەژی. مێردەکەم دادخوایە. .. . . کوڕەکەم لای ئەوە. زۆرجار لەخۆم دەپرسم کە ئەو منداڵە چی لێدێ؟ دەنگی شێداری دەلەرزی. پاشان سەرلەنوێ بە ورتە ورت قسەکانی درێژە پێدان:

-ئەو منداڵە یەکێك پەروەردەی دەکا کە دوژمنی خوێنی ئەو کەسانەیە کە لای من خۆشەویستن و بە باشترین کەسی سەر زەویان دەزانم. لەوانەیە کوڕەکەم ببێتە دوژمنی منیش. ناتوانم وەری گرمەوە و لەگەڵ خۆم بێ، چونکە من بە ناوێکی داتاشراو دەژیم. هەشت ساڵە نەمدیتووە. .. .. هەشت ساڵ زۆرە!

لە نزیك پەنجەرە ڕاوەستا و تەماشای ئاسمانی ساف و کەمڕەنگی کرد و لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

-ئەگەر لەگەڵ من بایە، بەهێزتر دەبووم و خەمم لە دڵدا نەدەبوو کە ئێستا دڵم هەر ژان دەکا. ئەگەر مردباش دڵم دادەمرکا و بۆ من هاسانتر دەبوو. ئەودەم دەمزانی کە مردووە و ناتوانێ دوژمنی ئەو شتە بێ کە لە خۆشەویستی بەرزترە و لە ژیاندا لە هەموو شتێك بە نرخترە.. . . .

دایك لەسەرخۆ گوتی:

-گیانەکەم!

هەستی کرد کە دڵی ئەو ژنە چۆن ژان دەکا. لیودمیلاّ بزەیەکی هاتێ و گوتی:

-تۆ بەختەوەری. چەند خۆشە کە دایك و کوڕ شان بە شانی یەکتر بە ڕێگادا دەڕۆن! زۆر باشە. شتی وا کەم ڕێدەکەوێ.

دایك بە دەنگی بەرز گوتی:

-بەڵێ، باشە.

وەك بیەوێ شتێکی نهێنی بڵێ، دەنگی کز کردەوە و درێژەی پێدا:

-ژیانێکی دیکەیە. تۆ و نیکۆلای و تەواوی ئەو کەسانەی لە پێناوی حەقیقەتدا کار دەکەن لەگەڵ ئێمەن! .... . . . هەر بەو جۆرەیە کە خەڵك لێك وەنزیك دەکەون. ئەو شتانە دەزانم، نەك هەر وشەکان، بەڵکو لە تەواوی مەبەست تێدەگەم. .. . . .. تەواو!

لیودمیلاّ گوتی:

-ئاخ. . .. .. هەر بەو جۆرەیە. .... هەر وایە!

دایك دەستی خستە سەر شانی لیودمیلاّ و درێژەی پێدا:

-وەك من تێی دەگەم منداڵەکان لە جیهاندا بەرەوپێش دەچن. دڵانی هەرە باش، گیانە هەرە جوامێرەکان، بێ‌ئەوەی ئاوڕ لە تاریکی پشت سەریان بدەنەوە، هێرش دەبن، دەچنە پێش. لاوان و ڕۆڵە بەهێزەکان تەواوی توانای خۆیان بۆ یەك ئامانج بەکار دێنن، یانی بۆ دادپەروەری. دەیانەوێ بەسەر ڕەنج و کوێرەوەریدا زاڵ بن. چەکیان دەست داوەتێ تا چارەرەشی مرۆڤایەتی نەهێڵن. دەیانەوێ چەپەڵی تێك بشکێنن و تێکی دەشکێنن. یەکێك لەوان بە منی گوت: "ڕۆژێکی تازە دادێنین"، داشی دێنن. یەکی تر گوتی: "هەموو دڵە شکاوەکان دەکەینە یەك"، ئەو کارەش دەکەن!

بۆ هەڵگیرسانی بڕوای تازەی، وشەی دوعاکردنی وەبیر خۆی دەهێنایەوە کە لە بیری چووبوونەوە، ئەو وشانەشی وەك پشکۆ لە دڵ هاتنە دەر.

-ئەو ڕۆڵانەی بە ڕێگای عەقڵ و حەقیقەتدا دەڕۆن، هەموو شتێکیان خۆش دەوێ، ئاسمانێکی تر دەخولقێنن. ئاگرێکی نەکوژاوەیان هەیە کە لە قووڵایی گیان و دڵەوە سەرچاوە دەگرێ. هەر بەو چەشنەوە کە لە ئەوینی گەرمی ئەو ڕۆڵانەوە بۆ هەموو دنیا، ژیانێکی تازە بۆ ئێمە پێك دێ. دەتوانێ ئەو ئەوینە دامرکێنێ؟ کێ؟ ئایا

هیچ هێزێك هەیە لەو ئەوینە بەرزتر و بەتینتر بێ؟ زەوی خولقاندوویەتی، سەرانسەری ژیانیش سەرکەوتنی ئەوی دەوێ. .... . سەرانسەری ژیان. ...

دایك لە لیودمیلا جیابۆوە و بە شەکەتی و هەناسەبڕکە و دڵگەرمی دانیشت. لیودمیلاش هێدی و لەسەرخۆ وەدەرکەوت، دەتگوت دەترسێ شتێك بشکێنێ. لە کاتێکدا چاوی لە شوێنێکی دوور بڕیبوون، بە هەنگاوی سووك بە نێو ژوورەکەدا تێپەڕی. شوش و باریکتر و کەڵەگەتر دەهاتە بەرچاو. بێدەنگی خێرا دایکی هێنایەوە سەرخۆ، بە ئەسپایی وەك بترسێ پرسی:

-ڕەنگە قسەی ئاوام کردبێ کە نەدەبوایە بیکەم؟

لیودمیلا خێرا ئاوڕی دایەوە و چاوێکی لێکرد و گورج گوتی

-نا، هەر وایە. .... . هەر وایە. .. . . .. بەڵام ئیتر لەو بارەوە قسە ناکەین. هەر وەك گوتت با بمێنێ. . . .

بەڵێ. .... .

بە ئارامییەکی زیاتر درێژەی پێدا:

دەبێ زوو وەڕێ کەوین. .... . . . نێزگە لێرەوە دوورە

-بەڵێ زوو. ..... . .... .. چەند کەیفخۆشم، ئاخ چەند کەیف خۆشم. .. . .... .. خۆزگە بتزانیبایە! قسەکانی کوڕەکەم دەبەم، قسەی خوێنەکەم، وەك گیانی منە.

بزەیەکی هاتێ، بەڵام زەردەخەنەکەی تەنیا تیشکێکی کەمڕەنگی هاویشتە سەر ڕوومەتی لیودمیلا. دایك هەستی کرد کە ئەو هەڵوێستەی لیودمیلا شادییەکەی سارد دەکاتەوە. دایك ویستی گەرمایی دەروونی خۆی لە گیانی ساکاری ئەو باوێ و لەگەڵ دڵی دایکانەی بیکاتە یەك. دەستی لیودمیلای گرت و بە گەرمی گوشی و گوتی:

-گیانەکەم! چەند خۆشە بزانی کە لە ژیاندا بۆ هەموو کەس ڕووناکایی هەیە و ڕۆژێك دادێ ئەو ڕووناکاییە ببینن، گیان خۆیان بەو ڕووناکییە دادەگیرسێنن و هەموویان بەو تیشکە بێدەنگە دەست بە سووتان دەکەن.

سەروچاوی مێهرەبانی دەلەرزی، چاوی دەدرەوشان، برۆی دەبزووتن، دەتگوت دەیانەوێ باڵ لە گەشایی چاوانی بنێن. بەو فکرە مەزنەی کە تەواوی سۆزی دڵ و هەستی خۆی لەنێو هاویشتبوو، سەرخۆش ببوو. بیرەکانی کە دەپشکوتن و بە تەواوی لە دڵیدا تیشکیان داویشت، لە نێو شووشەی بەرینی قسەکانیدا کۆی دەکردنەوە.

-دەڵێی خوایەکی نوێ بۆ ئێمە پەیدا بووە، هەموو شت بۆ هەموو کەس و هەموو کەس بۆ هەموو شت. لە هەموو کەسدا تەواوی ژیان و هەموو کەس بۆ تەواوی ژیان. من ئاوا لە هەمووتان تێگەیشتووم. لە راستیدا ئێوە هەمووتان هاورێن، هەمووتان خێزانێکن، هەمووتان رۆڵەی دایکێکن، ئەوە حەقیقەتە.

دایک بە نیگەرانی و پەشێوی هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە ژێستێکی دوور و درێژەوە، وەك یەکێك لە ئامێز بگرێ گوتی:

-کاتێك من لەبەرخۆمەدەوە وشەی "هاورێ" بەسەر زماندا دێنم، بە دڵ گوێم لێ دەبێ کە دێنە پێش، لە هەموو لایەکەوە دەستە دەستە دێن، دەنگێکی بەرین و شادیهێنەر دەبیسم، دەڵێی تەواوی زەنگی کلیساکانی سەر زەوی لێدەدەدرێن!

ئەوەی دەیویست تێیداسەرکەوتبوو. کوڵمەی لیودمیلا سووهەڵگەڕان، لێوی لەرزین، فرمێسکی روون یەك لە دووای یەك لە چاوانی هەڵوەرین. دایک لە ئامێزی گرت، بزەیەیك هاتێ و کەمێك بە سەرکەوتنی دڵی خۆی نازی. کەلە باوەشی یەکتر جیابوونەوە لیودمیلا تەماشای دایکی کرد و بە ئەسپایی پرسی:

-دەزانی لەگەڵ تۆ بوون چەند خۆشە؟!

وەڵامی خۆی دایەوە:

-بەڵێ، وە ك پیاو بەری بەیانی لەسەر چیایەکی بەرز بێ. ..... .

## (٢٩)

لە شەقام هەوایەکی سارد و وشك لە لەشی دەدا، گەرووی رێك دەگوشی و کونە لوتی دەزووراندنەوە و پشووی پیاوی رادەگرت. دایك لەپڕ راوەستا و سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. لە نزیك عارەبانەچییەك کە کڵاوێکی خوری لەسەر بوو راوەستا. تۆزێك دوورتر کابرایەکی پشت کوڕ ملی بردبووە نێو شانانی و بە رێگادا دەڕۆیشت. سەربازێك غاری دەدا و دەستی لە گوێی خۆی دەخست و هەڵدەبەزی.

دایك لە دڵی خۆیدا گوتی: "رەنگە ناردبیان لە دووکان شتێك بکرێ". رۆیشت و لە دڵخۆشی گوێی لە سیڕەی بەفر هەڵدەخست کە لەژێر پێیاندا دەنگێکی رەوان و گەنجانەی هەبوو. زوو گەیشتە نێزگە، دەرگای قەتار

هێشتا دانەخرابوو. لەگەڵ ئەوەش لە سالۆنی دووکەڵاوی و چڵکنی چاوەڕوانی ژمارە سێدا، خەڵکێکی زۆر دەبینرا. سەرما کرێکارانی ڕێگای ئاسنی لەو ژوورە پەستاوتبوو. عارەبانەچی و خەڵکی ڕەش و ڕووت و بێڕێگا و جێگا دەهاتن لەو سالۆنە خۆیان گەرم دەکردەوە. ڕێبواریشی لێبوون: چەند دێهاتی، بازرگانێکی قەڵەو بە پاڵتۆیەکی خەزەوە، قەشەیەك بە خۆی و بە کچێکی ڕەنگ پەڕیوەوە، پێنج شەش سەباز و چەند بۆرژوای پڕکار. سیغاریان دەکێشا و قسەیان دەکرد، یان ڤۆدکا یان چایان دەخواردەوە. یەکێك لە نزیك شت فرۆشەکە قاقا پێدەکەنی. دووکەڵ وەك هەور لەسەر سەران ڕاوەستابوو. کە دەرگا دەکرایەوە جیڕەی دەهات و کە بە توندی پێوەدەدرا شووشەکان دەلەرزین و لە هەوا دەنگیان دەدایەوە. بۆنی دووکەڵی جگەرە و ماسی خوێکراو دەهات.

دایك لە نزیك دەرگا لە جێگایەکی بەرچاو دانیشت و چاوەڕوان بوو. هەموو جارێ کە یەکێك دەهاتە ژوور، هێندێك سەرما وەدایك دەکەوت. ئەو سەرمایەی پێخۆش بوو، هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا. هێندێك کەس کە جلی ئەستووریان لەبەردا بوو، بەستەیان بە دەستەوە بوون، دەهاتنە ژوور و بە نەزانی بە دەرگاوە دەنووسان و جنێویان دەدان. کۆڵەکانیان لەسەر کەروێتەیەك یان لەسەر عەرزی دادەنا و پاشان زووخمی سەر یەخەی پاڵتۆ و قۆڵیان دەتەکاند و بە بۆڵەبۆڵ ڕیش و سمێڵیان دەسڕینەوە.

لاوێك کە جانتایەکی زەردی بە دەستەوە بوو، هاتە ژوور و خێرا چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و ڕاست چوو لە کن دایك دانیشت و بە ئەسپایی لێی پرسی:

-بۆ موسکۆ؟

-بەڵێ، بۆ کن "تانیا"!

-ئەها!. .. باشە!

جانتاکەی لە پەنا دایك لەسەر کەروێتێك دانا، سیغارێکی هێنادەر و دایگریساند و پاش ئەوەی کڵاوەکەی تۆزێك هەڵێنا، بە دەرگایەکی دیکەدا وەدەرکەوت. دایك دەستێکی بە چەرمی ساردی جانتاکەیدا هێنا و پاڵی وێدا.کەیفخۆش بوو. تەماشای خەڵکی دەکرد پاش تاوێك هەستا و لە نزیك دەرگای وەدەرکەوتن لەسەر کەروێتێك دانیشت. جانتاکەی بە هاسانی هەڵدەگرت. سەری هەڵێنابوو، تەماشای ئەو کەسانەی دەکرد کە بە بەرچاویدا تێدەپەڕین.

پیاوێك پاڵتۆیەکی کورتی لەبەردا بوو، سەری بردبۆوە نێو یەخە بڵندەکەی و بێئەوەی هیچ بڵێ دەستی بۆ کڵاوەکەی برد و دوورکەوتەوە. دایك وای هاتە بەرچاو کە پێشتر ئەو کابرایەی دیتووە. ئاوڕی دایەوە، دیتی لە

بنەوە چاوی لێدەکا. نیگای کابرا بە لەشی دایکدا تێپەڕی و دەستی سەر جانتاکەی لەرزاند، دەتگوت لەپڕ بارەکەی گرانتر بووە.

بۆ لابردنی هەستێکی بێتام کە لە دڵیدا پەیدا دەبوو و پاشان دەگەیشتە گەرووی و زاری وشك و تاڵ دەکرد، لەخۆی پرسی: "لە کوێم دیتووە؟".

وەك خۆی بێڕانەگیری، ویستی جارێکی دیکەش ئاوڕ بداتەوە و چاوی لێبکا. کابرا هەر لەوێ ڕاوەستابوو، دڕدۆنگ دەهاتە بەرچاو. جارێك لەسەر لاقی ڕاست و جارێك لەسەر لاقی چەپ ڕادەوستا. دەستی ڕاستەی خستبووە باخەڵی پاڵتۆی و دەستی چەپیشی لە گیرفانی نابوو. ئەو ڕاوەستانە شانی ڕاستی لە شانی چەپەی بەرزتر نیشان دەدا.

دایك بێپەلە، لە کەروێتێك وەنزیك کەوت و بە کاوەخۆ لەسەری دانیشت، وەك بترسێ کە شتێك بشکێنێ. مێشکی بە هۆی هەستی پێش ڕوودانی کارەساتێك وەخەبەر هات و دوو کلێشەی لە ڕواڵەتی ئەو کابرایە هاتنە بەرچاو. یەکیان کاتی ڕاکردنی ڕێبین و ئەوی دیکەشیان ڕۆژی پێش دادگا. ئەو پاسەوانەی دایك بە درۆ ڕێگای ڕاکردنی ڕێبینی پێگوتبوو، لە پەنا ئەو کابرایە ڕاوەستابوو. بێگومان دایکیان دەناسی و لێی وریا بوون.
لەخۆی پرسی: "دەگیر کەوتم؟". کەمێك لەرزی و وەڵامی خۆی دایەوە:

-"ڕەنگە هێشتا. .. ... . نا، دەگیر کەوتووم، هیچ چاریشم نییە. .. .. ."

تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، هیچ شتێکی گومان لێکراوی نەدیت. فکر وەك بروسکە، یەك بەدووای یەکدا، لە مێشکیدا هەڵدەبوون و دەکوژانەوە:

-جانتاکەم بەجێ بێڵم؟ .. .. . . برۆم؟

بەڵام زوو بروسکەیەکی ڕووناکتر هەڵبوو:

-"قسەکانی کوڕەکەم فڕێ بدەم؟ .. .. . لەو دەستانەی باوێم!".

جانتاکەی بە خۆیەوە گوشی.

-"چۆنە بە جانتاوە برۆم!. .. . . چۆنە ڕابکەم؟. .. . . ."

فکرەکانی خۆی پێ بێگانە بوون، وایدەزانی یەکێك بە زۆری لەمێشکی داخنی. وەك سووتانەوەیەك بوو کە بە دەرد و ژانێکەوە سەر و دڵی دادتوێنێ، لەخۆی و لە پاڤێلاَ و لەو هەموو شتەی کە لەگەڵ دڵی تێکەڵاو ببوو دووری دەخستەوە. هەستی دەکرد هێزێکی دوژمنانەی تینی بۆ دێنێ، گرانایی دەخاتە سەر سینگ و شانی و لە ترسێکی سارددا نوقمی دەکا. ڕەگی لاجانگانی هەستابوون و بنی موانی گەرم داهاتبوون.

پاشان به تێكۆشانێكی بەهێز و ڕووناكی دڵی، تەواوی ئەو تیشكە لاواز و نامەرد و فێڵبازانەی دامركاندن و بە شێوەیەكی فەرماندەرانە بەخۆی گوت: "شەرمێ بكە!". جێبەجێ هاتەوە سەرخۆ و بە لێبڕاوی بەخۆی گوت:

-"كوڕەكەت شەرمەزار نەكەی! لە هیچ كەس نەترسی؟".

چاوی لەگەڵ نیگایەكی شەرماوی و خەمبار تێك هەڵدەنگوتن. ڕواڵەتی ڕێبینی هاتەوە بیر. وادیار بوو كە ئەو چەند پشووە دڕدۆنگییە، سەرلەنوێ هەموو شتی لە وجوودیدا پتەو كردبوو. دڵ بە ڕێكوپێكی لێی دەدا. تەماشای دەوروبەری خۆی كرد و لەخۆی پرسی:

-"ئێستا چ دەقەومێ؟".

-جاسووسەكە بانگی پاسەوانی كرد و بە چاوی دایكی نشان دا و سرتەیەكی لەگەڵ كرد. پاسەوان چاوێكی لە دایك كرد و كشایەوە. پاسەوانێكی تر هاتە پێش و گوێی لە سرت و خورتی وان هەڵخست. ئەوەیان پیرەمێردێكی بەخۆوە بوو، موی ماش و برنجی بوون و ڕیشێكی پڕی هەبوو. بە سەر ئیشارەی بۆ جاسووسەكە كرد و بۆ لای ئەو كەروێتە هات كە دایك لەسەری دانیشتبوو، لەپڕ جاسووسەكە ون بوو. كابرا پیرە بە كاوەخۆ دەهات و دەچوو، بە چاوە ئاڵۆزەكانی تەماشای دایكی دەكرد. دایك هەستا و بۆ ئەو سەری كەروێتەكە كشایەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی:

-هەر ئەوەندە لێم نەدەن! . .. . . هەر ئەوەندە لێم نەدەن!. ...

كابرای پیرە لە كن دایك ڕاوەستا و پاش تاوێك بێدەنگی لێی پرسی:

-تەماشای چی دەكەی؟

-هیچ. . . . .

-باشە. . . دز؟ پیر بووی و دزیش دەكەی!. ... .

دایك ئەو قسانەی پێ وەك زللەیەك وابوون كە وەڕوومەتی دەكەون. زبر و ڕق هەستاوانە و ناخۆش بوون. دەتگوت ڕوومەتی هەڵدەدڕن و چاوانی هەڵدەكۆڵن. بە هەموو هێزییەوە هاواری كرد:

-من؟ من دزم؟. .. . تۆ درۆ دەكەی.

هەرچی لە دەوروبەری بوو لەنێو گێژەڵۆكەی قین و تووڕەییدا بەلادا هات. لەبەر تاڵایی جنێوەكە دڵی ڕێك گوشرا. جانتاكەی دەست دایە. دەرگای جانتاكە كرایەوە. هەستا و دەستەیەك بەیاننامەی لەسەر سەری خۆی ڕاگرت و هاواری كرد:

-بڕوانە! هەمووتان بڕوانن!

گوێی لێبوو کە لە هەموو لایەکەوە قسەی خەڵك بۆ لای دەهات:

-چییە؟

-ئەوەتا پۆلیس!

-چ باسە؟

-دەڵێن ئەو ژنە دزی کردووە... . .

-ئەو ژنە؟

-هاواریش دەکا. . .. .

-ئای! ئای! شکڵ و شێوەیەکی چەند موحتەرمی هەیە!

-کێیان گرتووە؟

دایك بە دیتنی ئەو خەڵکەی لە دەوری کۆدەبوونەوە هێدی دەبۆوە. بە دەنگێکی زۆر بەرز دووپاتی کردەوە:

-من دز نیم! دۆینێ هێندێك زیندانی سیاسیان حوکم دان، کوڕی منیش لەگەڵ وان بوو. ... ناوی ڤلاسۆڤە، لەوێ قسەی کرد، ئەمەش قسەکانییەتی. من دەچووم ئەم کاغەزانە بۆ خەڵك بەرم تا بیانخوێننەوە و لەبارەی حەقیقەتەوە بیر بکەنەوە.

یەکێ بە پارێز پەڕەیەکی لە بەیاننامەکان لە دەستی دایك دەرکێشا، ئەویش هەموو بەیاننامەکەی تورِ هەڵدا. بە یاننامەکان بە نێو خەڵکدا بڵاو بوونەوە.

دەنگێك بە ترسەوە بەرز بۆوە:

-ئەگەر پیاو بۆ بڵاوکردنەوەی ئەوانە پیرۆزبابییت لێبکا، مەترسی تێدا نییە!

دەنگێکی تر گوتی:

-وریا بن، لەوانەیە شتێك بقەومێ.

-دایك کە دیتی خەڵك بەیاننامەکان هەڵدەگرنەوە لە باخەڵ و گیرفانیاندا دەیانشارنەوە، دیسان وەغیرەت کەوت، بەستەیەکی دیکەشی لە جانتا هێنادەر و بە راست و چەپ دا بلاوی کردنەوە.

-دەزانن کوڕی من و ئەوانی تریان لەسەر چی حوکم دان؟ پێتان دەڵێم، بڕوا بە قسەی من بکەن کە لە دڵی دایکێك دێتە دەر. دوێنێ ئەو کەسانەیان حوکم دا کە حەقیقەتی پیرۆزیان بۆ ئێوە دەهێنا! دوێنێ زانیم کە ئەو حەقیقەتە سەرکەوتووە. . ....

هیچ کەس ناتوانێ بەربەرەکانی لەگەڵ بکا، هیچ کەس. .. . .

خەڵك سەرسام مابوو، تا دەهات پتر كۆدەبوونەوە. وەك ئاڵقەیەك لە پەیكەری زیندوو دایكیان گەمارۆ دەدا.

-بەرهەمی كار بۆ ئێمە هەژاری و برسییەتی و نەخۆشییە، هەموو شت دژ ی ئێمەیە، رۆژ بە رۆژ كارمان توندتر و سەختتر دەبێ، لە برسان و لە سەرمان رەنج دەكێشین. هەمیشە لە نێو زلكاوی فریودا نوقم بووین و خەڵكی تریش بایی زەحمەتی ئێمە دەخۆن و رادەبوێرن. ئێمە وەك سەگی بەستراوە لە نەزانیدا رادەگرن، هیچ نازانین و لەبەر ترسەنۆكی لە هەموو شت دەترسین! ژیانی ئێمە وەك شەوی رەش وایە، شەوێكی تاریك و بەترس.

.. ... لەوە زیاتر چی دیكەیە؟

چەند دەنگێك بە منگە منگ وەڵامیان داوە:

-نا!

-زاری ببەستە!

دایك لە پشت سەری خەلكەوە جاسووسەكەی لەگەڵ دو ژاندارم دیت. لە بڵاوكردنەوەی دووا بەستەی نووسراوەكان دا وەپەلە كەوت، بەڵام كە دەستی گەیاندە جانتاكەی، هەستی كرد دەستێكی دیكە وەدەستی دەكەوێ، داهاتەوە و گوتی:

-هەمووی هەڵگرن! هەمووی هەڵگرن! بۆ گۆڕینی ئەو ژیانە، بۆ رزگاری هەموو خەڵك، بۆ زیندووكردنەوەیان لە نێو مردوواندا، هەر وەك من زیندووبوومەوە. كەسانێك هاتوون تۆڵەی خوان كە تۆوی حەقیقەتی پیرۆز بڵاو دەكەنەوە. بە نهێنی كار دەكەن، چونكە ئێوە باش دەزانن كە هیچ كەس ناتوانێ راستی بڵێ بێئەوەی راوی بنێن، بیخنكێنن، لە زیندانی باوێن و سووكایەتی پێ بكەن. حەقیقەت و ئازادی دوژمنی لە ئاشتی نەهاتووی ئەو كەسانەن كە بەسەر ئێمەدا حوكمڕانی دەكەن و زۆرداریمان لێدەكەن.

ئەوان رۆڵەیەكی پاك و رووناكن كە حەقیقەت بۆ ئێوە دێنن. لە ئەنجامی تێكۆشانی ئەواندا، حەقیقەت دێتە نێو ژیانی دژواری ئێمەوە، ئێمە گەرم دادێنێ و گیانمان وەبەر دێنێ، ئێمە لە دەست ستەمی كاربەدەستانی و ئەو كەسانەی گیانی خۆیانیان پێ فرۆشتوون رزگار دەكا! لێتان روون و ئاشكرابێ!

كردیانە هەرا:

-خۆش بی پیرێژن!

یەكێك پێكەنی.

ژاندارمەكان بە تووڕەیی خەڵكیان پاڵەستۆ دەدا و هاواریان دەكرد:

-بڵاوەی بكەن!

خەڵك بە هەرا و هورياوە دەکشانەوە، ژاندارمەکانیان لە نێو خۆ دەگرت و بە ئانقەست زەحمەتیان دەدان. ئەو ژنە سەرسپییە، بە نیگای راستانە و بە دیمەنی گوشادی خەڵکی بۆ لای خۆی رادەکێشا. ئەوانەی ژیان لە یەکتری جیاکردبوونەوە، ئێستا وەك تۆپەڵێك یەکتریان گرتبوو، تینی ئەو قسانە کە بێگومان زۆریان لە مێژ بوو چاوەڕوانی بیستنیان بوون، گەرمی داهێنابوون. ئەوانەی لە دایك نزیکتر بوون بێدەنگ مابوون. دایك نیگای تیژی ئەوانی دەدیت کە بە وردی سەرنجیان دابوویە و لەسەر دەموچاوانی هەستی بە هەناسەی گەرمیان دەکرد.

هەرایان لێکرد:

-بچۆ سەر کەروێتەکە!

-بڕۆ، پیرێژن!

-ئێستا لە دارت دەدەن!

-ئای، چەند رووهەڵماڵاوە!

-خۆش خۆش قسان بکە! ئەوە دێن!

ژاندارمەکان وەنزیك دەکەوتن و هاواریان دەکرد:

-رێگا بدەن! رامەوەستن!

ژمارەیان زیاتر دەبوو، خەڵکیان پتر بە توندوتیژی رادەدا. خەڵکەکە پاڵەپەستۆ دەدرا و لە پاڵ یەك دەپەستێورا. دایك وای هاتە بەرچاو کە جۆش گرتنێك لە دەوروبەرییەتی و ئەو خەڵکە بۆ تێگەیشتنی مەبەستی و بڕواکردن بە قسەکانی ئامادەن. . ... دەیویست ئەوەی دەیزانێ بە پەلە بیلێ، تەواوی ئەو بیر و باوەڕە بەهێزەی بەڕێکی و بێ ماندووبوون لە قووڵایی دڵیەوە هەڵدەقوڵی، دەری ببڕێ، بەڵام ئیتر دەنگی نەدەگەیشت و بێجگە لە دەنگێکی گڕ و لەرزۆك و پچڕ پچڕ هیچی تر لە سینگی نەدەهاتە دەر:

-قسەکانی کوڕی من، قسەی پاکی رۆڵەیەکی خەڵکن: گیانێکی پاك و راست! پیاوانی راست لە نازایەتییەوە بناسن. ئازان و لە کاتی پێویستدا خۆیان لە پێناوی حەقیقەتدا بەخت دەکەن!

لاوەکان بە تاسە و بەسەر سوورمانەوە تەماشایان دەکرد.

زەبرێکیان لە سینگی دا بە لادا هات و کەوتە سەر کەروێتەیەك. دەستی ژاندارمەکان بەسەر خەڵکدا دەبینرا. شان و ملی خەڵکیان دەگرت و پاڵەپەستۆیان دەدان. کڵاویان لە سەری خەڵك هەڵدەگرت و فڕێیان دەدا. هەموو شت لە بەرچاوی دایك رەش هەڵگەڕابوو و دەجووڵایەوە، بەڵام بە سەر ماندوویی و شەکەتی خۆیدا زاڵ بوو، دەنگێکی کەمی کە لەبەردا مابوو دەری بڕی و هاوای کرد:

-ئەی میللەت، هێزەکانتان وەك تاقە هێزێك کۆبکەنەوە!

دەستێکی سوور و گەرمی ژاندارمێك گەیشتە پشت ملی دایك و رایوەشاند:

-بێدەنگ بە!

پشت ملی وەدیواری کەوت. هەڵمێکی بەتینی ترس دڵی داگرت، بەڵام ئەو هەڵمە لەژێر گەرمای گڕی دەروونیەوە توایەوە. ژاندارم دەنگی دا:

-برۆ

دایك هاواری کرد:

-لە هیچ شتێك مەترسن! هیچ رەنجێك لەوە خراپتر نییە کە لە تەواوی ژیاندا کێشاوتانە.

ژاندارم لە کاتێکدا باسکی گرتبوو، بۆ پێشەوەی رادەکێشا، هاواری کرد:

-دەڵێم بێدەنگ بە!

ژاندارمێکی تر باسکی دیکەی گرت. دایك درێژەی پێدا:

-هیچ رەنجێك لەوە تاڵتر نییە کە رۆژ بە رۆژ دڵی پیاو دەخواتەوە و سینگی وشك دەکا. . . .

جاسووسەکە غاری دایە و مستی لە پێش چاوی دایك راوەشاند و هاواری کرد:

بێدەنگ بە ناجسن!

دایك چاوی زەق بوون و تروسکەیان کرد، شەویلاگەی لەرزین، لاقی لە عەرزی گیر کردن و هاواری کرد:

-ناتوانن گیانی زیندوو بکوژن.

-هەی سەگە!

جاسووسەکە مستێکی لە روومەتی دایك دا. دەنگێك هاواری کرد:

-باش بوو، بۆ ئەو پیرە مردارە!

شتێکی رەش و سوور تاوێك بەرچاوی دایکی گرت و تامی سوێرایی خوێن زاری پڕ کرد. هاوارێکی لەبەر هاتەدەر و گیانی وەبەرهاتەوە:

-حەقتان نییە لێم بدەن!

-کوڕینە!

-نای، بێشەرەف!

-مستێکی لێدا!

-ناتوانن راستی له خوێندا بخنکێنن! ... ... .

له پشتەوەڕا پاڵیان پێوەنا. هەموو شت دەبزووت و له نێو گێژەلۆکەی تاریکی هاوار و هەرا و هوریا و فیکە فیکدا نوقم دەبوو. شتێکی خەست و گەرم بە گوێیدا دەچووە خوار و گەرووی پڕ دەکرد و دەیخنکاند. عەرز لەژێر لاقانیدا کە دەچەمانەوە، رۆدەچوو، لەشی لەبەر دەرد و ژان دەلەرزی. لەبەر لەڕ و لاوازی هەر بەلادا دەهات، بەڵام لە دەوروبەری خۆیدا چاوی زۆر دەدیتن کە بە گڕی ئازایەتییەکی ئەو شارەزای بوو و بە دڵ خۆشەویستی، دەدرەوشان.

بۆ لای دەرگا رایان دەدا. دەستێکی بەربوو، بە باهوی دەرگاوە گیر بوو و هاواری کرد: -بە دەریای خوێنیش ناتوانن حەقیقەت بێدەنگ بکەن.

زەبرێکیان لە دەستی دا.

هەی شێتینە، لە قین و تووڕەیی زیاتر بەرهەمێکتان نابێ! ئەو قین و تووڕەییەی خەڵکیش ئێوە دەخنکێنێ!. . . .

ژاندارمێك بە هەموو تواناوە گەرووی رێك دەگوشی. دایك بە خینەخین گوتی:

بەدبەختینە. . ..

یەکێك بە هەناسەیەکی درێژ وەڵامی دایەوە.

فەرهەنگۆك
محەمەدی مەلا کەریم و جەلال ئەحمەد
ئامادەیان کردووە

تێبینی:
مەبەست لە ئامادەکردنی ئەم فەرهەنگۆکە ئەوە نییە رۆشنبیرانی کورد ئەو وشانە نازانن کەوا ئێمە خستوومانتەتە نێو چووارچێوەی ئەم فەرهەنگۆکەوە. ئێمە ئەم فەرهەنگۆکەمان بۆیە ئامادە کردووە چونکە کتێبەکەش لە بنچینەدا بۆ خوێندەوارانی بنەوەی کورد، بۆ کرێکاران و جووتیاران و قوتابییانی کەم خوێندەواری کراوە بە کوردی. ئەوانەش زۆربەیان شارەزای دیالێکتە جیاوازەکانی زمانە نەتەوەییەکەی خۆیان نین و لە ئاستی گەلێ وشەی یەکتردا دادەمێنن. ئەم فەرهەنگۆکە لەوانەیە یارمەتییەکی ئەوانە بدات و کارێك بکات لە ئاخاوتندا لە یەکدی نزیك ببنەوە.

(ئ)

ئاتەگ: شاقەل، بەشێك لە داوێنی پاڵتۆ یان کراس و کەوا.

ئاژێر: شوت، زەنگی کارخانە.

ئاسنەواڵە: ئاسنە کۆنە.

ئاکار: کردەوە، رەفتار.

ئامپول: شرنقە، دەرزی.

ئامێز: باوەش.

ئاوردوو: سووتەمەنی.

ئەدادەرهێنان: نازکردن.

ئەرباب: خاوەن مڵك، یان خاوەن کارخانە، یان دەرەبەگ.

ئەنگوچك: سۆرانی، فەقییانە.

ئەوك: قورگ، گەرو.

ئەوین:خۆشەویستی.

ئیدارە: دائیرە.

ئیرەیی: حەسوودی، بەخیلی.

ئیستیکان: پیاڵە بە تایبەتی پیاڵەی چا پێخواردنەوە.

( ب )

باتلاغ: زەلکاو، زەل.

باتوم: داردەستی پۆلیش.

بریسك: برووسك.

بزاوتن: بزواندن، جووڵاندن.

بزۆز: بزێو، ئەوەی زۆر بزێوی دەکا.

بە تۆبزی: بە زۆر، بە کوتەك.

بە خۆداشکانەوە: تەریق بوونەوە، شەرمەزار بوون.

بەرماو: پاشماوەی خواردەمەنی.

بەزەر: زیانبەخش.

بەلەك: لای پاشەوەی لولاك لە گوێزینگەوە بۆ رەفیسکە.

بەلەك پێچ: ئەو پارچەی بەلەکی پێ دەپێچن.

بیژو: زۆڵ، حەرامزادە.

بێسەر و بەرە: بێسەر و بەر، نارێکوپێك

بێوازی: بێمەیلی، وەڕسی.

( پ )

پاتاڵ: گا و گۆتاڵ.

پاتە: خۆراکێکی رووسییە.

پاش پانییە: لای پشتەوەی پاژنەی پێ لە تەختی پاژنەوە تا خوار گوێزینگ.

پاشەشکێن: بە پاشدا شکاوە.

باشار: پێوێران، پێوەستان.

بالنج: پشتی.

باوێ: بهاوێ، بهاوە، فڕێبدە.

پرۆشار:پرۆش، تروش،
چاوی باش هەلنەهاتوو.

پڕیشك: پڕژ.

پڕینگانەوە: واز لێ هێنان.

پشتێند: پشتێن.

پشوو: هەناسە.

پۆرتۆ: جۆرە شەرابێکە.

(ف _ ٣٢)

پۆلو: پشکۆ، پنگر.

پەستاوتن: پەستووین، بەسەر یەکدا شێلان.

پێخوست کراو: پێشێلکراو، پێپەستکراو.

پێش: بەردەم.

پیشبینی: زانین و بەراوردکردنی داهاتوو.

پێشهات: رووداو.

پێکهەلپڕژان: بە گژی یەکداچوون.

پێوەربوون: پێدا بلاوبوونەوە.

( ت )

تابلۆ: لەوحەی وێنە لەسەرکراو.

تاتار: گەلێکە لە گەلەکانی رووسیا.

تاقیکاری: تەجرەبە.

پالاوتن: کینایەیە لە راکردن بە دزییەوە.

پالەستۆ: پال پێوەنان لە پشتەوەڕا.

پرچن: قژن.

تێوەرهێنان: لێ هالاندن.

تێهەلبوون: بەرەو سەر چوون.

( ج )

جندەخانە: شوێنی داوێن پیسی.

جەنگەلوان: قۆلچی دارستان.

جێنگل: گێنگل.

( چ )

چرتە: دەنگی کارکردنی سەعات.

چقر: کینایەیە لە شینی مەیلەوسپی.

قلە کێش: ئەوەی چل شەو تەرێك
دەکەوێ، هیچ ناخوا بە نیازی
خواپەرستی و کوشتنی نەفس کە
دیارە زۆر لاواز دەبێ.

چۆرت: ئامرازێکە بۆ حیسابکردن بە
کاری دێنن.

چوورە: چۆلەکەیەکی بۆربەلەت وەك
پاساری.

چەلەنگ: تەنەکە.

تالار: ژووری گەورە، هۆڵ.
تاو: هەتاو، خۆر.
تۆسن: سەرکێش، تووڕە.
تەمبێکردن: تەمێ‌کردن، سزادان.
تێکڕاکردن: لەپڕ بەخەبەرهێنان.
تێك نان: هێنانە یەك.

( خ )

خاچ: سەلیب، سێدارەی عیسا پێغەمبەر.
خرچە: پرخە، دەنگی هەناسەی نووستوو.
خوارە خوار: لارە لار.
خۆڕایی کردن: بەڕەڵڵاکردن، واز لێهێنان.
خورجین: هەگبە، خورج.
خەپەخولە: قەڵەوی کورتی ناتۆڵا.

( د )

دادیار: پارێزەر، محامی.
دانار دانار: دانە دانە، شتی خەست یان ورد کە باش تێکەڵاو نابێ، دەگوترێ بەفری دانار دانار.
داو داو: تاڵ تاڵ.
داوەڵ: داهۆڵ.
داهاتنەوە: خواربوونەوە.

چێژە: تام.

( ح )

حەوترو: هەفتە.

دە: لە.
دەرمان داو: دەرمان خواردوو.
دەرۆست: دەرەقەت.
دەرهەڵبوون: تووڕەبوونی لەناکاو.
دێو مانەند: چەشنی دێو.

( ڕ )

رابوون: راپەڕین، هەستان.
راتڵەکاندن: راتەکاندن، راوەشاندن.
راداشتن: پێشکەشکردن، نیشارە بۆ کردن
رادان: رووپاندنی شت.
راژا: راشەکا، لەرییەوە.
راشکاوی: بێ‌ترسی، (صراحە).
رامان: سەرنج دان، ماتبوونی کاتی بیرکردنەوە.
رانگاوتن: رانەنگاوتن، رایەڵ

دایسیٚ: دەستووتیٚ.
دڕ دڕ: لە چەند جێوە دڕاو.
دڕدۆنگ: دوودڵ، وشك کەوتوو.
درێژەکی: مەیلەو درێژ.
درێشە: درەوش، ئامرازێکە پێڵاودرو
بۆ کونکردنی پایش بە کاری دێنن.
دزێو: ناشیرین.
دژوار: زۆر زەحمەت.
دلۆ: ریزاڵ دەکردنی دەست لەبەر کاری زۆر.
رەگەڵ: لەگەڵ.
رەوەند: رەوت، جەرەیان.
( ز )

زار: دەم.
زاکون: دەستوور، قانون
(وشەیەکی رووسییە).
زاڵ: لەگەڵ "زیل" دەگوترێ و
مانایەکەی بەرینتر دەکا.
زمە: ژاوە، دەنگە دەنگی زۆر.
زووراندنەوە: برژاندنەوە.
زەڵەق: پوڕی خز.
زەنا زەنا: دەنگە دەنگی کۆمەڵێك
کە بە توندی قسە دەکەم.
زەندۆڵ: قەڵشە بەدری نەم دار،
کردن. تەنافی رانگاوت: رایەڵی
کرد، راهێلا.
ردێن: ئەڕدێن، ریش.
رۆبلٚ: گەورەترین پارچەی
رووسیا.
روخ: کەنار، قەراخ.
رومانتیکی: رێبازێکی ئەدەبییە.
روهاتە: دەستی دایە.... .
رە: لە.
ساز: ئامادە، تەبار.
سانسۆر: چاوەدێری، رەقابە.
سرت و خورت: قسە پێکەوە
کردنی هێدی.
سرتە: چپە.
سووتمان: سووتەرۆ، سووتێنراو.
سەرکۆنە: لۆمە، سەرزەنشت.
سێرە: نیشانە.

( ش )

شلوێ: لیخن، قوڕاو.
شلێوە: بەفر و بارانی تێکەڵ.
شنیل: بارانی، جۆرە پاڵتۆیەکە.
شوش: باریك و رێك.

زەوی قەڵشاو.
زیبک: بە کاری.
زیز: زوویر، تۆراو.

( ژ )

ژامبوون: جۆرە باسترمەیەکە.
ژاندارم: پۆلیسی دەرەوی شار.
ژێست: حالەتی تایبەتی قیافەی
نینسان.

( س )

فنەفن: جۆرە دەنگێك کە بە
لوتدا دێتە دەر.
فیزمالکی دایە: باریکەی دایە،
بە دزی رای کرد.

( ڤ )

ڤۆدکا: جۆرە نارەقێکی رووسییە.

( ق )

قازاخ: سەربازی سوارەی رووس.
قاژو: قاژ، باڵندەیەکی رەشە لە

شەپڕێو: پەشێو، ئاڵۆزکاو.
شەلاڵ بوون: زۆر تەڕ بوون.
شەم: مۆم، شەمع.
شیروانی: بانی کوڕ.
شێوەرد: زەوی جارێك کێڵراو.

( غ )

غەریزە: سروشتێ لەگەڵ لە
دایك بووندا هەبێ.

( ف )

کارگ: قارچك.
کراوات: بۆینباخ.
کوان: دوومەڵ.
کۆمەد: کەنتۆر.
کۆمیسیۆن: لێژنە.
کەپێك: بچووکترین پارەی رووسییە.
کەروێت: کورسی درێژی چەند کەسی.
کەزی: پەلکە، پرچی هوندراوە.
کەلانتەر: سەرپۆلیس.
کەڵپ: کەڵبە، ددان.
کەڵپە: کەڵبە.
کەلەگی: ژووی پشتەوە.

قەلەسابوونی بچووکترە و گۆشتی دەخورێ.

قامك: ئەنگوست، پەنجە.

قرژ: پێچەوانەی لوس و رێك.

تشقەڵە: قشقەرە، قشكەڵە، قەلەباسكە، قەلەباچكە

قورم: تەنی، رەشایی دووكەڵ كە شت دەگرێ.

قۆنداخ: قۆناخ، بنكی تفەنگ.

قەتران: خەستاوێكی رەش و چەورە لە هێندێك درخت پەیدا دەبێ.

قەڵاشتن: لەت كردن.

قەڵشت: درز، تێك.

( ك )

گەپجاڕ: گاڵتەجار، كەسێك گاڵتەی پێ بكرێ.

گێنگڵ: پێچ خواردن

( ل )

لاتاو: پلار، تەوس و توانج.

كەنداڵ: كەند، عەرزی بن كۆڵكراو.

( گ )

گارسۆن: بۆی، خزمەتكاری میوانخانە و چێشتخانە.

گالۆش: پێڵاوێكی لاستیكە پێی بە كەوشەوەی تێ دەكرێ.

گرفە: لرفە، گرپە.

گرووپ: تاقم، كۆمەڵ.

گڕوێ: گەڕۆڵ.

گنج: لۆچ.

گنجاوی: لۆچاوی.

گۆڕاندن: بە توندی و تووڕەیی قسەكردن.

گۆڕایی: دەشتایی بێكەند و كلۆ.

ماهوت: ماوت، جۆرە پارچەیەكی پەشمی ئەستوورە.

ماهیچە: ماسولكە.

مژ: هەوری پڕ و نەوی.

مژۆڵ: بژۆڵ، برژانگ.

مۆڕە: چاولێكردنێكی بە مۆنی.

مەزرا: كێڵگە.

مێشە: بێشە، دارستانی دەسكرد.

لاسک: قەد.

لامەزەب: بێ مەزەب، بێ دین.

لوشک: لەقە.

لەچەری: پیسکەیی، پێچەوانەی سەخیەتی.

لێک و لووس: بێگرێ و گۆڵ.

لینگ دان: غارکردن، هەڵاتن.

( م )

ماسک: رووپۆش، نقاب.

ماشین: مەکینە.

ماکە: ماک، توخم، سەرچاوە.

مامزە: ئامرازێکە لە ئاسن دروست دەکرێ سوار لە پاژنەی لاقی قایم دەکا و لە وەختی سواریدا لە کەلەکەی وڵاخی دەکوتی.

وەدەرکەوتن: دەرچوون.

وەرکەوتن: خەوتن، راکشان (بە زۆری بۆ حەیوان دەگوترێ).

وەنوشتاندن: نوشتاندنەوە.

وێ: لێ.

وێچوون: لێ چوون، پێ شوبهان.

( ن )

ناتەبایی: ناکۆکی توند و لە ئاشتی هەڵاتوو.

نارەنار: گۆرانی گوتنی لەبەرخۆوە.

نسکۆ: رەت بردنی توند بۆ پێشەوە.

نەزیلە: داستانی کورت.

نەیار: ناحەز، دوژمن.

نێردیوان: پەیژە.

نیسێ: نسێ، سێبەر.

نیگا: چاو تێبڕین، نەزەر.

نیگەرانی: دڵ ناخۆشی، گومانی ناخۆش.

نێڵە: دەنگی ئاگری بەتین.

وان: بانێو، گۆلی چکۆڵەی ژووری حەمام کە خۆی تێدا دەشۆن.

وستە: متەق، وستەی نەکرد، متەقی نەکرد.

وشتی: سڵی، قوتی، زۆر وریایی.

وە: ئەوە.

هێدی: ئارام.

ویژینکاوی: حاڵەتی وەنەوز دان.
ویژینگ: وەنەوز.
وێکهێنان: هێنانە یەك، بۆ لای یەك هێنانەوە.

( هـ )

هاوروژاو: وروژاو، هاروژاو.
هەدادان: سرەوتن.
هەراو: زۆر، بڵاو.
هەڵبوون: داگیرساندن.
هەڵتروشکان: جۆرە دانیشتنێك کە بەر ی پێی دانیشتوو لەسەر عەرزی بێ.
هەڵدەنگوتن: پێیان لە شت دەئەڵقا و رادەپەڕین.
هەڵمساو: هەڵاوساو، باکردوو.
هەڵنان: دیاریکردن بە نهێنی.
هەڵویژاردن: کۆکردنەوە و رێکوپێك کردن.
هەڵێنان: بەرزکردنەوە، هەڵبڕین.
هەوڕ: قاپ و مەنجەڵ.

## چەند وشەیەك لە کۆتایی ئەم رۆمانەدا

یەکەمجار لە (١٩٥١)دا بوو رۆمانی "دایك"م بە عەرەبی خوێندەوە. هەر ئەو کاتە بیرم لەوە کردەوە کە بیکەم بە کوردی. دەستیشم دایە، بەڵام هەر لە سەرەتاوە تێگەیشتم پێم ناکری. لە توانای ئەو کاتەم زیاتر بوو، بەڵام خولیای بە کوردی کردنی هەر لە سەرمدا مایەوە. پاشتریش هەر چەند رۆمانێ یان رازێکی پێشکەوتنخوازم ئەخوێندەوە، ئاواتی ئەوەم ئەوخواست کە بکرایە بە کوردی، چونکە دەوری رۆمان و رازی پێشکەوتنخواز لە بڵاوکردنەوی بیری شۆڕشگێڕیدا دەورێکی دیارییە. لام وایە بەشێکی زۆری تێکۆشەران لە سەرەتای ژیانیاندا رۆمان و رازی پێشکەوتنخواز رایکێشابنە کۆڕی خەباتەوە.

لە ناو ئەو جۆرە رۆمانانەدا "دایك" —یان وەك من حەز ئەکەم بە کوردی ناو بنرایە، "دایە" — لە ریزی پێشەوەی ئەو رۆمانانەیە کە رێگای راست، رێگای خەباتی چینایەتی، بێ هیچ جۆرە ئاڵۆزی و سەر لێ شێواندنێك، بۆ چینی کرێکار، بۆ جووتیارانی هەژار، بۆ هەموو ئەوانەی چارەنووسی خۆیان بەدوارۆژی سۆشیالیستیەوە بەستووەتەوە- روون دەکەنەوە. بۆیە بێگومان وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی ئازیزی کوردی خۆمان، بەشدارییەکی پیرۆزە لە خەباتی گەلەکەماندا، لە روونکردنەوەی رێگای دوارۆژی بەختەوەردا بۆی.

جا ئەمرۆ کە برای دڵسۆزم کاك کەریمی حیسامی ئەم ئەرکە بەجێ ئەگەیەنێ و کۆڕی زانیاری کوردیش ئەو بەشدارییە ئەکا لەم خزمەتەدا بە گەلی کورد، منیش خۆم زۆر بە بەختیار ئەزانم کەوا ئەگەر شەرەفی وەرگێڕانەوەی بۆ کاك کەریم بووبێ، ئەوەش بۆ من ماوەتەوە کە سەرپەرشتی لە چاپدان و راستکردنەوەی هەڵەی چاپ و هەندێ وردە دەسکاری رێنووس و زمانەکەیم کردووە و ناوە رووسییەکانی کەسانی رۆمانەکەم لەگەڵ تێکستە رووسییەکەدا بەراورد کردووە و رووسەکان خۆیان چۆنیان بە کاردێنن بەو جۆرەم لێ کردوون.من ناڵێم ئەم وەرگێڕانەی کاك کەریم تەواوی ئەرکی وەرگێڕانی ئەم رۆمانەی بەجێ گەیاندووە. بەڵام دیارە کەوا تا ئەو رۆژەی بۆمان هەڵئەکەوێ نووسەرێکی کوردی و رووسیزانی چاکمان ببێ راستەوخۆ لە رووسییەوە بۆمان بکات بە کوردی، کەلێنی نەبوونی رۆمانەکەمان بە کوردی، بۆ پڕ ئەکاتەوە.

دەسا، سوپاس بۆ کاك کەریم و بۆ کۆڕی زانیاری کورد و بۆ هەموو ئەوانەی لە زاخاودانی مێشکی رۆڵەکانی گەلەکەماندا بە بیری پێشکەوتنخواز، بەشدارییەك ئەنوێنن.

محەمەدی مەلا کەریم

لە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئەم کەسانە بەشدار بوون:
بەڕێوەبەری چاپخانە و سەرپەرشتی کەری گشتی: کامل منصور اسگیفو
پیت داڕێژانی سەر مەکینەی ئەنتەر تایپ: نینیئل یونان یلدا، حازم عبدالمسیح، اویایشو بنیامین
ڕێکخەری لاپەڕەکانی کتێبەکە: عمانوئیل میشو یوسف
بەردەستی ڕێکخەری لاپەڕەکان: شیردل فتحی معروف
لە چاپدەرانی کتێبەکە: نوئیل ایوکە سمعان ، حمید متی کە
راستکەرەوەی هەڵەی چاپ و نەخشەدانەری بەرگەکەی: محمدی مەلا کەریم
یارمەتیدەری راستکردنەوەی هەڵەی چاپ: عبدالرحمن سعید زەنگەنە ، جلال احمد
خۆشنووس: مهدی محمد صالح
(۲۰۰۰)دانە لەم کتێبە لە چاپ دراوە
دەستپێکردنی لە چاپدان: ۱۹۷۸/۱/۲
لێبوونەوە لە چاپ: ۱۹۷۸/٤/۲۷
لە کتێبخانەی نیشتیمانیدا
ژمارەی ٤۳٦ی ساڵی ۱۹۷۸ی دراوەتێ